# مەرگێکی بچووک

ڕۆمانێک لەبارەی ئیبن عەرەبییەوە

براوەی خەڵاتی بووکەری عەرەبی ٢٠١٧





محەمەد حەسەن عەلوان
و: حەیدەر عەبدوڵڵا

# ناوەندی ڕۆشنبیریی ئاوێر

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: حەسەن بورەیی

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: ئارێز حەسەن

بەرپرسی هونەریی بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس

ڕاوێژکاری ناوەند: د. نەجاتی عەبدوڵڵا

AWER

ناوەندی ئاوێر

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



هەولێر: پشت پارێزگا- پشت مزگەوتی مەحموود عەلاف

07505114142 - 07507476644

Nawendi awer :: ناوەندی ئاوێر

Nawendi.awer@yahoo.com

AWER ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٤٤٢

نووسینی: محەمەد حەسەن عەلوان
وەرگێڕانی: حەیدەر عەبدوڵڵا
پێداچوونەوەی: زیاد ئەسعەدی
چاپ :یەکەم- ٢٠١٨
دەرهێنانی هونەری :خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ : ئاکار جەلیل کاکەوەیس
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (١٣٠٠٠) دینار
شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەڵات - هەولێر
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکانی هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی( ٣٤٦ ) ی ساڵی ٢٠١٨ ی پێدراوە.

# سەرایی

سەردەستەی عاشقان، پیری مەیخانەی عاریفان، شاسواری مەیدانی تەریقەت، کبریتی سووری شەریعەت، هەردەگەڕ و فەیلەسووفی بیرهەڵکشاو، ئوستاد و خەرقەپۆشی دڵسووتاو، قوتبی تەسەووف، موحیەدینی ئیبن عەرەبی (١١٦٥-١٢٤٠ز).
بەر لەوەی بە جەستەی کزۆڵی سەفەر بکات، بە دڵی نوورینی کەشفی دەکات. بۆ گەیشتن بە شاڕێکەی هەقیقەت و تاڤگەی ئەوین، سڵ لە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک ناکاتەوە. دەشت و دۆڵ و چیا و چۆل و گوند و دوندان تەی دەکات و شەکەت نابێت. دەستنوێژی دڵی هەڵدەگرێت، بە چرای نوور، بە دوای مێخەکانیدا دەگەڕێت، بە هەر مێخێکی دەگات، باشتر لە حاڵی دڵی تێ دەگات و چاکتر ئادابی ڕێبواری بەجێ دەهێنێت. بەڵێ، سەفەر دەکات، نائومێد دەبێت و دەگەڕێتەوە، بەڵام دیسان بەگڕتر تێ هەڵدەچێتەوە. ئەو مەولانای ڕۆمی نییە، هەروا بەئاسانی توێکڵ بکرێت و هەر کەس بە کەیفی خۆی ئاو لە کانیاوە عیرفانییەکەی بخواتەوە. دەربڕینەکانی ئەو، دوای توێکڵکردن ئاڵۆزییان دەردەکەوێت و بیرکردنەوە سڕ دەکەن، بۆیە ناکرێت هێندە بەسێنایی مرخی خۆمانی لێ خۆش کەین و بەبێ مەشقی دڵ، مەلە لە دەریا پڕ ڕاز و نیازەکەیدا بکەین.
زۆرینەی وتە و دەربڕینەکانی ئەو، بە یەک لێکدانەوە، بگرە بە دوان و سیانیش تەواو ڕوون نابنەوە، ڕوونیشە هەر دەقێک خۆی

نەداتە دەسـت یەک لێکدانەوە، هەمیشـە بە نوێیەتی و نەمری دەمێنێتەوە.
دەبێت زۆر باش ئەوە بزانین، کە ئیبن عەرەبی بە زمانی حاڵ دەدوێت و لە زمانی قال خۆی نەبان دەکات، زمانی باتینی هەموو نووسین و کتێبەکانی ئەوی بەرەو ڕەمز و ناڕوونی بردووە. ئەو زمانی ڕووکەشـی بۆ خەڵک جێ هێشـتووە، چونکە ڕووکەش، زمانی عەقڵە و حاڵیش زمانی باتینە، ئاخر کوا زمانی عەقڵ دەتوانێت زمانی حاڵ لێک بداتەوە؟
لەبارەی ئەم ڕۆمانەیش، کە لەبارەی ژیانی ئیبن عەرەبی نووسـراوە، نامەوێت هیچ شـتێک بڵێم، چونکە ڕۆمانێکی هێندە گەورە بە چەند دێڕێک نەک ناناسرێت، بەڵکوو سەریش لە خوێنەر تێکدەدا، دیسـان ناشـمەوێت خوێندنەوەی خۆم زاڵ بکەم و خوێنەریش ناچار بکەم بەم چەشـنەی من چێژ وەربگرێت و بیخوێنێتەوە.
خۆشـی وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە لەوەدا بوو بەردەوام لەگەڵ خاوەنەکەی (محەمەد حەسـەن عەلوان) لە پێوەندیدا بووم، لە ڕێگەی پرسـیار و وەڵامەوە، چەندان گرفتی زمانەوانی و تەنانەت تەکنیکیشـمان تاووتوێ دەکرد. ئەو، کەسـێکی خاکی و دڵفراوانە، بەوردی پرسـیارەکانی وەڵام دەدامەوە و کارئاسـانی بۆ دەکردم، بۆ هەر هەڵەیەکیش، کە لە ڕۆمانەکەم دەگرت، سـوپاسـی دەکردم و دەیگوت: "وەرگێڕ ئاوێنەی نووسەرە".
عەلوان ئەگەرچی چوار ڕۆمانی دیکەیشی بەناوی: "سقف الكفاية" ، "صوفيا"، "طوق الطهارة"، "القندس" هەن، بەڵام هیچیان وەک ئەم ڕۆمانە (مەرگێکی بچووک)، شـۆرەتیان دەرنەکرد و بەو فراوانییە نەچوونە نێو گەلی خوێنەران. وێڕای ئەمانەیش، خەڵاتی ٢٠١٧ـی بووکەری عەرەبیشی بردەوە.

بۆ وەرگێڕانی ناوی ڕۆمانەکەیش "سووکەمەرگ" و نیوەمەرگ" و نیمچەمەرگ" و چەندان ناوی دیکەیش پێشنیاز کران، بەڵام لە کۆتاییدا "مەرگێکی بچووک" لە میچی زەینمدا لەنگەری گرت و خۆی چەسپاند، ئاخر "مەرگێکی بچووک" باشتر لەگەڵ مەبەستی ئیبن عەرەبی یەک دەگرێتەوە: "خۆشەویستی مەرگێکی بچووکە" بە هەر دەستکاریکردنێکش لایەنە فەلسەفی و تەسەووفییەکەی دەپووکێتەوە و خوێنەریش زیاتر سەرنجی بۆ شکڵ و سیما کوردییەکە دەچێت، کە ئەوەیش مەبەست نییە. خۆ ئەگەر تەنێ چەمکێکی ڕووتی ئەدەبی بوایە، ئەوە گونجاندن و کورداندنی زۆر ئاسان دەبوو، بەڵام چی لە ئیبن عەرەبی دەکەیت، کە هەر دەربڕینێکی بە چەندان مانا دالەنگاوە، لەنێو هەر وشە و ڕستەیەکیشدا، چەندان ئاماژەی عیرفانی و ئینسانی خەملیون.

حەیدەر عەبدوللا شێخوەسانی

هەولێر

"ئیلاهی!
تەنیا من نیم خۆشم ویستووی،
بەڵام من هەر تەنیا تۆم خۆش ویستووە"

ئیبن عەرەبی

# ١

**ئازەربیجان**
**٦١٠ك/١٢١٢ز**

سەرەوەی ئەم کوخە وەک کۆپارەی وشـــتر وایە. کاتێک تێیدا پاڵ دەکەوم و دەخەوم، لەبەر تەنگەبەریی شوێنەکە بەسەر لاتەنیشتمەوە ڕادەکشـــێم. گاوێک هەڵدەســـتمەوە، دووکەڵی ئاور، کە بنمیچی کوخەکەی گرتووە و پەنگی خواردووەتەوە، پشـــووم لێ دەبڕێ و وەخنکەخنکم دێخێ. گاهێک دەمەوێت لێی بێمە دەرەوە، لەبەرچاوم ئاســـمان وەک پارچەیەکی داوەریو لەگەڵ زەوی لێکی داوەتەوە، دەترسم بەرەو لای بڕۆم، تێی هەڵنووتێم[١]. لووتکەی کێوەکە شتگەلی بنارەکەی وا لێ دەکات بەئاستەم ببینرێن، بێ هەست و خوست بن، هیچوپووچ و ناکاریگەر بن. زەوی، دامێنی کوخەکەی خواردووە، لەنێوان هەر بستێکدا، کەلێنێکی تێ کەوتووە و زستانان بای ساردی لێ دێتە ژوورەوە. لە وەختی بارانبارینیش ئاو دەخزێتە نێوی. لە شـــەوانی وەرزی بەهاریش، مێروو و مەگەز ڕێچکەی بۆ دەبەســـتن. ڕەنگە دەرگەم بەکراوەیی جێ هێشتبێت، پەڵەهەورێکی سەرگەردان و وێڵ، خۆی بە ژووردا کردبێت. لەوانەیە بایەکی بەهێز هەڵبکات، یەکدوو تابلۆ لە کوخەکە بەرداتەوە. دوای هێوربوونەوەی بایەکە، ڕۆژێکی ڕەبەق ســـۆراخیان بکەم. دەشـــێ بزنێکی ڕێ لێ تێکچوو،

---

[١]-تێی هەڵبنەنکووم.

لەبەردەم قاپییەکەمدا باعەباعی کردبێت، یان مەلێکی کەسـیرە و کز، بەسـەر کوخەکەدا کەوتبێت. لێرەدا لەمە زیاتر شـتێکی دی ڕوونادات، بەڵام زۆر شـت لە دڵمدا جۆشـیان سـەندووە، ئەوەی لە ناخیشـمەوە ژاوەژاو دەنێتەوە، تۆقین و ترسناکە.

هەر لەو ڕۆژەوەی پێم ناوەتە ئەو کوخەوە، ئەوە حاڵیەتی. منیش جگە لە کەلوپەلەکانم هیچی دیکەم نەخسـتە سـەر. ڕایەخێکی خوریی هـەلاجنـەکراو لـە سـووچی کوخـەکـە دانراوە، تـەشـتێکی دەسـتنوێژهەڵگرتنیش لەوێ هەیە و شـانەیەکی تێدا نوقم بووە. لەتەک ئەویش پەڕاوە پێچراو و چرا و لیقە و حوبردانەکەم، کە بە زسـتانان حوبرەکەی تێدا وشـک دەبێتەوە، لەسـەر تاکە ڕەفەی دیواری نێو کوخـەکـە بـەسـەر یـەکـەوە کـەڵـەکـەکراون. لە نزیـک دەرگەکەیش کەندوولەیەکی ئاردی لێیە، کوپەئاوێکی لە پشـتەوەیە، بەسـەریشـیەوە کیسـەیەک خوێ و سـەبەتەیەکی پڕ لـە خورمـا و دەفرێـک لەتکەهەنجیری وشک، داندراون.

بۆ کەسێک بیەوێت خەڵوەت بکات ئەوهەموو کەلوپەلە گەلێک زۆرن، ڕاسـتییەکەی ئەو خەڵوەتە بەم شـێوەیە وێران و بەربادم دەکات. کاتێک بۆ بینینی مەتڵەعی نووری ئیلاهیی شـەونخوونی دەکەم، خەو دەمباتەوە! هەڵبەت ئەمەیش خەتای ڕایەخە خورییەکەیە، دەیەوێت ئەو فـەیزەم لێ زایە بکات. وەختێک خۆم بێدەنگ دەکەم و گوێچکەکانم بۆ خشپە و لەرەلەری ئەسراری قودسی قولاخ دەکەم، قۆڕەقۆڕ بە سکم دەکەوێت و برسـی دەبم و لە باسـەکەم دوور دەکەومەوە. گاوێک ویسـتم چراکەم داگیرسـێنم و پەڕاوەکانم دەربهێنم، قەڵەمڕیشـەکەم بخەمە نێو حوبردان و لەو شـوێنەی دوێشـەو وەستابووم، دەست پێ بکەمەوە، ڕێک لەو جێگەیەی ڕووپەل و قەڵەمڕیشـە بەیەک گەیشـتن، پەنجەرەیەک کرایەوە، دەوروبەری ئەندەلوس و کۆڵانەکانی فاس و سـووچ و گۆشـەکانی توونس و خانەقاکانی قاهیرە و دۆڵەشـیوەکانی مەککە و دووکانەکانی بەغدا و غوتەی دیمەشـق و دەریاچەکانی قۆنیای تێدا دەرکەوتن... وای خوایە ئەمە چ گۆشەنشینییەکە!

لەسەر ڕووپەلی ئەو زەمینەدا بە مەنزلگەی خۆم نازانم، هەرچەند ئەمە بۆ من گرنگ نییە، چونکە خوا دڵی منی بە چوارمێخ شەتەک داوە. شاری (مەلەتییە)م جێ هێشت و بەرەو خۆرهەلات کەوتمە ڕێ. بەڕەیەکی تووکنم بەسەر پشتەوە بوو، هەموو کەلوپەلەکانم تێدا گلدابوونەوە. تا شەکەت دەبم دەڕۆم، بە هەر خۆراکێک بگەم دەیخۆم، تا شەو حەز بکات دەخەوم. لە ڕۆژی سێیەمی ڕێکردنم، بنی پێیەکانم ڕەقهەلاتوون و دەتریوێنن، ڕەنگیان بە شێوەیەکی زۆر سەیر و غەریب گۆڕاوە، هەر دەڵێی لە جەستەی من نین! ڕیشم هێندەی تر ئاڵۆزاوە، لێوەکانم شەقشەق بوون، وەختێک بۆ خواردنی تیکەنانێک دەیانکەمەوە، خوێنیان لێ دەچۆڕێتەوە! هەموو ئەندامەکانی جەستەم وە شەکوا و نالەنال کەوتوون، کەچی هەر دەڕۆم و هەدا نادەم. ڕێگەکان یەک بەدوای یەک باوەشم بۆ دەکەنەوە. لووتکە و تەپۆلکەکان بەرزم دەکەنەوە و دۆڵ و نیهالەکان نزمم دەکەنەوە. بە لای خەڵکی گوند و ئاواییەکاندا تێپەڕ دەبم، لە چۆلەوانیدا بەتەک دڕندە و ئاژەڵی کێویدا ڕەت دەبم. بەر لەوەی ڕێگەی کێوەکانم کۆتایی بێت، مانگ لە سەرەتای نوێبوونەوە، لە شەوی چواردە و شەوانی ئۆغریدا، هاودەمیم دەکات. پشتم هەڵکرد و بەرەو سەرەوە هەڵکشام. ڕۆژگارێکی دوورودرێژە من خەریکی هەڵزنانم، ڕێگەی وەسڵم لێ دەگیرێت، دووبارە دێمە خوارەوە، دیسان ڕێگەیەکی دیکە دەگرم و تێ هەڵدەچمەوە. سەردەکەوم، خۆم لەسەر هەڵدێرێک دەبینمەوە، هەمدیس بە ڕێگەی خۆمدا دەگەڕێمەوە. ئەوجارەیش بە ڕێگەی سێیەمی کێوەکە هەڵدەگەڕێمەوە، تاکوو ڕێچکەیەک بۆ نزیکبوونەوە لە لووتکەی کێوەکە دەبینمەوە. هەتا بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێم، برسیەتی زیاتر تەنگم پێ هەڵدەچنێت، ئاخر وردە وردە گژوگیا کەم دەبێتەوە و زەوین ڕەقوتەق دەبێت. پەنجەکانم زامداربوون، ژانی ئازاکانم ڕوو لە زیادبوونە، ناوەناوە بە گریان و ڕۆندک ڕشتن، دڵنەوایی خۆم دەکەم. لە کۆتاییدا گەیشتمە سەر لووتکەی کێوەکە، شەوی یەکەم لەو چۆلەوانییە خەوتم. بەیانی ئاسمان ساف و بێگەرد بوو، کوخەکەی خۆم لە دوورەوە هاتە بەرچاو. بەرەو لای چووم،

دەرکەوت ماوەیەکی زۆرە چۆل بووە، ئەوسا زانیم گەیشتمە ئەنوا و پەنایەک، کە شیاوی  پەیمان و بەیعەتی منە، دوای پەنجا ساڵ خەڵوە و جەلوە و گەشت و مەشق و موجاهەدە، گەیشتمە قوتبی خۆم.

لە شیرینەخەودا بووم، هێزی باڵا بەیعەتی پێ دام، ئەمەیش شەوێک بەر لە دەرچوونم لە شاری (مەلەتییە) بوو. ئەو هێزە بە ویستی خوا هات و لەسەر پێخەفەکەم جەزبی کردم و بە قەد بستێک لە هەوا ڕای گرتم. خۆ ئەو جەزبەیە کتوپڕ نەبوو، بەڵکە هەر لەو کاتەی تەواوفم بەسەر مێخەیلی کێوەکانی ئەم زەمینەدا تەواو کرد، چرکە دوای چرکە چاوەڕوانی هاتنی ئەو جەزبەیە بووم... بەر لە لەدایکبوونم، ئەم تەوافەم لە لەوحی دێرین بۆ نووسرابوو! هەموو جەزبەکان تێکم دەهاڕن، تاکوو دڵم دەبێتە کۆترێک لە ئاسمانی مەلەکووت، قسەکانم شێوەی فەهوانی وەردەگرن و کەس نایانژنەوێ. نووری خودا بینایم دەڕفێنێ، لێ بەسیرەتم وەئاگا دێنێ... دواتر خودا بۆم کەشف دەکات چۆن و بەچی فەرمان بە بەندەی قەلەندەر و لێبڕاوی خۆی دەکات. داوام لێ دەکات کتێبێک بنووسم، زانستێک کەشف بکەم، یاوەریی شێخێک بکەم، کۆمەکی موریدێک بکەم، لە کاتی ئاتاجیدا خەڵوەت بکەم و جەلوە بگرم. هەر شتێک من دەیکەم فەرمان و تەگبیری ئەوە: خۆشی و ناخۆشی، سەختی و ئاسانی، شادی و خەمناکی، داسەکنان و سەفەرکردن، زانست و شەتەحات، حەرف و ڕەقەم، گۆکردن و وسکتبوون. ئیتر بوومە قوتبی شەئنی ئیلاهی، غەوسی هاوزەمانم، ئاوێنەی هەق لە دەستی تەلیسمی خواوەندی ئەعزەمم، تەرازووی فەیزی بەرفراوان.

- ئەرێ پیاوەکە تۆ هەیت؟

شوانە ئازەریەکە لە دەرەوەی کوخەکە  قسەی پێ بڕیم و بە زمانێکی قوڕسەوە بانگی کردم. منیش هەستام و بەرەو پیلی چووم، قاپلەمە و گۆزەڵەیەکم بە دەستەوە بوو. سەلامم لێ کرد و سەلامی لێ وەرگرتمەوە. لەنێو تێری سەر پشتی هێسترەکەی، نان و دان و تووری دەرێنا و خستییە نێو قاپلەمەکەی من. دواتر کوندەی سەر

پشـــتی هێنایە خوار و گۆزەڵەکەی لێ وەرگرتم و پڕ ئاوی کرد... کوندەکەی ڕێک خستەوە و هێسترەکەی تاودا و گوتی:
- دوای هەفتەیەکی دی دەتبینمەوە.
منیش دوو دەرهەمی سەلجووقیم دایێ و گوتم:
- حوبرم بۆ نووسین دەوێت، زەیتم بۆ چرا گەرەکە.
ســـەری قایلبوونی بۆ لەقاندم و ڕۆیشـــت. کەلوپەلەکانم هەڵگرتن و چوومـەوە نێو کوخـەکـەم، پاشـــان بۆ ئاگرکردنـەوە هـاتمـە دەرەوە، تەماشـای ئاسـمانم کرد هەڵۆ لەسـەر لووتکەی شـاخ دەسـوورێنەوە، هـەموو ڕۆژێـک لـە چاوەڕوانی گرتنی نێچرێک لـە مـەلاســـدا بوون، قەیرێک تێیـان ڕامـام. نـەختێک ئاوم لـەنێو قاپلـەمـەکە کرد و پاقلە و چنگەخوێیەکم ڕووکردە نێو... قاپلەمەم خســـتە نێوان دوو قەدەداری دایسـاو و گڕگرتوو، دانیشـتم، هەم خۆم لەبەر ئاگرەکە گەرم کردەوە، هەمیش چاوەڕوانی پێگەیشتنی خواردنەکەم بووم. نانم خوارد و خۆر ئاوابوو. نوێژم دابـەســـت، لـە دوورەوە لـە بنـاری کێوەکەدا گوێم لە لوورەلووری گورگ بوو. لەپشت لووتکەی کێوە بڵند و سەرکەشەکان مانگم لێ ئاوابوو، شـەوی ئەنگوسـتەچاو وەک سـندووقێکی تاریک و بێ درز و ڕووناکی، دای پۆشـیم. ئەسـتێرەکان لە بان سـەرم وەک شـــەوی گۆڕین، شـــوێنی خۆیان گرتەوە. بەرەو کوخەکەم چوومەوە، چراکەم داگیرسـاند و دانیشـتم، دەسـتم بە نووسـین کرد، نووسـینێک کەس وەک من لەبارەیەوە نازانێت، هیچ کەس وەک خۆم بە دۆخی ئەو، ئاشـــنا نییە: نووســـینی ژیننامەی وەلییەک، کە خوا خۆی هەڵی بژاردووە، چۆن ویســـتوویەتی فەرمانی پێ کردووە. لەبەر ڕووناکیی چرای ڕاستینە، قەوماو و بەسـەرهاتی ئەوم نووسییەوە. ئەمەیش بۆ ئـەوەی گـەر خـەڵک لـەبارەی من نـاکۆکی و جیـاوازییـان تێکـەوت بەڵگەیان بە دەســـتەوە بێت. "بســـم الله الرحمن الرحیم"، پیری ڕێبوار ئیبن عەرەبی وەهای گوت...

# ٢

**" ڕەحمی دایکان نیشتمانمان بوو، بە لەدایکبوونمان، ئاوارە و تەفروتوونا بووین"**
**ئیبن عەرەبی**

خوا دوو بەرزەخی پێ بەخشـــیم: بەرزەخێک پێشــی لەدایکبوونم و بەرزەخێکیش دوای مردنم. لە بەرزەخی یەکەمدا دایکمم بینی، منی دەبوو، لە هیی دووەمدا کوڕەکەمم بینی، دەفنی دەکردم. باوکمم بینی بە هاتنە دنیای کوڕە نۆبەرەکەی، دڵخۆش و دەم بە پێکەنین بوو. هاوژینەکەمم بینی، بۆ مێردە پیرەکەی، خەریکی گریان و قوڕپێوان بوو. پێشـــی لەدایکبوونم لە (مورســـیە) موەحیدەکانم بینی فتیلەی مورابیتەکانیان دەکوژاندەوە. دوای مردنم تەتەرەکانم بینی بەغدایان دەهاڕی. ئەولیاکانم بینی بەبۆنەی هاتنە دنیای ســـوڵتانی عارفان و فەقیهان مژدەیان بە یەک دەدا، بە لەناوچوون و نەمانی ئیمامی مورتەزەقانیش تەکبیریان لێ دەدا. هەموو ئەوانەم بە ماوەی چەند ســـاڵێکی کەم لەنێو ئەو دوو بەرزەخەدا بینین، ئەمەیش بە کۆمەکی موکاشەفەی فراوان و نووری پڕشنگداری خواوە. ئەم چەند ساڵە، ڕێگەی زوو گوزەرکردن و فەنابوونی لەنێو ئەو تەمەنەدا بۆ دۆزیمەوە، ئەو تەمەنەی، لە دێڕی نامەیەکی ئیلاهی و لە

تroووسـکەیەکی ئاسـمانی شـکۆدار و لە شـوێنەواری خوفێک لە زەمینی پانوپۆڕی خودا بترازێت، هیچی تر نییە.
وەختێک دایکم لە مانگی ڕەمەزاندا ژانی منداڵبوونی گرت، بەرزەخی یەکەمی من کۆتایی هات. توند دەستەکانی به گۆشەی ڕایەخەکەوە گرتبوو، بە دەمیشـی لە خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت: "پەروەرێنم! با منداڵەکەم کوڕ بێت و ژانەکانیشم سووک بکە."
دادە فاتیمە ئارەقەی منداڵبوونی لە تەوێڵی دایکم سـڕی و ترس و بیمی نێو دڵیشی ڕەواندەوە. کاتێک هاتمە دنیا بەر لە هەموو شتێک، ڕووی ئەو مامانە باشـەم بینی، دواتر ڕووی ئەوم بە هەزاران ڕووی دیکە بەراورد کرد، کە لە بەرزەخەکانی خۆمم بینیبوونم: بەڵێ، ڕووی هەزاران ئەولیا، هەزاران ئەتقیا، هەزاران زاهیدم بە ڕووی ئەو گرت، هیی هیچیان هێندەی ڕووی ئەو، مهیرەبان و بەخشـندە نەبوو. دوای لەدایکبوونم فاتیمە ڕاسـتەوخۆ دایکمی داپۆشی، بەڵام بۆی نەلوا من بخاتە سەر سنگی ئەو. شوشتمی و دابینی کردم. بە لووتفێکی دایکانە دەموچاوی سڕیم، بۆ یەکەم جار دڵم شەیدا و هۆگری بوو.
هەر لەو کاتەی تەماشـای ڕووی منی کرد، بە میهر و سـۆزی خۆیەوە داپۆشـیم، کردمیە کوڕی ڕووحیی خۆی، ئاخر میهرەبانی ئەو بۆ من، سەرەخۆشی و دڵنەوایی فیراقی بەرزەخی یەکەمم بوو، تێشـووی سـەرەتای گەشـتەکەم بوو. ئای خوایە چەند ناخۆشـە بەرزەخێکی پڕ لە کەشـف و دۆزینەوە، بۆ دنیایەکی سـیخناخ لە جەهل و نەفامی جێ بهێڵیت. لە بەرزەخی هەقیقەتەوە بەرەو جیهانی گومان و دڕدۆنگی بێیت! گواستنەوەی من لەو بەرزەخە بە دەسـتی پاکی دادە فاتیمە بوو، لە ڕەحمی دایکم ڕایکێشـام و تەسـلیمی ئەو دنیایەی کردم. تا لە ئیشبیلیا بە پیرەژنێکی بۆ خواسوڵحاو و خاوەن کەرامەت سـەری نایەوە، باشـترین و ئازیزترین خۆشـەویسـتی من بوو، قەت لە ژیانمدا ڕوویەکی هێندە درەوشاوە و جوانم نەدیتەوە.

ڕۆژێک بەردەوام هێمای بۆ دڵم دەکرد و دەیگوت: " ئەمە پاک بکەوە!"
هەر لەگەڵ وەهۆشهاتنەوەی دایکم ژنانی دەروجیران و یاریدەدەرانی مامان هاتن و دایکمیان ماچ کرد و گوتیان: "ئازادبوونت پیرۆز بێت". پاشان ژنگەلی دیکە لە هەموو لایەکەوە بە نۆرە پیرۆزباییان دەکرد و شادی و خۆشحاڵیی خۆیان بۆ ئازادبوونی دایکم دەردەبڕی، هەڵبەت ئەمەیش دوای خستنەوەی کوڕێک . لێکدا لێکدا دەهاتن سەریان بەسەر خەوگەمدا دەگرت و تەکبیر و تەسبیحیان دەکرد، تیلیلی و هەلهەلەیان لێ دەدا. هەر ئەو ئێوارەیە فاتیمە لە باوەشی کردم و بردمیە لای باوکم، ئەویش بە دیتنی من دڵخۆش و شاد بوو. هەرکە چاوم کەوتە سەر دەموچاوە خڕکەڵەکەی، زانیم لەدایکبوونی من بەدیهاتنی نیشانەی ژێر چاوی چەپیەتی، کە بەدرێژاییی تەمەنی لەوێ خۆی مت کردبوو. فاتیمە پێشتر مژدەی ئەوەی پێدابوو: "قوربان! بوونی ئەو نیشانەیە لە ڕووی تۆدا، واتا خوا کوڕێکت دەداتێ ناو و شۆرەتت بەرز دەکاتەوە، وەلێ کە لە ژێرەوەی چاوتە، مانای وایە بە پێچەوانەی ڕێبازی تۆ ڕەوت دەکات."
بەڵێ باوکم هەر لەو دەمەی چاوی بە دنیا هەڵێناوە، قەدەری منی لە ڕووی خۆیدا هەڵگرتووە. مەتەڵی ئەو قەدەرەیش تەنێ من توانیم کەشفی بکەم، کە ئێستە بەهێمنی لەبەردەمیدا دەنێو بێشکەدا خەوتووم.
کە گەورەبووم، دەستم بۆ نیشانەکە درێژ دەکرد و دەمویست بیگرم، باوکم پێدەکەنی، چونکە لای وابوو لە شوێنی خۆی لای دەبەم، نەیدەزانی لە قووڵایی ناخی ئەودا بیر لە دەموچاوە بێگەرد و دەنگە شکۆمەندەکان دەکەمەوە. چەند جار پێشبینییەکەی فاتیمە پاتە دەکەمەوە، ئاخر نامەوێت وەکوو باوکم لەبیرم بچێتەوە. بەڵێ، ناو و شۆرەتی باوکمم بەرزکردەوە، ئەوە باش دەزانم، بەلام ڕێک بە پێچەوانەی ڕێگە و ڕێبازی ئەو ڕۆیشتم، لە کۆشکی شاهانە

سـلـەمیمـەوە و نەچووم کاری تێدا بکەم. وێڕای ئەوەی دەموچاوم وەک ئـەو خڕ و بـازنـەیی بوو، سـیمـای چاوە قـاوەییـەکـان و کوڵمی دەرپـەڕیو وکـەپووی قیت و قژی پڕپیشـم لـەو دەچوون. ڕێکوڕاسـتی ئـەندام و، تەوێڵ پانی و، ڕێکوپێکی ددان و، چەناگەی درێژیشم، لە هیی دایکم دەچوون. بە منداڵی وەختێک نێوچاوانم تێک دەنـا، زۆر شـێوەی باوکم دەکرد، دایکم بەم لێکچوونە زۆرەمان لە قاقای پێکەنینی دەدا. دواتر شـتێکی دیکەیشـم بۆ ڕووخسـارم زیاد کرد، برینێک کەوتە چەناگەم، پەلەدارچواڵەیەکی تێ چەقی، هەر زوو دەرم هێنـا، چـەنـاگـەم بـە قـەد پـەنجـەیـەک برینـدار بوو، هـەتـاکوو گەورەبووم و لەژێر ڕیشـم ون بوو، هەر دیار بوو. حیکایەتی ئەم ڕووداوەیش بەم شـێوەیە بوو: بەیانییەک بەر لە باوکم هەسـتام و لەنێو باخ دەستم بە گەمە کرد، مەلەسوورە پۆل پۆل هاتن و لەسەر دوو دارپرتەقاڵەکەی تەنیشـت دەرگەکە نیشـتنەوە، لقوپۆپی دارەکان تێکئـاڵقـان و لـەرینـەوە. سـمۆرەیش لـە دەوروبـەری دارچواڵـەکـە دەسووڕانەوە، هەر شتێک بەربووبایەوە، خێرا قەپێکیان لێ دەگرت. مـەلی بۆقژەش بـە فڕکـەفڕک دابـەزین و لـە نـافوورەکـە ئـاویـان خواردەوە، دیسـان لـە شـەقـەی بـاڵیـان دایـەوە و لـەسـەر خشـتەسـوورەکانی خانووەکە نیشـتنەوە. هێشـتا باوکم دەسـتی لە نـانخواردن هـەڵنـەگرتبوو، گوێی لـە دەنگی نـاڵـە و گریـانی من بوو. بەغار هات و لە باوەشـی گرتم، بە خوێنی فیشـقەکردووی چەناگەم، جلەکانی خەڵتانی خوێن بوون.

بردمی بۆ لای پزیشـکی کۆشـک، کەماڵیان لە کۆلانەکەی ئێمە بوو، قاچی توند لە دەرگە هەڵدا و بە دەنگێکی بەرز بانگی پزیشـکەکەی کرد، دواتر پزیشکەکە هات و دەرگەی لێ کردینەوە:

- نەدەبوو چاوەڕێ بکەیت؟

- ئەی خوایە! خێرە ئینشائەڵڵا، کوڕە ئەوە چیت لێ قەوماوە؟

- دارچواڵە لێی داوم!

بزەیەکی کرد و سەرمی خستە سەر ڕانی خۆی، پەڕۆیەکی تەڕ کرد و وردە وردە خوێنی ســــڕیمـەوە و برینـەکـەی پاک کردەوە، ئینجا گوتی:
پەلەدار تا سەر ئێسکی چووە، بەڵام خۆشبەختانە نەیبڕیوە.
- دەی درویتەوە؟
- برینەکە بچووکە پێویست بە دروینەوە ناکات، خۆی چاک دەبێتەوە.
- بەڵام دەبینی خوێنی لێ دەچۆڕێتەوە.
- بە پەڕۆیـەک یـان ئیســـفنجێک بیپێچـەوە، دوای ماوەیەک خوێنی دەوەســتێت. باشــە برینەکە لەســـەر دەمار نییە، دەرمانێکت دەدەمێ سارێژی بکات.
سندووقی دەرمانەکانی هێنا و پرسیاری لە باوکم کرد و گوتی:
- فەرموو: مەرهەمت دەوێت یان بۆدرە؟
- کامیان ئازاری کەمترە ئەوم بدێ.
- زۆرباشە هەتوانی (عەفص)ـــت دەدەمێ، بیخە سەر برینەکەی و بـە ڕۆژێـک چـاک دەبێتـەوە. هـەروەهـا بـەیـانیش بۆ یـەکگرتنـەوەی گۆشـــتی برینـەکـە، مـەرهەمی (مەرداســـەنگ) ئامادە دەکەم و بۆ ماڵەوەتانی دەنێرم.
- خوا خێرت بنووسێت.
بـاوکم منی دەبـاوەش گرتـەوە و بەرەو ماڵەوە بردمیەوە، لای دایکم داینامەوە... دواتر خۆی شۆرد و جلەکانی گۆڕین و بۆ کۆشک خۆی سـاز و تەیار کرد. ئەگەرچی نەیگوت دەچمە کۆشـک، بەڵام جلەکانی وایان پێ گوتین. ئەگەر پێچەی خستبایە سەری و، جلە توونسی و، قایشـــی ئاوریشـــم و، کەوای دیباجی پۆشـــیبا ، ئەوە دەمانگوت ڕۆژێکی ئاســاییە و بۆ کارکردن دەچێتە کۆشــکی شـــا محەمەدی مـەردەنیش. خۆ ئـەگـەر کڵاوێکی خســـتبـایـە ســـەر و جوبـەیـەکی دەبـەرکردبـا، ئـەوە دەمـانزانی نـاچێتـە کۆشـــک، بـەڵکوو دەڕواتـە سـەردانی کەسێک، یان دەچێتە بازاڕ شمەکێک دەکڕێت... ئەگەریش

قاپووتی سەر بە قۆچکەی بێ جوبە و کڵاوی پۆشیبا، ئەوە بە زۆری دەچووە مزگەوتی (مەرسـیە) بۆ ئەوەی وانەیەک بڵێتەوە، یان قسـە لەگەڵ کەسـێک بکات. وەک گوتراوە: "هەر شـوێنە و جلی تایبەتی خۆی دەوێت." جلی دیباجی بۆ لای حەزرەتی مەلیک ، جوبە بۆ شـوێنی گشـتی، قاپووت بۆ مزگەوت... هەر وەک ئەوەی کاروباری باوکم وا بخوازێت سێ پیاو لە جەسـتەی یەک پیاودا کۆ ببنەوە، پیاوێک گوێ بەوە نەدات، کە سـێ دڵ لە یەک سـینەدا وێران و گرفتاری دەکەن... نموونەی باوکم ڕێک وەک هەڵسـوکەوت و ڕەفتاری ئەمڕۆی سێ دەوڵەتەکەی باشـووری ئەندەلوس: مورابیت و موەحید و فەڕەنگەکان وایە.

جگە لە عەبدوڵلای کوڕی قەتتان کەس بوێریی ئەوەی نەدەکرد بەگژ هەڵسـوکەوتە دژ بە یەکەکانی باوکمدا بچێتەوە دوای چەندان سـاڵ دوورکەوتنەوەمان لە (مورسـیە)، ڕۆژێک قەتتان لە (ئیشـبیلیا) بۆ نانی شێوان بووە مێوانمان، ئەوسا تەمەنم شانزە ساڵان بوو، زۆر هامۆشۆم دەکرد، نەریتی وا بوو لە مزگەوت و حوجران دانەدەنیشت و وانەی تێدا نەدەگوتنەوە، بەڵکە لەسەر شەقامەکان بەبێ پاداشت و پارە وانەی بە ڕێبواران و سـواڵکەران دەداوە. قسـەی بۆ هەموو کەسـێک دەکرد: بۆ ئەوانەی حاڵی دەبوون و ئەوانەیش، کە حاڵی نەدەبوون. ئامۆژگاری هەموو چینێکی دەکرد: ئەوانەی بە گوێیان دەکرد و ئەوانەیش،کە پشـتگوێیان دەخسـت. لەو ڕۆژەی، کە ئێوارەکەی مێوانداریی ماڵی ئێمەی قبووڵ کرد، دایکردە بارانێکی بەخوڕ ، لەژێر (قەوسـی حونیە)ی ئیشـبیلیا دانیشـتبوو، هەموو جەستەی لە ئاو هەڵهاتبوو، بۆ ماڵەوە بانگهێشتم کرد ئەویش ڕازی بوو. کاتێک باوکم خشپوهۆڕی ئێمە و چێشتلێنەرەکەی، کە خەریکی خواردن سـازکردن بوو لەنێو باخچەی ماڵەوەمان بەر گوێ کەوت، بانگی کردم، بە دەم بێجامە دەبەرکردن و پۆشینی کراسەسووکەڵە هاوینیەکەی، گوتی:

- موحی ئەوە کێیە تەشریفی هێناوە؟
- باوە، ئەوە شێخ عەبدوڵڵای قەتتانە.
- باشترین کەس هاتووە. یاخوا بەخێر بێت، ئەمنیش وا هاتم.
باوکم بە جلیماڵەوە هات، نێوچاوانی ماچ کرد:
- قوربان! ماڵت ڕووناک کردمەوە، ئێزەت بەرەکەتدار کرد، ئومێدم وایە تەندروستیت باش بیت.
- شوکر باشین عەلی، خودا کارت ڕاست بێنێت!
وەختێک خزمەتکار لەگەنێکی زیرباجەی کۆتر و دەفرێکی پڕ لە سەوزە و سەبەتەیەک هەنجیری لەپێش دانایین. باوکم هێمایەکی بۆ کرد و فەرمووی لێ کرد، بەڵام قەتتان هێندە بە زەق و زیتی تەماشای خواردنی دەکرد و سەری خۆی نەوی دەکرد، وەک ئەوەی هیچ خواردنێک لەو ناوە نەبینێت. لەپڕ سەری خۆی بەرزکردەوە و چەناگەی باوکمی گرت و هاواری بەسەردا کرد:
- پیری ئاخرشەڕ! کاتی ئەوە نەهاتووە شەرم لە خوا بکەیت؟ تاکەی هاوەڵی ئەو غەدار و زاڵمانەی کۆشک دەکەیت؟ دواتر چەناگەی باوکمی بەردا و بەدەستەکانی مێزی خواردنی وەلا نا. زۆر بە نابەدڵی باسکەکانی کردنەوە و دیسان هاواری بەسەردا کردەوە:
- تۆ ناترسی لەم دۆخە خراپەی تێی دای باهۆزی مەرگ لێت بدات و ڕاتپێچێت؟ تۆ لە خۆت دڵنیای مەرگ نابێتە مێوانت؟ دەی وەڵام بدەوە.
تەماشای باوکمم کرد، سەری بەخۆیدا بەردابووەوە، لە سیمایدا نیشانەی گەردەنکەچی بەدی دەکرا، بەڵام من مەراق و مەلوولبوونم لە دەروونیدا هەست پێ کرد. شێخ بۆ بینینی چاوەکانی باوکم سەری خۆی نەوی کرد، بە دەنگێکی نەختێک نزمتر گوتی:
- بۆ پەند لە کوڕەکەت وەرناگریت؟ لاوێکی شلک و جوان و جاحێڵە، کەچی ئارەزوو و هەوای نەفسی خۆی سەرکووت کردووە. دە شەیتانی هەڵداوە، ڕووی لە خودای خۆی کردووە. هاوەڵی کەسانی

خواناس دەکات، لە ستەمکاران خۆی نەناس دەکات! کەچی تۆ ئەی پیری ئاخر شەڕ، نازانی لەسەر لێواری کەندەلانی ئاگر وەستاوی، هەروەکوو خۆتی و هیچ نەگۆڕاوی؟
باوکم بە جۆرێک تەماشای کردم نەمزانی مانای چی بوو. ئەری دەبێ لەوە هەراسان نەبووبێت گوێم لە شێخێک دەبێت فەزڵ و سەنای من بەسەر ئەو دەدات؟ یان پێی وایە من شەکوا و هانام بردووەتە بەر قەتتان و نەخشەی ئەو ئامۆژگارییە تاڵ و وشکانەم بۆ کێشاون؟ دواتر ئاخێکی هەڵکێشا و خۆی وا نیشان دا خەمناک و نیگەرانە، بۆ چکاندنی ئەسرینێک، چاوەکانی هەڵگلۆفین، بە دەمیش دەیگوت خودایە تۆبە، پشت و پەنام هەر بە تۆیە! قەتتانیش وازی لە ئامۆژگاریکردنی هێنا و دەستی بۆ خواردنەکە درێژکرد و ناوی خودای لێ هێنا. کتوپڕ دەنگی قەتتان گۆڕانی بەسەردا هات و نەرم بوو، ئەبرۆکانی بەرزکردنەوە و غەزەب و تووڕەیی لە نێوچاوانی نەما، بە شاگەشکەبوون و سەرسوورمانەوە پرسیاری لە باوکم کرد، هەر وەک ئەوەی پێش چەند چرکەیەک هیچ نەقەومابێت:
- وای عەلی ئەم کۆترە چەند قەڵەوە! باوەڕ دەکەیت سەرەتا وامزانی مریشکێکی چووکەڵەیە؟

# ٣

" هەر خواناسییەك بۆ سەختی و دژوارییەکان نەبووە دەرەتان، ئەوە بۆ پشتپێبەستن ناشێت."

ئیبن عەرەبی

باوکم لەبەر ســــەرقاڵی بە کاروباری کۆشـــک، لە ڕۆژی حەوتەمدا هۆزەبانـەی بۆ نـەکردم، لـە ڕۆژی چواردەمیشـــــدا هـەر نـەی کرد، بەڵکوو دوای تێپەڕینی بیستویەک ڕۆژ بەسەر لەدایکبوونمدا مەڕێک لە کۆزی ڕانەمەڕی کۆشـک ڕادەکێشـێت و لای قەسـاب لەتوپەتی دەکات و گۆشـــــتەکەی دەهێنێتەوە مـاڵـەوە، بە دایکم دەڵێت لەنێو قاپلەمەیەکدا بیکوڵێنێت. دواتر دانیشـتووانی کۆشـک و مامم عەبدوڵڵا و منداڵەبچووکەکانی و دەروجیرانە هەژار و دەســــتکورتەکان لێی دەخۆن. هـەریـەک لـە قازی ئیبن عـەرجوون و وتـاربێژی مزگـەوتی گەورە: (ئیبن فەتح)، سەوزەی دەوری قاپلەمەکە دەخۆن و دەست بۆ گۆشـــــتەکە نابەن. یەک لە هەژارە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنینەکان خۆی لە باسەکە هەڵدەقورتێنێت و دەڵێت:

- ئەرێ ئێوە بۆچی دەست بۆ گۆشتەکە نابەن؟

هیچیان وەرامیان نەدایەوە، ئەویش وازی لێ هێنان، بەڵام لەو کاتەی باوکم چوو هێندێک گۆشتی دی بهێنێت، مامیشم هەستا دەستەکانی بشوات، ئیبن فەتح بە چرپە وەرامی هەژارەکەی دایەوە:

- لەبەر ئەوەی ئەو مەڕە هیی کۆزی مەڕەکانی کۆشکی پاشایە.

- ئینجا ئەوە چی تێدایە؟
- ئەی نازانی لە مۆڵگەی ئاژەڵانی کۆشک، بەرازیش هەیە؟
پاشـان قازی و جەنابی خەتیب بەر لە تێربوونیان بەرەو دەسـتشۆر چوون! هـەردووکیـان هـەتا بڵێی بەتەقوا و مرۆڤی باش بوون، بەڵام هەتا بڵێی ترسنۆک و بێغیرەت بوون. بوێریی ئەوەیان نەبوو ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕەخنەیەک لەو دۆخە نالەبارەی مورســییە بگرن، کە ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ بـەرەو خراپی و دژواریی زیـاتر دەڕوات. هـەر لـەو کاتەی دەوڵەتی مورابیتەکان هەرەس دێنێت و دەوڵەتی موەحیدەکان دروســـت دەبێت، (ئیبن مەردەنیش) حوکمڕانی شـــاری مورســـییە دەگرێتە دەست و دەبێتە پاشا، لەو کاتەوە حاڵی ئەو شارە بەرەبەرە تێک دەچێت. هـەر یەک لـەوانـە ســـاڵانێکی زۆر لـە دەســـتـەڵات دەمێنەوە. وەختێک ســـــەرەوە گەندەڵ دەبێت، لە خوارەوە گەندەڵی دەبێتە شتێکی ئاسایی و کەس لێی ناپرینگێتەوە. گاهێک شار گەمارۆ بـدرێت و هیچ درز و دەرفەتێک بۆ هەڵمژینی هەوای پاک بۆ ژوورە خنکاو و داخراوەکان نـەمێنێتـەوە، وەختێک ڕزق و ڕۆزی بـەرتەنگ بکرێت و هیوا لەبین بچێت، ئا لەو ئانەدا خەڵک بە بیانوی زەروورەت و تەنگەتاوی، هەموو بەدکارییەک بەڕەوا دەزانن.
ئیبن مـەردەنیش بۆ تۆکمـە و پتـەوکردنی دەســـتـەڵاتـەکـەی، داوای کۆمـەکی لە فەرەنگان کرد. قازی ئیبن عەرجوونیش فەتوای حەڵاڵیی ئـەم کارەی بۆ دا. ئـەوســـا هـاوپـەیمـانیی لـەگـەڵ شـــای فەرەنگان (ئەلفۆنسۆ) بەست، ئەویش سـەتان مورتەزەقەی بۆ نارد، بە کەیفی خۆیان لە شاری مورسییە دەسووڕانەوە، هەر دەڵێی بابەلباب شاری خۆیان بووە. مەردەنیش چەندان کڵێســـا و دووکانی بۆ دروســـت کردن. ئەگەر یەکێکیان لەگەڵ موســـڵمانێک ناکۆکی و دەمەقاڵێی لێ دروست بووبا، ئەوە ڕاستەوخۆ دۆسیەکەی دەبرایە لای مەردەنیش نـەک قازی، ئـەمـەیش بۆ ئـەوە بوو لە بەرژەوەندیی فەرەنگان بڕیار بـدات و مـەزاج و ســـــەلیقـەی مورتـەزەقـەکان لـە خۆی لێڵ نـەکات.

نەخوازەڵا دوای ئەوەی زۆربەی موسڵمانان بەیعەتیان بە خەلیفەیەک دا و موەحیدەکان گەمارۆیان دا، هەر بەجارەکێ دەهری بوو، ئیتر موسڵمانان پشتیان لە مەلیکێک کرد، کە بە ئایین و ناسنامەکەی نامۆ بوون.
بەڵام تازە لەژێر ئەو گەمارۆ توونددا، نە فەتوای ئیبن عەرجوون و نە مورتەزەقەی (ئەلفۆنسۆ) فریای دەکەون، وەک دەڵێن کار لە کاران ترازا. میوەجاتی مورسییە، کە هەمیشە زۆر و هەرزان بوو، ئەمێستە خەڵکی ڕەشۆک پێیان ناکڕدرێ، تەنیا کەسانی زەنگینیش گۆشتیان دەست دەکەوێت. بازاڕی گەورەی ڕایەخ و تەونیش لەبەر کەمیی خوری و کەتان و ئاوریشم، کە پێشتر لە (بلنسیە) و غەرناتە و توونسەوە بۆی دەهات، ئێستا نیوەی دووکانەکانی داخراون. زیوگەرەکانیش بە کەمێک پارە زیویان لێ دەکڕن و بە پارەیەکی زۆریش پێیان دەفرۆشنەوە. شەقام و ڕێوبان پڕن لە سواڵکەر. کەشتییەکانی سەر ڕووباری (شقورە) نەماون، ئاخر خەڵک هەقی گواستنەوە بە کەشتیوانەکان نەدا. تاکە بازرگانییەک، کە ئێستە لەنێو خەڵکدا برەوی پێ دەدرێت، دەرس و دەوری مزگەوتەکانە، حەلقەی زانستە، چەندان هێندەی پێشوو زیادی کردووە، ئەمەیش لەبەر ئەوەی فوقەها بازاڕی بازرگانییان بەرەو کەساد چووە و جگە لە وانەگوتنەوە، هیچی دیکەیان بەدەستەوە نەماوە. گەمارۆ تەنگی بە خەڵکەکە هەڵچنیبوو، دڵەڕاوکێ نووزەی لێ بڕیبوون، بۆیە لێکدا لێکدا ڕوویان لە مزگەوتەکان دەکرد و لای فەقیهەکان وانەیان دەخوێند، بەمەیش دڵنەوایی خۆیان دەکرد و ئارام دەبوونەوە.
ئەگەرچی سەرباز و پاسەوانەکان هەموو کوچە و کۆڵان و شەقامەکانیان تۆق دابوو، بەڵام هێشتا ئیبن مەردەنیش نەیدەوێرا لە کۆشکەکەی بێتە دەرەوە. لە نیوەڕۆی جەژنی قوربان و دوای چوارەمین ڕۆژ لە ئابلۆقەدان، بە مەبەستی نوێژکردن بۆ خەڵکەکە و قوربانیکردن لە لەوەڕگەی ڕان و مێگەلی شوانان لە نزیک

ڕووبارەکە، دەرکەوت. هات بۆ ئەوەی بە خەڵکەکە بڵێت قوربانییەکەی ئەو بۆ هەموو ژێردەستە و بەردەستەکانیەتی، ڕۆژانی تر هیچ کەسێک: دارا و نەدار، نابێ قوربانیی دیکە بکەن. بە کورتی و پوختی، جارڕدەر بانگی ڕاهێشت و گوتی:" موجاهید و پاشای گەورەمان محەمەدی کوڕی سەعدی کوڕی مەردەنیش، وەک نواندنی بەزەیی و سۆزێک بۆ خەڵکەکەی و سووککردنی باری سەرشانیان، دەیەوێت لەبری هەموویان بەرانێکی قەڵەو بکاتە قوربانی."

دوای نوێژی جەژن، ئیبن مەردەنیش کورتیلەوتارێک دەخوێنێتەوە، لە چەند خولەکێکی دیاریکراو تێپەڕ ناکات، لە وتارەکەدا دەڵێت: "خەڵکینە! ئارامگرتن کلیلی سەرکەوتنە. ئێوە خۆتان دوژمنانی خوا دەبینن چۆن گەمارۆیان داون و ڕزق و ڕۆزییان لێ بڕیون. ئەگەر ئەوانە برای دینیی ئێوە بوان، نەدەبوو ئەو کارە بکەن، بەڵام دیارە خوا خێر و چاکەی بۆ ئێوە دەوێت. هێندێک جار کاری خراپ وەخێر دەگەڕێت. دیارە ئێوە نەتانزانیوە کاتێک تاعوون لە ئەندەلوس بڵاو دەبێتەوە، گەورە و بچووک و وشتر و بزن و مەڕی بە یەکەوە بە فەتارەت بردووە؟ لە خوا بەزیاد بێت ئەوە لە ئێمە دوورە، مادەم هیچ کەسێک نەیەتە ناو شار و کەسیش لێی دەرنەچێت، ئەوە یانی هەر بە سەلامەتی دەمێنینەوە."

کەس ئەو قسانەی مەردەنیشی بە گوێدا نەچوو. خەڵک لەوپەڕی تەنگەتاوی دابوون و ئارامییان لێ هەڵگیرابوو. هاوپەیمانییەتی ئەو لەگەڵ فەرەنگان، دڵی موسڵمانانی بریندار کردبوو. سەرکێشییەکانی دژ بە موەحیدەکان، ئەوانی برسی کردبوو. سەرەڕای هەموو ئەمانەیش، بە چاوی سەریان ڕۆژانە خۆبادان و کشوفش و شەوانە بێئابڕوویی سەربازە فەرەنگیەکانیان دەبینی. لەم لاشەوە، گوێیان لە دەنگوباسی خۆشگوزەرانی و ڕابواردنی شامەردەنیش لە کۆشکەکەی دەبوو. بە پاساوی هاوردەکردنی کاڵای نوێ لە ئایندەدا،

باجیان لە خەڵکەکە وەردەگرت، ئەمەیش گوایە فەرەنگەکان هەڵمەت بۆ موەحیدەکان دەبەن و گەمارۆیان پێ دەشکێنن. خەڵک زۆر ڕقیان لە مەردەنیش دەبوویەوە، ئەویش باش لەمە حاڵی بووبوو، هەر بۆیە لە ترسی نەفرەت و ڕقی ئەوان، لە کۆشکەکەی نەدەهاتە دەرەوە.
ڕۆژێک مەیموونەوانێک بۆ وەبزەخستنی خەڵک، لە چەقی ڕێگە سەما بە مەیموونەکەی دەکات، ئیبن مەردەنیش بە سواری ئەسپێک بەناو سەرباز و پاسەوانەکانی، بەوێدا ڕەت دەبێ، مەیموونەوان بانگی دەکات:
- ئیبن مەردەنیش...
ئەویش خۆی لە خەتی مەیلان دەدا و وەڵامی ناداتەوە. مەیموونەوان، دەستەکانی بە وێنەی کەڕەنا دەخاتە بەر دەمی خۆی و بە دەنگێکی بەرز هاوار دەکات:
- قسەم لەگەڵ بکە، خۆ خوا قسەی لەگەڵ مووسا کرد.
ئیبن مەردەنیش تاوێک ڕادەوەستێ و بانگی دەکات:
- چیت گوت؟
- گوتم خوا قسەی لەگەڵ مووسا کرد، تۆیش قسە لەگەڵ مندا بکە.
- ئیبن مەردەنیش سەری ئەسپەکەی دەسووڕێنێتەوە و بەتووڕەییەوە هاواری بەسەردا دەکات:
- ئاخر ئەو مووسا بوو، خۆ تۆ مووسا نیت!
ئەمە دەڵێت و دەڕوات، کابرای مەیموونەوانیش لە دوایەوە دەڵێ:
- ئێ ئەو خوا بوو، خۆ تۆ خوا نیت!
ئەو ڕۆژە مەیموونەوان لێدانێکی وا دەخوات، کە بە درێژایی ژیانی، ئەشکەنجەی وای نەدیوە. یەک لە پاسەوانەکانی مەردەنیش شمشێرەکەی هەڵدەکێشێ و بەسەری مەیموونەکەدا دەکێشێ و ساردی دەکاتەوە. دوای ڕۆیشتنی سەرباز و پاسەوانەکان، هەموو خەڵکی لێ خڕ دەبێتەوە، بەڵام کەس متەقێکی لێوە نایەت. مەیموونەوان بە خوارەخوار و لاکەلاک هەڵدەستێتەوە و مەیموونە

مردووەکەی هەڵدەگرێت و لەبەرچاوان گوم دەبێت، دواتر کەس نایبینێتەوە.
پاشان مەردەنیش لەنێو کۆشک خۆی گۆشەگیر کرد، ترسی لە هەموو شتێک هەبوو. چیتر شەوان بەسەر ژووری ژنەکانیدا نەگەڕا، بەڵکە ژوورێکی بۆ خۆی سازکرد، ئارەزووی بۆ هەر ژن و کەنیزەیەک بچووبا، بانگی ژوورەکەی دەکرد. دواتر پشتی لە ژنەکانیش کرد، جاری وا هەبوو بە چەندان هەفتە لە هیچ ژنێکی نزیک نەدەبووەوە. لە کۆتاییدا تینوتاوی دەروونی گەرمتر بوو، تارمایی ترس خۆی بەسەردا کێشا، هەموو ژنەکانی خۆی لە هۆڵە تایبەتەکەی وەدەرنان. پاشان هێنانیەوە هەمان هۆڵ، خۆیشی ڕۆیشت تاکوو لە کۆشکە بەرز و بچووکەکەیدا بخەوێت، کە پێشتر خۆی فەرمانی دروستکردنی دابوو. ئەو کۆشکە لە چەند نهۆمێک پێک هاتبوو: نهۆمی یەکەم، سەربازەکانی لێ بوون. نهۆمی دووەم: پاسەوانە نزیکەکانی تێدابوون. لە نهۆمی سێیەمدا بەندە ئەمەکدارەکانی لێ بوون، مەردەنیشیش چوو لەسەرووی هەموویانەوە خەوت.

# ٤

"هەر کەسێك بێئاگا بوو، یانی خۆری ئاوابوو."

ئیبن عەرەبی

بەر لەوەی ســـاڵی یەکەمی تەمەنم تێپەڕێنم، وەســـەر پێیان کەوتم. ئێوارەیەک لە گاگۆڵکێوە هەســـتامە پێیان، بێ ئەوەی مەیلی ئەولا و ئەملا بکەم و بەربیمەوە، دەســـتم بە ڕۆیشـــتن کرد. دەڵێی لە ســـاڵی دووەم، یان سێیەمدا بووم. دادە فاتیمە پێکەنی و پێشبینی ڕۆیشتنێکی دوورودرێژی بۆ کردم، ڕاســـتییەکەی هەر واش بوو. لەو ڕۆژەوەی خوا منی لە مورســـییە خولقاند، تا ئەو کاتەی لە دیمەشـــق ســـەرم نـایـەوە، لـە ســـــەفـەرێکی نـەبڕاوەدا بووم. چـەنـدان وڵات و مرۆڤم بینیون، هـاوەڵی و یاوەری چەندان ئەولیام کردووە، لەژێر حوکمی موەحیدە و ئەیووبی و عەباسـی و سەلجووقییەکاندا ژیاوم، ئەمەیش بە نەخشـەڕێگەیەک، کە خوا پێش خەلقم بۆی کێشـابووم. کەسێک لە شـــارێکی ئابڵۆقەدراو لەدایک بێت، ئارەزوویەکی ســـەرکەشـــی بۆ چوونە دەرەوەی ئەودیو شوورەکان لەگەڵدا لەدایک دەبێت. وەختێک مـامم بۆ ســـــەیرانکردن ئێمـەی لـەگـەڵ منداڵـەکانیدا دەبردە نزیـک ڕووبارەکە، دەســـتم لە شـــوورە بەردینییەکانی مورســـییە دەدا و دەمپرسـی ئەرێ دەبێ چی لەپشت ئەم دیوارانەوە بێت؟ ئاخۆ دەبێت

شارێکی دیکەی وەک شاری ئێمە هەبێت؟ دەبێ هیچ شارێک لە هیی ئێمە گەورەتر بێت؟ دەبێ خەڵکەکەی وەک ئێمە بن، یان جیاواز بن؟ پرسیارەکانم ڕووبەڕووی مامم کردنەوە، ئەویش نەخشەیەکی بچووکی لەنێو خۆڵدا کێشا، شارە دراوسێ و دوورەکانی نیشان دام. ئەو نەخشەخۆڵییە لە زەینمدا چەسپا. ئیتر لەنێو خەیاڵمدا بەرەو باشوور لای (قرتاجنە) و، باکوور کن (بلنسیە) دەڕۆیشتم، لە خۆراوایش بۆ (قورتوبە) و، (ئیشبیلیا) و، (غەرناتە) بە خەیاڵ ملی ڕێم دەگرت. مامم بە تەمەن زۆر لە باوکم گەورەتر بوو، ڕاستییەکەی خۆشیان نەیاندەزانی چەند ساڵیان بەینە، بەڵام دەیانزانی، کە چوار منداڵ لەبەینیاندا بوون و هەر بە گچکەییش مردوون.

ڕێگەی نێوان دووکان و ماڵەوەی مامم، بە ماڵی ئێمە دابوو، هەر بۆیە لە منداڵییەوە پێی ئاشنابووبووم. باوکم بەردەوام لە کۆشک بوو، دایکیشم بە سکێک دوو کچی بوون، ئیتر لە ماڵەوە کەسێک بۆ من نەمایەوە کاتی خۆمم پێ بدات. مامم سەرنجی ئەوەی دابوو، هەر بۆیە بۆ هەر شوێنێک چووبایە لەگەڵ خۆی دەیبردم... جاروبار بۆ دووکانەکەی دەبردم، کە زەیت و بەهارات و گیادەرمانی لێ دەفرۆشت. هەروەها دەیبردمەوە ماڵەوە، کە بە ژاوەژاو و چریکە و هاواری سێ کچ و دوو کوڕەکەی، قانگ درابوو.

تەنانەت باوکم نوێژەکانی هەینیشی لەگەڵ مەلیکدا لە کۆشک دەکردن، مامیشم ناچار دەبوو بێت لەگەڵ خۆی بم بات. بەدەر لەوەیش، هەندێک جار مامم نانی بەیانیانی لەگەڵ باوکمدا دەخوارد، وەک ئەویش لەنێو باخەکە قەیلوولەی دەکرد. بە درێژایی دووگیانبوونی دایکم، مامم گیادەرمانی بۆ دەهێنا. ئەو بە حوکمی ئەوەی ئاگاداری هەموو ڕووداوێکی ورد و درشتی نێو ماڵی ئێمە بوو، زۆر لە باوکم قەڵس دەبوو. ڕۆژێک باوک و مامم لە گۆڕەپانی بەردەم ماڵمان نانی ئێوارەیان دەخوارد، مامم زۆر بە توندی گلەیی و گازاندەی لێ دەکرد، دایکم بۆ ئەوەی بزانێت باوکم ئەو

هاتوهاوارەی لە چییە و بۆچی هێندە دەنگی خۆی بەرز دەکاتەوە، پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوە:
- چی بکەم، کۆشک جێ بهێڵم؟ باشە ئەگەر کۆشک جێ بهێڵم بەرەو کوێ سەری خۆم هەڵگرم؟ خۆ مورسییە گەمارۆ دراوە.
مامم وەک نیشانەیەکی دڵخۆشی، قۆڵەکانی فشکردن و سەری بردە دواوە و گوتی:
- وەرە لەگەڵ من کاسبی بکە، لە دووکان لەتەک من دانیشە.
- تۆ بە حاڵەحاڵ بژێوی بۆ منداڵەکانت پەیدا دەکەیت، چۆن ئەم چۆرە قازانجەیش لەگەڵ مندا بەش دەکەی؟
- خاترجەم بە کەسمان لە برسان نامرین، بەڵام لە سایەی شمشێردا سندانمان دەگاتێ.
مامم دەستی خستە سەر شانی باوکم و تکای لێ کرد:
- برام من بەزەییم بەتۆدا دێتەوە. باشە ئەگەر موەحیدەکان مورسییە بگرن خۆ لەگەڵ خۆیان دەتبەن، چۆن ناتبەن، خۆ تۆ داروودەستەی مەلیکی. ئەگەر ئەهلی مورسییە یاخی بوون، وەزیر و مەیتەر لێک ئاوێر ناکەن!
باوکم لە قسەکردن کەوتە مننە و گننە، هەوڵی دا ڕێڕەوی گفتوگۆکە بگۆڕێت:
- نا بابە نا، کەس یاخی نابێت. ئەورۆ نا سبەی موەحیدەکان گەمارۆمان لەسەر هەڵدەگرن، هەر زوویش ددانمان پێدا دەهێنن و هەوڵی ئاشتەوایی دەدەن.
- بەڵام ئەوە قسەی نێو کۆشکە. دەتەوێت قسەی خەڵک بژنەویت؟ دە گوێم لێ بگرە: هەموو خەڵکەکە پێیان باشە (مورسییە) بکەوێتە دەستی (موەحیدەکان). خەڵک هەر لە ئیشبیلیاوە تاکوو (تیلیتە) لەژێر دەستی ئەوانن و لەوپەڕی ژیانی خۆشیشدان.
- مورسییە جیاوازە.

- لای مەغریبییەکان هەموومان ئەندەلوسیین، موەحیدەکان جیاوازیی نێوان خۆرهەڵاتی ئەندەلوس و خۆراواکەی ناکەن.
باوکم چوارمەشقی دانیشت و بە تووڕەییەوە گوتی:
- براکەم! گوێم لە قسەکانت بوو، بەڵام پێت وایە ئێمە مەردەنیش لەو دۆخە ناهەموارەدا دەهێڵێت لە کۆشـــکەکەی دەرچم؟ بەخودا دە کونجی زیندانێم دەئاخنێ...
دایکم کە گوێی لە وشەی (زیندان) بوو، قیژەیەکی کرد، باوکم لێی لە هاوار دا:
- کچێ نوور، ئەو پەنجەرەیە داخەوە.
دایکم پەردەی داداوە، بەڵام پەنجەرەکەی بەکراوەیی هێشتەوە.
باوک و مامم نەختێک دەنگیان نزم کرد، باوکم دەوامی بە قســەکانی دا:
- هەر کەسێک لە کۆشکەکەی خۆی بدزێتەوە، مەلیک لێی نابوورێت، ڕاستییەکەی ئەو ئێستە وەکوو شێرێکی بریندار وایە.
باوکم  پتر دەنگی خۆی نزم کردەوە، هەر دەتگوت بە ســرتەســرت قسان دەکات:
- یەک لەو بەندییانەی بەردەســـتییان دەکرد، بەنهێنی پێی گوتم: ئەو بە ترس و بیمەوە لە خەو هەڵدەســـتێت. کاتێک تووشـــی تۆقین و دڵەتەپێ دەبێت، هەموو خەڵکی نێو کۆشـــک وەئاگا دێنێت و داوایان لێ دەکات لە دەوری دانیشن.
مامم وەک نیشانەیەک بۆ ناڕازیبوون و تووڕەیی، بەشێنەیی پێیەکی لە زەوی دا:
- مەلیکی تۆ شـێر نییە، بەڵکە گورگێکی هیچە، باجی ئەو هیچییەشـی دەدات. کوا (ئەلفۆنسـۆ)ی هاوپەیمانی ، کە بۆ پاراســتنی لە دەســتی موەحیدەکان ســەرانەی پێ دەدا؟ کوا ئەو مەسـیحیانەی، کە دنیایەک کڵێســـای بۆ کردنەوە؟ ئەی نابینی ئەوان هەموو شـــتێکیان ئاوەژوو کردووەتەوە؟

پاشان دەستەکانی خستە سەر ئەژنۆکانی و قیت بووەوە و گوتی:
-ئەگەر موەحیدەکان دەست بەسەر مورسیەدا بگرن، دەردێکی وایان پێ دەکەن با بە دەواری شڕی نەکردبێت.
دایکم، کە ئەو قسانەی بیست، لە خەفەتان سەری خۆی خستە سەر لەپی دەستەکانی. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نیگەرانی لە سینەیدا کەڵەکەی دەکرد، بەم قسانەی مامیشم تەواو نیگەران و هەراسان بوو. ئای خودایە چەند بەدبەختە! لە کۆیلایەتییەوە هاتە دەر و کەوتە نێو ئابڵۆقەدان! بەڵێ ئەو، هاوژینی وەزیرێکە، بەڵام بەناشکوری نەبێت ئەو وەزیرە لەنێو کۆشکی پاشایەکدایە، کە لە دەرێ و ژووریێ گەمارۆ دراوە، لەو پەڕی دڵپەشێوی دایە. ڕەنگە کار لە کاران بترازێت و موەحیدەکان ئەو ژنە قوڕبەسەرە دەستگیر بکەن و دیسان وەک پێشتر بیکەنەوە کەنیزەک!
باوکم دەیزانی دەشێ هەموو ئەو ئەگەرە خراپانەی مامم ڕوو بدەن. باوکم هەرچەند بە زمان نکوڵیی دەکرد، لێ باقیی ئەندامەکانی تری بە کزۆڵبوون و، ڕیشسپیبوون و، نەمانی ڕەونەقی دەموچاوی، ئەو ئەگەرانەیان وەراست دەگەڕاند.
باوکم شەوانە زۆر لەتەک نافوورەی گۆڕەپانی خانووەکە دادەنیشت، هێندێک جار تا نیوەی شەو دەمایەوە، ڕووپەل و پەڕاوەکانی کۆشکی دەخوێندنەوە و پێشوازی لە میوانگەلێک دەکرد،کە ئێمە نەماندەناسین.
وەختێک بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر یەکێکیان درزێک بخاتە شوورەکە و موەحیدەکان دزە بکەن، یان یەکێک فتیلەی شۆڕش داگیرسێنێت ڕەشوڕووت و برسی لە بازاڕ و کوچە و کۆڵانان بکەونە خۆ، ئەوە هەزار جار مردن خۆشترە! بەس خودا دەزانێت ڕۆژانی داهاتوو چ دەقەومێت، بەڵام هەموو لەوە دڵنیان دۆخەکە بەم جۆرە بەردەوام نابێت، شتێک هەر ڕوو دەدات.

ئـەو ڕووداوەی هـەمووان چـاوەڕێیـان دەکرد و خۆیـان لێ نـەزان دەکرد، خەیاڵی هەموو هاوشـاریانی مژووڵ کردبوو، هەمووشـتێک لەکار کەوتبوو. هێندە بەو باسـه خەریکابوون، کەس بیری نەمابوو دواجار کەینێ بوو خانوویەکی نوێ دروسـت کرا، یان دووکانێک کرایەوە. ڕاستییەکەی کەس مژدەی ڕۆژانی داهاتووی نەدەدا. هەموو دەستیان بە پارە و پوولەکانیانەوە گرتبوو، بەدەر لە بژێویی ڕۆژانە، هیچ شـتێکیان نەدەکڕی و نەدەفرۆشـت. وردەوردە دۆخەکە ئاڵۆز و خراپتر دەبوو، کەسـانی لانەواز و بێنەوا زۆر دەبوون، بەسـەر ڕێگەکانەوە کەوتبوون، لە دەرگەی ماڵانیان دەدا، بەرماوەی خەڵکیان دەخوارد و دەسـتیان لەبەر خەڵک پان دەکردەوە. خۆ ئەگەر چاوی سـەربازانیان لێ ونبووبا، ئەوە دەسـتیان بە دزی و تاڵانیش دەکرد. ئیبن مـەردەنیش بۆ ڕێگرتن لـەو بارە نـەخوازراوە، مورتـەزەقـەکانی بڵاوە پێ کردبوون، بـە شـەو و ڕۆژ شـاریـان تۆق دابوو. بۆ پـاسـەوانیکردنی شـوورەیش زۆر توونـد و بـەئـاگـاتر بوون، موەحیدەکان بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی دزە بکەن.

# ٥

**"کەسێك حیکمەتی نەبێ، حوکمیشی نابێ."**
**ئیبن عەرەبی**

ڕۆژێک دایکم ژەمی شێوانی ئامادە دەکرد، مەنجەڵی شۆربای بەسەر پەنجەکانی پێ و پاژنەیدا ڕژا و سـووتاندنی، پاشـان بەربووەوە و سمت و ساتانی هەڵاوسان. لە مەتبەخ کەوتە شین و ڕۆڕۆ، باوکم گەیشـتە سـەری و بڕیاری دا خزمەتکارێکی بۆ بگرێت. بەندەیەکی کورتیلەی بە ناوی سـەلووم هێنا، تەمەنی سـی سـاڵان بوو، قژێکی ئاڵۆزکاو و گروازەی هـەبوو، گوێچکەکانی چکۆڵە و ڕوخسـاری خڕکەڵە بوو. دایکم قەمیسـێکی تڵخی خوری و شـەرەبێجامەیەکی باوکمی دایێ. ئەوسا لەبارەی شیوی بەیانی پرسیاری لێ کرد:

- سەلووم قەولە چ لێ بنێیت؟

- خـاتوونی من، سـەلوومی خزمـەتکـارت خـەریکی ئـامـادەکردنی سرکاوی ئیشبیلی و تەنجیری فاسی، مریشکی بە ڕۆن سوورکراوە، زولابیە و وەسفەی شەک و هەموو جۆرە خواردنێکی تریش دەبێت.

- ئەی مزەورەی سەوزە و پەنیر؟ وابزانم گۆشتمان زۆر نییە.

- بەڵێ خـاتوون هـەروەک لـە غـەرنـاتـە ئامادە دەکرێت، وا سـازی دەکەم، بەڵام نازانم لە مورسیە چۆن چێ دەکرێت؟

- بە هەنگوین و هەنجیر و چواڵە ، ئەگەرنا بە خورما و قەیسی.
دایکم چێشـــتلێنەرەکەی لە یەکەم زیافەتکردندا تاقی کردەوە. باوکم چەند مێوانێکی بانگهێشت کرد و ناوی شتاقیانیشی ئاشکرا نەکرد، ڕێزێکی زۆری لێ گرتن و گەلێک بەخێرهاتنی کردن، سەلووم لەژێر فەرمانی باوکم خواردنێکی زۆری بۆ ئامادە کردبوون. مێوانەکان بە دەنگێکی بەرز قسەیان لەبارەی نامەیەکەوە دەکرد، کە (ئیبراهیم ئیبن هەموشک) بە مۆری تایبەتی خۆی بۆ مەلیکی ناردووە. ڕاستییەکەی نـامـەکە فڕێدرابووە ئەو دیو شــــوورەکە، ســــەربازەکانیش هەڵیان گرتبۆوە و بۆ باوکمیان هێنابوو:
"لە ئیبراهیم ئەحمەد ئیبن هەموشـــکەوە بۆ محەمەد ســـەعدی ئیبن مەردەنیش. دوای سـڵاو ڕێز: بزانە خەلیفەی موەحیدەکان بەزەیی بە مندا هـاتـەوە و منی وەژێر بـاڵی خۆی گرت. لـەبـارەی تۆیشــــەوە سپاردەی خێری کردووم، تۆ خزم و کەسی منی، ئەگەر شار تەسلیم بکـەیتـەوە، ئـەوە هیچ گرفت و تەگەرەیەکت نایەنە ڕێ، ئەگەرنا دەبێ تەنیا خۆت سەرکۆنە بکەیت."
مێوانەکان ڕۆیشـتن و باوکیشـم لە باخەکەی ماڵەوە توونـد نامەکەی بە دەســتەوە گرتبوو، ئیبن هەموشـک دوا خەلیفەی ئیبن مەردەنیش بوو، کودەتـای بـەســــەردا کرد و پێوەندیی بە موەحیدەکانەوە کرد. باوکم دیسان نامەکەی خوێندەوە، بەر لەوەی بچێتەوە شوێنی خۆی، چـەنـد هـەنگاوێک ڕێی کرد. دڵـەڕاوکێی بـاوکم گـەیشـــتـە تۆقەڵان، نامەکەی فڕێ دایە سەر زەوی و بە تووڕەیی و هاتوهاوارەوە گوتی:
- هەبێ و نەبێ کاری ئەو گوێبڕاوەیە!
لەپاشان بانگی سەلوومی کرد و بەغار هاتە لای:
- بڕۆ بۆ ماڵی عەبدوڵلای برام و پێی بڵێ ئێستە بێت.
سەلووم خەریک بوو دەرگە بکاتەوە و بڕوات، باوکم بانگی کرد:
- ئەمڕۆ لێ گەڕێ، سبەی بڕۆ.

باوکم وەک ئاش، بە دەوری گۆڕەپانی ماڵەوە دەسووڕایەوە. پاشان کەلوپەلی نووسین و لێنووسەکانی هێنانە دەرەوە و خواردنی بەردەمی وەلاوەنا و دەستی بە نووسین کرد: "لە محەمەد سەعدی مەردەنیشی مەلیکی خۆرهەلاتی ئەندەلوسەوە، بۆ خەلیفە یووسف عەبدولموئمینی خەلیفەی موسڵمانان و پێشەوای موەحیدەکان..."
تاوێک لە نووسین وەستا، دەمی لێک بەشبوو و چاوەکانی لە شتێکی نادیاری نێو گۆڕەپان زەق کردنەوە. پاشان کاغەزەکەی بەردەمی لابرد و ڕووپەلێکی نوێی هێنا و نووسی: "لە قازی مورسییە: ئیمامی مزگەوت و شێخی فەرموودەناسانەوە بۆ خەلیفەی موسڵمانان و پێشەوای موەحیدەکان..." دیسان پەڕەکەی وەلانا و پەڕەیەکی دی نوێی داناوە، تێیدا نووسی: " لە خەڵکی مورسییەوە، کە عەلی ئیبن عەرەبی نوێنەرایەتییان دەکات، بۆ سەرلەشکر خەلیفە ئیبراهیمی ئیبن هەموشک."
مورسییە لە هەواڵ و دەنگوباسی کودەتای ئیبراهیم بن هەموشک و نەمانی ئۆقرە و سەبری موەحیدەکان شەپۆلی دەدا. لەنێو خەڵکی وا بڵاوبووەوە، کە سوپاکە چەند مەنجەنیقێکی هەن، ئاگر و نەوتی سووتێنەر دەپژێنن. هەروەها هەموو ئاوایییەکانی دەرەوەی مورسییە لە (شەقرە) و (لەورەقە) و (ئەلمریە) کەوتوونەتە دەستی موەحیدەکان، هەموو قەڵا و قەڵاتەکانیشیان تەسلیمی ئەوان کردووە. لەشکری موەحیدەکان ئێستە لە مالیقەوە بۆ مورسییە کۆمەک و پشتیوانی دەکرێن. ئەوە مانای وایە گەمارۆی پێشتر هەر بەردەوام دەبێت. دوایی هەر بە تەواوی پشتیان شکا: ئەلفۆنسۆ هەموو لەشکرە بچووکەکانی باکووری شاری کشاندەوە و شوێنە گرنگەکانی خۆی لە قووڵاییدا پێ مەحکەم کردن.
هەموو ئەو هەواڵانە لە ڕێگەی ئەو خانمە ئارایشکارانە بەر گوێی دایکم دەکەوتن، کە دەهاتن مووی قاچی دایکمیان دەکرد و، جلیان بۆ دەدروی و لە شیرپێدانی دوو منداڵەکەشی، هاوکارییان دەکرد.

هەروەها ئەو ژنانەی کالاَ و کەلوپەلی جوانکارییان دەفرۆشــــت، ئەوانەی شــەنس و بەختیان دەخوێندەوە، ئەوانەی کاری عەتتارییان دەکرد، ئەوانەی ئیشــی مەســـاج و شــێلانیان دەکرد... تەنانەت ئەو چەند ژنە دراوســــێیەی، دوای ئەوەی لە کەنیزەیی ئازاد دەبن، هاموشـــۆی دایکم دەکەن و ئەو باســـانەی لەلا دەکەنەوە. دابی ئەو ژنگەلە وابوو دوو هەواڵیان لێک دەدا، ئینجا لەســــەر ڕاســـتی و دروستی سوێندیان دەخوارد، دایکیشم بەبێ هیچ دوودڵی و گومانێک بڕوای دەکرد. دەیانگوت مەلیک بە هۆی بوونی گومانەوە، دایکی خۆی لە ژوورێکی کۆشک حەپس کردووە، داوایشــی کردووە کەس نەچێتە کنی، وەک زیندانییەک لە کولانکەیەکی دەرگە خواردنی بۆ دەبەن. ژنگەل بەقێز و بێزەوە، باســــی ئەو کارە دزێو و ڕەفتارە ناشیاوەیان دەکرد:

- ئۆهــــــ! لەو بەدکارییە، بەلاَم ڕاســـتییەکەی ئەو کارە بە ئیبن مەردەنیش نامۆ نییە!

- خوشکێ! خۆ ناوی مەردەنیش نییە، ناوی ڕاستینەی ئیبن مارتنیزە، ئەو، لە ناخی دڵەوە کەسێکی فەڕەنگییە.

- ئائا! دیارە فەڕەنگەکان وایان لە دایکی کردووە!

لە ئانی ئەو هەموو مقۆمقۆ و واتەواتە، کە مێشـــکی دایکمیان کاس کردبوو، باوکم گەڕایەوە ماڵەوە، زرێکی بە دەســـتەوە بوو، خســـتیە ســـەر نافوورەکە و ڕاســـتەوخۆ بۆ ژوورەکەی خۆی ســـەرکەوت. دایکم بەرەو حەوشـــــە هات، کە زرێیەکەی بینی، هەترەشـــــی چوو، دەســـــتی بە هێڵنجکردن کرد، هەرچی لەنێو هەناوی دابوو هێنایەوە. پاشان دانیشت و پشتی بە نافوورەکە دا، قاچێکی درێژ کرد و لەسەر قاچەکەی دی دانیشت، ڕێک وەک ژنانی شینگێڕ. باوکم لەسەرەوە گوێی لە گریە و ناڵەناڵی بوو:

- خاتوونە شێتەکەم، ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟

دایکم لای بۆ نەکردەوە، وەک ئەوەی گوێی لە هیچ نەبووبێت:

- جەنگ، جەنگ ... هاوار لەمن دەمانگرن. قورتبەسەر نوورە، پاش ئەوەی ئازادبوویت، دیسان جارێکی دی، دەبییەوە بە کەنیزە.
- ئەرێ ژنەکە جەنگی چی و حاڵی چی؟ هیچ شەڕێک ڕوو نادا، دەی هەستەوە.
ئەو قسانە بۆ دایکم نەبوونە مایەی دڵنەوایی، بەکوڵ شینی دەگێڕا، چاوەکانی دەتگوت دوو جۆگەلەکەی ڕووباری (شقوورە)ن. دواتر باوکم پێی گوت ئەوە زڕێی قاسید (رسول)ە نەک هیی جەنگ، بەیانی نامەیەکی مەلیک، بۆ سوپای موەحیدەکان دەبەم، کەس ناوەرۆکەکەی نازانێت، خودایش هێشتا هیچی بۆ دەرنەخستووم. دایکم، کە ئەمەی بیست، گریان و هاواری بەتینتر بوو، کێشای بە ڕووی خۆیدا و گوتی:
"ئەرێ مەلیک لە تۆ زیاتر کەسی دیکەی نەدیتەوە، خۆ هەموو خەڵک دەزانێت تۆ پارێزەری نهێنی و بەڕێوەبەری کۆشکی ئەوی، دڵنیام دەستگیرت دەکەن، یان دەتکوژن، یان دەتکەنە کەرەستەی دانوستان؟
- ئەرێ ئافرەت! جەنگەکان کەی وا بەڕێوە دەچن؟ کوا قاسید لە جەنگ دەکوژرێت؟ تەنێ من ئاگام لە ترپەترپی دڵی باوکم بوو، کە چۆن وردە وردە زیادی دەکرد. هەر چەند هێنای و بردی نەیتوانی ترس و بیمی دایکم بڕەوێنێتەوە، ئاخر خۆیشی دەیزانی ئەو ئەگەرە هەیە. ئێ خۆ موەحیدەکان ئیبن مەردەنیش و دەستوپێوەندەکانی بە کافر دەزانن، چونکێ ئەوان لەگەڵ فەڕەنگان دژی موسڵمانان هاوپەیمانییان بەستووە، ئەوان خیانەتیان کردووە و بەر لە گەمارۆ کودەتایان بەسەردا کردوون، ڕەنگە بڵێن زەمەنی ئاشتەوایی و هودنە بەسەرچووە. ئەو کەسانەی درۆ و خیانەتیان کردووە، تازە ئەمن و ئاسایش بۆ وان هەیهاتە! کوشتنی قاسید بۆ ئیبن مەردەنیش باشترین پەیام دەبێت، بەمەیش مەودای تووڕەیی و ڕقی خۆیان دەردەخەن.

بەڵام تازە هیچ فێڵ و پاساوێکی بەدەستەوە نەماوە، هیچ کەسێک لە پیاوماقووڵ و دەمڕاست و سەردەستەکانی مورسییە نەیاندەویست وەکوو قاسید دەربچن. ئائەوەتا وتاربێژی مزگەوت دەڵێت نەخۆشم، کەچی لەوپەڕی ساغ و سەلامەتیش دایە. ئیبن عەرجوونی قازیش فەتوای داوە کۆمەک و پشتیوانیی فەڕەنگەکان بکرێت، بۆیە گەر بچێت، ئەوە هەڵدەواسرێت. لەو لایشەوە، دەرگەوانی مەلیک پێی وایە ناکرێ و ناشێت جەنابی مەلیک لەم نەخۆشییەدا جێ بهێڵێت.
بەڕێوەبەری بازرگانانیش چەند مانگێک بەر لە ئێستە لە شار هەڵاتووە و بەرەو مەغریب سەری خۆی هەڵگرتووە، ئەمێستە بازاڕ بێ دەمڕاست و مشوورخۆر ماوەتەوە. هەردوو کوڕەکەی مەلیکیش خەریکی ئیشوکاری خۆیانن، هەر لەبەر ئەوەی کوڕی مەلیکن، ناکرێ و نالوێ وەک قاسید بنێردرێن. ئەگەر بێت و مەلیک کەسێکی دوور لە پیاوماقووڵ و دەمڕاستانی مورسییە بنێرێت، ئەوە وەک سووکایەتیکردن بە شا ئیبن هەموشک دادەنرێت، ئومێدی وەرامدانەوەی ناوەرۆکی نامەکەیش زۆر لاواز دەبێت.
لەبەر ئەو هەموو ئەگەر و تەگەرانە، باوکم پێی وابوو ئەو تاکە شۆڕەسواری ئەو مەیدانەیە، کە نامەکە ببات. زرێیەکەی پۆشی و جانتایەکەی بە دەستەوە گرت. مۆر و نامەیەکی مەلیک و چەند نامەیەکی دیکەی خەڵکی مورسییە لەناو جانتاکەدا بوون. لای دەرگە دوو ئەسپسوار و ژنێک لەنێو کەژاوە، چاوەنۆڕیان دەکرد. باوکم لەگەڵیاندا وەڕێ کەوت، بەرەو نزیکترین خاڵی شوورەی سوپای موەحیدەکان چوون. لەشکری موەحیدەکان پەیژەیەکیان داهاویشت، باوکم پێیدا سەرکەوت، وەختێک گەیشتە سەر دیواری شوورەکە، ئالای سپی هەڵدا، پاشان هێمای بۆ هاوەڵانی کرد، ئەوانیش ژنەکەیان لە کەژاوەکە هێنایەدەر و سەریان خست. ژنەکە خڕوخەپان و گۆشتن بوو، بەزەحمەت وەسەر پەیژەکە هەڵدەگەڕا. هەر کە ژنەکە گەیشتە سەرووی شوورەکەوە، باوکم پەیژەکەی بۆ دیوی

دیکە هێنا و سەرەوخواری کردەوە، وەختێک باوکم لە دیوی دووەمی شووورەکە دابەزی، دوو ئەسپسوار بەرەو لای هاتن، ئەویش بەرانبەریان وەستا و بە گوڕ و تینەوە گوتی:
- من عەلی ئیبن عەرەبیم، قاسیدی مەلیک محەمەدی ئیبن مەردەنیشم، بۆ لای خەلیفە یووسفی عەبدولموئمین هاتووم. ئەمەیش سەلمای کچی هەموشکە، جەنابی مەلیک داوای لێ کردم بەڕێز و شکۆوە بیگێڕمەوە لای ئیبراهیمی کوڕی هەموشک، چونکە مەلیک تەڵاقی داوە و ئێستە ژنی ئەو نەماوە.
لەو سەینوبەینەشدا دایکم ژانەسەرێکی توونـدی گرت، بە پارچەپەڕۆیەکی زەرد پێچای. خوشکەکانیشم کۆترێکی باڵشکاویان لە باخەکەی ماڵەوەمان گرتبوو، یارییان پێ دەکرد. عەبدوڵڵای مامم لەگەڵ یەک لە کوڕەکانی، لە چێشتەنگاوەوە لە دیوەخانی باوکم دانیشتوون، من لەنێوان ئەوان و هەردوو خوشکەکەمدا، کە خەریکی وازیکردنن، دێم و دەچم. کەشەکە هەتا بڵێی ساف و بێگەردە، لێ من هەست بە هاتنی قەدەری خودایی دەکەم، کە مورسییە وەژێر نسێی خۆی دەگرێت.
گەر شنەبا هەڵی کردبا، لکوپۆپی دوو دارپرتەقاڵەکە، بەهێمنی دەشنانەوە، وێجا دڵم ئۆخژنی دەگرت و دەمگوت ئەوە خودا قەدەرێکی باشی نارد، ئەمێستەیش کەشەکە هێندە خامۆش نییە تا بڵێین لە کەشی بەر لە هاوار و قیژەی گەلی سەموود دەچێت، ڕەشەبایش نییە تا بڵێین شێوەی پێش سزاکەی عاد دەکات.
دوای چەند دەمژمێرێک، باوکم لە سەرووی شوورەکە دەرکەوت و بە پەیژەکەدا هاتە خوارەوە، هەرکە پێی لەنێو خاکی مورسییە دانا، ڕێک سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو کۆشک هاتەوە، وەختێک گەیشتەوە کۆشک، بانگی پاسەوانەکانی کرد:
- ئەمیر غانم لە کوێیە؟

بەر لەوەی کەس وەڵامی بداتەوە، ئەمیر غانم لەگەڵ دەنگی باوکم هاتە دەرەوە، لەگەڵ باوکم چوونە دانیشـــتگەی خەلیفە، کە ماوەی چەند مانگێک بوو لێی دانەنیشتبوون، دەرگەیان لەسەر خۆیان قوفڵ دا. کەمێک قســـەیان کرد و دواتر باوکم بۆ ماڵ گەڕایەوە. ئێمە هەموومان لە دەوری خواردن کۆبووبووینەوە، دایکم خێرا چوو بۆ لای، بە دووریی چەند پێیەک بەبێدەنگی لەبەرانبەریدا وەســـتا، خۆیشی نەیدەزانی چی دەکات. تەماشای ڕەنگوڕووی باوکمی کرد، چاوەڕوانی چارەنووسی خۆی و خانەوادە و هیی تێکڕای شار بوو، وەلێ سـیمای وشـکی باوکم، هیچی لێ هەڵنەدەکرێنرا. بەبێ ئەوەی ورتەیەکی لە زار بێتە دەرەوە، بەرەو ژوورەکەی چوو. دایکم بە دڵێکی خەمگین گەڕایەوە سـەر خوانەکە، دەسـتی بۆ تیکەنانێک برد، بەڵام ڕاستەوخۆ داینایەوە، دیسان هەستایەوە و خۆی گەیاندە باوکم و پرسیاری لێ کرد:

- عەلی، پێم بڵێ چی ڕووی داوە؟
- نوورخانم، لە کاتی خۆیدا دەیزانی.
- پێم بڵێ، حاڵمان وەخێر دەگەڕێت؟
- بەڵێ، مەترسە.

باوکم لە دەرەوەی ژوورەکەیدا جوبە و جلەکانی دانان، تەشـــتێکی دەسـتنوێژی برد و دەسـتنوێژی هەڵگرت، بەرماڵەکەی ڕاخسـت و ئەڵڵاهو ئەکبەری کرد و بە هێمنی " إذا جاء نصـــرالله والفتح..."ی خوێند.

# ٦

**"ئەو زەمەنەی نەبێتە یار یا نەیار، هەر بۆ ئەوە باشە پشتی تێکەیت."**
**ئیبن عەرەبی**

بەیانی سەرکەوتن و فەتحی خودا هات، بەڵام بۆ موەحیدەکان نەک بۆ ئیبن مەردەنیش. خەڵکەکە لە ڕێگەوبانەکان گوێیان لە جاڕدەری مەلیک بوو، وەک نەریتی هەمیشەیان، لە جێگەیەک لە سەرەتای بازێڕ گردبوونەوە، جاڕدەر سینەی خۆی پڕ لە هەوا کرد، دەستەکانی بەرزکردنەوە، وەک ئەوەی لەبەر ئاسمان بنووزێتەوە، گوتی: " ئیبن مەردەنیش، مەلیکی موزەفەر و موجاهیدی گەورەمان، دەیەوێت باری سەرشانی گەلەکەی سووک بکات، چیتر بە گەمارۆ پشتیان نەچەمێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەیش چەند تەتەرێکی موەحیدەکان هاتوون و پەیماننامەیەکی تۆکمەیان لەگەڵ خۆدا هێناوە، تێیدا داوای ئاشتەواییان کردووە، بەڕەنگێک دەرگەکان بخرێنە سەر پشت و گەمارۆی سەر ئێوە هەڵبگیرێت. مەلیکیش باڵی ئاشتەوایی ڕاخستووە، خودایش بە هەموو کەینوبەینێک ئاگادارە."
نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، دەروازەکان کرانەوە. سەربازەکانی ئیبن مەردەنیش بۆ پێشوازی موەحیدەکان، ژمارەیەکی زۆری لانەواز و ڕەشوڕووتی خەڵکی شاریان کۆکردەوە. ئەگەر موەحیدەکان نیازی کاری خێریان هەبێت ئەوە بێگومان بەزەییان بەو برسی و

ڕەشـــوڕووتـانـە، بەو چاوکز و قژبژانـە دیتەوە. خۆ ئەگـەر نیازی شـــەڕیان هەبێت و بیانەوێت شـــمشـــێرەکانیان لێ هەڵکێشـــن، ئەوە خەڵک لێیان دێنە دەســـت و بەرگری لە خۆیان دەکەن، ئەوســـا ئەوانیش بە ڕاکەڕاک پشـــت هـەڵدەکەن و بـەرەو ســـووچێک سەرهەڵدەگرن.

دەرگەکان کرانەوە، ماوەیەکی زۆری خایاند کەس نەهاتە ژوورەوە. پاشـان دەستەیەکی پیادەڕۆ دەرکەوتن، زرێیان پۆشـی بوو، بە دوو ڕیز لە بەرانبەری یەکتر دەڕۆیشـــتن، وەختێک دەروازەیان تێپەڕاند، هـەردوو ڕیزەکە لێک جیابوونەوە، هەر یەکەو بەرەو شـــوورەکەی بـەرانبـەریان چوون. پاشـــان تـاقمێکی دی هـاتن، ئـەوانیش هـەمـان تاسوحەمامی ئەوانیان پاتە کردەوە. دوایی گرووپگەلێکی ئەسپسوار بە دوایاندا هاتن، هەر دەســـتەو لە چوار کەس پێکهاتبوون، لەپشـــت دەروازەکـەوە ســـەنگـەری خۆیـان گرت. دوو گرووپ لـە چـەپ و دووشـــیان لە دەســـتی ڕاســـتەوە وەســـتان. دوابەدوای وانیش دەســـتەگەلێکی دیکەی تیرهاوێژ، پۆل بەپۆل هاتن، بۆ تیرهاوێژی، خۆیان ســـاز و تەیار کرد. لە کۆتاییدا چەند تاقمێکی دیکەی پیادەڕۆ هاتن، ڕیزی تیرهاوێژ و ئەسپسوارانیان تێپەڕاند، هەموو پێشڕەوییان کرد، بەڵام زۆر بە ســـســـتی و وریاییەوە، دەترســـان بۆســـەیان بۆ دانرابێتـەوە، هـەر بۆیـە بـەوردی چاودێریی پـەنجەرە و دەرگەکانیان دەکرد.

دوای چەند ســـەعاتێک، نیوەی ســـوپای موەحیدەکان هاتنە نێو شـــار، نیوەکەی تریشـان لە دەرەوە، لەشـوێنی پێشتری خۆیان، سەنگەریان داکوتا. زۆر بەخێرایی سـوپا دەسـتی بەسـەر شـاردا گرت، لە هەموو خاڵە ســـەرەکییەکان و دەروازەی بـازاڕ و، مزگـەوت و، کوچە و کۆڵانەکان خۆیان قایم کرد. نێوان ســـەربازەکان تەنیا پەنجا گەزێک دەبوو، ئاخر نەبادا لە بێئاگاییدا کەســـێک پەلاماریان بدات و زیانیان پێ بگـەیـەنێت. هـەموو چـەکـەکان لـە گۆڕەپانی مزگەوت کۆکرانەوە،

شـــمشـــێرەکان بەجیا کەڵەکەکران، خەنجەر و چەقویش لەلایەکەوە خرانە سـەر یەک، ڕمەکانیش بە جودا وەسـەریەک هەڵدران. تیرەکان لە سـووچێک و کەوانەکانیش بەجودا هەڵنران. جارڕدەرانی سـوپا، بە بازاڕدا دەسـووڕانەوە و بانگەوازیان دەکرد: هەرکەسـێک چەکەکەی تەســـلیم بکات، ئەوە دەکەوێتە ناو ئاســـایش و تەناهی، لێ هەر کێ چەکی لەلا هەبێت و نەمانداتەوە، ئەوە ئۆباڵی بە ئەستۆی خۆی.

پاش تێپەڕینی چەند سـەعاتێک، سـوپا بەبێ هیچ بەرگرییەک هەموو شارەکەی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەوسا بەشێک لە سەربازەکان خودەکانی ســـەر ســـەریان هێنایە خوار، بەشـــێکی دیکەیش بۆ خۆشـــۆردن چوونــە گــەرمــاوەکــان، هێنـدێکی دیش بۆ کڕینی پێداویستییەکانیان چوونە دووکانەکان. خەڵکەکەیش لە ڕێوبان لەگەڵ سـەربازەکان دەوەسـتان و قسـەیان لەگەڵدا دەکردن. دەچوون ئاو و نانیان بۆ دەهێنان، لە یەکتریان دەپرسی لە چ شار و وڵاتێک هاتوون. مورتـەزەقـەی فـەرەنگـەکـان بـەبێ هیچ جـەنـگ و بـەرگرییـەک مورسییەیان جێ هێشت، ئەمەیش بەو مەرجەی، شمشێر و نێزە و تیرەکانیان دابنێن، خواردن و ئەســـپەکانیشـــیان ڕەگەڵ خۆدا بەرن. هـەر چۆنێـک لـە مـاڵ دەرچووبـام، ئـاڵای موەحیـدەکـانم دەکـەوتـە بەرچاوان، ئاڵاکە شـــێوەی تەختەی شــــەترەنجی دەکرد، لە هەموو دەروازە و شـــوورەکانی شـــار هەڵدرابوو. هێندێک جار لە مزگەوت لەتەک ســـەربازێکی وان ڕیز دەگرم، دەبینم هێشـــتا قەڵغانی جەنگی لەبەرە و چەکوچۆڵی شـــەڕی پێیە. ڕاســـتییەکەی هەر کاتێک بۆم بلوێت تۆقەیان لەگەڵدا دەکەم.

ئەوجارەیش ژیان هاتەوە بەر شاری مورسییە، دووکانە داخراوەکان کرانەوە، بازاڕە چۆلوهۆڵەکان بووژانەوە، دەنگی کاســبکاران هەموو مورســـییەی کاس کرد. شـــوانەکۆچەرەکان بە ڕانەمەڕ و مێگەلی بزنەکانیان بەرەو شار بوونەوە، کاروانی سوف و کەتان و ئاوریشم لە (قرتانجە) گەیشـــتەوە جێ. زار و ســـک پڕبوونەوە، گیرفانەکان

ئاوەدان بوونەوە. خەڵک لە دڵەوە سوپاس و ڕەزامەندیی خۆیان بۆ لەشکری موەحیدەکان دەردەبڕی، هیچ سەرباز و ئەسپسوار و فەرماندەیەکی موەحیدەکان نەبوو، خەڵکەکە بانگهێشتی ماڵەوەیان نەکات و وەک بەرەکەت و نزیکبوونەوە، زیافەتیان بۆ ساز نەکات. باوکم چەند هەفتەیەکی تریش دوای ئەم ڕووداوە، بەردەوام هامۆشۆی کۆشکی دەکرد، وەک ئەوەی هیچی تازە ڕووی نەدابێت، ڕۆژێک گەڕایەوە و هەواڵێکی نوێی بە گوێی دایکمدا چرپاند کە تامەزرۆی دەنگوباسی نوێ بوو:

- شا ئیبن مەردەنیش کۆچیدوایی کرد.

دایکم بە سنگی خۆیدا کێشا و چریکاندی:

- ئەی خودایە!

- ئێمەیش دەڕۆین.

- بۆ کوێ؟

- بۆ ئیشبیلیا.

لەو کاروانەی بۆ ئیشبیلیا دەچوو، چوار وڵاخی بارییان بۆ ئێمە تەرخان کرد. باوکم لەگەڵ بردنی جل و جنگوڕ و کەلوپەلی زۆر نەبوو، چونکێ زۆربەیان لەبەر زۆر بەکارهێنان لەکەڵک کەوتبوون، بەهۆی گەمارۆیش نەمانتوانیبوو هیی نوێ دەست بخەین. بە گواستنەوەی کاڵا و ئاتاجەکانی ماڵەوە بۆ سەر پشتی وڵاخەکان، زۆر شاد و دڵخۆش بووم، ئەوەی توانیم و پێم هەڵگیرا بردم. خانووەکەمان چۆڵ کرد و دەرگەمان داخست. لەسەروبەندی ڕۆیشتن، دایکم خۆڵ و خاشاکی حەوشەی ماڵەوەی گسک دا، ئەمەیش بەبێ هیچ هۆ و هودەیەک، مەگەر دڵی خانووەکە بداتەوە، کە ماوەیەکی زۆر بەچۆلوهۆڵی بەجێی دەهێڵین.

دوای بیست ساڵ، بۆ فرۆشتنی خانووەکە گەڕامەوە مورسیە، بینیم گسکەکەی دایکم لە شوێنی خۆی، لە لێواری مەزرای ئاوەکە ماوەتەوە، زەلەکانی دەوروبەری شکاون، خاک و خۆڵ لەسەری

خڕبووەتەوە، گڕوگیا بەنێویدا ســەریان دەرهێنابوو. ئەوکات دایک و باوکم مردبوون، ڕیشـــم درێژبووبوو، بە مردنی وان، دوو خەرقەی ئەولیایانم لێ داکەلابوون.
با بێمەوە ســەر باســی ڕۆیشــتنمان، ولاخێک دوو بوخچەی پڕ لە جلکی من و، دایک و، باوکم و، دوو خوشــکەکەمی لێ بار کرابوون. دایکم لـەگەڵ دوو منداڵەکەی چوونە نێو کەژاوەیەک. ســـەلوومیش سواری هێسترێک بوو، خەروارێکی پڕ لە پێداویستییەکانی کردبوو، خەروارێکی دیکەیشــی لە مەنجەڵ و کەلوپەلی شــیولێنان ئاخنیبوو. باوکم بە سواری ولاخێک لە پێشەوە ڕۆیشت، جانتایەکی پێستی پێ بوو، پەڕاو و، مۆر، حوبر و، قەڵەمڕیشــەی تێدابوو. لەنێوان هەرســێ ولاخـەکەدا، دەهاتم و دەچووم، ئەگەر ڕێ چەقێن بووایە و تۆزوتاڵ لەبن پێی ولاخان هەڵنەســـتابا، ئەوە بە پێیان دەڕۆیشـــتم، هەرکە شەکەتیش دەبووم، دەچوومە لای دایکم و لەنێو کەژاوەکە دەخەوتم. تا دەگەیشـــتمە ماڵ و منداڵی مامم، دەبوو مەودای نزیکەی بیســـت ولاخێک ببڕم، ئەوجا دەمان کردە قۆشمە و بەزمی خۆمان.
دادەفاتیمەی کچی موســەنایش دەگەڵ ئێمەدا شــاری جێ هێشــت، سواری هێسترێکی ماچە بوو. دواتر لە کاروان هەڵبڕاو بەرەو شاری قورتوبە چوو. لە دووڕیانەکە، قافڵە بەســەر دوو بەشــی هاوتەریبدا لەت بوو، هەموو خوداحافیزییان لە دادە کرد، وەختێک نۆرە گەیشتە من، دادە فاتیمە گوتی:
- کوڕە شیرینەکەم لێم نزیک بەوە.
- قوربانت بم دادە گیان.
- دڵنیابە یەک لە چوارمێخەکان لە ئیشبیلیایە...
- دادە مێخەکان چین؟
- چوار شتن، زەمین لە کاری خراپ و بەد چەپاڵە دەدەن.
- چۆن پێیان ئاشنا بم؟
- ئەوان بەتۆ ئاشنان و باش دەتناسن.

- چۆن پێیان بکەم؟
- ئەوان بەتۆ دەگەن...
ئینجا ماوەیەکی زۆر، توووندی منی بە خۆوە نووساند. لەپی دەستی خستە سەر سنگم و چاوەکانی نوقاندن، سوورەتی فاتیحەی لەسەر خوێندم و پەنجەکانی لەسەر دڵم خشاند و گوتی:
- ئەمە پاکژ بکەوە... پاشان شوێنی بکەوە، وێجا مێخی خۆت دەدۆزییەوە.
چونکێ منداڵ بووم، هەستم بە ئازاری فیراق نەکرد، بەڵام ئەم هەڵوێستە بەزیندوویی لە یادگەمدا مایەوە، کە گەورە بووم زۆر ئازارم پێ خوارد. ڕاستییەکەی ئازاری ئەولیایان وەکوو قەرز وایە، لە منداڵان وەرناگیرێتەوە، بە هەڵکشانی تەمەنیش لاناچێت. من دوای چەند ساڵێک قەرزەکەم بیرم کەوتەوە، ڕۆژێک وانەم بە دەستە فەقێیەک دەگوتەوە، کتوپڕ بەبێ هیچ دەسپێک، دەستم بە گریان کرد، فەقێ گوتیان:
- مامۆستاگیان چیت بەسەر هات؟
- قەرزێکم بیرکەوتەوە و دامەوە.
- خاوەن قەرزەکە کێ بوو؟
- قەزای خودا.
- قەرزەکەت چییە؟
- ئازاری فیڕاقە، خودا بۆی ناردم. پێشتر لەبەر ئەوەی منداڵ بووم، نەمتوانی لە کاتی خۆیدا بیدەمەوە، قەرزەکەیش لەنێوان ئەرز و ئاسماندا دەخولایەوە، تا کاتی دانەوەی هات و بۆ ئاسمانی مێشکم دابەزی.
یەک لە فەقێ وریا و زیتەڵەکانم لێی پرسیم:
- ئەی چۆن بە هۆی منداڵیتەوە خودا لەسەری لانەبردی؟
- ئەگەر لایبردبا، ئێستە نەی دەهێناوە، هەر خۆیشی زانا و دانایە. کوڕەکانم! قەزای خودا لەسەر کەس لاناچێت، هەموو کەسێک لە

کاتی گەورەبوون و پێگەیشتندا، دەبێت قەرزی زەمەنی منداڵیی خۆی بداتەوە. هەر کەسێک بێهۆ سینەی تەنگ بوو، بێپاساو هەستی بە ئازار کرد، با بزانێت قەرزێکی لەسەرە و لەبیری چووەتەوە... خودای دەبیان، قەت دەینەکەی لەبیر ناچێتەوە.
ها ئەوەتە من بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا لە دەرەوە تەماشای مورسییە دەکەم. لەوەتەی لە دەوری ئەو شووورانەدا لە دایک بووم، ئێرە نیشتمانی من بووە. دوای چەند سەعاتێک ڕێکردن، ئیتر شاری مورسییە لەبەرچاوان ون بوو. پاشان خۆر ئاوابوو، بارەکانمان خستن. کاروانچی پشوویان دا، نانیان خوارد و ئاویان خواردەوە. منیش لەگەڵ هاوەڵانی باوکم، لەسەر تەختێک دانیشتم، ڕاستییەکەی باوکم منی لەسەر تەختەکە دانیشاند، چونکە ترسی ئەوەی هەبوو ئازارم پێ بگات. قاچەکانم شۆڕکردنەوە وەک قاچەکانی وان نەدەگیشتنە زەوی، بەڵام گوێچکە و چاوم لە ئاستی گوێچکە و چاوی ئەواندا بوون. لەو دانیشتنەدا هەستم بەوە نەکرد لەوان بچووکترم یاخود ڕێز و پایەم کەمترە.

# ٧

**" هەر سەفەرێك سەركەوتنی تێدا مسۆگەر نەبێت، وەك بڵقی سەرئاو وایە."**
**ئیبن عەرەبی**

لەو شـــەوەدا هێمنی و بێدەنگییەكی ئەفســوناوی باڵی خۆیان داهێشتبوو. مەگەر دەنگی فڕكەفڕكی ئەسپ و جەڕجەڕەی وشتر، دەنا هیچ شتێک نەبوو ئەو كەشە هێمنە بسمێ. نەختێک بەر لە هاتنی بەیانی، لێرە و لەوێ، گوێمان لە ترینگە و زرینگەی قاپ و قاچاخ بوو، هەروە سووكەجووڵە و بزاوی ئەو كەسانەشمان هاتە بەر گوێ، كە زوو لە خەو هەستابوون. زۆری پێ نەچوو، یەكێک بە دەنگێكی بەرز بانگی دا، خەڵک بێدار بووەوە، بوو بە دەنگەدەنگ و ژاوەژاو. هەر كەسەی بەلایەكدا چوو، دەستیان بە ئاو گەیاند و دەستنوێژیان هەڵگرت، بۆ نوێژكردن خۆیان ئامادە كرد. هەركە لە نوێژبوونەوە، دیسان خۆمان بۆ ڕۆیشتن ساز كردەوە. خزمەتكارانی قافڵەكە، جڵەوی وشترەكانیان لێک بەستەوە، خەڵک بە پەلەپرووزێ شتێكیان خوارد و وڵاخەكانیان باركردەوە و ژنەكانیان خستنەوە كەژاوە. لە كۆتاییدا سەرقافڵە دەنگی دان و بەردەستەكەیشی دەنگی ئەوی بە هەموو لایەكدا پەخش كرد، تا ئەو كاتەی دوا كەسی قافڵەكە، بانگەوازەكەی بیست، ئینجا ملی ڕێگەمان گرتەوە بەر.

بەهاران ڕێگە زۆر نەرم و خۆشـــە. قافڵەکەمان بەردەوام بەدەو ڕووبار و ئاوەڕۆدا دەڕۆیشت، مەگەر لە ڕووبارێکەوە بۆ ڕووبارێکی تر چووبایین، یان بە دێیەکدا ڕەتبووبایین، دەنا هەر بەدەم ئاوەوە دەڕۆیشتین.

تا شـاری (لەورەقە) بەدەم ڕووباری (تین)وە ڕۆیشـتین. بە درێژایی ڕێگەکە، بەدەر لە چەند ئاوەڕۆ و دەربەندۆچکە و دەریاچەی پچڕپچڕ و چەند ڕووبارێکی لای باشـــوور، هیچی دیکەمان بەدی نەکرد.

دواتر لە (غەرناتە) نزیکبووینەوە، چەند ڕۆژێکیش بە دەو ڕووباری (شـــینیل)وە ڕێمان کرد. چەند جاران، لە ڕۆخ ڕووباران لامان دەدا، دەچووین ئاومان بۆ خواردنەوە و چێشـــتلێنان دەهێنا. هەرکە لامان دەدا، سەرقافڵەکان دەهاتن پەتی درێژی وڵاخەکانیان، کە بەیەکتریان بەســـتبوونەوە، دەکردەوە. هەر گرووپە و لای وڵاخەکانیان دادەنیشـتن. سـەلووم هەر زوو دەچوو دەفر و مەنجەڵەکانی پڕ ئاو دەکرد. بەو کەروێشکانەی لە ڕێگە ڕاوی کردبوون، شیوی بۆ ساز دەکردین، یان ماســـییەکانی (شـــبوت)ی بۆ دەبرژاندین، کە خزمەتکارەکان لە ئاوی ڕووباری زەحلە گرتبوونیان و بە خەڵکیان دەفرۆشتنەوە.

قافڵەکە چەند قەفەســـێکیان لە داری حەیزەران پێبوو، مامر و کەوی کێوییان تێدا بوو. هەروەها چەند فەردە برنجێکی بڵنســـی و سەبەتەیەکی وشکەهەنجیریان هەڵگرتبوو. هێندێکیان لەنێو سندووقی دار ســـەوزەیان چاندبوو، لە کاتی پێویســـتیدا دەیانڕنیەوە و دەیانخوارد. ناوەناوە چەند کەســـێک لە قافڵەکە جیادەبوونەوە، دەچوون لە ئاوایی، کەلوپەل و میوە و دەرمانیان دەهێنا. کەڕەتێک باوکم بۆ ترێ کڕین لە (جیان)، ســـەلوومی لەگەڵدا ناردن، بەڵام بەدەســـتبەتاڵی هاتەوە، ئاخر ترێفرۆشـــەکان دیناری مەردەنیشـیان وەرنەگرتبوو، ئەگەرچی پێشتر بازرگانانی (لەورەقە) وەریان دەگرت

و هیچ گرفتێکیان لەگەڵ ئەو پارەیە نەبوو. باوکم خۆی لە سـەلووم تووڕە کرد، چونکە پێی نەگوتبوون، کە خەلیفە دیناری مەردەنیشـی قەدەخە نەکردووە و مورسییەیش هێشتا پارەی موەحیدەکانی، کە لە مەغریب چاپ دەکرا، پێ نەگەیشتووە.

ئەو ڕەفتارەی باوکم بەرانبەر سـەلووم، بۆ ئەوانەی لەوێ بوون، مایەی سـەرسـووڕمان بوو، چونکە پێیان سـەیر بوو پێشـبینی گفتوگۆیەکی وەها لەو بەندەیە بکات، کە بچێت لە بازاڕ باسـی مورابیت و موەحیدە و دینار و خەلیفە و پاشاکان بکات.

سـەلوومی بەسـتەزمان بەبێدەنگی سـەری بەخۆیدا شـۆڕکردەوە، باوکیشـم جامی غەزەبی خۆی بەسـەردا ڕشـت و تێر سـەرکۆنەی کرد، بەڵام ڕاسـتییەکەی ئەوە تووڕەیی و سـەرزەنشـتی کەسـێکە خەجاڵەت و شەرمەزاری خۆی لە پەنا ئەودا دەشارێتەوە، کە ئێستە توانای ئەوەشی نەماوە ترێ بۆ خێزانەکەی بکڕێت.

دوای ئەو ڕووداوە، بەدرێژایی ڕێگە باوکم زۆر نیگەران بوو، هەر کەسێک باسی پارەی لەلا کردبا، کۆڵێک خەمبار دەبوو. گوێم لێ بوو بە شێوەی پرسیار بە مامی دەگوت: دەبێ بازرگانەکان لە ئیشبیلیا پارەی مەردەنیشی بە پارەی موەحیدەکان بگۆڕنەوە؟ یان بەناچاری پەنا بۆ توانەوەی بەرین و بە چواریەک زەرەر، بیگۆڕینەوە؟

- تۆ دەزانی ئیبن مـەردەنیش دینـاری لـە زێڕ و زیوی بێگـەرد لـە سککە نەداوە.

مامم بە ئارامی و متمانەوە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، موەحیدەکان ئەمە زۆر باش دەزانن.

- ئەی کەواتە چی لە دینارەکانی خۆم بکەم؟

- بە دیناری موەحیدەکان خەلیفە فریات دەکەوێت.

بۆ ئەو ئەگەرە مامم لە باوکم زیاتری نەدەزانی، وەلێ کەمتر گوێی بەو باسـە دەدا. ئاخر خۆ هەموو ماڵی ئەو بریتی بوو لە چەند دەبە و کیسـەیەک و چەند پرێسـکەیەکی دەرمان و چەند جۆرکێکی

بەهارات و چەند توورەگەیەک لە کانزای دەگمەن و گیاوشـــکە و ئاویّ بێنە و دەســتان بشـۆ. هەموو ئەمانە لەگەڵ خێزانەکەیدا، باری دوو ولاخ بوون. مامم لە ئیشبیلیا ڕاستەوخۆ بازرگانی بەو چتانەوە کرد. زۆر جار، بەبێ هیچ دەســـتمایە و قازانجێک، گیای بە گیا دەگۆڕییەوە. هەندێک جاریش بەخۆڕایی دەرمانی بە کەســانی نەدار و هەژار دەدا. ئەگەر قوت و بژێوی ئەمڕۆی هەبوایە، زۆر گوێی بە بەیانی نەدەدا. کۆکردنەوەی ماڵ لای ئەو، زۆر گرنگ نەبوو.

دوای ئەو گوندە، بە چەند گوندێکی دیکەدا ڕەتبووین، بەبێ منجەمنج پارەی مەردەنیشـــەکانیان قبووڵ کرد. وا دیاربوو بەشـــێکیان نەیاندەزانی مورســییە کەوتووەتە دەســتی موەحیدەکان، بەشــێکی دیکەیشیان هیچ گرنگییان بەو باسە نەدەدا. خەریک بوو خواردنمان لێ ببڕێت، باش بوو باوکم بڕێک میوە و خواردنی بۆ کڕین. شـــەو ســـەلووم دوو مریشـــکی بۆ برژاندین، من و دایکم و باوکم و خوشکەکانم بە دەوریدا خەرمانەمان کرد. شـەکەتی و ماندووبوون، بە دایکم و دوو منداڵەکەیەوە دیاربوو، بەڵام باوکم زیاتر هەڵەشە و نیگەران بوو، دەتگوت تەمومژی ئیشبیلیا گوشاریان خسووەتە سەر مێشــکی و هەراســانیان کردووە. بۆ منیش هەموو ڕۆژەکان، وەک ڕۆژی یەکەم، پڕ لە شادی و ئومێد و سەرسامی بوون.

لە کۆتاییدا ولاخەکانمان لە دەوروبەری ئیشبیلیا ڕاگرتن، شەوێک تا بەیانی ماینەوە، لە کۆتایی یەکەم گەشـــتی ژیانم نزیکبوومەوە. هەر میلێکمان لە زەوی دەبڕی، بە قەد ئەو میلە دڵم گوشـــاد دەبوو. ســۆمای چاوەکانم بەنێو ئاســۆکاندا دەکشـا، ســینەم پڕ هەوا بوو، ڕاســتییەکەی پێشـتر قەت هەوای ئاوام هەڵنەمژیبوو. ئای خودایە! بۆ بینینی ئیشـــبیلیا، چەندە عەوداڵ و تامەزرۆم! چەندان حیکایەت لەبارەی ئەو شـــارە دەماودەمیان دەکرد، ســـوارگەل بەم قەوماوانە شـــاگەشـــکە بووبوون. لە قافڵەکە چەند کەســێکمان لەگەڵدا بوون، ئیشـــبیلیایان نەبینیبوو. شـــەو ڕاشــکا، بۆ پرســیاری وان ورد گوێم

قولاخ کردبوو، پرسـیاری دڵبەتاسـان و وەڵامی عاریفان. مامم یەک لەو عاریفانە بوو، کە چەند جارێک بۆ بازرگانی سـەردانی ئیشبیلیای کردبوو.

- قوربان عەبدوڵلا، ئیشبیلیا چۆنە؟

- چەند ڕۆژ لەوێ مایتەوە؟

- لە بازاڕی ئەوان چ باسوخواسە؟

مامم بەر لە لێشـاوی ئەو هەموو پرسـیارە منداڵانەیە دەگرێت و ئارامیی لێ هەڵدەگیرێت.

- نەفامینە شاد و دڵخۆش بن! دڵنیابن خانوویەکتان دەست دەکەوێت لە خانووەکەی خۆتان باشـتر و خۆشـتر دەبێت، دە ئیتر وازم لێ بێنن... بـەڵام ئـەوان وازیـان نـەدەهێنا، زیوینگـەر و زێڕینگـەرەکـان، پرسـیاری بازاڕی زیو وزێڕیان لێ دەکرد. مامۆسـتای زارۆکان، پرسیاری دەرس و دەوری مزگەوتانیان دەکرد. زەیتفرۆش، لەبارەی کێڵگەی زەیتوون دەیانپرسـی. بلوێرژەنیش لەولاوە دەیگوت خەڵکی ئیشبیلیا شـایی و سـەما دەکەن؟ سـەرتاشیش دەیپرسـی ئەرێ لێرە خەڵک قژیان درێژ دەکەن و ڕیشـیان دەهێڵنەوە؟ بەرگدروویش سەبارەت بە جۆری جلوبەرگی خەڵکەکە، پرسیاری دەکرد.

مامم پرسیارێکی وەڵام دەدایەوە و دانەیەکیشی پشتگوێ دەخست. خەڵکەکە کە زانییان مامم بەبێ حەوسـەڵەیی و بەقرچۆکی وەڵامیان دەداتەوە، پشـتیان تێ کرد و ڕوویان لە پیرەشـوانێک نا، کە دوو ڕۆژ دوای دەرچوونی قافڵە لە مورسییە، لەگەڵ کوڕەکەیدا پێوەندیی پێوە دەگرن و دەخزێنە ناویەوە. مام شـوان بە دەنگێکی زۆر نزم قسـەی دەکرد، ئـەوەی لـەتـەکی نـەبووایە، گوێی لێ نەدەبوو. وەک منداڵێک لەپشـت پیرەشـوانەکە دانیشـتم، توانیم بەڕوونی گوێ لە دەنگی نزمی بگرم، ئـەو بـە زمـانێکی زۆر ڕەوانی عـەرەبیی دەدوا، شێوەئاخاوتنی بەربەری و دووڕەکانی پێوە دیار نەبوو:

-... ئیشبیلیا شارێکی ئاوەدانە، چەندان دێ و شارۆچکە و کۆشک و قەڵا و بازاڕ و بازرگانی لێن، هەروا گەرماوی گەورە و فراوانی تێدان، خاکەکەی پیرۆزە، بەردەوام سەوزە و دەشنێتەوە، لە دەوروبەریدا، چەندان باخ هەن، لەبەر سێبەری چڕی دارزەیتوونەکان، تیشکی خۆر بەر خاکەکەی ناکەوێت. نزیکەی بیست کەس لە دەوری ئەو پیرەشوانە خڕبوونەوە، زۆر بەتاسەوە گوێیان بۆ گرتبوو. ئەمن نەمزانی ئایا گوێگرتنی ئەوان بۆ ئاشنابوون و شارەزایی بوو لە شاری ئیشبیلیا، یان لەبەر زمانپاراوی و ڕەوانبێژیی شوانەکە بوو؟ شوانەکە کە هەستی کرد خەڵک وردەوردە لە دەوری جەم دەبن، دەنگی وەلەرەلەر کەوت، هەردوو پێڵوە قوڕسەکانی بەرەو خەڵکەکە بەرزکردنەوە، دوو چاوی تەڕ، وەک چاوی هەر پیرێکی دیکە، لە ناوەڕاستیاندا هەڵتۆقیبوون. درێژەی بە قسەکانی دا و ئاوازی حیکایەتخوانی تێکەڵ بە دەنگی بوو:

- کەشوهەواکەی مامناوەند و لەبارە، بالاخانەکانی جوان و قەشەنگن، خەڵکەکەی دارا و زەنگینن، بەڵام بەدڕەوشت و بێناموسن، سات لە دوای سات بەدوای هەلی زەمانەدا دەگەڕێن، یانە و هەوارگەی دڵڕفێن و هەستبزوێنیش، پتر دنەیان دەدەن و زیاتر دەستیان دەگرن.

پیاوێک، کە میسر و شامی بینیبوون، لێیان پرسی خاڵۆ ئەوان خۆشترن یان ئیشبیلیا؟ گوتی: ئیشبیلیا، چونکە بەرزییەکەی دەڵێی غوتەی دیمەشقە بەبێ دڕندە، ڕووبارەکەیشی وەک نیلی میسر وایە بەبێ تیمساح.

# ٨

**دەستنووسێك لە شاری حەلەب**
**٦٤٦ك/ ١٢٤٨ز**

- تاهیر...
- ..........
- تاهیر تۆ لەکوێیت؟

دیارە کوڕەکەم وەڵام ناداتەوە! لەوە دەچێ لە ماڵ دەرچووبێت. منیش بەهۆی کۆکە توندەکەمەوە پەراسووم تێکشکاون و لەبزاو کەوتووم. دەمەوێت قومەئاوێک بخۆمەوە، سووتانەوەی هەناو و گرژی و غەرغەرەی نێو گەرووم لابەرێت، بەڵام کوا دەستم پێی دەگات. بە مەبەستی ساردبوونی، گۆزەڵە ئاوێکیان لەسەر دیواری نزیک پەنجەرەکە داناوە. لەتەکیشییەوە چەندان گیادەرمان دانراون، هەرکە هاتینە (بیت المقدس) تاهیر دەستی خستن. لە سەفەرێکی دووروودرێژی شەوانێکی سارددا، ئەو نەخۆشییە بووە میوان... هەر خودا شیفابەخشە و بەس.

- هۆ تاهیر. کوڕم تۆ لە کوێی؟

جگە لە زایەڵەی دەنگم، هیچ شتێک دەنگی نییە. بەزەحمەت خۆم وەرگێڕا، هەوڵم دا دانیشم. وەختێک سییەکانم پڕ هەوا کردن، کۆکەیەکی توند دایگرتمەوە. هەر دەتگوت دڕکێک لە گەردەنم گیربووە و ئەو کۆکە دزێوەم لێ شێت و هار دەکات. چەند تنۆکێک

خوێن کەوتوونەتە ســـەر ئەرز و تەنیشـــت پێخەفەکەم، لە کوڕەکەم تووڕە و پەســـــتم، ئاخر چۆن دەبێت باوکی خۆی لێرە فڕێ بدات و پایدۆز بکات!
کۆکەکەم هێوربووەوە، وا بەســـــەر کەلەکەوەم، بۆ ئەوەی دیســـــان کۆکە پەلامارم نەداتەوە، بڕیارم دا لە شـــــوێنی خۆم نەجوولێم. چـاوەکـانم لێکنـان و بێئـاگـابووم، دەســـــتێکی گـەورەم بینی ڕەشـــەڕەیحانەیەکی گەش و جوانی لەبان لەپیدا ڕوا، لێکدا لێکدا ماچ و بۆنم دەکرد، لەگەڵ هەر ماچێکی من، نمای دەکرد، بەڵام وەختێک سپیەکانم لە بۆن و بەرامەی سیخناخ کرد، لکوپۆپی دەرکردن. دواتر لەنێو پەنجەکانیدا ڕەیحانەی تر ســـــەریان دەرهێنا. بەجۆرێک بەرزبوونەوە، بەســـــەر قەد و قیافەی منیاندا دەڕوانی. هەســـــتم کرد بەسەر لەپەدەستەکانمدا دەڕۆم، هەر چواردەورم ڕەیحانستان بوو، تا دەهات لێکهاڵان و تێکئاڵقان زیاتر دەبوو، بۆ ئەوە کە بە نێویدا تێپەڕم، دەبوو بە دەستم لکوپەرچەکان وەلا نێم. لە دوورەوە، دەنگی قورئان و زیکرێکی خۆش دێتە بەر گوێم، تەســـــبیحاتی ســـــۆفیانەو بەنگەوازی خودایی دەژنەوم. لەپڕ لکوپەرچی لێکهاڵاوی ڕەیحانەکان بوو بە ڕیشـــێکی چڕوپڕ و نەرمۆڵە، چۆن مەل خۆی بەنێو هێلانەدا دەکات، منیش وا خۆم بەنێو ئەو ڕیشـــــەدا کرد. بینیم لە بەردەمم وەستاوە:
- سڵاو سودکین.
- قوربان؟
ســـــەرم قیت کردەوە، بینم خۆیەتی، ڕوویەکی هێندە درەوشـــــاوە و پرشـــنگداری هەبوو، دەتگوت ســـەعاتی یەکەمی شـــرووقە. ڕیشـــە سپییەکەی وەک پەڵەهەورێکی بێگەرد و پاقژبوو لە ڕووخساری جیا نەدەبووەوە، زەردەی پێکەنینیشـــــی، کە من قووتی ڕۆژانە و زیکری شەوانەم لێ دەڕنیەوە، ڕووی بەجێ نەدەهێشت. دەستی خستە سەر ڕووم و پێی گوتم:

- سودکین، تاسەی دیدەنت بووم.
- مەولای! منیش بۆ دیدارت تامەزرۆ بووم.
- دەی کەوایە دوام بکەوە، لێرە مەقام فراوانە و ماخۆی ماڵیش بەخشندەیە.

باڵەکانی لێک کردنەوە و سوورێکی خوارد. منیش چاوەکانم هەڵێنان و تەماشای ئەو دەموچاوە پاک و پڕ و سامناکەم کرد. خوێن لە دەمم دەچۆڕایەوە، گۆنا و سەرینم لە خوێن هەلاتبوون، لاڕوومەتێکم هێندە سوور بووبوو، کەس نەیدەوێرا تەماشای بکات، ئەو هات بە دەستی موبارەکی خوێنەکەی سڕییەوە.

- باوکە، باوکە.
- تاهیر.
- لە خزمەتتدام قوربان.
- بمبە ژووری کتێبان.
- باوکە پێم بڵێ چیت دەوێت، با بۆت بهێنم.
- نا ڕۆڵە، بمبە ئەوێ.

قۆڵێکی خستە بن هەنگڵەکانم و قۆڵەکەی دیشی خستە پشت ئەژنۆکانم و بە ئاسانی هەڵی گرتم. گاوێک لە قاهیرە بە شێخی گەورە ئیبن عەرەبی گەیشتم، وەک ئەو بەهێز و بازوو بووم. ئەو کات لە خانەقا سەردانی کردین، خانەقا وەک باخچەیەکی وشک و برینگ وا بوو، بە هاتنی ئەو، بەهاری بەسەردا هات. بەرەکەت کەوتە نێو هەست و سینە و دڵ و دەروونمان، تەنانەت ئەو زیکرانەی ئێواران دەمانخوێندن، قووڵتر لە جاران شوێنەواریان بەسەرمانەوە جێ دەهێشت. کاتێک وانەی پێ دەگوتین و دەچووینەوە حوجرەکانی خۆمان، هەستمان دەکرد کێشمان لە زەوی کەمی کردووە و لە ئاسمان نزیک بووینەتەوە. وێجا من هەستم بەوە کرد، کە دوای چەندان ساڵ هامۆشۆی شێخانی تەسەووف و تەریقەت لە قاهیرە، ئەوە ئێستە شێخە نازدارەکەی

خۆم دۆزییەوە... بەڵام وەک دیارە غەریبە و گەڕیدەیە؟ باشە ئەگەر بنەوبارگەی پێچایەوە و ڕۆیشت، ئەمن چی بکەم؟ لەوە خراپتر دەبێ چی بێت، کە بەر لە وادەی خۆی مورید لە شـــێخەکەی هەڵببڕێت، ئەگەر وای لێهات، ڕووحی هەرگیز تێر نابێتەوە. ئەگەر شـــێخ موحییەدینی ئیبن عەرەبی بە بێی من بڕوات و ســـەرهەڵبگرێت، بە خوای ئیتر منیش ناتوانم بەرگەی ئەو برسیبوونە ڕووحییە بگرم. ئەو ڕۆژەی کۆچی کرد، نزیکترین کەسی بووم، دەستەکانم خستە سەر نەعلەکانی و چاوەڕوانی دەرچوونی بووم، ئەویش ماڵئاوایی لە هاوەڵانی کرد. کاتێک دەرچوو، نەعلەکانیم خســـتنە پێیەکانی و تا کاروانســـەرا دەگەڵی چووم، لە ڕێگە دەرگەی گفتوگۆم کردەوە و قسەی نێو سینەم بۆ هەڵڕشت:

- قوربان! من موریدم و تۆیش کەسێکی گەڕیدەی.

- پێم بڵێ چیت دەوێت؟

- ئەزبەنی، دەمەوێت ببمە یاوەر و خزمەتکاری تۆ، لە زانســـتی تۆ بەهرە وەرگرم.

- دەی کەوایە دوام بکەوە، مەقام فراوانە و ماخۆی ماڵێش دەهەندە و دلاوایە.

لە خۆشیان خۆم پێ نەگیرا، توووند باوەشم پێدا کرد و ڕامووسی. بە تووندوتۆڵی قۆڵ و هێزی بەدەنم پێکەنی، دەســـتی لە قۆڵ و بازوومدا و گوتی:

- باشترین کەسی بەهێز و بازوو و دەستپاکم دەستکەوت.

ئەو پیاوە بە هێز و بازووەی جاران، ئەوەتە ئێســـتا لەبەردەمی کوڕەکەی، وەک تووڕەگەی ئارد دێت و دەچێت. ئەگەر بە تێپەڕینی سالان، هێزم نەپووکابایەوە، ئەوە بێگومان ئەمانەتی شێخ و مەولای منیش بێسەروسەودا نەدەمایەوە. ها ئەوەتە ئێستا ئەمانەتەکە لەنێو ئەو ســـندووقە کەڵەکەکراوانەی ژووری کتێبخانەدا خەوتووە. چاوم کەوتە سەر کتێبە سەفتکراوەکان، کە لەبن دیوارەکە پۆلێن کرابوون

و هێشـــتا لە خوێندنەوەیان نەبووبوومەوە. لەنێو ســـندووقەکاندا چەندان کتێب خۆیان مات دابوو، بەڵێ ڕاستە پێشتر خوێندبوونمەوە، وەلێ ماڵم هەقە بۆ تاقە جارێکیش سەرم لێیان نەدابووەوە.
- تاهیر، لە دوای مەرگی من چ لە کتێبەکانم دەکەیت؟
بەم پرسیارە کتوپڕە، زمانی بوو بە تەڵەی تەقیو و وەرامی نەدامەوە. ڕوونـە ئـەم کوڕەم ڕێگـەی منی نـەگرتـەبـەر. هێندەی توانیم هـەوڵم لەگەڵ دا، فەرمانم پێ کرد، گوێڕایەڵی نەکردم، خۆشـــەویســـتی و ســۆزی خۆم بۆ دەرخســـت، لێ هیچ ســوودێکی نەبوو. ڕۆژێک لە دیمەشق لای ئیبن عەرەبی شکایەتم لێی کرد، ئەویش سەبارەت بەمە منی بە خەمبار و دڵتەنگ بینی:
- ها بۆچی لێوبەبار و خەمباری؟
- تاهیری کوڕم ڕێگە و ڕێبازی منی نەگرت.
- ڕێگە هیی خودایە، هەرکێ بیەوێت دەبێتە ڕێبواری.
- بەس من حەزم دەکرد ئەو ســـۆفییەکی زاهید و خوداناس بووایە، وەک من و باوکم بەشی چێژ و ئۆقرەیی دڵ و دەروونی پێ بڕابایە.
- خۆ ئەگەر ڕێڕەوی باوکم گرتبایە، دەبوومە دەرگەوان و پاسەوانی کۆشـکی موەحیدەکان، ئەوســا هیچمان بە یەک نەدەگەیشــتین... لێ خودا ڕێگەیـەکی دیکـەی جودا لـە ڕێبـازی باوکمی پێ نیشـــان دام، ڕێگەیەکەی جیاواز لە ڕێگەی باوکیشی بۆ تاهیر دیاری کرد.
- پێم ناخۆشـە خەریکی ژیان بەسـەربردن و بازرگانی بێت و پشـت لە زوهد و خوداناسی بکات.
- حەفتا ســـاڵ مامم خەریکی بازرگانی بوو، بەڵام کاتێک کاســـەی مەرگی نۆش کرد، وەلییەکی خاوەن کەرامەت بوو!
پاشـان وەک نەریتی هەمیشـەی، هەردوو لەپی دەسـتی خسـتنە سـەر دەموچاوم، ویستی پەیڤەکانی خۆی لە قووڵایی دەروونم بنەخشێنێت و هەرگیز نەسڕێنەوە، ئینجا گوتی:

- سـودکین گوێ بگرە: ڕێگەیخودا، شـاڕێگەیەکی گشـتی و فراوانە، بـەڵام ڕێگـەی بـەرەوخوداچوون، بە ئـەندازەی ژمارەی هەناســـــەی خەڵک لکوپۆپی لێ دەبنەوە.

- تاهیری کوڕم هیچ لەم ڕێگەیانەی گرتووەتە بەر؟

- بەڵێ، ڕێگەی بازرگانی کاری پێغەمبەران بووە. زوهد، لە باتیندایە نەک لە ڕووکەش. پێویســت بەوە ناکات زوهد لە شـتێکدا بکەین، کە بۆی ئافراوین.

ئیتر لـەو ڕۆژەوە منیش نیگـەرانی تـاهیر نیم. ئـەو، ئێســــتە خـەریکی بـازرگـانی و کاروباری دنیای خۆیەتی، خوا هەڵناگرێت لەگەڵ منیش زۆر باشـە. دوای تێپەڕینی هەشت سـاڵ بەسەر کۆچیدوایی شێخی مەزن، ئێســتە زۆر لە جاران باشــتریش بووە. کزۆڵی و ســیســی و نـەخۆشـــــی، ڕوویـان تێ کردووم، هـەر وەختێک بۆی خـەمبـار و نیگەران بم ئەو قســەیەم بیر دەکەوێتەوە :" الطریق، طریق الله." دەی مادەم خودا ڕێگەکەی دەســتنیشــان کردووە، مرۆ لەچی داوە، بۆ وا خۆی قەڵس و پەشۆکاو دەکات؟

- دەی ڕۆڵە! وەڵامم بدەوە، دوای من، چی لە کتێبەکانم دەکەیت؟

- بـاوە! خودا تـەمـەنت درێژ بکات. چۆنت دەوێت و دەڵێیت وایان لێ دەکەم.

- هەر هەموویان وەقفی فەقێیانی حوجرەی فیردەوس بکە.

- باوەگیان چۆنت دەوێت وا دەبێت.

- ئەو سندووقەی سەرەوە بێنە...

هەسـتا و بەئاسـانی سندووقەکەی هێنایە بەردەمم. پێم گوت بیکەوە، ئەویش کردیەوە، کتێبێکی هێنایە دەر، دوای مەرگی شـــێخی مەزن، هەمیشە هاودەم و هاونشینم بوو. کتێبەکەی دایە دەستم، نەختێک بە سینەمەوە نووساند و دامەوە دەستی و گوتم:

- ڕۆڵە! تەنیا ئەو کتێبە مەبە، با ئەوەت لەلا بمێنێتەوە، وەک گلێنەی چاوت بیپارێزە، وەسـیـەت بۆ منداڵەکانیشـت بکە با بیپارێزن و نەیفەوتێنن.

چاوەکانی تاهیر سـامگرتی بوون، بە هێواشـی و هێمنی دەسـتی بە بەرگی کتێبە گەورەکەدا هێنا.

- کوڕە شـیرینەکەم، ئێستە بە کەیفی خۆت شـوێنێکی کتێبەکە بکەوە و چەند بۆت دەلوێ بیخوێنەوە.

سـەرم بۆ پشتەوە برد و چاوەکانم نوقاندن. بۆ ئەوەی لەبارەی من، نیگەرانی داینەگرێت و لە خوێندنەوە نەپچڕێت، بەنهێنی لەژێر لێوان شـایەتمانم هێنا. ڕاسـتییەکەی دەمەوێت بەدەم مەرگەوە گوێ لە ژیاننامەی شـێخی گەورە بگرم، ئەو شـێخەی وەک دەریا وایە، زانسـتی وی هەتا بڵێی فراوانە. هێواش هێواش بادەی مەرگ نۆش دەکەم، بە خورپە و ترپەی پاکەوە سـەر دەنێمەوە، ها ئەوەتە پەیڤەکانی شـێخی من، بەسـەر زوانی کوڕەکەم لە گوێچکەمدا دەزرینگێنەوە:" مەقام فراوانە و ماخۆی ماڵیش دڵاوایە، کاکی ڕێبوار وەهای دەفەرموو."

## ٩

**"خەڵك ڕووحی خانووەکانیان"**

**ئیبن عەرەبی**

بانگبێژ لە دەروازە و شیپانەی ئیشبیلیا بانگی بەیانی دا، ڕوومان لە ڕووگە کرد و نوێژمان دابەست. کاتێک لە نوێژ بووینەوە، بینیم پیاوەکان چۆن باوەش بەیەکدا دەکەن و ژنەکانیش بە فنکەفنک و نیگەرانییەوە، بەشەرم و نازەنینییەوە، ماڵاوایی لێکدی دەکەن. سەلووم و باوکم چوون وڵاخەکانمان ئامادە بکەن، کەژاوەی دایکمیان لەسەر پشتی وڵاخەکە داناوە. دایکم لە ورتکە و چنکەی دوێنێ، لەتەنانێکی دامێ. دواتر هەڵووژەیەکی وشککراوەیشی پێ دام. زارۆک لە خەنیخۆشییان گۆرانی منداڵانەیان دەچڕی، بە چوونە نێو ئیشبیلیا دنیایەک کەیفخۆش و شادبوون. خۆ هەتا دوێنێش شەوق و چاوەڕوانیی من بۆ ئیشبیلیا لە هیی ئەوان کەمتر نەبوو، هەر خودا دەیزانێ دوێشەو، بە چ حاڵێک خەوم لێ کەوت.

هەر کە دەروازەی شارمان تێپەڕاند، پاسەوان و قافڵەناسەکان هاتن و ڕایان گرتین، سەرقافڵە قسەی دەگەڵ کردن، ئەوان گوتیان:

- لەکوێ هاتوون؟

- له (مورســیه) و دەوروبەری، کەمێکیشــمان خەڵکی دەوروپشــتی (جیان)ین.
- کەس هەیە خەڵکی ئەندەلوس و مەغریب نەبێت؟
- نەخێر، تەنیا بەندەکەمان نەبێت.
- کەس کاڵای بازرگانی (گینۆڤا) و (سەردایگنا)ی پێیە؟
- نەخێر، تەنێ کاڵای خۆمان پێیە.
- ڕێناســێک خۆی داهێناوە و هێمایەکی بۆ پاســەوانەکە کرد، قافڵە بەکاوەخۆ بەرەو شار کەوتە ڕێ. پاشـان ڕێوانەکە بە سەرقافڵەکەی گوت:
- ڕێشــمەی ئەســپەکانتان بکەنەوە، لەم گۆرەپانەی بەردەمتان پەرتوبڵاو بن، بەیەک کەرەت مەچوونە نێو شــار، با وڵاخەکانتان تەپوتۆز دروست نەکەن...
ســەرقافڵە ســەری ڕازیبوونی لەقاند. بەردەســت و خزمەتکارانی قـافڵـەکـە، خێرا ڕێشــمەی وڵاخـەکـانیـان کردەوە. ڕێوانیش لـە ڕێنمـاییـەکـانی خۆی بـەردەوام بوو، لـەگـەڵ نزیکبوونـەوەی قـافڵـە لـە سەنتەری شار، پتر دەنگی بەرز کردەوە:
- بە سواری وڵاخەکانتان مەچوونە نێو بازاڕەکان. وڵاخەکانی خۆتان ببەستنەوە، نەکەن بەرەڵایان بکەن.
بە ڕیزێکی پانوبەرین داخڵی ئیشبیلیا بووین، بازێڕوان ورد تەماشای دەموچاو و کەلوپەلەکانی کرد، ئەوەی ویســتبای لێپرســینەوەی لێ دەکرد و کەلوپەلەکانیشــی دەپشــکنی. وڵاخەکانی ئێمە و مامم لە قافڵەکە جیابوونەوە. باوکم پارەی دایە منداڵێک تا لە ڕێگە ڕێنوێنیمان بکـات، بـە هـەمبـەر (نهر الوادی)دا بردین، لـەوێ ڕێکـەوتی چـەنـدان کەشــتیی گەورەمان کرد، وەها ڕووباریان شــەق دەکرد، دەتگوت لەنێو دەریادا دەڕۆن. ئێمە پێشــتر کەشــتی وا گەورەمان نەدیبوون، هـەر تـەنێ چـەنـد بـەلـەمێکی چکۆلـەی ڕووباری (شــقورە)مان چاو پێکەوتبوو. کاتێک ئامۆزاکانم دیمەنی ئەو کەشــتییە زەبەلاحانەیان

بینی، له خۆشـییاندا خەریکبوو باڵ بگرن. پاشـان کوڕێژگەکە ئێمەی لـە ڕووبارەکە دوورخسـتەوە. من و سـەلووم و دایە و بابە و خوشکەکانم لە چوار ولاخ سـواربووین. مامیشم بە خۆی و سێ کچ و دوو کوڕە بچووکەکەیەوە، لە پێنج ولاخ سـواربوون. مامۆژنیشـم مردبوو، پێشـتر لە کاتی ئابلۆقەدان تووشـی نەخۆشـیی سـیل بوو، لەترسـی تەشـەنەکردنی نەخۆشـییەکەی، دوور لە ماڵی خۆیان، خسـتبوویانە نێو خێوەتێک، هەر بە هۆی ئەم نەخۆشـییەیش سـەری نایەوە. بیرمە باوکم بە مامۆژنمی هەڵدەگوت و دەیلاواندەوە:
- ئەی بەستەزمان و کڵۆڵ و بەدبەخت! خەڵک ئابلۆقەیەکیان لەسەرە، تۆ لەمەیش دووانت پێ بڕاوە : ئابلۆقەی ناو خێوەت لە لایەک و هیی شاریش لە لایەکی تر.
ئەو کات لە مورسییە بەدەر لە پزیشکی کۆشک، کە نەدەبوو خەڵکی ڕەشـوڕووت و ڕەشـۆک تیمار بکات، هیچ پزیشـکێکی دیکەی خودان متمانە نەبوو. باوکم لە کۆشـک مامۆژنمی بە ژنی خۆی ناوبردبوو، بەم پاساوە پزیشکی هێنابووە لای. پزیشکەکە لە دەرگەی خێوەتەکە دەوەستێت و دەڵێت:
– خاتوون! دەستت بێنە با ببینم!
مامۆژنیشـم دەسـتی درێژ دەکات، پزیشـک تەماشـای نینۆکەکانی دەکات، دەبینێ ئاوساون و وەک تەختەی سەری تەپڵیان لێ هاتووە، سەری خۆی بادەدا و بە باوکم دەڵێت:
- کاتێک نینۆک ئاوسـان، ئیتر چارەسـەر نامێنێ. با وەسـیەتی خۆی بکات، باهۆزی مەرگی نزیک بووەتەوە.
دوای چەند ڕۆژێک گیانی سـپارد، ئیتر دوای ئەو، مامیشـم ژنی نـەهێناوە. کچـەگەورەکەی مشـووری ماڵ و منداڵی دەخوارد، هەر بۆیەش تەمەنی گەیشتە سی ساڵ و هێشتا مێردی نەکردبوو. هەرکە دەگەیشتە من، گاڵتەی پێ دەکردم:"ها پسمام! تۆ کەی گەورە دەبی و دەمخوازی؟" شـەرم دای دەگرتم و خەجاڵەتبار دەبووم، ڕاسـتیت

دەوێت ئەو قســـانەم پێمناخۆش بوون، بەتایبەتی ئەو کاتانەی ماچی دەکردم و شـــاشـــی و کەلوکۆمی ددانەکانی و بالوکەی کەپوویم دەبینین، وێڕای ئەمانەیش، بۆنێکی ناخۆشی لێ دەهات، وەک ئەوەی باوکی پێشــتر قەت عەتتار نەبووبێت! باوکم لە خۆراوای ڕووبارەکە خانوویەکی لەگەڵ مامم بەکرێ گرت. خانووەکە چوار ژوور و حەوشەیەکی گەورەی هەبوو. سەلووم لە حەوشەکە خێوەتێکی بۆ خۆی هەڵدا. مامم و کوڕەکانی چوونە ژوورێک، ســێ کچەکەیشــی چوونە ژوورێکی دی. باوکیشم بە تەنیا ژوورێکی گرت. من و دایکم و خوشــکەکانیشــم فراوانترین ژوورمان پێ بڕا. دوای چەند ڕۆژێک ئەم دابەشـــکارییە گۆڕانی بەســـەردا هات: باوک و مامم بە یەکەوە چوونە ژوورە گەورەکە، منیش چوومە ژووری منداڵ و کوڕە مامەکانم. تەنێ دوو ژوور بۆ ژنەکان مانەوە، کچەیلی مامم بە کەیفی خۆیان لەنێوان ئەو دوو ژوورەدا جرتوفرتیان دەکرد. هەر وەختێک دەچوومە لای دایکم دانەیەکیان لەلای دانیشتبوو. دوای چەند مانگێک لە ئیشـــبیلیا کچە بچووکەکەیان مێردی بە زڕەعەرەبێک کرد، باوکم بەمە زۆر تووڕە بوو:

- خۆ ئەو گەنجە عەرەبی ڕەسەن نییە!

مامم بە پێکەنینەوە:

- کوا عەرەبی ڕەسەن لە ئیشبیلیا ماون؟

چەند مانگێک باوکم و مامم لەبارەی شووکردنی ئەو کچە گاڵەگاڵ و دەنگەدەنگیان بوو، بەڵام مامم لە بڕیاری خۆی پاشـــگەز نەبووەوە. باوکم بە قەیرەبوونی کچەگەورەکەی مامم، زۆر خەمی دەخوارد، دەترسا ئەویش بە دەردی کچە بچووکەکەی بچێت. مامیشم وەک نە بای دیبێت و نە باران، هیچ گوێی بە بۆچوونی باوکم نەدەدا، لە حوزووری ئێمەدا گاڵتەی بە باوکم کرد:

- خزمەتکارێکی بەربەری پێی ناخۆشـــە کچ بە زڕەعەرەبێک بدەم؟ وای چەند سەیرە!

بە هەرحاڵ، ژیانی هاوژینییان پێکهێنا و لە ئیشــبیلیاوە بۆ (شــبربل) ڕۆیشـتن. ئیتر باوکم و مامم دەستیان لەو دەمەقاڵێیە هەڵگرت. دوای ئەوەی خەلیفە بانگهێشــتی کرد، باوکم لە کۆشــک دەســتی بە کار کردەوە. هـەواڵی بۆ بـاوکم نـارد: پـاش ئـەوەی خەلیفە لە گێڕانەوەی چەند گوندێکی بچووکی نزیک قورتوبە بۆ ژێر ڕکێفی خۆی تەواو دەبێت، نیازی هـاتنی بۆ ئیشــبیلیا هـەیە، بۆیە پێویســـتە بەر لە گەیشـتنی جەنابیان دیوانەکان ڕێک بخرێن. مامیشـم دابەزینی نرخی دووکـانـەکـانی نزیـک مزگـەوتی (ئیبن عـەدیس)ی بـە هـەل زانی، دانەیەکی کڕی و کاری بازرگانی تێدا کرد. دیارە هەرزانبوونی نرخی ئەو دووکانەیش بە هۆی دروستکردنی مزگەوتی (قەصبە)وە بوو.

ڕۆژێک خـەریکی نانخواردنی ئێوارە بووین، دیســـان گـاڵـەگاڵ و هاتوهاواری باوکم دەسـتی پێ کردەوە. وەک نەریتی هەمیشــەی، بە دنیایەک پێداهەڵدان و ســەناوە، باســی خەلیفە و، والی و، وەزیر و، دیوان و، عـەرزوحـاڵنووســـانی کرد. ئـەمڕۆ والی لە کۆشـــکەکەی هاتووەتە دەر، کەس نەبووە ئەسپەکەی بۆ ساز بکات، ناچار بەپێیان چووەتە سەر کارەکەی، ئەمەیش بۆ ڕایکردنی کاروباری خەڵک.

- خۆشــحاڵی بۆ ئیشــبیلیا کە ئەو والییە زاهید و خاکەڕایەی هەیە، ئامادەنەبوونی ئەسـپەکەی بۆ چوونە ســەر کار نابێتە بەربەســت و بەپێیان ملی ڕێ دەگرێت.

مامم بە دەنگێکی نزم، بەڵام هەموو بیستمان گوتی:

- بریا تۆی زین کردبا و سوارت بووبا!

ئەم ڕســـتەیە دەتگوت هەورەتریشــقە بوو لە دەمی مامم هاتە دەر، بێدەنگی باڵی خۆی بەســـەر ئەو ناوەدا کێشـا. کچەکەل هەترەشــیان چوو، بـاوکم لـە تووڕەییان دەمـارەکانی ملی دەرپـەڕین، گرکانێک لە تووڕەیی لە هەناویدا جۆشی خواردبوو. بە چپەوە بە باوکمی گوت:

- عەبدوڵڵا! نابینی ئەندامانی خێزان دانیشتوون!

ئەو نیوە بابۆڵەی بە دەستیەوە بوو فڕێی دا و بەرەو ژوورەکەی خۆی چوو. هیچ وشەیەک لە دەممان نەهاتە دەرەوە. دایکیشم بە کچەکانی گوت نانی خۆتان تەواو بکەن، خۆیشی دوای باوکم کەوت. ڕاستییەکەی منیش ترسام، بەڵام خۆم وا دەرخست، کە خۆڕاگرم و گوێ بەمە نادەم... هەر من و مامم لەسەر خوانی نانخواردن ماینەوە، دواتر ئێمەیش هەستاین و دانیشتنەکە بەتەواوی تێکچوو.
دوای چەند ڕۆژێکی کەم، خەلیفە گەیشت، هەموو ئەو لیستانەی باوکم و والی لەبارەی دەستوپێوەندە نوێیەکەی لە ئیشبیلیا ئامادەیان کردبوو، دایانە دەست. لەم کەینوبەینەدا باوکێشم لە ئیقلیمی شەڕەف[٢] خانوویەکی پێ برا، بەڵام بە بنەموڵکی نا . ئیتر ئێمەماڵمان بۆ وێ گواستەوە، مامیشم بۆ خانوویەکی نزیک دووکانەکەی خۆی، باری کرد.

[٢]-ناوی دەڤەرێکی ئیشبیلیایە.

# ١٠

**"لەبەر چاوچنۆکی نەبووایە، هیممەت ئەژنۆی دەشکا"**
**ئیبن عەرەبی**

تازە چەند ڕۆژێک بەسەر هاتنی خەلیفە بۆ ئیشبیلیا تێپەڕیبوو، خەڵکەکە لە هیکڕا هەواڵێکیان بەر گوێ کەوت، کە قەت شتی وایان بەبیردا نە دەهات: "جەنابی خەلیفە هاوسەرگیری لەگەڵ سەفیەی کچی محەمەدی کوڕی مەردەنیش دەکات." دایکم وەختێک ئەم هەواڵەی لە باوکم بیست، داخێکی قووڵی هەڵکێشا و دەمی خۆی گرت: دیارە کچ لە دنیا بڕاون، هەر کچی دوژمنەکەی مابوو هاوژینیی دەگەڵدا بکات؟ سەیرە! ئەی خۆی گەمارۆی نەدابوو؟ باوکم بەدەم داکەندنی خوفەکانی و نوقمکردنیان لەنێو تەشتێکی ئاودا، گوتی:

- ژنەکە، ئەوە زیتەڵی و وشیاریی خەلیفەکانە. سەفیە لە ماڵی خۆیەتی، خوشکی سەفیەیش لە ماڵی ئیبراهیمی کوڕی هەموشکە.

کەواتە ئێستە جووتەخوشکی مەردەنیشییەکان لای موەحیدەکانن.

- یانی ئێستە خەلیفە لەو کچە دڵنیایە؟

- بەڵێ لە هەموو مەردەنیشەکان دڵنیایە... ئەو چاپووکی و چاوپۆشیی خۆی بۆ دەرخستن، هەموویان شایانی ئەوەن لەژێر حوکمڕانیی ئەودا بمێننەوە.

- ئەی کچەکە ژەهری بۆ لە خواردن کرد؟

باوکم پێکەنی گوتی:

- نا ئازیزەکەم، تۆ پێت وایە خەلیفەکانیش وەک ئێمە لەلایەن ژنەکانیانەوە خواردنیان بۆ ئامادە دەکرێت و هەموو شەوێک لەتەکیاندا دەخەون؟ نا گیانە! کەسانی متمانەدار خواردنیان بۆ چێ دەکەن، چەندان پاسەوان و بەندەیش چاودێریی هەموو جووڵە و بزاوێکیان دەکەن. ژنەکانی خەلیفە لە مانگێکدا تەنیا یەک ڕۆژ، یان دوو ڕۆژ، خەلیفە دەبینن.

خەلیفە بەبۆنەی سەرکەوتن و هەم زەماوەندەکەی، ئاهەنگێکی حەوت ڕۆژیی ڕێک خست. گۆڕەپانەکانی شار پڕبوون لە مارەوان و مەیموونەوان، سەمایان بە مەیموون و مارەکانیان دەکرد و خەڵکیش پەیتا پەیتا دەهاتن و لە دەوریان جەم دەبوون، هەر گاهێک لە یەکێکیان وەڕەزبووبان ڕوویان لە یەکێکی دیکە دەکرد.

من و باوکم و خوشکەکانم و جاروباریش دایکم ڕۆژانە دەردەچووین، بەڵام دایکم لەبەر سەرئێشەی توونت هێندێک جار سەر لە نیوەڕۆیان دەگەڕایەوەماڵەوە. حیکایەتخوانەکان لە سیلەی مزگەوت دادەنیشتن، هەریەکەو منداڵێکی لابوو، خەڵکیان بۆ خڕدەکردنەوە. منداڵەکان تەپڵێکی بچووکیان بە کەلەکەوە کردبوو، پێیاندا دەکێشا و هاواریان دەکرد: " گوێ لە شتە سەیر و سەمەرەکانی خورهەلات بگرن...هی بەغداد و بەسرە.... ئی دیمەشق و قاهیرە... باسی زەیرسالم و ئەبوولەیلای موهەلهەل و بەسووس دەکەین....گوێ بگرە و هیچ مەپرسە، خەم و مەراق لە دڵتان دەرهاوێژن، ئەرێ گەلۆ مژاری شۆڕشی زەنجتان نەبیستووە؟

یەکبەیەک بەســەر ئەو حیکایەتخوانانەدا دەگەڕام، لەژێر قاچ و قۆڵی ئەو قەرەباڵخی وجەنجاڵییەدا هەڵدەشــێلرام، حەزم دەکرد زۆر لە حیکایەتخوانێک نزیک ببمەوە، بەڵام ئەگەر نەگونجابا دەچوومە لای دانەیەکی دی. پاشــان ڕێکەوتی حیکایەتخوانێکی ئیشــبیلیام کرد، پێشــتر چەند جارێک لەکن دووکانی مامم دیبووم، بەڵام ڕاســتی نەمدەزانی حیکایەتخوانە. لە حەلقەکەی ئەو، بیســت پیاو و چەند ژنێک، کە ماتۆی مەغریبییان پۆشیبوو، دانیشتبوون، هەروەها چەند ســەربازێک بە شــمشــێرەکانیانەوە لەوێ بوون، چەند منداڵێکیش لە تەمەنی جۆربەجۆر، گوێیان گرتبوو. حیکایەتخوان بەم تەرزە حیکایەتەکەی گێڕایەوە:

- "کەشتیگەلی ئاگرپەرستان هاتنە نێو شاری ئیشبیلیا، بە شمشێر و تەورداس، کەوتنە وێزەی خەڵکی هەژار، دەڵێی قەلەڕەش بوون دەریایان داپۆشی، دڵی خەڵکیان پڕ کرد لە خەم و ناخۆشی. بە زۆر خۆیان بە مزگەوت و ماڵاندا کرد، ئەوەی کوشــتیان و ئەوەی بەدیلیان گرت. حەوت ڕۆژ تێیدا مانەوە و بادەی مەرگیان بەو خەڵکە بەستەزمانە نۆش کرد..."

حیکایەتخوان بەئەنقەســت بەرزی و نزمی بە دەنگەکەی دەکرد و چاوەکانی زەق دەکردنەوە، منداڵە بچووکەکان لە ترســان خڕدەبوونەوە ســەر یەک و خۆیان وێک دەهێناوە. ئەویش باســی ســەختی ناخۆشــیی غەزوەی نورمانی دەکرد: " ... ئەوکات ئیشــبیلیا شــارێکی بێ شــووره بوو، کافر و بەدکاران بەســێنایی هاتنە نێوی، کەشــتییەکانیان پڕ کردن لە دیل، دواتر بەرەو جەزیرەی (قیبتیل) ڕۆیشــتنەوە، خەڵک بەترســولەرزەوە ئیشــبیلیایان جێ دەهێشــت و بە پەلەپرووزێ خۆیان دەرباز دەکرد. کابرای عەرەب دەیگوت: مەجووس، مەجووس. فەرەنگی دەیگوت: فایکنج، فایکنج، هیچ مرۆ و مەل و ئاژەڵێک نەبوو لە سایەی شمشێری ئەواندا زیانی پێ نەگات، تێکڕای شار، کەوتە ژێر ڕکێفی وان."

پاشـــان حیکایەتخوان دوا حیکایەتی خۆی خوێندەوە، کە بەڕاســـتی شایانی میهرەجانە گەرموگوڕەکەی جەنابی خەلیفە بوو:
" ... پاشـــــان نەژدە و فریادڕەس لە قورتوبە و قرمونە بەهانایانەوە هـاتن، موسـلـمانان لە (مۆرۆر) و (لشـــبونـە) دژ بـە دووژمنانیان کۆبوونەوە، لە دەوروبەری ئیقلیمی ڕەشـــەف جەنگیان بەرپاکرد، ئەوان باشترین خەلەف بوون بۆ باشترین سەلەف، مەنجەنیقیان لە دەوری ڕووباری گەورە دانان، کەشتییەکانی ستەمکار و بەدکارانیان پێکا، ئاگرپەرســـتان ڕێگەی هـاتنەژوور و چوونەدەریان لێ گیرا، چەندان سەقالیبە و علووجیان لێ کوشتن..."
خەڵکەکە دەستیان بە تەکبیرلێدان کرد و فلووسی مسیان بۆ هەڵدایە سەر دەسرۆکەکە، ئەویش سوپاس و ستایشی دەکردن و فلسەکانی کۆ دەکردنەوە... پاشـــان خەڵکەکە پەرتەیان لێ کرد، هەریەکەو بەدوای دڵنەوایی و چێژێکی تردا دەگەڕا.
دوا ڕۆژەکانی میهرەجان، ڕێگەوبان پڕبوون لە ســـەرباز، لە هەموو ڕەنگ و چینێکەوە جمەی دەهات. مەغریبییەکان دەســـرۆکێکی سووریان بەسـەرەوە بوو، بەســەر شـانەکانیانەوە هاتبووە خوار، جلێکی سپیی قیبتی ڕازاوەیان پۆشیبوو، ئاڵای سووریان بەدەستەوە بوو. سـوودانییەکانیش زرێی پێســتی و وشـتری قەشـەنگ و بە زەنگوڵیان پێ بوون، کڵاوی تورتوڕیان بەسەرەوە بوو. لەولایشەوە، ئەغزازەکان بە ڕیشـی سـەیر و سـەمەرەیان دەبینران، بە جۆرێک هەردوو لاڕوومەت و ژێر چەناگەیان تاشـیبوو، تەنیا ڕیشـی سـەر چەناگەیان هێشـتبووەوە. بەدەر لەمانەیش، لەنێو ســـەربازەکاندا کەســـانی بەربەر و عەرەب و ســـەقالیبە و کۆیلە دەبینران. زۆر بەڕێکوپێکی ڕێیان دەکرد، نە ورتە و پرتەیەکیان دەکرد و نە لاشیان بە ڕاست و چەپ دەکردەوە، هەر کەسەو تەماشای پشتەملی کەسی پێشەخۆی دەکرد.

نزیکەی دوو هەزار کەس لە گۆڕەپانی ئیشبیلیا لە بەرانبەر مزگەوتی گردبوونەوە، داوایان لێ کرا، بازنە بازنە دانیشـــن، هەر بازنەی دووسەت کەس بێت، بازنەی یەکەم پەنجا، پاشان پەنجای دی، دواتر پەنجای دیکە... ئا بەم جۆرە. لەنێو هەر بازنەیەکدا وتاربێژێک وەستابوو، وتاری بۆ دەدان و دەیگوت:

- جیهاد، لووتکەی هەرەبەرزی ئیسلامە.

سەربازەکانی دواوەیش هەموو بەیەک دەنگ دووبارەیان دەکردەوە، دیواری ماڵ و دووکانەکانی بەرانبەریان، دەنگیان دەدایەوە و دەلەرینەوە:

- بەڵێ، جیهاد تۆقەڵانی هەرە بەرزی ئیسلامە.

ئینجا تاوێک بێدەنگ دەبوو. ســەربازەکان هەریەکەو تابلۆیەکیان پێ بوو، هەموو ئەو دەســــتەواژانەی دەیانگوتنەوە، بە نەخش و نیگار دەیاننووسینەوە. پاشان کاکی وتاربێژ دەستی پێ دەکردەوە:

- جیهاد، قاپییەکەی بەهەشتە.

ســەربازەکان بە زمان دەیانگوتەوە و بە قەڵەمیش دەیاننووســیەوە. باوکم لەتەک من وەســــتابوو، دیمەنێکمان هاتە بەرچاو، لەناو ڕێبوارانیش بوو بە دەنگە دەنگ و هەرا، تومەز ئەوانیش قەت دیمەنی وەهایان نەدیبوو. باوکم ئاوڕێکی لێ دامەوە و بە دەنگێکی پڕ شکۆ و شانازییەوە گوتی:

- نابینی چ ڕوو دەدات؟ ئەوەم بە خەلیفە گوت. ئەمە ڕای خۆمە. بەڵێ، ئەمە کاری خۆمە.

- بۆچی باوکە؟

- چونکە ســەربازەکان دەســتەدەســتە و جۆراوجۆرن، شــتێک نییە هەموویان لەخۆ بگرێت. من لە کاتی ئامادەکردنی دیوانی ســەربازان و ناونووسینیان ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە. مەغریبی و نیمچە عەجەم و ئەندەلوســی و پاشــماوەی ســوپای مورابیتەکان و مورتەزەقەی گاوران و کۆیلە و ژێردەســتەی ســەقالیبەکانی تێدان. بەوەدا زانیم

ئەوان ڕێبازیان جۆراوجۆره و مەبەســت و ڕای جوداوازیان هەیە، هەموویان لەیەک شکڵ و شێوه نین.
پاشان هێمای ڕۆیشتنی بۆ کردم و له قسەکانیشی بەردەوام بوو:
- پێشـــتر بە خەلیفەم گوت مامۆســـتایەکیان بۆ دابین بکات، فێری جیهاد و کاروباری ڕۆژگاریان بکات، بۆچوونەکەی منی بەڕاســـت دانا و ڕازی بوو.
بەم پرســـوڕا و تەگبیرانه والی پتر بایەخی بە باوکم دەدا و له خۆی نزیـک دەخســـتـەوە، بـەڵام هیچ پلـە و پۆســـتێکی بـەرزتر لـە عەرزوحاڵنووسی نەداین.
باوکم پێشـــتر زۆر له کۆشـــکی ئیبن مەردەنیش دەمایەوە، بەڵام ئێســـتە هێندەی پێ ناچێت و زوو دەگەڕێتەوە . ئەمەیش بەوە لێک دەداتەوە، کە له کۆشـــکی خەلیفە مەغریبییەکان بێزار و هەراســـانی دەکەن، بە زمانی مەســـموودی دەدوێن، کە باوکم هیچی لێ نازانێت. بەڵێ، باوکم دوای نوێژی عەســـر بەرەو ماڵ دێتـەوە، خۆ ئـەگەر بزانێت خـەلیفە لـەگـەڵ خـەڵک دانیشـــتووە، ئەوە تا ســـەروبەری خۆراوابوون ناگەڕێتەوە، بەڵام ڕاســـتییەکەی ئەمە زۆر ڕوو نادات. خەلیفە بەردەوام لەگەڵ کەســـە نزیکەکانی دادەنیشـــێت، کە باوکم هێشتا لەوان کەسان نییە. ئەو، نە وەک ئیبن توفەیل فەیلەسووفە، نە وەک ئیبن زوهەیر پزیشـــکە و نە وەک ئیبن ڕوشـــدیش قازییەکی گەورەیە... بـەڵام لـەگـەڵ هـەموو ئـەمـانـەیشـــدا زۆر نیگـەرانی و بێئومێدبوونی پێوه دیار نەبوو. زۆر ســـوپاســـی خەلیفەی دەکرد، کە له کۆشـــکی ئیشـــبیلیا دایمەزراندووە و مانگانە مووچەی دەداتێ و خانوویەکیشـــی داوەتێ. باوکم پار شـــەوانێکی ناخۆش و دژواری لەناودا بەســـەر دەبرد، بیری لەوە دەکردەوە، کە لەتەنیشـــت ئیبن مـەردەنیش لەناو جەرگەی شـــاردا هەڵبواســـرێت. ئەگەر بێتو بەم ســـاڵەی بەراورد بکەین، ئەوە باوکم ئێســـتا لە خۆشـگوزەرانییەکدایە نـەبێتـەوە. تۆ بڵێی گلـەیی له چی هەبێت؟ ها ئەوەته لای خەلیفەیەک

عەرزوحاڵنووســـــە، کە حوکمڕانیی مەغریب و نیوەی ئەندەلوس دەکات... ئەوە زۆر باشـــترە بۆ ئەو لای پاشـــایەک وەزیر بێت، کە فەرمانڕەواییەکەی لە ســـنووری شـــار بڕ نەکات. تەنانەت ئەگەر بەڕێوەبەری دارایی بە فەرمانی خەلیفە دینارە مەردەنیشییەکانیشی لێی وەنەگرتبایەوە و دیناری موەحیدەی نە دابایێ، ئێســـتە ڕەنج بەخەسار دەبوو.

باوکم بۆ ئەوەی لەبەر خوێندنم دابنێ، یەک ڕۆژی ڕەبەق کۆڵان بەکۆڵانی ئیشبیلیا لەگەڵمدا گەڕا، دەچووینە هەر مزگەوتێک لە مەلا و فەقێکانی دەپرسی. کاتێک زانی گەورەفەقیهی شار، لە مزگەوتە تەنگ و تەســـکەکەی خۆی دەرس و دەوری هەیە، لەلای قەوســـەکەی ئیشبیلیا، زۆر لە چاوەڕوانی هاتنەوەی وەستا. ڕۆژی دواتر، کە زانی من ئەوێ پێ دەزانم، ناردمیەوە، چەند منداڵێکیشـــم دەگەڵدا بوون، شێخ پێی گوتم:

- کوڕەکانم بڕۆنەوە ماڵەوە، بە دایە و بابەتان بڵێن مزگەوتەکە فەقێی زۆرن و جێگەمان نەبووەوە. مانگی شـــەعبان وەرنەوە، خوا یاربێ، وەرتاندەگرم.

گەڕامەوە ماڵەوە و چاوەڕوانی باوکم بووم لە کۆشـــک بێتەوە، کە هاتەوە، پێچەی ســـەری هێنایە خوارەوە، حاڵ و حیکایەتی خۆم بۆ گێڕایەوە، ڕێک پێچەکەی خســـتەوە ســـەرســـەری و بردمیەوە ماڵی جەنابی شـێخ. باوکم لە دەرگەی ماڵی شـێخی دا، شـێخ بە ڕیشـە ســـــوورە خەنەکراوەکەی، بە تەویڵە پان و بەرینەکەی، کە خاڵێکی جوان و گەورە لە نێوەڕاســـتی هەڵتۆقیبوو، دەرگەی لێ کردینەوە، باوکم ڕاستەوخۆ پێی گوت:

- شـێخ بمانبوورە کاتێکی خراپ هاتین، پشـوومان لێ تێکدایت، بەڵام لە شاری ئیشبیلیا بۆ غەریبەیەکی وەک من ناخۆشە کوڕە تاقانەکەی لە وەرگرتنی زانست و نووری تۆدا بێبەش بێت.

- کوڕەکەم! نوور، هەر نووری خودایە. حەلقەی دەرســـمان زۆر بەرتەنگ بووە. ئەگەر منداڵ زۆرتر بن، گاڵەگاڵ دەکەن و دەرس کەڵکی پێوە نامێنێت. خۆ لە مزگەوتەکانی دیش حەلقەی دەرس و دەور هەن.

- یا شێخ! خودا نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتویت. من متمانەم بەتۆ هەیە. خەڵکانێک لەم شـــارەدا هەن بە خێچەخێچ بە زمانی عەرەبی دەدوێن، بەڵام کوڕەکەی من، عەرەبێکی ڕەسەنە. بەو ئومێدەی جێی بکەیتەوە، تا ببێتە خزمەتکار و پەیمانپارێزت.

- باشە، قەیناکە.

لەپاشا لای بۆ کردمەوە و گوتی:

- کوڕی شیرینم! بەیانی لە حەلقەی وانەکەمان ئامادەبە.

## ١١

**"هەر هونەرێك کەڵکی زانستی پێوە نەبێت، هیچ بایەخێکی نابێت"**
**ئیبن عەرەبی**

ڕووبەری ماڵە نوێیەکەی ئیشبیلیامان لە هیی مورسیە کەمتر بوو، بەڵام بیناکەی نوێتر و هەواکەی پاکتر بوو. لە شاخ زۆر نزیک بووین، ویقەویقی چەقەڵ هەترەشی هەردوو منداڵەکەی بردبوو، باوکم دڵی دەدانەوە و ترسی دەڕەواندنەوە: " ئێوە لە ویقەویقی چەقەڵێکی بەستەزمان تۆقیون لە حاڵێکدا خەریکی تەسبیحاتی خودایە؟" بەم جۆرە دڵی دەدانەوە. منیش بیرم لەو ژیاندار و گیاندارە دڕندانە دەکردەوە، کە ئێستە وەک ئەولیای خودا، دڵسۆز و لێبڕاوانە بە ئێوارە و بەیانیان لە دەوروبەرمان سەرگەرمی زیکر و تەسبیحاتی زاتی هەقن.
ژوورەکەم ڕوو لە خۆرهەڵات بوو، وەختێک بەیانیان تیرێژی خۆر لێی دەدا، خەوی زۆر ناخۆش و ناحەز دەبوو. پیرەژنێکی کەنفت و خەڵەفاو، لە خانوویەکی بچووکی بەردەم پەنجەرەکەم بوو، هەرگا پەنجەرەم دەکردەوە، دەستی بە بۆڵەبۆڵ و فڵتەفڵت دەکرد و هیچی لێ تێ نەدەگەیشتم. هەندێک جار هاواری دەکرد و ناوکی میوەجاتی تێ دەگرتم. ڕاستییەکەی من لێی دەترسام، بەدەگمەن نەبووایە

پەنجەرەم نەدەکردەوە. باوکم بەتەنێ ژوورێکی هەبوو، دایکشم لەگەڵ دوو منداڵەکەی لە ژوورێکی دی بوون. لە خوارەوە، حەوشەیەکمان هەبوو، گۆمێکی لاکێشەیی گەورەی لێ دروست کرابوو، زۆرینەی حەوشەکەی گرتبوو. گۆمەکە قووڵییەکەی کەمتر لە بستێک بوو، بە خشتی سوور و شین، کە هێندەی پەنجەی دۆرەدرێژە دەبوون، هەڵنرابوو. من خەریکی هەژمارکردنی خشتەکان دەبووم، کە دەمبینی ژمارەیان لەنێوان دوو هێڵی ناتەریبدایە، بێزار دەبووم و وازم لێ دەهێنان. هەرچەند شار لەژێر پرتەقاڵ و زەیتوون دالەنگابوو، بەڵام ئێمە هیچمان نەبوو، با ئەوەیش بڵێم: پرتەقاڵی ئیشبیلیا تاڵ و تفت بوون و وەک هی مورسییە خۆش و بەتام نەبوون. لەتەک شوورەکەمان دارمێوێک هەبوو، لەتەنیشت ویش بەهێیەک ڕوابوو، لە لایەکەی دیکەیش دارسنەوبەرێکی گەورە بۆ ئاسمان هەڵکشابوو، ماڵی ئێمەی پێ دەناسرایەوە. سەرەتای هاتنمان بۆ ئیشبیلیا بەهۆی ئەم سنەوبەرە کەڵەگەتەوە ماڵی خۆم دەدۆزییەوە. سەلووم بۆ ئەوەی مشەقەتی هاتوچووی بازاڕی لەکۆڵ بێتەوە، باخچەی ماڵەوەی بە چەندان شتی جۆراوجۆر داچاندبوو، هەر لە تەماتە و لیمۆ بگرە تا مارچێوە و شتی تریش.

باوکم لەژێر دارمێوی باخچەکە، جێگەیەکی بۆخۆ چێ کردبوو، زۆربەی ڕۆژانی ساڵ، کەشوهەوا خۆش بووایە، لەوێ دادەنیشت. لەوێ دەینووسی و دەیخوێندەوە، پێشوازیی لە مێوانان دەکرد، هەندێک جار نانیشی هەر لەوێ دەخوارد. عەبدوسەمەد بازرگانی مەڕومالات بوو، لەوێ زۆر دەگەڵ باوکم دادەنیشت، ئەو لەنێوان ئیشبیلیا و (ئیستیجە) کاری بازرگانی دەکرد و لە ماڵی زاواکەی دەمایەوە. دەهات لە دەرگەی دەدا، ئەگەر لەوێ نەبووایە دەڕۆیشت. باوکم چەندجار لەکنی، گلەیی لە مەغریبییەکان کرد:

- دووسـێ ڕۆژبوو شـتێکم لە دڵدا دەهات و دەچوو، کەس نەبوو لەو بارە کۆمەکم بکات، دوای ئەوەی شـتەکە لە کۆتایی نزیک کەوتەوە، بەر لە من چوونە لای والی و پێیان گوت.

عەبدوسەمەد بە نابەدڵی سەری خۆی لەقاند و گوتی:

سوبحانەڵڵا! ئەوانە پەرتەوازەی بیابان بوون، هیچ شتێکیان بەدەست نەبوو، کەچی ئێستە بوونەتە کەڵەگا و مشوورخۆر.

باوکم زەندەقی لەو قسانە چوو، هەڵی دایەوە و گوتی:

- نا، نا، راسـتییەکەی ئەوان کەسـێ زۆر نایابیان تێدایە. هەر ئەوان بوون ئایینی ئیسلامیان سەرخست، دادگەرییان بەرپاکرد، خەلیفەیش لەپێش هەموویانەوە...بەس هەشـیانە مافی ئەندەلوسـیەکان پێشـێل دەکات و سووکایەتییان پێ دەکات.

- وا دەزانن ئێمـەیان لـە هـەلاکـەت و تێچوون ڕزگار کردووە، بەڵام هـەر لـەو ڕۆژەوەی دەوڵەتی خەلافەتی ئەندەلوس کەوتە سـەرپێ، ئەوان بەدوای قووت و کاری خۆیانەوە بوون.

باوکم سەری لەقاند و تاوێک بێدەنگ بوو، ئینجا گوتی:

- وەها بە زمانی (مەسمووودی) قسـە دەکەن، هەر دەڵێی لە جەرگەی بیابانەوە کۆچیان کردووە! خودا شـایەتە چەند جار گوێم لە خەلیفە گرتووە، قەت بەم زمانە قسەی نەکردووە، هەرچەند باشیش دەیزانێ، بـەڵام حـەز نـاکـات پێی بدوێت، ئـەو بـە عـەرەبیەکی ڕەوان قسـان دەکات، وەک ئەوەی عەرەبی دەشتەکی بێت!

- ئاخر ئەوان نایانەوێـت کەس تێیان بگات و کەس لە ئاینوئۆینیان سەر دەربکات.

بـە هـەرحاڵ، دوای ئـەوەی باوکم ئاگری تووڕەیی دامرکاندەوە و بە بزەی خستەوە، عەبدوسەمەد هەستا و ڕۆیشت.

ڕۆژ بـە ڕۆژ کارەکانی باوکم زیاتر دەبوون، تەنانەت هێندە جەنجاڵ بووبوو، هیچ کاتێکی وای بە دەسـتەوە نەمابوو کە لەنێو باخچەکە دانیشـێت. نانی ئێوارە و بەیانیانی لە کۆشـک دەخوارد، هەرچییەکی

پێ سپاردرابایە، بە پێخۆشبوون یان پێناخۆشبوون، دەبوو بی کات، هەر لە هاوەڵایەتی والی بۆ شوێنی کارکردن و تۆمارکردنی هەرچییەک، کە فەرمانی پێ بکرێت، تاکوو دانانی بەشەئالیکی ئەو ئاژەڵانەی بۆ خانووبەرە و بیناکردن بەکار دێن.

کاتێک لە خۆرهەڵاتی مەغریب و باشووری ئەندەلوس چەندان شار و قەڵا و قەڵاتیان فەتح کردن، پارە و پوولێکی زۆریان بۆ خەزێنەی موەحیدەکان هاورد، ئەوسا ئارەزووی خەلیفە بۆ بیناکردن زیاتر بوو، سەرقاڵی و جەنجاڵیی باوکم هێندەی تریش زیادی کرد. بۆ ئەو مەبەستەیش چەندان وەستا و کورەچی و دارتاشیان لە فاس و مەراکیشەوە هێنا، هەروەها چەندان ژمێریاریان بۆ سەرپەرشتیی کارەکان و خەرجکردنی پارە و دارایی، دامەزراندن. بۆ تەواوکردنی مزگەوتی (قەصبە) و دروستکردنی پردی نێوان ئیشبیلیا و بوتریانە دەستبەکار بوون. دواتر (ئیبن باسە)ـی ناوداریش گەیشتە ئیشبیلیا، دروستکردنی کۆشکی دەریاچەکەیان خستە ئەستۆ. لە قەڵای جابر ئاوی بۆ ڕاکێشا، هەنار و سێوی غەرناتەی لەو کۆشکە ڕوواندن. پاشان باخێکی فراوانی کۆشکی بۆ درەختی دارتوو تەرخان کرد، ئەمەیش بۆ بەرهەمهێنانی کرمی ئاوریشم.

بیناکردن و بنیاتنانەوە، هەموو ئیشبیلیای گرتەوە. تەنانەت گەڕەکە هێمنەکەی ئێمەیش، بەیانیەک بەدەم دەیان وەستا و کرێکار وەخەبەر هات، قەدەداری درێژ و قورسیان هەڵگرتبوو، بەرەو ناوچەی (پیشەسازیی کەشتییان) ڕێیان گرتبوو، دیارە خەلیفە فەرمانی فراوانکردنی ئەوێی دەرکردبوو.

کاتێک بۆ وەرزشکردن دەچووینە نزیک ڕووبارەکە، یان ڕۆژانی هەینی، کە بۆ مەلەکردن دەڕۆیشتینە ئەوێ، ئەم شوێنەم دەبینی. هاوینێک باوکم بڕیاری دا فێری مەلە و ئەسپسواری و تیرهاوێژیم بکات. سەرەتا ویستی فێری مەلەم بکات، ڕاستییەکەی من هەر لەو وەختەوەی حیکایەتی(نورمان)ەکانم بیستووە، کە لەو ڕووبارەوە

هـاتوونـه دەر، ڕقم له مەلەکردن دەبێتەوە... بەڵام بەهەر حاڵ، دەبوو فێری مەلەکردن بم. سـەلووم لەسـەر ڕێنمایی دایکم، بە موویش لە من دوور نەدەکەوتەوە، ئاگای لێم بوو و هەمیشە بە دەورمەوە بوو. ڕووباری ئیشبیلیا ساردبوو، بەردەکانیشی تیژبوون، بە پێچەوانەی ڕووباری (شـقورە)، کە هێمنتر دەهات و ئاوەکەیشـی کەمتر بوو. باوکم بانگی کردم: " لێرەوە خۆت هەڵدە و تا ئەو ڕاستە بڕۆ." پاشان ئاسنێکی فڕێ دایە ناو ڕووبارەکە و گوتی"بیهێنەوە."

ئەو شێوە فێرکارییەی ئەو بۆ من بەردەوام بوو، بەڵام هیچ کەڵکێکی نـەبوو. ئاخر ئـەمن لـە بنچینەوە ڕقم لە مەلەکردن بوو، سـاردی و پیسـی ئاوەکەیش هێندەی تر بێزار و بێحاڵیان کردبووم. باوکم هەر ئـەوەنـدەی دەزانی، کـە خۆهـەڵدانـە نـاو ئـاو، واتـا مـەلـەکردن لـە مـەلـەکووتی خودا و فێربوونی تیرهـاوێژیش، یـانی قسـەی هەق لە شـوێنی ترسـناک و سـەخت. هەروەها فێربوونی ئەسـپسـواریش، سـەفەر و گەڕانە بەدوای زانسـت و زانیاری. باوکم هەر لایەنە ڕووکەشـەکەی وەرگرتبوو، خودایش لایەنی پەنهانیی بۆ ڕۆشـن کردمـەوە. بـاوکم بۆ کـارێک پەلکێشـی کردم، نە حەزم لێی بوو، نە نەتواناشیم بەسـەریەوە هەبوو، ڕۆژێک لەو سسـتی و خاویەی من، تووڕە بوو! پێی گوتم مـادەم خـاوەخـاو دەکەیت، شـەرت بێ دەبێ لەوبەر بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە بپەڕیتەوە. گریام و خۆم بە قوربانی کرد، لێ ئەو لەسـەر قسـەی خۆی هەر سـوور بوو. شـەپۆلی ئاو و سـاردییەکەی منیان تاسـاندبوو، باوکم لەسـەر ڕۆخی ڕووبارەکە وەسـتابوو، دەسـتەکانی لەسـەر سـنگی دەبەر یەک وەرینابوون، بە ڕوویەکی گرژ و مۆن لێم ڕامابوو. بە مـەلـە تا نیوەی ڕووبارەکە ڕۆیشـتم، قاچەکانم شـل و بێهز بوون، زۆر کۆشـام سـەرم لە دەرەوەی ئاو بمێنێتەوە... لە کۆتاییدا گەیشـتمە ئەوبەری ڕووبارەکە و لە ئاو هاتمە دەر، باوکم دەنگی دامەوە و بەردی تێگرتم، دیسـان خۆم هـەڵداوە نێو ئاو، شـەکەت بووم، لە سـەرمان هەڵدەلەرزیم.

نەختێکی دی مەلەم کرد، وام هەستم کرد شەپۆلی ئاو لەگەڵ خۆی بردم. سەلووم و باوکمم بە ئاماژە ئاگادارکردنەوە، ئەوانیش خێرا هاتنە لێواری ڕووبارەکە، سەلووم خۆی تێ هاویشت و گرتمی و هێنامیە دەرەوە. باوکم بۆ ماڵەوە پێشمان کەوت و یەک تاقە قسەیشی لەگەڵدا نەکردم. ئەمن لە سەرمان و لە ترسان لەرزم گرتبوو. قەمیسەکەم بەرزکردەوە و سەرمم پێ داپۆشی، بە لارەلار دەڕۆیشتم، قاچەکانم تریوەیان دەهات و چاوەکانیشم ڕێیان بەدی نەدەکرد. مووچڕکی سارد، پشت و شانیان وێکهێنابووم. دوای ئەوەی لەرزێکی توند هەموو جەستەی داگرتم، هەستم کرد تەڕاییەکی گەرم بەنێو قاچەکانمدا دێتە خوارەوە، ئیتر لەوە زیاتر خۆم پێ نەگیرا و میزم پێدا هاتە خوار، قاچم لە ڕۆیشتن کەوتن، سەلووم لە کۆڵی کردم و تا نە گەیشتینەوە کۆڵانەکەمان و سنەوبەرەکەم لێ دەرنەکەوت، وەهۆش خۆم نەهاتمەوە.

## ١٢

**"ئای لە بێداریم وای لە بێداریم!"**

**ئیبن عەرەبی**

هەناسـەم لەخۆ بڕیوە و بەنێو تووڵەڕێ و کووچەکانی ئیشـبیلیادا بە گورگەلۆقە ڕێ دەکەم. دەڕۆمە نێو هەر کووچەیەک، مەودای نێوان تیشـەبەردەکانی فراوان دەبێت. خلیسـک دەبەم و قیت دەبمەوە، لە ڕاکەڕاک بەردەوام بووم تاکوو کەلێنی نێوان هەر بەردێک، لەگەڵ بەردێکی دی، بەقەد پێیەکانی من شـاش بوون، ئیتر منیش لە گۆڕەپانەچۆلەکان ڕام کرد، خۆم لە شـوێنی بەردەڵان دوور گرت. دواتر ڕێگەم زۆر لێ تەنگ و تەسـک بووەوە، قاچەکانم لە ڕێکردن کەوتن. بە تەواوی لە ڕۆیشـتن بێزار و دەسـتەوسـتان بووم، ڕاسـتییەکەی ئەم ڕێگەیە بووە کۆت و بەندی من. ئاو لە کون و درزەکان دەربووەوە، سـەرەتا تا قولەپێم هات، دوایی گەیشـتە قاچ و ئەژنۆکانم. ویسـتم بەسـەر ڕوومدا بکەوم و مەلە بکەم، ئاو لە دەم و لووتم وەلابنێم، لێ تەنگەنەفس بووم و خەریک بوو بخنکێم. پێیەکانم توند و تۆڵ کردنەوە، ویستم لەو کۆت و بەندە بەردینە خۆم دەرباز بکەم، تیمسـاحێک توند کلکی لە قاچم لوول دا. لە ئاسـۆشـەوە کەشتیگەلی (نۆرمان)ـەکانم هاتنە بەرچاو، سەریان لە وێنەی ئەژدیها بوو، لەسـەر بەڕێکی ئاگرین دەڕۆیشـتن و لەمن نزیک دەبوونەوە،

ســەرنشــینەکانی بە تێلا و دارعەســاکانیان لە دوورەوە هێمامیان بۆ کردم. بە نابەدڵییەوە شانم وەبەر ئاوەکە داو بۆ ئەولا و ئەملام وەلانا، ئەمەیش بە ئومێدی ئەوەی ئاگری بە گڕی ژێرەوەیان خامۆش بکەم. پەنجەکانم لەنێو ئاو دەرهێنان، بینیم وەک تۆپەڵەســووفێک تێکهاڵاون. درکم بەوە کرد ئیتر کار لە کاران ترازا و ئەمڕۆ دەبێ تاڵاوی مەرگ بنۆشم. بە کۆشــان و زەحمەتێکی زۆرەوە ئەو وشــانەم بیرکەوتنەوە، کە لەپێش مردنـدا دەگوترێن. گەردەلوولێکی چڕوپڕ، لەنێو کاســـەی ســـەرمدا لوول دەخوات، لە هەر ســـووچ و گۆشـــەیەکی ئەفکاری وشکهەڵاتوومدا، گێژەڵووکێکی چکۆڵە دروست بووە. ئاوەکە داکشا و ڕووپەلی زەمین دەرکەوت، بەســـەر ڕوودا کەوتم، گوێم لە تەپەتەپی پێڵاویان بوو لێم نزیک دەبوونەوە. من ئێســـتا تەواو لە بزە و بزاو کەوتم. گۆناکانم بەنێو خۆڵدا چوون، چاوەکانم، دوورتر لە لووتم نابینن. قاچگەلێک لەبەردەممدا چەقیون، هەتا بڵێی نینۆکی پەنجەکانیان دزێو و پیســن و دەوریشــان ڕەش و چڵکنە. زانیم کەسێک لەبانمەوە وەســتاوە، خەریکە بە دارعەســاکەی ســەرم هەپروون بە هەپروون بکات. ســەرم لەنێو شــانەکانمدا متبووە و چاوەنواڕی کوتکێک دەکات، کەچی نەک هیچ شــتێک ڕووی نەدا، بەڵکە عەبایەکی کەتانیم پێ دادرا، ســـووکەڵە بوو، بەڵام گەرم بوو. عەبایەکەم تەواو بەســـەر خۆمادا هەڵکێشـــا و خۆم کڕ کرد، نۆرمانەکانم بینی بەرەو شـــوێنێکی دوور ڕایان دەکرد، زەندەقیان چوو بوو، وەسەر کەشتییەکانیان هەڵدەچوون و بەســەر یەکدا بەردەبوونەوە. وا هاتە بەرچاوم قاچ و شــانەکانیان بە چەند مەنجەنیقێک بەردباران دەکرێن، قاچیان دەپێکرێت و شـــانیان دەشــکێت، لەبەر ئازاری بەســوێیان گریە و ناڵەناڵیان بوو. ئاوڕێکم بۆ دواوە دایەوە تا ماخۆی عەباکە ببینم، فەرماندەیەکم بینی، ئادگار و سیمای لام ڕوون نەبوو، شانوشەپێلک پان بوو، هەر دەتگوت لەژێر عەباکەدا، زرێی بەســتبێ. بە شــمشــێرەکەی هێمایەکی بۆ نۆرمانەکان کرد، مەنجەنیقەکان لێیان دەربوونەوە و ورد ورد کوتانیان... پاشـــان

شـــمشـــێرەکەی نزم کرد و مەنجەنیقەکان بۆردوومانیان وەســـتاند، دیســـــان ئاماژەی بۆ کردنـەوە و مـەنجەنیقەکان پرژاندنیانەوە. دواتر لـەنێو جـەرگـەی جـەنگدا لایـەکی بۆ کردمـەوە و بزەیـەکی هـاتێ، هـەر دەگەڵ بزەکە، ددانەکانی دەرکەوتن، ئەوســـا ئەگەرچی تەقوتۆق هەر بەردەوام بوو، بەڵام کەم بووەوە.

لـە ئـاســـمانـەوە دەنگی هێندێک منداڵ هـات، لـە دەوری شـــێخێک خڕبووبوونـەوە و خـەریکی خوێندنی قورئـان بوون، پـاشـــان دەنگی شـــێخەکەیان بەســـەر دەنگی وان بەرز بووەوە، ئەویش دەســـتی بە قورئـان خوێندن کرد: (إنـا نحن نحيي الموتى ونكتب ما قدموا وآثارهم وكل شـــيء أحصـــيناه في إمام مبين) ڕێک خۆم بەســـەر پێیانەوە بینییەوە، هەر دەڵێی لە گۆڕ هەســـتابوومەوە، بەرەو نورمانەکان ڕێم کرد، ئـەوان شـــەل و کوت بووبوون، بەملا و ئەولادا دەهاتن، هێز لە دەســت و قاچ و جەســتەیان نەمابوو، لەگەڵ جەنابی شـێخ دەسـتم بە قورئانخوێندن کرد: (... وإن نشأ نغرقهم فلا صريخ لهم ولاهم ينقذون) لێـیـان نزیـک کـەوتمـەوە، بـە تیلـەچـاوی ئومێـدەوە دەیـانڕوانی و هـاتوهـاوار و نـاڵـەنـاڵیـان بوو، دەمیـان هێنـدە بـەش بووبووەوە، مـەرجوومـاتی مـەنجـەنیقیـان تێوە دەچوو... بـەخێرایی ڕێم کرد، هـەر دەڵێی بـازەبازم دەکرد، ئـایـەتی (اليوم نختم على افواههم...) خوێندەوە. پاشـان لای سـەری یەکێکیان وەسـتام، قاچی خۆی شـەتەک دەدا و لەبەر ئازاری زۆری، لێوەکانی دەکرۆشـتن: (وتشـهد أرجلهم بما كانوا يكسبون) دوایی بە جورمانی دواندمی، بەڵام هیچی لێ تێ نەگەیشتم، هەر بە قورئان وەڵامم دایەوە: ( .. فلايحزنک قولهم إنا نعلم ما يسرون وما يعلنون) ئاو هەسـتا، ئەوانی بە کەشـتییەکانیانەوە دوورخسـتەوە... منیش چاودێریم کردن، بینیم ڕووبارەکە بەرەو دەریای بردن و هەڵی ڕشـــتن، یـەک بـە قورگی خۆم هــاوارم کرد: (وامتــازوا اليوم ايهاالمجرمون). پاشـــان ئاوەکە وشـــک بوو، ڕێگە ئاچووغ بووەوە، بەری ئاســـمان هێندە فراوان بوو، زەوی وەک مەلۆتکەیەک وابوو لە

باوەشـیدا. تەماشـام کرد فەرماندە لەتەکمەوە وەسـتاوە و لە ئاسـۆ ڕاماوە. گوتم: " مامە تۆ کێیت؟" ئاوڕێکی لێ دامەوە و بەم شـێوە وەڵامی دامەوە: ( یس. والقران الحکیم إنک لمن المرسلین) . باوکم ئەو ئایەتانەی خوێندنەوە و منیش هەوڵمدا چاوەکانم بکەمەوە، بینیم چوارمەشقی لەکن سەرم دانیشتووە و دەستی لەسەر تەوێڵم داناوە، تاکوو جارێکی دی قورئانم بەسـەردا بخوێنێتەوە، چاوەکانم لێک نانەوە: (علی صراط مستقیم. تنزیل العزیز الرحیم لتنذر قوما ما أنذر آباؤهم فهم غافلون). خۆم مت کرد، تاکوو باوکم تەواوی سـوورەتەکەی بەسـەردا خوێندمەوە، نەک تەنیا جارێک، بەڵکە چەند جارێکی دیکە، بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکات، کە من دەمێکە وەهۆش خۆم هاتوومەتەوە. ڕۆژانی داهاتوویش هەموو بوو بە خوێندنی سـوورەتی (یاسـین)، بەیانیان و ئێواران هەر یاسـین بوو. ئەمن لە دڵەوە ئەو سـوورەتەم دەخوێندەوە، هەر دەڵێی پێشتر قەت دەمم لێی نەگێڕابوو و بە حەوت قیرائەتەکەیش نەمخوێندبووەوە. ڕاسـتییەکەی بە هەموو سـەر و بەر و بۆر و ئیزهار و ئیقلاب و غوننەیەکی ئاشـنابووم، لێ ئەوجارە تەنیا سـوورەتێک نەبوو، بەڵکە نامەی خودا بوو بۆ دڵی من هات، چرای نوور و ڕێنوێنی ڕێگەم بوو. هەموو مژدە و هەڕەشـەکانی بۆ من بوو. دەبێ بە درێژایی تەمەنم لە دەوری شـوورەی ئەو سـوورەتەدا بێم و بچم، لە خودام داوایە ڕازەکانیم بۆ دەربخات، دەرگاکانیم بۆ والآ بکات، بۆ ئاشـنابوون بە قووڵاییەکی کۆمەکم بکات، لە قۆناخبەندییەکەی تێم بگەیێنێت. خودا کلیلی سوورەت و دەرگەی قورئان تەنیا بەو ئەولیایانە دەدات، کە باش ئەویان ناسیوە، عاشـقانە خۆشـیان دەوێت و ئەوینداری ڕێگەی ئەون. خودا چۆنی بوویت وا سـاز و تەیارم دەکات. ئیتر لەرز و تا یەخەی بەردام و سوورەتی (یاسین)یش لە سینەمدا ماکی گرت و مایەوە.

## ١٣

**"خورپەی یەکەمی دڵ بە هەڵەدا ناچێت"**

**ئیبن عەرەبی**

لەنێو خەڵکدا وا بڵاوبووەوە، کە ڕۆحانییەتی ئەسقووف ئیسیدۆری ئیشبیلی لە مزگەوتی (ئیبن عەدیس)ـدایە، گوایە بەردێکی گڵکۆکەی، بۆ دروستکردنی منارەکەی بەکارهاتووە... هەر لەبەر ئەوەیشە بانگدەرەکانی، یەکبەدوای یەکدا دەمرن.

پاش ئەوەی کۆشک چیتر موئەزینی نوێی بۆ ئەو مزگەوتە دانەمەزراند، چەند دەنگخۆشێک، خۆبەخشانە دەهاتن بانگیان لەنێو دەدا. ئەو کۆنە مزگەوتە، هەفتە دوای هەفتە بە نوێژکەران جەنجاڵتر دەبوو، گەلێک جار ئەگەر لە بەیانی زووەوە لەوێ نەبووام، ئەوە بە ناچاری دەچوومە ژێرزەمینەکە نوێژم دەکرد، بەڵام مامم چاوەڕێی دەکرد تا ڕیزی نوێژکەران دەگەیشتە بەردەم دووکانەکەی، ئەوسا بەبێ ئەوەی هەنگاوێک بچێتە پێش، بەرماڵەکەی ڕادەخست و لەگەڵ ئەواندا نوێژی دەکرد. گوێی لە وتارەکە نەدەبوو، ڕاستییەکەی هەر گرنگیشی بەمە نەدەدا. دەنگی (الله أکبر) بەباشی نەدەگەیشت، بەتایبەت ئەگەر ڕەشەبا بوایە، یان باران لە لەسەروو هەنوانی پێش دووکانەکانی بدایە، کە بۆ سێبەر لە ڕێڕەوی دووکانەکان دورستیان کردبوون، کەس گوێی لە ئەڵڵاهوئەکبەری مەلا نەدەبوو... چەند

نوێژکـەرێـک ڕیز لـەدوا ڕیز تـەکبیریـان لـە مـەلا وەردەگرتـەوە و دەیانگوتەوە، بەڵام ئەمە بۆ بەشێک لە نوێژکەران تەواو جیاواز بوو، کە مەلا لە ســوژدەی دووەم هەڵدەســتایەوە، ئەوان تازە ســوژدەی یەکەمیان دەبرد، هێشتا ئەوان لەنێو هەردوو سوژدەکەدا بوون، مەلا ســەلامی دەدایەوە، نە ســوژدەیان پێ دەبرا و نە تەحیاتیشــیان پێ دەخوێندرا.

بەدرێژایی ڕۆژ، لـەنێو قـەرەباڵخیی ئـەو مزگـەوتـە پڕ لـە دەرس و دەورە دەمامەوە. ئەگەر برسی بوومایە دەچوومە لای مامم، ئەویش هـەرچییـەکی لـە نـان و پـەنیر و میوە لا بوایـە دەیدامێ. وام لێهاتبوو هـەموو بـەیانییـەک دەچوومـە کنی، ئـەویش زۆر کـەیفخۆش دەبوو، ئـاخر بـەم دوایانـە، کوڕەکـانی خـەفـەخـان و پیریـان کردووە، هـەر بۆیەش کەیفی بە چارەی وان نەدەهات. نە کار و بازرگانییان لەگەڵدا دەکرد، نە لە دووکان هاوکارییان دەکرد، ئەوان لە کەیف و ســەفای ئیشــبیلیا نغرۆ بووبوون. لەســەر کەناری ڕووبارە گەورەکە بێ کار دەســـووڕانەوە، خۆیان لەو ژنە قشـــتالییانە مات دەدا، کە پەچەیان لادەدا و هیچ جلێکی وایـان لـەبـەردا نـەدەمـا. زۆربـەی ئـەو ژنـانـە مێردیان بە پیاوێکی عەرەب کردبوو، ئەمەیش بۆ ئەوەی هەر کاتێک موســڵمان و قشــتالەکان تێکگیربوون، هەر لە ئەندەلوس بمێننەوە و نەبنە سەبایە و دوورنەخرێنەوە.

دواتر هـەر بـەڕاســـتی کوڕە مـامـە گەورەکەم کەوتە داوی کچێکی قشـــتالی. بـاوکم کـە بـەوەی زانی زۆر تووڕەبوو، ئـەو ڕۆژە بـە ڕوویەکی گرژومۆن لە کۆشـــک هاتە دەرەوە، ڕێک بەرەو دووکانی مامم هات، منیش ئەو کات لەوێ بووم، پێی گوت:

- برا دەتـەوێـت چیمـان پێ بکـەیـت؟ دەتـەوێـت پێمـان بگوترێـت بێ ڕەچەڵەک و ڕیشە؟

هەورێکی لێڵ و چڵکن، ســـەروســـەکووتی مامی گرتبوو، وەڵامی نادایەوە، باوکم نەیبڕیەوە:

- کچەکەت بە زڕەموسـڵمانێک دا، بە هەرحاڵێک بوو قبووڵمان کرد، بەڵام ئەگەر کوڕەکەت هاوژینیی دەگەڵ کچە گاورێکی قشـتالییدا بکات، خەڵک چیت پێ دەڵێن؟

- مامم بە دەنگێکی ماندوو و بێزارەوە وەڵامی دایەوە:

- وازم لێ بێنە عەلی. من بە هیچ شـێوەیەک بەو هاوژینییە ڕازی نیمە، بەڵام ئەو پەکی لەسـەر ڕەزامەندیی من ناکەوتووە. ئەگەر بەگوێی کردبام ئێستە لێرە لەو دووکانە، لەگەڵ مندا کاسبی دەکرد.

باوکم دەستەکانی پێکدادان و نەختێک هێوربووەوە و گوتی:

- یانی هیچ شتێک ناکەیت؟

مامم لە جێگەکەی هەستا، کاسەکەی لە کوپەکە پڕ ئاوکرد و بێوەی تەماشای باوکم بکات گوتی:

- ئەگەر تۆ شتێکت لەدەست دێ، فەرموو بیکە، دەی ئەوە کارەکەم دایە دەستی تۆ.

ڕاستییەکەی باوکیشم هیچی پێ نەکرا، زەماوەندەکەیان کۆتایی هات و لەبەرچاوان ون بوون، تەنانەت کەس نەیزانی لە ئیشبیلیا ماون یان دەرچوون. کچە گەورەکەیشـی ڕۆژێک بە ڕاکەڕاک گەڕایەوە ماڵەوە و بە هاتوهاوارەوە گوتی: "فریام کەون، کەسێک ڕاوم دەنێت." دەروجیران هاتنە دەرەوە، چەندە ئەولا ئەملایان کرد کەسـیان نەدۆزییەوە، ڕێگە چۆلوهۆل بوو. ڕۆژێکی دی، ماسـییفرۆشـێک بۆ فرۆشـتنی ماسـییەکانی لە قاپییەی دەرگە دەوەسـتێت، کچە دێتە دەرەوە و سـەرکەبزووتێکی پێوە دەنێت، کابرا ئازاری پێ دەگات و هاوار دەکات، کچەیش بەسـەریدا دەقیژێنێت. خەڵک لێی خڕدەبنەوە، دۆتمامەکەیشم دەڵێت: "کوڕی قەحپەی دەستدرێژییم دەکاتە سەر."

بەرەبەرە ڕەفتاری دەگۆڕێت، تا وای لێ دێت وەسـوەسـە کۆنترۆڵی دەکات، لاجانگەکەی خۆی داخ دەکا و پشـتەملیشـی قۆرت قۆرت دەکات. پەنجەرەی ماڵەوە بە تەختەدارێک دەگرێت و لەنێو باولەی

جلکان دەخەوێت، ئەمەیش نەبادا زیندەوەرێک پێوەی بدات. وێڕای ئەمانەیش، دەست بە قسەی هەلەق و بەلەق و ورێنە دەکات.
بەهەرحاڵ، ئەو ئاکار و ئادگارە گوێنەدەر و کەمتەرخەمانە، کە ڕووی مامیان دەردەخست، لەبەرچاوان ونبوون، ماسکێکی قەترانی گرژ و تەنگ، جێی ئەوانی گرتەوە. ئەوسا مامم خووی بە مەیخواردنەوە گرت، زۆربەی ڕۆژان دووکانەکەی لەسەر خۆی دادەخست و تا مەست دەبوو دەیخواردەوە، هەر لەوێش دەخەوت و نەدەگەڕایەوەماڵەوە. دووکانەکەی خۆی بە تەوای پشتگوێ خستبوو، خۆ من دەمزانی ئەوانەی لەنێو فەخوورییەکانی سەر ڕەفەکان دانراون هەر دەبەی زەیت نین، بەڵکە زۆربەیان شەڕابن. ڕاستییەکەی ئەو نەیدەزانی بەمە دەزانم، تاکوو ڕۆژێک دایکم تووشی سەرئێشە بوو. بۆ چارەسەری هەرچی دەرمان بوو تاقی کردەوە: سەری خۆی بە مولاس جوانجوان چەور کرد، پێیەکانی خستنە نێو گولاو. دووکەڵی دەیان گیادەرمانی گرانبەها و هەرزانی هەڵمژی. بە ئاوێکی سوێری ئاوێتە بە زەیتی داربی خۆی شوشت، دواتر جوان خۆی بە هەتوانێکی گیراوە بە زەیت و خۆڵەمێش، چەور کرد. دووجار حیجامەی کرد، بەڵام سوودی نەبوو. مانگی ڕەمەزان ناردمی بۆ لای مامم:
- موحی بڕێک (شۆنیز) و دەبە زەیتێکم بۆ بێنە.
منیش ڕۆیشتم و چوومە دووکانەکەی، بێ سلاوکردن وەژوورکەوتم، دیتم مامم بادەیەکی سووکەڵەی بەدەستەوەیە و خەریکی مەینۆشییە. بە ترسولەرزەوە کشامەوە، ئاخر بەو ڕەمەزانە پیرۆزە مەیخواردنەوە مانای چییە؟ ئەو منی نەبینی. پاشان نەختێک کشامەوە و لە دەرەوە بانگم کرد، هەروەک ئەوەی تازە هاتبم و ئاگام لە هیچ نەبێت، ئەویش ڕووخسەتی چوونە ژوورەوەی پێ دام. من شۆک بووبووم، بەو ڕێکەوتە کتوپڕە سەرم سووڕی دەخوارد، ڕاستییەکەی نەمدەزانی چی بڵێم.

- دایکم شۆنیزی سپی دەوێت.
- چیت گوت؟
- شۆنیزی سپی.
قەیرێک بە سەرسوورمانەوە لە دەموچاوم ڕاما و دواتر لە تریقەی پێکەنینی دا. ئینجا لیفکەیەکی سەرشۆرینی تێ گرتم و لە تەپڵی سەری دام.
- مامە بەچی پێدەکەنیت؟
- بە نەزانیی تۆ! شۆنیز کوا سپییە؟
بەم ڕەفتارەی مامم تووڕەبووم، ئاخر کەی ماقووڵە کەسێک بەو ڕەمەزانە ڕۆژوو بشکێنی و مەی فرکات، هەر لەبەر ئەوەی شارەزاییم لە شتێک نییە گاڵتەیشم پێ بکات! ئاگام لە خۆم نەما و بە ڕوویدا تەقیمەوە:
- من بە نەزانینی ڕەنگی شۆنیز، هیچ زیانێکم لای خودا پێ ناگات، بەڵام ئارەزووبازی و غەفڵەتزەدەیی تۆ لەکن خودا گوناهبار و زیانبارت دەکات. بەرلەوەی بزانم کاردانەوە و هەڵوێستی ئەو چی دەبێت، هاتمە دەرەوە و خێرا بە چاوی بەئەسرینەوە بەرەو ماڵ بوومەوە. تووڕەیی و ماندووبوونم، شۆکبوونم بە فاسقبوونی مامم، پەستبوونم لە هەمبەر ئەوەی بە نەفامی دانام، هەموویان تێکەڵ بە یەک بووبوون. وەک ئەسپی چەمووش بەرەو ژووری دایکم خۆم هەڵکووتا، بینیم لەسەر پشت ڕاکشاوە، سەری پێچاوە و قۆڵێکی لەسەر چاوەکانی داناوە.
- دایە!
بە دەنگی من ڕاچڵەکی و کەمێک سەری بەرزکردەوە و چاوە شەکەت و ماندووەکانی تێ بڕیم، بە دەنگێکی کز گوتی:
- چییە؟ شۆنیزت هێنا؟
- شۆنیزی سپی یان چی؟ چۆن داوای شتێکم لێ دەکەیت، کە نازانم ڕەنگەکەی چۆنە؟

- شۆنیز، کوڕی خۆم شۆنیز، ڕەشکە. نازانی ڕەشکە چییە؟ نابینی ناوەکەی بە خۆیەوەیە؟
کە زانیم دایکیشم خوێ بەسەر برینەکەوە دەکات، شێت بووم، نەمدەزانی چی دەڵێم:
- چۆن بزانم؟ تۆ چیت لە من دەوێت؟ دەتەوێت، کە گەورەبووم ببمە شێخێک لە مزگەوت قسە بۆ خەڵک بکەم، یان ببمە دووکاندار و ڕۆژووی ڕەمەزان بشکێنم؟
- چی بووە؟ کێ ڕۆژووی ڕەمەزانی شکاندووە؟
- عەبدوڵلای مامم، بە چاوی خۆم بینیم مەی دەخواردەوە.
- یا ئیلاهی!
- بەڵێ، بەڵێ، لە ڕۆژی ڕەمەزان.
لەپی دەستی وەتەوێڵی داهێنا و توووند چاوەکانی چوقاندن، سەری خۆی ڕاهەژاند و بە حەسرەتێکەوە گوتی:
- یا ئیلاهی! بەزەیی تۆ! خودایە بیبوورە.
دوای ئەم ڕووداوە، ئیتر نەچوومەوە دووکانی مامم. دایکم ئەگەر کارێکی هەبوایە سەلوومی دەنارد، منیش بۆ ئەوەی سەروفیسالی نەبینم، بە ڕێگەیەکی دیکەدا دەچوومە مزگەوت، با ڕاستییەکەی بڵێم ئەوەم هەموو لە تووڕەییان نەبوو، بەڵکە بەشێکی لە ترسان بوو. ئەمن نازانم مامم ئەو قسانەی منی چۆن بە دڵدا چوون، لەوانەیە چاوەڕێی بینینم بکات و لێم بدا. خۆشبەختانە مامم زوو زوو سەردانی نەدەکردین، پچڕانی پێوەندیی منیش لەگەڵ ئەو، چەند مانگێکی خایاند. هەرچەند ماوەکە زۆرتر دەبوو، زیاتر لە دیدەنی دەترسام. شەوانە خەونی ناخۆشم دەبینی، مامم دەبینی لە چەقی ڕێگەدا شلوکوتی دەکردم، ڕێبواران دەهاتن لەبەر دەستی دەریان دەهێنام.
جارێک باوکم بۆ چەند ڕۆژێک سەفەرێکی بۆ قورتوبە کرد، نامەی خەلیفەی بۆ هەندێک لە زانایانی وێ برد، وەک نەریتی پێشووتری،

کاروبار و مشـــووری ماڵەوەی تەســـلیمی مامم کرد. دوای چەند ڕۆژێک مامم هات، چووم دەرگەم کردەوە، خەریک بوو نەیناسمەوە، لە ماوەی ئەو چەند مانگە پشتی کووڕ بووبووەوە، لە ڕۆیشتن هێندە خۆی دادەهێناوە، دەتگوت کڕنووش دەبات. وەختێک گوتی سەرمامە، بە زوویی فەرمووی ژوورەوەم لێ کرد. ئاوم بۆ برد و لەتەنیشتیەوە دانیشتم، تاوێک بێدەنگ بوو، گوتم:

- مامە چیتە، نەخۆشیت؟

ڕۆندک لە چاوی هاتنە خوارەوە و ڕووی تێ کردم و گوتی:

- ڕۆڵە تەنێ گوناهـەکان ئازارم دەدەن.

شوکر مامم تۆبەی کرد. ئێواران دووکانەکەی دادەخست و دەچووە مزگەوت و بە درێژایی شـــەو ئیعتیکافی دەکرد. پێش نوێژی بەیانی بڕێک دەخەوت، دواتر هەڵدەستا و دەستنوێژی هەڵدەگرت، نوێژی بە جـەمـاعـەت دەکرد و دەگـەڕایـەوە دووکـانـەکـەی. هیچ هـاوڕێ و هاونشـینێکی نەبوو، لە حەسـەن شکازی دراوسـێی بترازێت، دیدەنی هیچ کەسـێکی نەدەکرد. بەیەکەوە شـەویان بە زیکر و قورئانخوێندن و تێفکرین بەرز ڕادەگرت. پێم وابوو حیکایەتی من لەگەڵ شـۆنیز و ئـامۆژگـارییـە توونـدەکـەی من بۆ ئـەو، بوون بـەهۆی ڕێنمـایی و گەڕانەوەی بۆ لای خوا. هەر کاتێک ئەوەم بە خەیاڵدا دەهات، هەستم بە شـــانازی و عیززەت دەکرد، بەڵام قەت ئەوەم نەدەدرکاند، ئاخر ترســـی ئـەوەم هـەبوو بڵێ وانییـە درۆ دەکـەیت! لـەوەیش خراوتر، دەترسـام بەم قسـانەی من دەماری گوناهکاریی سـواری یەک ببن و بچێتەوە سەر بەزموڕەزمی جارانی.

هـەرکـە دەچوومـە مـاڵی شـــکاز، دەمبینین لـە گـەرمـەی زیکر و تـەســـبیحـاتدان. جاروبار قورئانیان بەیەکەوە دەخوێند و یەکێکیان ئەوی دیکەی وەگریە دەخســـت. ناوەناوەیش شـــکاز قســـەی بۆ

دەکردین، لە خۆشـەویسـتی و ئەوینی خودا نوقمی دەکردین، کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد خەڵوە گەرموگوورەکەمان لێ تێک بدات.
هێندێک جار لە ماڵی ئەو دەخەوتم، بەمە یەکەم کەرامەتی مامم بۆ دەرکەوت. وەختێک بەرەبەیانییان بێداردەبووەوە، دەیگوت:
- ڕابن فەجر هەڵهات.
- لەکوێوە ئەمەت زانی؟
- بۆنم کرد. ئاخر هەناسەکانی فەجر بۆنیان هەیە.
ڕۆژێک کەسـێک لە دەرگەی دا، چووم کردمەوە، بینیم ئامۆزامە، کەیل و مەستبوو، بە لارەلار و خوارەخوار دەڕۆیشت:
- باوکم لەکوێیە؟
بردمە ژوورەوە و ڕێک بەرەو لای باوکی چوو، شـکازی نەبینی، کە لە ڕۆخ باوکی دانیشتبوو، پێی گوت:
- باوە! پارەم بدێ، ئەو پارەیەی دابووت بەمن، تەواو بوو.
- پارەم پێ نییە.
بە دەنگێکی زۆر بەرز هاواری کرد:
- پێم گوتی پارەم بدێ...
- هەتا دەتوانی هاوار بکە، پێم گوتی پارەم پێ نییە.
- ناڵێم پارەم بدێ خەڵەفاو... پارە بۆ کێ دادەکەیت، زۆرت نەماوە بمریت. دەی پارەم بدێ!
- ئەگەر لێرە نەڕۆییت بەو عەسـایەم وەک ئاژەڵ لێت دەدەم و تێت هەڵدەدەم...
ئیتر کتوپڕ کوڕە هەڵیکوتایە سـەری. چاوەکانی مامم دەمێک بریسـکانەوە، تاسـان و بێئومێدبوون لەنێویاندا جرتوفرتیان دەکرد. بەپەلە چووین لێمان دوورخسـتەوە، گۆزەیەکی شـکاند. لەو کتێبەی هەڵدا کە شـکاز دەیخوێندەوە و دواتر ڕۆیشـت. مامم بە هانکەهانک هەستایەوە، چاوەکانی پڕ ئەسرین بوون، لەبەر خۆیەوە گوتی:

- دڵت بریندارکردم، خودا دڵت بریندارbکات و هەرچی زووە بۆ خۆی بتباتەوە.
شکاز دەستی بەسەر و جەستەی مامما هێنا و بە چپەوە پێی گوت:
- نا، لە قســـەکەت پەژیوان بەوە، نزای ڕێنوێنی و هیدایەتی بۆ بکە، خودا بە لاڵانەوەی دایک و باوک ڕێگەی نیشان دەدا.
- ئەمە نزا نەبوو، کەشفی خودا بوو.
ئەسرین زەنگوڵ زەنگوڵ لە چاوەکانی بارین و گوتی:
- ئەو پێشی من دەمرێت، منیش چل ڕۆژ دوای ئەو دەمرم.

## ١٤

**"ئەو (مەکان)ەی (مەکانەت)ی تۆی تێدا نەبێت، بەرکەناری خە"**
**ئیبن عەرەبی**

حەلقەی عیلم و دەور و تەدریس بۆ مزگەوتی (قەصبە) گوازرایەوە. کەمێکیشی لە مزگەوتی ئیبن عەدیس مایەوە. کاسبکارە دەستگێڕەکان هەراسانیان کردبوون، دەهاتن لە گۆرەپانی مزگەوت کەلوپەل و کاڵاکانیان دادەنا. هەرچەند ڕێگە بە بەشێکیان درابوو، بەڵام ژمارەکیشیان بەبێ ڕووخسەت دزەیان دەکرد و کەسیش ڕێی لێ نەدەگرتن. منیش یەکێک بووم لەو فەقێیانەی بۆ مزگەوتی (قەصبە)یان بردن، برامە حەلقەی ئەو شێخەی کە لە ڕۆژێکی خۆرەتاودا ئاسمانی ئیشبیلیای درەوشاندەوە. بەر لەوەی شێخ (یووسف کومی) لە فاسەوە بێت، باسی کەرامات و شکۆی کەوتبووە نێو زاری هەموو خەڵکی. باوکم لە حەلقەی وانەبێژیی ئەودا جێگەیەکی بۆ کردمەوە. بۆ یەکەمجار، کە لە خزمەتی دانیشتم، وام هەست کرد لە هەمبەر چرایەکی درەخشاندام. زۆربەی منداڵە تازە فەقێکان، لەبەر دەموچاوی گرژ و ئەبرۆی پێکدادراوی، مۆڕەیان لێ دەکرد و دەڕۆیشتن. بەدرێژایی ڕۆژ ئەو پیاوە هەر وا گرژ و مۆن بوو، تا ئەو کاتەی هەژارێکی دەبینی، وێجا پێدەکەنی، بانگی دەکرد

و لەتەک خۆی دایدەنا، پارە و خواردنی پێ دەدا، بەم جۆرە هەتا پریاسکەکەی بەتاڵ و حەتاڵ دەکرد.
باوکم ئەو شـێخەی بۆ دەسـتنیشـان کردم، بێ ئەوەی بزانێت، یان هەست بکات بەم هەنگاوەی، منی لە سەرەتای ڕێگە داناوە. خودا لە ئاسـمان نەخشـەی کێشـا و باوکیشـم لە زەمین جێبەجێی کرد، لە کۆتاییدا مورید بە مورادی خۆی گەیشت. بەنێو ئادگار و ڕوخسـارە نوورانییەکەیدا سەفەرم کرد، بەوێنەی کۆترێک، کە هیچ ئاسمانێک لە غەیری ڕووی ئەو بەئەمانتر نەزانێت، هیچ ڕووحێک لە ڕووحی ئەو بەرفراونتر نەزانێت. لەلای ڕاستی خۆی داینیشاندم. من مەتنی کتێبم دەخوێندەوە، ئەویش شـەرحی دەکرد... لە لای چەپیشـی کوڕێک دانیشـتبوو، ناوی ئەحمەد حەریری بوو، بۆ یەکەمجار لەو حەلقەیە ناسـیم، دواتر بوو بە هاوڕێی تەمەنم، لە دڵی خۆمدا جێیەکم بۆ ڕاخست، تا کۆتایی ژیانم ئەو جێگەیەم هەڵنەگرت.
من و ئەو، لە هەموو فەقێکانی شـێخ زیرەک و زیتەڵتر بووین، هەربۆیە ڕۆژێک لەنێو هەموان ئێمەی هەڵبژارد و گوتی:
- لە بەیانییەوە هەموو ڕۆژێک دەچینە (منتیار).
- بۆچی یاشێخ؟
- ریسالەی قوشەیری دەخوێنینەوە.
هەرچەند پێشنیازەی شێخ زۆر کەیفخۆشی کردم، بەڵام پێم گوت:
- بۆ چاوەڕێ نەکەین تا لە خەڵوەت دەگەڕێیتەوە، ئینجا لە مزگەوت بۆت بخوێنینەوە؟
- لەوێ ئەم نهێنییە دەزانن.
بەهەرحاڵ، دەروازەی شـارمان بەجێ هێشـت و بەرەبەری نوێژی نیوەڕۆ گەیشتینە کێوی منتیار، لە تۆقەڵانی کێوەکە لە خەڵوەتگەیەکی کۆندا نوێژمان کرد. شـێخ لە سـووچێکدا لێی دەخەوت. دوای نوێژ، ریسالەکەی لەنێو کەلوپەلەکانی هێنایە دەر و دایە دەستم و گوتی:
- موحی، ئەوەندەی دەتوانیت بیخوێنەوە.

ریسالەی قوشەیریم لێ وەرگرت و بەرگەکەیم هەڵدایەوە و دەستم بە خوێندنەوەی کرد. لەناکاو لەرزەیەک هەموو جەستەی داگرتم، مەپەرسە لەبەر چی؟ چونکە نازانم! وشە لە قورگم گیربوون، چەندی کردم نەمتوانی دەریانبڕم. چاوەکانم ڕوو بەرەو شێخ بەرزکردنەوە، لە هەموو ئەو وێنانەی بینیبوونم هیچیان هێندەی ئەو بە شکۆ و ئیجلال نەبوون. دیسان دەستم بە خوێندنەوەی کرد، لەرزەم زیاتر بوو، ڕووپەلەکان لە دەستم دەلەرینەوە، خەریک بوو لە داوەکەیان ڕاپسکێن و بەربینەوە. چەند جارێکی دیکە هەوڵم دا بیخوێنمەوە، بەڵام شکستم خوارد و نەمتوانی، هەروەک ئەوەی دەنگم پوکابێتەوە و نەمابێت. ڕیسالەی قوشەیریم لەدەست کەوتە خوارەوە، بە چاوی پڕ لە ترس و سامەوە، تەماشای شێخم کرد. شێخ زەردەیەکی کرد و ڕیسالەکەی هەڵگرتەوە، دواتر دایە دەستی ئەحمەد و گوتی:

- ئەحمەد تۆ بیخوێنەوە.

ئەحمەد ریسالەی قوشەیری بەهەستیارییەوە لە شێخ وەرگرت و بە جۆرێک لە نیگەرانی لایەکی بۆم کردەوە. پاشان ئەعوزوبیلا و بیسمیلای کرد و ریسالەکەی لێک کردەوە و خوێندییەوە. بە دەنگێکی ڕوون و ڕەوان و زۆر بە سێنایی پێداچوو، ناوەناوە شێخ ڕای دەگرت و شەرحی دەکرد. ماوەیەک بەم حاڵەماینەوە، هەر ئەو دەیخوێندەوە و شێخیش ڕاڤەی دەکرد، منیش بێدەنگ و خامۆش، نە هیچ پرسیارێکم دەکرد، نە هیچ وەڵامێکیشم پێ دەدرایەوە. لەرزەکەم نەما، بەڵام هێشتا هەر پەشۆکاو و خەمناک بووم. گاهێک وەختی عەسر هات و نوێژمان کرد، شێخ گوتی:

- موحی، تۆ لای من بمێنەوە، با ئەحمەدیش بڕواتەوە.

پاشان ئاوڕێکی لە ئەحمەد دایەوە و گوتی:

- بڕۆ بۆ لای کەسوکاری موحی، پێیان بڵێ ئەو لەگەڵ من خەڵوەت دەکێشێت و تاکوو ڕیسالەکە تەواو نەخوێننەوە ناگەڕێنەوە.

ئەحمەد ڕۆیشــــت و منیش لەو خەڵوەتگە چکۆڵەیە ڕامام و ورد بوومەوە. شێخ خەریکی نوێژکردن بوو، منیش گۆشەیەکی گونجاوم بۆ خەوتن دەســــتنیشـــان کرد. کاتێک لە نوێژ بووەوە، بێئەوەی ورتەیەک لە دەمی بێتە دەرەوە، هێمای بۆ لای ســـــووچێکی نزیک دەرگەکە کرد، کە بچم لەوێ بخەوم. دواتر شـــێخ لە خەڵوەتگە دەرچوو و منیش تەنیا مامەوە، بیرم لەو دۆخەی خۆم دەکردەوە، ئاخر قەت خەڵوەم نەکردبوو، نەشمدەزانی لە خەڵوەتدا چی پێویستە بیکەم. ئاخۆ دەبێ چی بکەم؟ جەنابی شـــێخ خزمەتکاری نییە، دەبێ خزمەتی بکەم؟ خۆ خواردنیشـــم بەپێی پێویســـت نەهێناوە، ئەی چی بخۆین؟ باشە بۆچی شێخ منی بۆ تەواوکردنی ریسالەی قوشەیری هێشتەوە و ئەحمەدیشـی ناردەوە؟ تا شـێخ گەڕایەوە، سـەرم لەنێو ئەو هەموو پرسیارانەدا گێژی دەخوارد. بەرەو قوڕنەیەکی خەڵوەتگە چوو، پێشـتر ئەو قوڕنەیە لای من دیار نەبوو، پاشـان بە دەسـتی پڕ لە خورما و لەتکە هەنجیر گەڕایەوە و لەبەردەمی من داینان و گوتی:

- دەزانم تۆ پێخۆرت نەهێناوە، فەرموو ئەو خواردنەیە بخۆ.

- بەڵام یا شێخ ئەوە هەر زۆر زۆرە، پێنج شەش دەنکە خورما بۆمن بەسە.

- خۆ ئەوە خواردنی یەک ڕۆژ نییە، ئەمە بۆ یەک هەفتەی ڕەبەقە.

پاشان ئاماژەی بۆ گۆزەڵەی ئاو کرد و گوتی:

- هەڵی بگرە و دوام بکەوە.

لە خەڵوەتگە چووینە دەرەوە و بەرەو لووتکەی کێو ڕۆیشـــــتن، گەیشـــتینە کانییەک ئاوێکی گەرمی لێ هەڵدەقوڵی. داوای لێ کردم بیخۆمەوە و گۆزەکەیشـــی لێ پڕ بکەم. ڕاســـتییەکەی ئاوەکە تامی ناخۆش بوو. دەســـتنوێژمان هەڵگرت و گۆزەم پڕ ئاو کرد و بەرەو خەڵوەتگە گەڕاینەوە، لە ڕێگەی هاتنە خوارەوە پێم گوت:

- یا شێخ، پێشتر بە هۆی ماندووبوون و شەکەتی لە ڕێگە، نەمتوانی ریسالەکە بخوێنمەوە، من...

- نا موحی نا، لەبەر ئەمە نەبوو.
- ئاخر لە بەیانییەوە بە ڕێگەوەبووین، هیچ وچانێکیشـــکان نەدا، ماندووبووم.
- موحی خۆ پێم گوتی لەبەر ئەوە نەبوو.
هەرچەند دەنگی نزم بوو، بەڵام زۆر بەپەرۆش بوو، قســـەی لەگەڵ دەکردم و ئاوڕی لێم نەدەدایەوە. بیانوەکەی منی پووچاندەوە و هۆیەکەیشی پێ نەگوتم، بەمە سامگرتی بووم. وا دیار بوو لەبارەی گوناهێکەوە ســـەرکۆنەم دەکات، کە نازانم چییە. تا گەڕاینەوە خەڵوەتگە بێدەنگ بووم. گۆزەکەم دانا و دانیشتین. ریسالەکەی لەنێو کەلوپەلەکان دەرهێنا و دیسان دایەوە دەستم و گوتی:
- بیخوێنەوە.
- زۆر بەسـێنایی خوێندمەوە. بێ هیچ زۆرلەخۆکردن و مشـەقەتێک. بە دڵێکی ئارام و هەناســـەدانێکی تەواو دەمخوێندەوە، تا داوای لێ کردم بوەستم، ئەوسا گوتی:
- دەبوو ئێســتە لە پێشـووتر شـەکەتتر بیت، کەچی زۆر بە ڕوونی خوێندتەوە.
- بۆ یا شێخ؟
- چونکە جاری یەکەم دەســـتەکانم قوچاندبوون، نەتتوانی بیخوێنییەوە، ئێستە کردنمەوە و بە ئاسانی خوێندتەوە.
- چۆن قوچاندن و کردنەوەی دەستەکانی تۆ ئاوام لێ دەکەن؟
- چونکێ من شـــێخی تۆم، خودا منی کردە مورادی تۆ و تۆیشـــی کردە موریدی من. بە فەرمانی خودا دەتبەســـتم و دەتکەمەوە... تازە یەکەم هەنگاوت نا، ئەوجا بۆ کوێ دەچی بڕۆ. دوای یەک هەفتە مانەوە لە کێوەکە، تەواوی (ریسالەی قوشەیری)م ئەزبەر کرد. خۆم گۆشـــەگیر کرد، لە خودا ناوڕامەوە لەســـەر ئەو ڕێگەیەی بۆ منی داناوە کۆمەکم بکات. دواتر شـــێخ ڕێگەی دا بڕۆم، خۆشـــی لە خەڵوەتگە مایەوە. بەیانییەکی باراناوی و ســـارد بەرەو ئیشـــبیلیا

هاتمەوە، ڕاســـتیت دەوێت هیچ هەســـتم بە ســـەرما نەکرد، نیازی سەفەرێکی دوورودرێژم هێنا و هیچ هەستم بە ماندووبوون نەکرد... کە گەیشتمە بناری کێوەکە، تەماشایەکی لووتکەکەم کرد، خەڵوەتگەم لێ ئاوا بوو. بە فیراقی شـێخەکەم، چاوەکانم پڕ لە ئەسـرین بوون، خـاترجەم بوون لەوەی بوومەتە موریدێکی هەقیقی، بۆیە وا بەکوڵ ئەشـکیان دەڕشـت. هەیبەتی شـێخ لە کێوی (منتیار)، دەیان هێندەی ئیشـــبیلیا بوو. هەرچەند پاڕامەوە و لاڵامەوە، زۆرم بیر لێ کردەوە، داوام لە خودا کرد نهێنیی ئەوەم بۆ دەربخات، بۆی دەرنەخســـــتم... پشـتی چەند سـاڵان، لە مەککە ئەمەی بۆ کەشـف کردم. ئەو هەموو فیکرانـەی نێو ســـــەرم پێکدا دەپژان، وەک تـاڤگـەیـەک لـە خـەونمـدا هـەڵدەڕژان، زانیم ئەوە موکاشـــــەفەی خودایە، بەپەلە خۆم گەیاندە قەڵەم و نووسیم:

- لە کێوی منتیار، (مەکانەت)ـــــی ڕووحیی شـێخ کامڵ بوو. (مەکان) نێرە و (مەکانەت) مێیە. ئادەم نێربوو، تەنیا بە حەوا کامڵ بوو. منتیار کێوێکە تەنێ بە لووتفی شێخ کامڵ بوو. ئادەمی بەبێ حەوا، کەسێکە هیچ ڕیشـــــە و ڕەچەڵەکی نییە. کێو بەبێ شـــێخ، تەپۆڵکەیەکی بێ بەهـایـە. (مـەکـان) بـەبێ (مەکانەت) بلقی ســـــەر ئاوە. بۆیە گەرەکە (مـەکان) ڕامی بەردەســـــتی مێیینە بکەین، تاکوو (مەکانەت)ی خۆی تێر و کامڵ بکات.

## ١٥

**دەستنووسێك لە حەلەب**

**٦٥٧ز/١٢٥٩ك**

چووم بیست چێڵم بە یەک وشتر گۆڕییەوە، هێشتایش پێم وابوو قازانجم کردووە. هەتا دووژمن لە شار نزیک دەکەوتەوە، نرخی وڵاخی سواری و باری گرانتر دەبوو، هیی ئاژەڵی دیش وردەوردە دەهاتە خوار. کاسبکاران هەرچی لە دووکان و کۆگەکان هەیان بوو بە هەرزانترین نرخ هەراجیان کرد. خەڵکیش هەر پارەیەکیان لەبەر دەست بوو، بەپێخۆر و نان و خورما و ئالیکیان دا، بەمە باری کۆچڕەویی خۆیان سووک کرد، بەڵام ئەوەی ئاتاجیان پێنەبوایە نەیان دەبرد. هەرکێ توانای هەبوایە دەڕۆیی، ئەوەی درەنگ کەوتبا، دواتر فریا نەدەکەوت. خەڵکانێکم دیتن لە ماڵەوە بۆ بازاڕ دەچوون، دواتر پێش ئەوەی بۆ ماڵ بگەڕێنەوە، ڕاستەوخۆ بۆ دەرەوەی حەلەب کۆچیان دەکرد. گاورەکان بەرەو ئەنتاکیە و ئەزنە و سیس و ترسوس ڕۆیشتن. لە دەروازەی ئەنتاکیە و خۆراوای شار، کۆبوونەوە، پشتێنەکانیان لەخۆ دەکردەوە و سەلیبە بچووکەکانیان وەلا دەنا. گاورەکان نیازی گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان هەبوو، لەترسی ئەوەی چەتە لەڕێ ڕووتیان نەکەنەوە، هەموو زێڕەکانیان دەفرۆشت. زێڕنگەران دوای ئەوەی زانییان گاورگەل زێڕ و زیویان دەفرۆشن،

لـەنزیـک دەروازەکـە قۆنـاخیـان داکوتـا، دواتر، کـە گـاورەکـان ئاشکرابوون، وازیان لەم کارە هێنا...

بەڵام زۆربەی موسـڵمانەکان بۆ باشـوور، ڕێک بەرەو ئاراسـتەی دیمەشق و حیجاز و میسر دەڕۆیشتن. بە درێژایی سـاڵی ڕابردوو، مەلا لە ڕۆژانی هەینیدا تەنێ شتێکی بە گوێدا چرپاندبوون:

"ئەو کاتە ملی وشتران لە بەسرا بە ئاگری حیجاز ڕووناک دەبێتەوە نبوئەتی ئیلاهی بە نزیکبوونەوەی ڕۆژی پەسـڵان دێتە جێ." هەینی دوای هـەینی وتـاربێژەکان خەڵکیان لە نزیکبوونەوەی ڕۆژی قیامەت و نیشـانـە و ڕووداوەکـانی ئاگادار دەکردەوە. کاتێک بەغدا کەوتە دەسـتی تەتەرەکان، لەنێو خەڵکی وا قاوە[٣]، کە هۆلاکۆ مەسـیحی دەججالە، تەنیا بە کۆچکردن بۆ ئەرزی موقەددەس، خەڵک لە چنگی ڕزگاری دەبێت... وتاربێژی ئێمە هەر زۆر باوەڕی بەم باسە هەبوو: "... خەڵکینە! بۆیە مەسـیحی دەججال ئەم ناوەی لێ نراوە، چونکە لە مـاوەیـەکی کـەمـدا، زەوی دادەمـاڵێت. فەرماندەی تەتەرەکان هۆلاکۆ نـەفرەتی خودای لێ بێت، بە مـاوەی هەفتەیەک لە ئازەربایجانەوە تا شـام، زەوی وەبنـەخۆ گرت، ئـەمـە مـەسـیحی دەججالـە... ئـەو، بانگەشـەی ئیسـلام دەکات، لێ ئیسـلام لەو بەرییە. هەرکێ لە ئێوە باوەڕی بە پێغەمبەرایەتیی محەمەد هەیە، با ڕاسـپاردەکانی جێبەجێ بکات. ئەو فەرموویەتی دەججال لەنێوان شام و عێراق دێت و ڕاست و چەپ بۆگە دەکات، هیچ شـوێنێک لەو دنیایە نامێنێت سـەری پێدا نـەگرێت، تـەنێ مـەککە و مەدینە نەبن." خەڵک لە گۆڕەپانی مزگەوتێ لـەرزەیـان وێ کـەوتبوو. ئـەو دەنگۆ و واتەواتانە، هەموو گۆڕەپان و مزگـەوت و بـازاڕ و مـاڵ و گـەرمـاو و کێڵگـەکـانیـان گـەرم کردبوو. هەرکاتێک هۆلاکۆ گەمارۆی شـارێکی دەدا، ئەو دەنگۆیانە دەبوونە سـرتەسـرت، بەڵام گاوێک لەشـکرکێشـی دەکرد و لە حەلەب نزیک

---

[٣]-وا بلاوبووەتەوە.

دەبووەوە، دەبوونە بنێشتەخۆشەی سەرزاران. لە کۆتاییدا ماردین کەوتە دەستی هۆلاکۆ، هیچ بەربەستێک لەنێوان حەلەب و ئەودا نەما، ترس کەوتە دڵی خەڵک. قەت بازاڕم وا شەپرێو نەدیبوو. کەلوپەل لەکن دەرگەی دووکانەکان دانرابوون. پێڕۆ و ئاژەڵ بەنێو بازاڕدا جرتوفرتیان بوو، کەس نەبوو ئەو پەشێوییە بەرزەفت بکات. دەنگ و هاواری کاسبکاران بەسەریەکدا بەرز دەبووەوە. لە هەر کوێیەک ویستبایان شەمەک و کەلوپەلیان دادەنا. زینفرۆشەکان هاتبوونە بازاڕی عەتتاران، قوماشفرۆشیش کەوتبوونە بازاڕی ئاسنگەران. دەفر و قاپوقاچاغ و شووشە ورد و هەڕا کرابوون، لەنێو کۆلانان خەڵک پێیان لێ دەنان، ئەمەیش دوای ئەوەی کاسبکار لە فرۆشتنیان بێئومێد بووبوون، تێیان هەڵدابوون و بەولاولایان دادابوون. وشترەکەم ڕاکێشا و بەرەو ماڵ بوومەوە، باوکم لە قاپیەکە وەستابوو، ئۆقرەی لەبەر بڕابوو، هەرکە منی بینی، دەنگی دام:

- ڕۆڵە! بۆ درەنگ کەوتی؟ دەی خێرا گورج بە.

من چاوەڕێی ئەوەبووم بەڕوومدا هەڵشاخێت، چونکە ئەگەر زانیبێتی چ مامەڵەیەکم کردووە، دەردێکم پێ دەکات، با بە دەواری شەڕی نەکردبێت، بەڵام خۆشبەختانە هیچی نەکرد. پێکەوە سندووقەکانمان داگرتن، لەبەر خۆمەوە دەمگوت ئاخۆ دەبێ ئاگاداری ئەو دۆخە بێت؟ وەگومان کەوتم، ئەرێ دەبێ بزانێت، کە من بیست چێڵم بە یەک وشتر گۆڕیوەتەوە، یان نا؟ بەهەرحاڵ، یازدە هێستری لە سندووق و بوخچە و قووت و زەخیرە بارکردن، هانکەهانکی وێ کەوت. بە تەنیشتییەوە ڕۆیشتم، وەک ئەوەی قسە لەگەڵ خۆمدا بکەم:

- بیست چێڵ بە یەک هێستر، وای ئەوە چ شێتییەکە!

باوکم بێ ئەوەی لام لێ بکاتەوە، گوتی:

- دیاره ئەو کەسەی ئەو چێڵانەی لێ وەرگرتوویت شێت بووە، مەگین چییان لێ دەکات؟ بەخوا هەمووی لێ مردار دەبنەوە.
دواتر هێمایەکی بۆ کەژاوە لوولدرارەکەی و سەر زەوی کرد و بە جۆرێک لە دنەدانم گوتی:
- دەی کەژاوەکەی دایکت هەڵدە و ڕێکی بخە.
دایکیشم وەک ئاماژەیەک بۆ تەواوبوونی کارەکانی، لە دەرگە دەرکەوت و دەستەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:
- تاهیر هیچ شتێک لە ژوورەوە نەماوە.
- دەی کەوابوو بەر لە خۆرئابوون وەڕێ دەکەوین.
دایکم لەم بڕیارە کتوپڕەی باوکم سەری سووڕما:
- یانی شەو؟ ئەی بۆ تا بەیانی ئارام نەگرین؟
- نا، تا تەتەر نەهاتووە، دەنا شار دەشڵەژێت و کەس بەکەس نامێنێت، دوایی دەرەوەی شار زۆر لە ناوەوەی ئەمینتر دەبێت.
- ئەی دز و چەتە چی؟
باوکم ئاوڕێکی لە دایکم دایەوە و بۆ یەکەم جار لە بەیانییەوە بزەیەکی هاتێ و گوتی:
- حورمێ! باوەڕم پێ بکە ڕێگەی حەلەب دیمەشق ناگیرێت، حەلەب دوای چەند ڕۆژێکی کەم، چۆل دەبێت.
فرمێسکێک کەوتە سەر پێڵوەکانی، تەماشای کوسپەکەی دەرگەی کرد و گوتی:
- خانووەکەمان؟ خزموخوێشمان؟ دەروجیرانمان؟
باوکیشم لاسایی کردەوە:
- دووکانەکەم؟ بازرگانییەکەم؟ شمەک و کاڵاکانم؟
دەموچاوی دایکم نوقمی فرمێسکان بوو، بە ناڵەناڵ گوتی:
- ئای لەو بارە نالەبارە، لەو دۆخە پڕ لە ئاخ و داخە.

- دایکی ئیسماعیل، بەر لە هەمووشتێک گەرەکە خۆمان حەشار بدەین. ئێستە مفارقین و ماردین و رەها کەوتوونەتە دەستیان، لە حەلەب زیاتر سەنگەریان مەحکەمتر بووە.
- ئەمن وام دەزانی شوورەکانی ئێمە بەرزترن و قەڵاکانمان شکست ناهێنن.
- ئەگەر گەمارۆمان بدەن لە برسان دەمرین. بیستم دوای ساڵێک گەمارۆدان چوونەتە نێو مفارقین، دەبینن هەموو خەڵکەکە مردوون.
- لوتفی تۆ خودایە...
دانیشتم و گوێم بۆ ئەو گفتوگۆیەی دایە و بابە هەڵخست، لە خەفەتان خەریک بوو شەق بەم، لە ترسان هەموو گیانم دەلەرزی. سوپای تەتەر بەرەو ڕوومان دێت، سوپای ناسرِ یووسفیش لە دیمەشق وەک مریشکی سەر هێلکان کڕکەوتووە. نە ئێمە قوتار دەکات، نە هیچیشی بۆخۆی پێ دەکرێت. لەوەتەی ئیسلام خۆری هەڵاتووە، ئەوە یەکەمین جارە موسڵمانان بێ خەلیفە بن. قوتر لە میسرە، ناسرِ لە شامە، موغیس لە کەرکە! بە خوای ئەوانە مریشکن. هەموویان مریشکن و لەسەر هێلکە متبوون، تاکوو ڕۆژێک هۆلاکۆ دێت و هەموو هێلکەکانیان دەشکێنێت!
باوکم سەرێکی بەنێو ماڵدا گرتەوە، بۆ ئەوەی بزانێت هیچی تێدا ماوە یان نا، بەنێو ژوورەکاندا هات و چوو. پاشان هاتە دەرەوە و بە چپەوە سندووقی سەر هێسترەکانی ژماردن. دیسان بۆ دواجار گەڕایەوە ماڵەوە، سندووقێکی دارینی هێنا، زۆر بە مەحکەمی داخرابوو، نەخش و هێڵی جوانی بەسەرەوە کێشرابوو. لەو هێسترە باری کرد، کە خۆی سواری دەبوو. پاشان گەڕایەوە و لەبەر دەم دەرگەکە وەستا، دایکیشم بە چاوی پڕ گریان و ڕەنگی زەردەوە هات بە باوکمی گوت:
- ئەی بە لای ماڵی ڕوقیەدا نەچین؟ لەوانەیە پێویستی بە هاوکاریی ئێمە هەبێت.

- له دەروازەی (قنسرین) پێیان دەگەین.
- ئەی سومەییە؟
- هەموو کچ و هاوژینەکانیان لەوێ دەبینی. ئەمڕۆ بەیانی ئیسماعیل سەردانی کردبوون.

بەهەرحاڵ، دایکم چووە نێو کەژاوەکە و جڵەوی وشترەکەیشم دایە دەستی یاقووت، کە ئەویش سواری هێسترەکەی خۆی بووبوو. دەگەڵ قافڵە بچووکەکەمان ڕێگەمان گرتەبەر، ڕاستییەکەی من هەستم بە و نیگەرانی دەکرد: "تخودا ئەمە چ قافڵەیەکە؟ یانزە هێستر و وشترێک بۆ بازرگانێکی ناسراوی حەلەب چین؟ تەنانەت سەرنجی دز و جەردەی شار و دەوروبەریش بە لای خۆیدا ڕاناکێشێت! دایکم لەنێو کەژاوەکە دەنگی هات، نزای سەفەری بیرخستینەوە. هەرکە لە کۆڵانەکەمان دەرچووین، دایکم بە دەنگێکی گریاناوی و پچڕپچڕ گوتی:

- یا سەتتار، سەترمان کە. یا حەفیز، حیفزمان کە.

گەیشتینە دەروازی (قنسرین)، زاوا و خوشکەکانم لە وێ چاوەنۆڕیان دەکردین، باوکم هێمای بۆ مێردی سومەییە کرد، کە سواری هێسترێکی مە بێت، چونکە خۆی هیچ وڵاخێکی پێنەبوو. لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا، کە لە دۆزەخی ڕەشی تەتەر ڕایان کردبوو، دەروازەمان جێ هێشت.

شارێک، وا باڵەخانەکانی لە خەڵک هەڵدەتەکێنێت، وەک ئەو کەسەی، کە دووپشک پێوەی داوە پێخەفەکەی دادەوەشێنێت! دەرودراوسێی خۆمانم بینی، هاوڕێکانمم دیتن، پیشەوەر و پیاوانی ئاساییشم دیتن، تەنانەت سەربازەکانم بینین، زرێ و خودەکانیان بە وڵاخەکانیان خستبوو... بەشێکمان بەم سەربازانە زۆر دڵخۆش بووین، چونکە بە چەکەکانیان بەرگریمان لێ دەکەن و چەتە و ڕێگر توخنمان ناکەون، ئەگەرچی خۆشیان لە ترسان ڕایانکردبوو.

پێشــــتر لەگەڵ باوکم زۆرجار ڕێگەی نێوان ئەو دوو شــــارەمان کوتاوەتەوە، گەلێک جاریش چووینەتە نابلس و کەرک، بەڵام قەت هێندە قەرەباڵخم نەدیوە، تەنانەت لە مەراســیمی حەجیش شــتی وا نەبووە. کە گەیشــتینە دیمەشــق، جەنجاڵی و پاڵپەســتۆیەک بوو، لە ژیانمدا شتی وام نەدیبوو. ئەگەر لەبەر ڕێزی باوکم لەکن بەشێک لە بازرگانەکان نەبوایە، ئەو شــەوە شــوێنێک نەدەما تێیدا بخەوین، جێگەیەک نەدەما وڵاخەکانمانی لێ ببەستینەوە، بەڵام باش بوو باوکم پێش ئەوەی بگەین کەســێکی ناردبوو خانوویکمان بۆ بۆ دابین بکات... زۆر لە هاوەڵانمان لە دەوروبەری شــار خێوەتیان هەڵدا. ســەدان کەس بە چەند ڕیزێکی ناڕێک وەســتابوون، چەندان پیاو و ژن و منداڵ و بەندە و کاســبکار، لەنێو ئەو ڕێزانە دەهاتن و دەچوون، خێرخوازان بۆ هاوکاریی ڕێبواران هێنابوونیان.
بەیانی دواتر باوکم گوتی:
- من دەچمە سەر گڵکۆی ئیبن عەرەبی، کێ دەیەوێت با بێت.
من و دایکم و ســومەییە لەگەڵی چووین، بەڵام روقیە دووگیان بوو، بەدەر لەوەیش، حەزی دەکرد لای مێردەکەی بمێنێتەوە، کە لە ڕێگە دووپشــک پێوەی دابوو و تووشــی لەرزوتا بووبوو. بەپێیان چووینە (قاســـیون)، گڵکۆی ئالزەکی لەوێ بوو، چووینە ژوورەوە، باوکم ســندووقێکی جوان و ڕازاوەی بەدەســتەوەبوو. لە بەرانبەر گۆڕێکی گەچکراو وەســـتا و ســـڵاوی لە شـــێخی ئەکبەر کرد، دایکم و ســـومەییەیش لەبن لێوان نزایان دەخوێند، من گوێم لە هیچ نەبوو. ئەمنیش سڵاوم لە گۆڕی شێخ کرد، پێش چەند ساڵان لەگەڵ باپیرە سودکین ئەو ڕێگەیەمان بڕیبوو. باوکم هەستا و بەرەو لای خادیمی گڵکۆی شێخ چوو، لە سووچێکی نەزم خەریکی قورئان خوێندن بوو، سەلامی لێ کرد و لەکنی دانیشت و گوتی:
- ئەم کتێبە هیی شێخی گەورەمانە، بە دەستی خۆی نووسیویەتیەوە، باوکم لە ســەرەمەرگدا داوای لێ کردم وەک گلێنەی چاوم بیپارێزم.

ئەمن هیچ شـــوێنێک لێرە بە گونجاو و ئەمینتر نازانم، ئاخر ئێرە گڵکۆی خاوەنەکەیەتی. ئایا دەکرێت لەنێو گڵکۆکە داینێین؟

- خادیمەکە زۆر بایەخی بەم قسـانەی باوکم دا، قورئانەکەی بەردەستی داخستەوە و لایەکی لە باوکم کردەوە و لێی پرسی:

- کوا دەستنووسەکە؟

باوکم سـندووقەکەی لەپێش خۆی دانا و کردیەوە، ڕووپەلە تەجلیدکراوەکان دەرکەوتن، دەوروبەری بە دەستی کەسانی شارەزا و لێهاتوو ڕازابووەوە، پەڕی حەلەبی بریسـکەداری لێدرابوو، ماددەیەکی پێوەبوو، بە کۆنبوون پەڕپووت نەبێت. ئاخێکی هەڵکێشـا و ڕۆندکی بە چاودا هاتنە خوارەوە.

- بەڵێ، ڕاست دەفەرموون، دەبێ سپاردە بدرێتەوە خاوەنەکەی.

# ١٦

**"زەمان (مەکان)ـێکی جووڵەدارە، (مەکان)ـیش زەمانێکی وەستاوە"**
**ئیبن عەرەبی**

لەهیکڕا برای خەلیفە کۆچیدواییی کرد، دەبوو باوکم بچێتە مەراکیش. داوام لێ کرد و لەبەری پاڕامەوە لەگەڵ خۆیم بەرێت، ئەویش ڕازیبوو و گوتی خۆت ئامادە بکە، بەڵام دواتر پەشیمان بووەوە. پێی گوتم ڕۆڵە شاندەکە لەبەر نەبوونی کات، بڕیاری دا بە بەلەم تا دەریای ڕەش، بەنێو ڕووباردا بڕۆن، لە بەلەمیش جێی تۆ نابێتەوە. بە لووتفەوە دەستی خستە سەر شانم و گوتی:

- ئەگەر لە ڕێگەی قافڵەوە بوایە، پەیداکردنی ولاخێک ئاسان دەبوو.

دڵم وێکهات، هەستم بە خەمناکی و نائومێدییەکی زۆر کرد. شوورەکانی ئیشبیلیا لە چاومدا زۆر بچووک بوونەوە، تا بوونە زیندانێکی بەردینی گەورە. تەمەنم گەیشتبووە بیستوپێنج ساڵ لەم دنیا فراوانەدا تەنێ مورسیە و ئیشبیلیام دیتوون. چاوم پڕ ئەسرین بوون، باوکم دڵی نەرم بوو، گوتی:

- کوڕی شیرینم خەم مەخۆ، کە لە سەفەرەکەم گەڕامەوە، کەڕەتی داهاتوو بۆ قورتوبە لەگەڵ خۆم دەتبەم. دوای دوو مانگ گەڕایەوە، سندووقێکی گەورەی زاخی لەگەڵ خۆی هێنابوو، گوتی هاوڕێیەکی

بازرگانم ئەمەی پێ سپاردووم. ئەمن چەند فیکرم لێ کردەوە نەمزانی ئاخۆ بۆچی جێگەی ئەو سندووقە، کە قەبارەکەی دوو هێندەی منە لەنێو بەلەمەکە بووەتەوە، کەچی جێگەی من نەبووەتەوە!
باوکم زۆر دڵخۆش دیاربوو. خەلیفە بەم شاندە زۆر ئاسوودە دەبێت، بە ئامادەبوونیان سۆزی بۆ ئیشبیلیا دەخرۆشێت. هەر یەکەو بەخششێکی باشیان دەداتێ. پاشان نامەیەک بۆ والییەکەی دەنووسێت:
" خودا وەفای لەگەڵمان نواندووە، سەرانە و داهات و دەستکەوتێکی زۆرمان دەستگیربووە، بۆیە داوا دەکەین سەرانە لەسەر خەڵکی ئیشبیلیا هەڵگرن و لەمڕۆ بەدواوە، هیچ شتێک لە خەڵکەکە وەرنەگیرێت... سوپاس بۆ خودای تاقانە."
هەر ئەو ڕۆژە والی ئەمەی ڕاگەیاند و داوای لە مەلاکان کرد، ئەمە لە وتارەکانیان باس بکەن و نزای سەرکەوتن و شکۆمەندیش بۆ خەلیفە بکەن، بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی لە فەرمانی دەردەچن تەفروتوونایان بکات.
خەلیفە ئەسپێکی ڕەسەنی عەرەبی دابووە باوکم، هەروەها خشڵێکی مەراکیشیشی بۆ دایکم ناردبوو. بەڵام دایکم دوای ئەوەی، کە زانی خەلیفە کەنیزەیەکی قشتالی داوەتە باوکم، خشڵەکەی لەبەرچاوان کەوت. ئەو ژنە قشتالییە یەک لەو کەنیزانە بوو ساڵانە بەزۆر وەک بەشێک لە سەرانە لە (ئەلفۆنسۆ) وەردەگیران و دەبرانە کۆشکی موەحیدەکان. دوای دوو هەفتان، پاش گەیشتنی بەخششەکانی خەلیفە بە والی، ڕۆژێک دوو سەرباز لەنێو کەژاوەیەکدا خاتوو(دوڕە)یان بۆ باوکم هێنا، باوکم دەستبەجێ بردیە ژووری خوشکەکانم، پاشان چووە لای دایکم و گوتی:
- نوورەگیان! گوێم لێ بگرە، خەلیفە کەنیزەیەکی بۆ ناردووم، من نامەوێت منداڵم لێی بێت، تکایە کێشە دروست مەکەن و بەدفەڕی مەنێنەوە.

دایکم لەبەرانبەر باوکمدا بەرگەی گرت و بەڵێنی گوێڕایەڵبوونی پێدا، بەڵام هەرکە چووە دەرەوە بە خامۆشی دەستی بە گریان و واوەیلا کرد، بالیفی لەنێو دەمی خۆی نابوو بۆ وەی دەنگی دەرنەچێت. هێندە گریـا تـا کڵوکۆی دامرکـا، ئینجـا چووە ژووری کچـەکـان، بینی دورەخاتوون بەبێدەنگی دانیشتووە، کچەکانیش دەیانەوێت لێی نزیک بکەونەوە و قسەی لەگەڵ بکەن. دایکم پێی گوت هەستە وەرە لەگەڵم. هـەموو ژوورەکـانی مـاڵـەوەی لـەگـەڵـدا گـەڕا، فێری کرد چۆن جلی باوکم دەشـوات و چۆن جێخەوەکەی بۆ چێ دەکات، چۆن ئاوی بۆ گەرم دەکات و گەرماوی بۆ پاک دەکاتەوە. لە ئاخریش پێی گوت:

- لەمڕۆ بەدواوە تۆ لە هەمووشـتێکی گەورەکەی خۆت بەرپرسـی.

وەختێـک بـاوکم ئێوارە گـەڕایـەوە، دایکم زۆر بـە گـەرموگوڕی و دڵخۆشی پێشوازیی لێکرد، پاشان پێی گوت:

- خودا کەنیزەکەت بەرەکەتدار بکات. هەموو شـتێکم بۆ باس کرد، پێم گوت چۆنچۆنی خزمـەتی تۆ بکـات. وەک دەبینی من پیربووم و توانای کارکردنم نەماوە. سـەرئێشـەیش لە کۆڵم نابێتەوە. ئەگەر ڕەزامـەندی بفـەرموویت من و کچـەکانم لـە هـەردوو ژووری بەری خۆرهـەڵات دەمێنینـەوە و تۆ و دورەی کـەنیزەشـت لـە هـەر دوو ژوورەکـەی خۆرئاوا نیشـتـەجێ بن. موحیبیش بـا لـە ژوورەکـەی خوارەوە بێت. ئـەوە بـاشـتـرە بۆ تۆ لـەوەی هـەموو شـەوێـک گوازەگوازی ئەوجێوجێ بکـەیت. بـاوکم ڕێگەی پێدا، هـەرچـەند بە ڕوواڵەت خۆی وا دەرخسـت کە پێی ناخۆشـە، بەڵام وا دیاربوو زۆری پێ خۆش بوو. ڕێک بە پێچـەوانەی من، خۆم دەردەخسـت کەیفسـازم، بەڵام هەتا بڵێی دڵتەنگ و نیگەران بووم. هیچ شـتێک لەو ماڵەدا هیممەتبەرزی و گەیشـتن بە موورادم پێ نابەخشـێ. دایکم خەریکی گریانە، باوکیشـم لەنێوان دین و دنیادا تێماوە. خوشـکەکانم بوونەتە دەسـتەژن، ئێسـتا پەچە و چارۆگە دەپۆشـن، بەڵام هێشـتا نازانن جیاوازیی نێوان عەدەس و عەلەس بکەن. ئەوان تەنیا بایەخ بە

حیکایەت و، چاوەڕوانیی خانمانی ئارایش و، گوتنەوەی سروود و هۆنراوە دەدەن. سەلوومیش کڕوماتە و قسە دەگەڵ کەس ناکات، هەروەک گایەک وایە لە ناعوورێک بەسترابێتەوە، کاری تەنیا خواردن و کارکردن بێت و بەس. هەستم دەکرد خانەوادەکەم ڕێگەی ڕۆیشتنم لێ دەگرن و لە گەیشتن بە ئاواتم پێشم لێ دەگرن. خۆ هێشتا دایک و باوکم هێندە پیر و کەنەفت نەبوون تا بەسەروکاریانەوە بم، هێشتا خوشکەکانم مێردیان نەکردووە، تا ئەوەی ماڵیان لێ چۆل بووبێت.

ئەسیرێک لە سینمدایە، دەیەوێت بفڕێت. خۆرێک لە چاوەڕوانیی هەڵهاتندایە. قافڵەیەک، چاوەڕێی ڕۆیشتن دەکات. لە ماڵەوە باوکم بە کەنیزەکەیەوە خەریکە، دایکیشم بە کچەکانی، لە دەرەوەی ماڵیش هیچ شتێکی نوێ نییە.

حەلقە و مەجلیسی زانست و زیکریش خامۆش بووە، ئێ ئاخر خەلیفە ڕۆیشت و هەرچی زانا و فیقهزان و فەیلەسووف و حەکیم هەبوو لەگەڵ خۆیدا بردنی. ئیشبیلیا ئاوی تێوەرکراوە، شتێک نەماوە بەناوی فیکر و عەقڵ. لە تێکڕای شار، شێخێکی جێ متمانە نەماوە نەچووبمە دەرسەکەی و کتێبەکانیم نەخوێندبنەوە. پەڕاوگە و کتێبفرۆشێک نییە سەرم بە دووکانەکەیدا نەگرتبێت و دەستنووسەکانیم هەڵگێڕ و وەگێڕ نە کردبن. شێخ یووسف کومیش لە منتیار چووەتە خەڵوەت و هیچ وانەیەک ناڵێتەوە. بێمەیلیی خۆی بەسەردا کێشاوم، ئەوەیش یەک لە شەیتانەکانە، کە هیممەت لەنێو دەبات و عەزیمەت دەپوکێنێتەوە.

ڕۆژێک لەگەڵ ئەحمەد حەریری بەبێ گوێدانە هیچ چتێک، پیاسەیەکمان بۆ دەوروووبار کرد. ئەو ئەگەرچی دووساڵ لەمن گەورەتر بوو، بەڵام باڵای کورتتر بوو ، وا دەردەکەوت کە برا بچووکی من بێت. باویەمان کڕین، لە کەناری ڕووبار دانیشتین و دەستمان بەقسان کرد. من دەرگەی قسەکردنم کردەوە و گوتم:

چیتر بەرگەی ماڵەوە ناگرم. دایکم بەردەوام سەری دێشێت. خوشکەکانم بەکاری خۆیانەوە خەریکن. باوکم لەنێوان کۆشک و کەنیزەکەیدا هەر هاتوچۆیەتی. پیرەژنەکەی پشت ماڵمان نەک هەر جنێو دەدات، بەڵکە بەرد و نەعلەیش لە هەموو ئەو کەسانە دەوەشێنێت، کە بەپێش ماڵیدا ڕەت دەبن. حەریری بە بیستنی ئەو قسانەی من، یەک بە دەمی خۆی پێکەنی و گوتی: بەخوا حاڵی ماڵی منیش لە هیی تۆ باشتر نییە. دایکم پیربووە و توانای بەخێوکردنی خۆیشی نەماوە، براگەورەکەم کە بەرگدرووە، بەخێوکردنی خستووەتە ئەستۆی خۆی. باوکمان لە سوپای مورابیتەکان سەرباز بوو، لە کاتی هاتنی موەحیدەکان بۆ ئەندەلوس وەفاتی فەرموو.

- پێت چۆنە ڕاکەین؟

بە لفتێکی خۆش و ناوەرۆکێکی تفت، ئەم پرسیارەی کرد. منیش سەری خۆم ڕاهەژاند و بزەیەکم کرد و گوتم:

- برا یا دەچینە میسر، یان دیمەشق، یانیش (دار السلام).

ڕاستییەکەی ئەمن دڵم بۆ هەموو ئەو شارانە لێی دەدا. چێژم لەو قسانەی ئەو وەردەگرت، ئەگەرچی بە گاڵتەوە دەیکردن. ئەو بەدەم چواڵەخواردنەوە، خەریکی خەیاڵپلاوی بوو، ورد لە ئاسۆکە ڕامابوو، کە لە کلکەی ڕووبارەکە ون دەبوو:

- ئەرێ باسوخواسی (ئیبن جوبێری غەرناتی)ت بیستووە، کتێبێکی لای کتێبفرۆشەکان هەیە.

- باسی چی دەکات؟

- باسی گەشتەکەی بۆ مەککە دەکات. خەڵک حیکایەتێکی زۆر خۆش و پێکەنیناوی لێ دەگێڕنەوە.

- جا حیکایەتەکە چییە؟

خۆی ڕاستکردەوە و لایەکی لێ کردمەوە و ئەوەی لە دەمی بوو قووتی دا و بە مەشرەبێکی خۆشەوە گوتی:

- ئەو پەڕاوفرۆشـــەی کتێبەکەم لە دووکانەکەی خوێندەوە گوتی: والیی غەرناتە بەدوای جوبێریدا نارد نامەیەکی بۆ بنووســێت، ئەویش کە دەچێت دەبینێت خەریکی مەینۆشـــییە. فەرمووی لێ دەکات، ئەویش وەری ناگرێت و نایخواتەوە، ئاخر ئەو کەســێکی لەخواترس و موتتەقییە. والی بەمە تووڕە دەبێت و سـوێند دەخوات، کە دەبێت حەوت بادە بەسەریەکەوە فڕ بکات.

حەریری لێرە حیکایەتەکەی بڕی و دەستی بە پێکەنین کرد و چاوی لێ ئەبڵەق بوون، ئەوسا گوتی:

- بیر لە کەسێک بکەوە، کە قەت مەی نەخواردبێتەوە، ڕۆژێک حەوت بادە بەدوای یەکدا بخواتەوە، چی لێ دێت؟

دیســان حەریری لە قرتەی پێکەنینی دا و توونـد سـکی خۆی گرت، ئەمنیشی وەپێکەنین خست، بە چاوی پڕ ئاوەوە گوتی:

- کتێبفرۆشەکە دەیگوت وەختێک جوبێر بادەی حەوتەمی خواردەوە، هەستایە سـەرپێیان و بەربووەوە، پاشــان ڕشـایەوە و هەرچی لە سـکیدا بوو هێنایەوە و بەســەر ڕوویدا کەوت. والی کە بەم دۆخەی بینی، بەزەیی پێدا هاتەوە، داوای لە پاســـەوانەکەی کرد، کە هەر حەوت بادەکەی بۆ پڕ لە دیناری زێڕ بکات.

- ئەگەرچی ئەمە زۆر لەوە کەمترە، کە تەقواکەی بۆ قەرەبوو بکاتەوە!

- ئیبن جوبێر هەڵدەســتێتەوە و پارەکانی هەڵدەگرێ و دەڕوا. بڕیار دەدات وەک کەفارەتێک بۆ گوناهەکەی، ئەم پارەیە لە خەرجی حەجکردن ســـەرف بکات. ئیتر بۆ حەجکردن دەچێت، بە میســـر و عێراق و (سـقیلە) تێپەڕدەبێت، وێجا کتێبەکەیشـی دەنووسـێ، کە بە دڵنیاییەوە باسی هۆکاری گەشتەکەی تێدا نەکردووە.

- لەکوێ ئەو کتێبە دەست بخەم؟

- بڕۆ بۆ لای کتێبفرشە توونسییەکە، دووکانەکەی لەنێوان مزگەوت و ئـەو ڕێڕەوەیـە، کـە دەچێتـەوە بـازاڕی زێڕنگـەران. بێگومـان

دەیناسییەوە، چاوی ڕاستەی خێلە، دووکانەکەیشی مەیلەو خێچە و شێوەیەکی سێگۆشەیی وەرگرتووە.

- چۆن ئەو کتێبفرۆشانە دەناسیت؟ من قەت ئەو کتێبفرۆشانەم نەدیون.

- زۆربەیان دوای ئەوەی کتێبەکان دەنووسنەوە، بۆ لای محەمەدی برام دێنن تا بۆیان جزوبەند بکات. هەر بۆیە هەموویان دەناسم، بێ بەرانبەر کتێبیان لەلا دەخوێنمەوە.

- دەی کەواتە سبەی دەچین.

## ١٧

**" ئەو خواناسییەی هەر تەنیا لە یەك بابەتدا كورتهەڵدێنرێت، هیچی لێ سەوز نابێت"**
**ئیبن عەرەبی**

دوای ئەوەی حەریری پەڕاوفرۆش و کتێفرۆشـەکانی پێ ناسـاندم، بازاڕی ئەوان بوو بە ماڵی دووەمی من. بەڵام من بێ بەرانبەر کتێبم نەدەخوێندنەوە، بەڵکە هەر کتێبێکم داوا دەکرد، دەسـتبەجێ پارەم دەدانێ. هەتا کتێبەکە دەگمەن و سـەیرتر بوایە، فزووڵیی من بۆی زیاتر دەبوو، گەڕانیش بە دوایدا سەخت و دژوارتر دەبوو.
کتێبفرۆش بە کتێفرۆش بەدوایدا دەگەڕام، دەیانبردمە کۆگەی کتێبان، نێو کۆنەکتێبان دەگەڕان. دەیان جار ئەو ڕێگەیەم تەی دەکرد و بەدوای کتێبدا دەگەڕام. هیچ کتێبفرۆشـێک نەبوو نەچمە لای، تەنێ ئەو کتێبفرۆشـانە نەبێت کە کتێبی قشـتالی و یۆنانییان دەفرۆشـت، ئاخر من تاقە پیتێکم لەو کتێبانە نەدەزانی. لەکن ئەو کتێبفرۆشـانە وەرگێڕ هەبوون هەر کتێبێکیان بە دەیەکی کێشـی زیو بۆ زمانی عەرەبی وەردەگێڕا. جارێک چوومە لای یەکیان کتێبێکی یۆنانیم پێبوو، کتێبەکەی بۆ کێشـام، نیوەی پاداشـتەکەم پێدا. پیاوێکی تەمەن شێست ساڵیشی لەکن دانیشتبوو، شێوە و ئادگاری بە قشتالییەکان دەچوو، کوڵەبنە بوو، چاوەکانی زۆر جوان بوون، هەر کەسـێک

بەویدا دەڕۆیشــــت بزەیەکی بۆ دەکرد. لەو کتێبەی من ڕاما، کە لە تەرازووی وەرگێڕدا بوو، تەماشایەکی کردم و وەک سەرسامبوونێک بەو کتێبە سەری خۆی بادا. سڵاوی لێ کردم و گوتی:

- من نیوەی هـەقی وەرگێڕەکە دەدەم، بـە مـەرجێک دوای وەرگێڕان بینووسمەوە.

- زۆرباشە، بەڵام دەبێ پێشتر من بیخوێنمەوە.

- بەڵێ، بەڵێ، هیچ پەلەم نییە.

ئەو کابرایە ناوی فریدریک بوو. خودا نزاکەی منی گیرا کرد، بێمەیلی لـە دڵ لادام، تـەنبـەڵی لـە عـەقڵ وەلانام. فریدریک وەک من بوو، هیچ دووکانێکی لای پەڕاوفرۆش و کتێبفرۆشەکان نەبوو، بەڵام بەردەوام هامۆشۆی دەکردن. ڕۆژبەرۆژ نێوانمان خۆشتر دەبوو، ئەو وەڵامی هـەموو پرســــیارێکی لـەبـارەی کتێبی گریکی و فـەرهـەنگی دەدامەوە، زۆریش لەبارەی کتێبگەلی هیندی و چینی شـارەزابوو، کە هێشتا بۆ زمانی عـەرەبی وەرنـەگێردرابوون. ڕۆژێک بـانگهێشـــتی مـاڵـەوەی کردم، منیش بۆ حەریری ڕووخسـەتم لێ خواسـت، ئەویش ڕازیبوو. لـەگـەڵ حـەریری چووین، لـە دەرگـەمـان دا فرێـدریـک بـە دەمی بەخەندەوە هاتە دەرەوە، خۆشحاڵیی خۆی نیشان دا و بە شێوەزاری قشتالییەکان فەرمووی لێ کردین.

لە مەجلیســی ئەودا، نۆ پیاو و دوو ژن دانیشــتبوون. لەناوەڕاســتدا کەسێک کتێبێکی دەخوێندەوە، ئەوانی دیش گوێیان بۆ قولاخ کردبوو. بەخێرایی چاوێکم بە سـەروسـەکوتیاندا گێڕا، ڕەنگی چاو و سـەریان جیاواز بوو. عەرەب و زڕەعەرەب و فەڕەنگ و بەربەریان تێدا بوو. فرێدریک هێمـایەکی بۆ کردین و لە نزیک دەرگە دانیشـــتین، جوان گوێمان بۆ شل کرد، دیارە قسـەکان لەبارەی فیسـاگۆرسـەوە بوون، بەیۆنانی دەیخوێندەوە، ئینجا وەری دەگێڕایە ســــەر زمانی عەرەبی. لە خوێندنەوە و وەرگێڕان بەردەوام بوو، دواتر لە مەجلیس هەســتا و هاتە لای ئێمە دانیشت. پیاوێکی دیکە هەستا و چوارمەشقی لەنێو

مەجلیس دانیشـــت و ئەویش کتێبێکی دیکەی یۆنانی خوێندەوە و وەری گێڕایە سەر زمانی عەرەبی.
ئەو پیاوەی پێشـــتر قســـەی کرد، گوتی: "تەنیا لۆژیک خلوود و جاویدانییە، هەمووشـتەکانی تر کاتین و لەبەین دەچن." سـەرم لەبن گوێی حەریری نا و بە سـرتە پێم گوت: "بەخوا ئەم قسـانە بوون سەریان لە ئیبن ڕووشد شێواند." من و حەریری زۆربەی شەوانی شـەممە و یەکشـەممە دەهاتینە مەجلیسـی فریدریک، ئەویش بە ئامادەبوونی ئێمە دنیایەک دڵخۆش و شـاد دەبوو. من هەندێک جار لە پێش وادەی دانیشـتنەکە دەگەیشـتم، لەگەڵ فریدریک و کچەکەی دادەنیشتم، تا ئەوانی دی دەهاتن قسەمان دەکرد.
- جەنابی فریدریک کەی هاتوویتە ئیشبیلیا؟
- من نەهاتووم، هەر لێرە لەدایک بووم.
- باوکت؟
- باپیریشم لێرە بووە، پێش ئەوەی موەحیدەکان بێن، (ئوسقوف)ـی کڵێسایەک بووە.
- یانی لە سەرەتاوە لێرە بوویت؟
- نا، بەرەو باکوور ئاوارەبووین، من ئەوسـا منداڵ بووم، لە گوندێک لە نزیکی (تیلتلە) ژیانم بەسەر بردووە.
- ئەی بۆچی گەڕایەوە؟
- لەبەر جەنگ.
- جەنگی نێوان مورابیت و موەحیدەکان؟
- نانا، لە قشتالە لەسەر وەسیەتەکەی (ئەلفۆنسۆ)ـی هەشتەم، کە لە منداڵییەوە عەرشی دەستەڵاتی گرتبووە دەست، جەنگێک هەڵگیرسا. بیرم کردەوە بڕۆمە فەرەنسـا لای مامەکانم، بەڵام ترسـی ئەوەم هەبوو ئەو کتێبانەی لە باپیرمەوە بۆم جێ مابوون، زەوت بکرێن یان بسـووتێنرێن. یەک کتێبخانەی پڕ لە دەسـتنووسـی یۆنانی لەدوا جێما، بەشـێکیانی بە دەسـتی خۆی تەرجەمەی عەرەبی و قشـتالی

کردبوون. دواتر بیســـتم موەحیدەکان وەک مورابیتەکان ئەزیەت و ئازاری گاورەکان نادەن. هاوژینەکەم ئەمری خودای کرد، ئەوکات گالای کچیشم چواردەسالان بوو، بۆ ئیشبیلیا کۆچمان کرد.
وەک بلێی گالاخان گوێی لە ناوی خۆی بوو، هاتە ژوورەوە جلێکی درێژی لەبەردا بوو، جگە لە گەردەن و ڕوخســار و قژە ئالۆزکاو و زۆرەکەی، هەموو جەســتەی داپۆشـیبوو. چاوەکانی بچووک بوون، بە تەماشــاکردنی من زۆر ئاســوودە نەبوو. وەک ئامادەباشــی بۆ هاتنی مێوانان، ڕایەخەکانی تەکاندن و لەســەر دیوار دەقی کردن. فرێدریکیش دەربارەی گەڕانەوەی بۆ ئیشــبیلیا بەردەوامی بە قەسەکانی دا:
- کە گەڕاینەوە تەماشــام کرد خانووی ماڵی باپیرم چۆلە و کەســی تێدا نییە، منیش یەکســەر کڕیم. باخچەی (بەهشــیە)یشــم لە دەوروبەری ئیشــبیلیا کڕی. لە بەهاران زۆر خۆش و بەردڵ دەبێت، ڕۆژێک لەوێ داوەتتان دەکەم. کرمی ئاوریشــم دەبینن، کە بۆیەی جلوبەرگی لێ دەردەهێنرێت، ژنە قیبتییەکان زۆر حەزی لێ دەکەن. من ئەوە بە قافڵەگەلی بازرگانیی نێوان ئەندەلوس و فەرەنســا دەفرۆشم.
لە دەرگە درا، خاتوو گالا بلەز دەرگەی کردەوە. گەلی پیاوان وەژوور کەوتن، هێشتا ناوی بەشێکیانم نەدەزانی. بە چەندان زمان ســەلامیان کرد، ســەلامە عەرەبییەکانم وەردەگرتەوە. ئێرەییم بە فرێدریک و گالا برد، ســەلامی هەموو خەڵکیان وەردەگرتەوە، بە زمانێکی ڕوون و ڕەوان قسەیان بە عەرەبی و قشتالی دەکرد.
فرێدریک مەی بۆ هێنایین، من بادەیەکم وەرگرت، حەریری نەختێک دوودڵ بوو، بەلام کە منی بینی، ئەویش وەری گرت. قومێکم لێی خواردەوە، ســەرنجی پەشــۆکان و ســەرســووڕمانی حەریریم دا. بەهەرحاڵ، من شــەڕابەکەی خۆم تەواو کرد، هێشــتا حەریری دەمی بۆ نەبردبوو. دواتر لام لێ کردەوە و پێم گوت:

- ئەوە بۆ ناخۆیتەوە؟
- دەترسم.
- لە کێ دەتەرسی؟
- دەترسم خودا لەسەر ئەو گوناهە گیانم بکێشێت.
- بەڵام تۆ لەسەر گوناهـ نیت!
- چۆن چۆنی؟ ئەی مەی حەڕام نییە؟
- بەڵێ. بەڵام تۆ ئیمانداری، ئیمانت لکاوە و گوناهت پچڕاوە. ئەگەر خودا گیانت بکێشیت، بە ئیمانەوە دەیکێشێت، کەواتە سەرئەنجامت باش دەبێت.
- بەڕاست؟
- بەڵێ.

حەریری بادەکەی لە دەم نزیک کردەوە و نەختێکی لێ فڕکرد. تەماشایەکی کردم و منیش دنەم دا. بزەیەکی کرد و منیش زەردەیەکم بۆ کرد. هێمای گەمەوگەپ لەسەر ڕوخساری دروست بوو، تەواوی بادەکەی هەڵقوڕتاند. فرێدریک دیسان بادەکەی بۆ پڕکردینەوە و ئەویشمان فرمان کرد. حەریری پرسیاری لێ کردم:
- کێ ئەو فەتوایەی بۆ دایت، کە ئیمان (لکاوە) و گوناهـ (پچڕاوە)؟
- کەس فەتوای بۆ نەداوم. خوا وەهای بۆ کەشف کردووم. حەریری ترپی بادەی سێیەمیشی هەڵچۆڕاند و گوتی:
- سەیرە! من لە هەموو دەرس و دەورێکدا لەگەڵ تۆ بووم، کەچی خودا ئەوەی بۆ من کەشف نەکردووە.
- کەشف بە گوێرەی عاریفەکە دەبێت، گەرەکە خودان زەوق و سەلیقە بیت.
- ڕاست دەفەرموویت. دەربارەی زەوق و چێژ: ئەمن قەت شەڕابێکی هێندە خۆشم نەخواردیتەوە.
- هەی درۆزن! ئەوە یەکەمجارە لە ژیانتدا دەخۆیتەوە، زەوقی چی و حاڵی چی!

- یا ئەڵڵا! خودا ئەمەیشی بۆ کەشف کردیت.
بە گاڵتەجاڕییەکەی پێکەنیم و گوتم:
- چاوە مەستەکانت ئەوەیان بۆ کەشف کردم.
- ئەری چەند بادەمان خواردەوە؟
- چوار.
- واتا کەمتر لەوەی ئیبن جوبێر، بۆ ئەوەی وەک ئەو سـەفەر بکەین، دەبێ حەوت بادە بخۆینەوە.
بانگی فرێدریکمان کرد:
- سـێ بادەی ترمان دەوێت، ئاخر دەمانەوێـــت بەرەو خۆرهەڵات گەشت بکەین!

# ١٨

**"چۆن ئاو بە شووشە ڕەنگاوڕەنگ دەبێت، وەهایش هەقیقەت بە وشیاریی عاریف، فرەڕەنگ دەبێت"**
**ئیبن عەرەبی**

خاتوودوڕە، شـــەوی یەکەمی لەگەڵ باوکم بەڕێ کرد و باوکیشـــم تاســـە و تامەزرۆیی شـــکا و بەڵێنی بەجێهێنانی پەیمانەکەی پێدام. لـەگـەڵ قـافڵـەیـەکی دووروودرێژ، ڕێگەی قورتوبـەمان گرتەبەر. لەنێو قـافڵـەکـەدا نێردەی والی هـەبوون، نـامـە و مـاڵ و کـاڵا و کەلوپەلیان پێبوو. نیمچـەبازرگانیشـــمـان ڕەگـەڵ کـەوتن، چونکێ قـافڵەکانیان بچووک بوون، بۆ خۆچەپاڵەدان و پارێزی لەگەڵ قافڵەی والی لێکیان دابووەوە. بڕێک خزمەتکار و بەندە و کرێکاریش، کە بۆ خزمەتکردنی مە هاتبوون، لەنێو قافڵەکە دەبینران. باوکم دەمڕاســـتی قافڵەکە بوو، هەموویان فەرمانیان لەو وەردەگرت. سەرەتای مانگی ڕەمەزان بوو، لـە دەروازەی خۆرهـەڵات دەرچووین و بـەرەو بـاکوور و ئینجـا خۆرهەڵات ڕۆیشتین. ڕێگە پێویستی بە ڕێوان و ئەستێرە و فیراسە نەبوو. ڕووبارە گەورەکە لەنێوان هەردوو شـارەکە بوو، ڕێکوڕاسـت دەڕۆیشـــت، تەنێ لە هێندێک شـــوێن خواری و خێچی تێ دەکەوت، کاروانچییەکان تا شـوێنی مەبەست، دەبوو لە هەمبەر ئەو ڕووبارەدا بڕۆن.

ڕۆژی دواتر، ڕەوە کەرەکێوییەکمان بینی، چەند کەسێک دوایان کەوتن و ڕاویان کردن. داوام لە باوکم کرد ڕێگەم بدات لەگەڵیاندا بچم، بەڵام ئەو بەتووندی بەڕوومدا هەڵشاخی: خۆ بۆ ڕاووشکاری نەهاتووین، لە سەفەردایین و منیش ئەمینداری ئەو قافڵەیەم. ئینجا گوتی:

-... بەتایبەتی لە کاتێکدا پورتوگالییەکان بۆسەیان لە قافڵەکانمان گرتووە.

- باوکە بۆچی؟ ئێستا لەگەڵ ئەواندا لەجەنگ داین؟

- بەڵێ بەدڵنیایی. ئەی نازانیت لە چ بارێک داین؟ هێزی دەریایی خەلیفە نیوەی کەشتییەکانی ئەوانی تێک شکاندووە.

- بۆچی بەیەکجاری لەناوی نەبردن؟

- کارەکە هێندە ئاسان نییە، پرتوگالییەکان لە هەموو فەرەنگەکان ئازا و لێهاتووترن.

- ئەوان هەڕەشە لە قافڵەکان دەکەن؟

- دەستیان بەسەر چەند قافڵەیەکی ئێمەدا گرتووە و قافڵەوانەکانیشیان کوشتوون.

- ئەی چارە چییە؟

- هەواڵمان هەیە خەلیفە لە مەراکیش بۆ جەنگی وان، نوێژی ئیستیخارەی کردووە.

لە ڕۆژی سێیەمی سەفەرەکەماندا، لە دوورەوە سنووری قورتوبەمان لێ دەرکەوت.

دەوروبەری عەسر گەیشتین، تووشی چەند سووکەڕێکەوتێکی سەیر بووم: پیاوەکانی وێ، پێچەیان لەسەر نەنابوو، قژی خۆیان بەسەر شانیاندا بەردابووەوە. شەقامەکان بەو فانۆسانەی شەوان دادەگیرسێن و ڕۆژان خامۆش دەبن، ڕووناک بووبوونەوە. خانووەکان پێکداچووبوون و تێکئالابوون، هیچ کۆلانێکیان لەنێودا نەبوو تا گوفەکی زبڵ و خاشاکی تێدا کۆبێتەوە، یان سواڵکەران تێیدا

بخەون. چەند گالیسکەیەکم بینی بە گا ڕایاندەکێشان، بە گەڕەکەکاندا دەسووڕانەوە، زبڵ و خاشاکیان کۆدەکردەوە. خەڵک بەگشتی جلی جوان و ئاڵووالایان پۆشـــی بوو، هەر دەتگوت ڕۆژی جەژنە. بەرەو بازاڕ چووین. هـەندێک منداڵە بازرگان هاتن بزانن چ کەلوپەلێکمان پێیە. ئـەو نیمچـەبـارزگـانـانـەی لـەگـەڵمـان بوون هـەر زوو کـالا و کەلوپەلەکانیان ســـاغ کردەوە. بەر لەوەی بگەینە جەرگەی شـــار، کۆمـەڵێک ئـەســـپیان لـە کۆشـــکی والی بەپیلەوە هێناین و بەرەو کۆشکیان بردین. باوکم نووسراوە ڕەسمییەکانی قافڵەکەی تەسلیمی کاتیبانی کۆشـــک کرد و ئەوانیش وەریان گرتن و تۆماریان کردن. پاشان قافڵە پەرتوبڵاو بوو: سەرباز، بۆ خانەی سەربازان. بازرگان، بۆ خانەی بازرگانان. من و باوکم و بەندەی خزمەتکاریشـــمان چووینە مێوانخانەیەکی تایبەتی والی لە نزیک مزگەوتی گەورە. ئاوێکمان بەخۆدا کرد و تۆز و چڵکی ســـەفەرمان لەخۆ کردەوە. قەمیس و بێجامـەیەک و جوبەیەکم دەبەر کرد. ســـەرم کۆت کرد، یەک لە کارگوزارانی گەرماو، قژی بۆ داهێنام و خاوی کردەوە، تا ســـەر شـــانەکانم هات. چوومە لای باوکم، بینیم ئەویش خۆی شۆردووە و خەریکی پونگاوخواردنەوەیە، بەم سـەر و شکڵەی من پێکەنی:

- ڕۆڵە! بوویە قورتوبی؟

- ئـەی گوێت لـەو وتـەیـەی ئیمرۆزی فـەڕەنگی نـەبووە: "ئەگەر ڕێت کەوتە ولاتای ڕۆما، وەک ئەوان ڕەوتار بکە."

- ئەمەت لەکوێ بیســتووە؟ نەمزانیوە لە ئیشـبیلیا هیچ هاوڕێیەکی فەڕەنگیت هەبێت.

- ئەو وتەیەم لە پیاوێک بەناوی (فرێدریک) بیســـت، لە مەجلیســـی ئەودا باسـی ڕۆم و گریک و زانسـت و ئاداب دەکرێت، کالای کچی ئەو وتەیەی فێرکردم.

باوکم بە هەستیارییەوە پێکەنی و گوتی:

- خاتوو گالا چۆن بوو؟
- وەک هەموو کچە فەرەنگییەکان شۆخوشەنگ بوو.
خۆی ڕاستکردەوە و لای لێ کردمەوە و گوتی:
- کوڕی خۆم، نابێ ژن لە فەرەنگان بخوازیت، تێگەیشتی؟
- خۆ من نەمگوتووە حەزم لێیەتی. بابەگیان من هەر ژن ناهێنم، ژنهێنان و کەسی وەلییان نەگوتووە!
- بۆ تۆ بوویتە وەلی؟
- هێشتا نا، بەڵام بە ئیزنی خودا دەبمێ.
- یانی دەتەوێت ببیە ئەو وەلییە سەرگێژ و گێلانە، کە بێ هیچ ڕێنوێن و ڕێوانێک بە ڕێگەدا دەڕۆن؟
- ئەمن بە ڕێنوێنیی خودا دەڕۆم، ڕێنمایی خودا دڵمان ڕۆشن دەکاتەوە، ڕێنوێنی کەس وەک هیی ئەو نییە.
باوکم هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:
- کوڕە شیرینەکەم ئەگەر پێت وایە ئەو تەمەنەی لە خزمەتکردنی کۆشک بەسەرم بردووە بۆخۆم بووە، هەڵەیت. من ڕێگەم بۆ تەخت کردی، چەندان ساڵم بۆ کورت کردیەوە، کارە گرنگەکانم بۆ ئاسان کردی، ئێستە هەقی ئەوەم هەیە داوات لێ بکەم لەکن یەک لە کاربەدەستانی کۆشک ببیە کاتیب، لەوانەیە دواتریش ببیە کاتیبی تایبەتی خەلیفە.
- نا باوەگیان، نا. تەنیا دەمەوێت ببمە وەلی.
- ئاخر چۆن دەبییە وەلی؟
- خودا خۆی ئەولیاکانی بژاردە دەکات، ئەوەندە بەسە من خۆم بۆ ئەو بژاردەیە ئامادە بکەم، بۆ قەدەری ئەو، خۆم ساز و تەیار بکەم.
- یانی هەتا ئەو کاتەی خودا دەتکاتە وەلی، بێکار دەسووڕێیتەوە؟
- نا باوە، بە دوای زانست و زانایاندا دەگەڕێم. ئەوەم پێخۆشترە لە کاری کۆشک و خەلیفە. تکایە مەمخەرە ژێر بارێک، کە پێم ناخۆشە، دڵی من هۆگری خودا بووە، تەوەللام مەکە.

باوکم قاچێکی بە تەنیشتمەوە کێشا و گوتی:
- ئەعوزوبیللا... بۆ ڕۆڵە وا دەزانی من شەیتانم تا لە خودات تەوەللا بکەم! هەستە لەبەرچاوم ونبە، خودا بەزیادت نەکات.

بە درێژایی ئەو ڕۆژە لەبەرچاوی باوکم گوم بووم. بۆ سەردانی دادەفاتیمەی کچی موسەننا ڕۆیشتم، مەودایەکی زۆر بەپێیان ڕۆیشتم، دواتر گەیشتمە ماڵەکەی، لە کۆتا گەڕەک، بەسەر ڕێگەی زبڵدانی شار، لە ژوورێکی بچووکدا بوو. زبڵ و خاشاک دەسووتا و دووکەڵ ئەو گەڕەکەی قانگ دابوو، هەرکەس بەوێدا تێدەپەڕی، خنکەخنکی وێ دەکەوت. لە دەرگەم دا، منداڵێکی چکۆڵە دەرگەی کردەوە، دیار بوو منداڵی ژنێکی دراوسێیان بوو، هەر ڕۆژێک کاری هەبوایە، دەهات لای دادەفاتیمە دایدەنا. منداڵەکە منی بردە ژوورەوە، بینیم دادە فاتیمە لە سووچێک دانیشتووە و لێفەیەکی ستووری بە خۆوە لوول داوە. دەست و قاچیم ماچ کردن و لەتەکی دانیشتم. لچکی لێفەکەی گرت و بەسەر منیشی داهێنا، ئەگەرچی سەرمام نەبوو، بەڵام دەنگم نەکرد. لەو سووچە لەژێر لێفەیەکدا ئاوێزانی یەکتر بووین. لە نزیکەوە تەماشای ئادگار و ڕوخساریم کرد، بە هەر چرچ و لۆچێکی تازەی، جوانتر بووبوو. بە پرسیاران دامگرت، وەک ئەو منداڵەی ماوەیەک لە دایکی ون دەبێت. ئەویش هەموو قسەیەکی لەگەڵدا کردم، وەک ئەو دایکەی منداڵەکەی لێ ون دەبێت و دواتر دەیبینێتەوە. کزی و لاوازیی جەستەی بڕستیان لێ بڕیبوو، دەنگی وەک دەنگی کچۆڵان ناسک بووبوو. دوای قسەوباسێکی زۆر، ڕووی لێ کرد:
- دایەگیان! هێشتا مێخی خۆم نەدۆزیوەتەوە.
- نا، دۆزیوتەوە.
- ئەی بۆچی خۆیم بۆ دەرناخات؟
- تاکوو دەبیە ئەهلی ئەو کارە.

- پێشـــتر گوتت تا دڵت پاک دەکەیتەوە. ئێســـتە دڵم بایی ئەوە پاک نەبووەتەوە؟
- چۆن پاکت کردەوە؟
- بە ڕەوشـــتی جوان، بە بێگەردکردنی نیازم، بە نییەتی باش، تا وام لێ کرد جگە لەمانە هەموو شکڵ و وێنەیەکی دی ڕەت بکاتەوە.
- کوڕە شیرینەکەم، ئەمە نیوەی پاکییەکەیە.
- ئەی نیوەی دی چۆن پاک بکەمەوە؟
- وای لێ بکە هەموو شکڵ و شێوەیەکی تر قبووڵ بکات.

## ١٩

**"نهێنی، له سینەی ئاشکرادا شراوەتەوە"**

**ئیبن عەرەبی**

بە هەواڵێکی زۆر ناخۆش و بەسوێ قورتوبە پێشوازیی لە ئێمە کرد، خەلەفی کوڕی بشــکوال، گەورە فەقیهی قورتوبە کۆچیدواییی کردبوو. لەگەڵ باوکمدا چووینە پرســەکەی، دیتم خەڵکەکە هەموو جلی سپییان پۆشیوە، هەر دەڵێی ڕۆژی جەژن بوو. باوکم سەرنجی شۆکبوونی منی دا و گوتی:

- ڕۆڵە ئەهلی قورتوبە لە پرسەدا جلکی سپی دەپۆشن.

- ئەی دەبێ لە چ بۆنەیەک جلی ڕەش بپۆشن؟

هەر ڕۆژێکم لەوێ بەسەر دەبرد، باشتر بۆم دەردەکەوت، کە هەموو شتێکی پێچەوانەی ئیشبیلیایە. ئەم خەیاڵەم زوو بە مێشکدا ڕەتبوو، پێم وابوو زوو لادەچێت و نامێنێت، بەڵام سەیرەکە لەوە دابوو ئەمە بوو بە باسوخواسی پرسەکە. ئیبن ڕوشد هاتە پرسەکە، خەڵکەکە یەکجێ لەبەری هەستان و بەخێرهاتنیان کرد، نیشانەی خەمباری و شوێنەواری فرمێسکی وشکەوەبووی بەسەر ڕوخسارەوە دیار بوو. بیرم لەو پیاوە دەکردەوە، ئاخر لەوەتەی پێی ناوەتە ســەر خاکی ئیشــبیلیا، باس هەر باســی ئەوە. وەختێک لە حەلقەی دەرس دادەنیشــم، مەلا و شێخ وتەکانی ئەو بە بەڵگە دەهێننەوە. کە دەچمە

دووکانی مامم، بۆ برەودان بە داودەرمانەکەی، وتەکانی ئەو لە بواری پزیشکی بە بەڵگە دەهێنێتەوە. گاوێکیش لە ماڵەوە دادەنیشم، باوکم چۆن باسی دەستوپێوەندی خەلیفە دەکات، ئاوایش باسی ئیبن ڕوشد دەکات. تەنانەت دایکم حیکایەتێکی لە ژنێکی ئارایشکەر ژنەوتبوو، دیارە ئەویش لە ژنێکی یۆنانی، کە هاوژینی بازرگانێکی ئیشبیلیی بوو، بیستبوو: ئیبن ڕوشد دەڵێ: "هیچ جیاوازییەک لەنێوان ژن و پیاودا نییە. ژنیش وەک پیاو بۆی هەیە حوکمڕانیی وڵات بکات، وەک ئەو، ببێتە جەنگاوەر و شەڕ بکات."

دایکم پرسیاری لێ کردم: موحی، شێخەکانی تۆ لەوبارە چی دەڵێن؟ ئاخر چی بە دایکم بڵێم؟ خۆ هێشتا دوو دەیە بەسەر ئازادبوونی لە کەنیزەیی تێنەپەڕیوە، کەچی وا بیر لە حوکمڕانی دەکاتەوە! بەشێک لە خانمە ئارایشکەرەکان پێویستە بەرلەوەی بچنە هەر ماڵێک دەمی خۆیان بگرن و هەتا دێنە دەرەوە نەیکەنەوە. ئەمە لەو هەفتەیەدا بوو، کە خەلیفە داوای لە هەموو نووسەرانی کۆشک کردبوو، کە هەرچی لەبەر دەستیاندایە وەلاینێن و خەریکی نووسینەوەی ڕاڤەکانی ئیبن روشد بن لەبارەی ئەرستۆ تالیس، هێندە زۆریان لەبەر نووسییەوە، تا وای لێهات کتێبفرۆشەکان دانەیان بە چارێکە دەرهەمێک دەدا.

بەیانییەک شێخ عەبدولقەییوم، کە ئەمن ئەوسا لە حەلقەی دەرسی دادەنیشتم هاتە ژوورەوە و دانیشتنەکەی خۆشتر کرد. ئەو لەسەر مەزهەبی شافیعی بوو. گوتی:

- ئەوەندەی لە کتێبەکەی پێشتر خوێندمانەوە با بەس بێت. ئەمڕۆ کتێبی (تهافت الفلاسفة) دەخوێنینەوە.

داوای لە فەقێیەک کرد کتێبەکەی لەنێو پریاسکەکە بۆ بێنێت، ئەویش چوو بۆی هێنا. شێخ چوارمەشقی دانیشت و کتێبەکەی خستە سەر ڕانی خۆی و دەستی بە خوێندنەوەی کرد، دەرکەوت یەکەم جارە دەیخوێنێتەوە و تازە بەدەستی گەیشتووە: "ابتدأت لتحرير هذا الكتاب، ردًا على الفلاسفة القدماء، مبينا تهافت عقيدتهم، وتناقض

كلمتهم، فيما يتعلق بالإلهيات، وكاشفا عن غوائل مذهبهم، وعوراته التي هي على التحقيق مضاحك العقلاء، وعبرة عند الأذكياء. أعني: ما اختصوا به عن الجماهير والدهماء، من فنون العقائد والآراء..." پاشان سەری خۆی بەرزکردەوە و ڕاستەوخۆ گوتی:

- ...قازیی قورتوبەیش لەوان دوور نییە، گوێتان لە ناوی بووە؟

- منیش پێم گوتم:

- ئیبن روشد؟

شێخ گوتی:

- دەک خودا ناهومێد و هەوڵبڕاوی بکات! لە مەجلیسی خەڵکیدا گوتوویەتی:" کاری باش ئەوەیە عەقڵ بە باش و چاکی دابنێت، کاری خراپیش ئەوەیە عەقڵ بە خراپ و دزێوی دابنێت." هەی بەدبەخت بیت! ئەی حوکم و شەرعی خودا لەکوێن؟

منیش لەبەرخۆمەوە دەمگوت:

- خۆت بەدبەخت بیت! ئەی بەشی عەقڵ و کەشفی خودا لەکوێن؟

ئەو ئیبن ڕوشدەی پێشتر دەمەتەقێ و گفتوگۆمان لەمەڕ قسەکانی دەکرد، ئا ئەوەتە ئێستە لە هەوەڵی مەجلیس لەگەڵ دەمڕاست و سەرانی شار، لەبەرانبەرم دانیشتووە. زۆر بە ڕوونی دەنگی دەبیستم. بە جوانی گوێم بۆ گرتووە، وەک ئەوەی ئاواتەخوازبم شتێک بڵێت و یەقینم بە ڕایەکەی خۆم زیاتر بێت. دانیشتووانی پرسەکە هەر باسی ئیبن بشکوالیان دەکرد. یەکێک، بە پیاوە هەرە چاکەکەی قورتوبە ناوی برد، کە لەدایکبوون و مردنی لەو شارەدا بووە. یەکێکی دیکە ئەشەدوبیلای بۆ کرد و سەری بۆ لەقاند، بەڵام ئەوەیشی بۆ زیاد کرد، کە چەند ساڵێک لە ئیشبیلیا قەزاوەتی کردووە. کەسی سێیەم لایەکی لە ئیبن ڕوشد کردەوە و پێی گوت:

- لە ئیشبیلیا بە خزمەتی گەیشتبوویت؟

ئیبن ڕوشد سەری خۆی بە نەخێر بادا.

دواتر قسە و باس هاتە سەر بەراوردکردنی نێوان ئیشبیلیا و قورتوبە. سەیرە! ئەو خەیاڵەی من لەبارەی دژەیەکی ئەو دوو شارە،

بەر لە چەند خولەکێک بە مێشـکمدا تێپەڕی، ئەوان ئێسـتە قسـەی لەسەر دەکەن. ئەها ئیبن ڕوشد دەدوێت:
- نازانم باسـی چی دەکەین! هێندە هەیە پێم خۆشـە ئەگەر زانایەکی ئیشـبیلیا بمرێت کتێبەکانی بێنن لە قورتوبە بیانفرۆشـن. ئەگەر گۆرانیبێژێکیش لە قورتوبە بمرێت، هەقە ئامرازە مۆزیکییەکانی لە ئیشـبیلیا بفرۆشـن. خەڵکەکە بە بیسـتنی ئەم قسـەیە لە مەجلیسـی پرسەکە خۆیان پێ نەگیرا و لە قرتەی پێکەنینان دا.
لە بەرانبەر ئیبن ڕوشـددا، هەسـتم بە جۆرێک لە تووڕەبوون کرد، ئاخر ئەوە سـووکایەتیی بە شـارەکەم دەکات، باوکیشـم لەگەڵ خەڵکەکە وا بە حیتە پێدەکەنێت. کاتێک ئیبن ڕوشـد سـڵاوی لێ کرد، باوکم ڕێزێکی زۆری لێ نا، تەنانەت سـەری ماچ کرد. ئیبن ڕوشـد لای باوکم نموونەی شکۆ و گەورەیی بوو: زانا و قازی و هاونشینی خەلیفەکان بوو، هەموو ئەوانەیش بە دڵی باوکم بوون. بەیانی ڕۆژی دواتر، خەبەریان بۆ ناردم: ئیبن ڕوشد دەیەوێت بتبینێت:
- من؟ بۆ چ کارێک؟
- کێ باسی منی لەلا کردووە؟
- گوێت لێ دەگرێت و گوێی بۆ دەگریت.
- واز لەم پرسـیارانە بێنە، هیچ پێوەندیی بەتۆوە نییە. دوای نوێژی عەسـر بڕۆە لای،ماڵیان لە نزیک پردەکەیە، یەک لە بەردەسـتەکانی والی نیشانت دەدا.
نوێژی عەسرم دابەست، خەیاڵم بۆ ئەوە چوو، کە دیداری من لەگەڵ ئیبن ڕوشـددا، بەشـێک دەبێت لە پیلانی وێرانکردن و گەندەکردنی دەروونی خۆم، بەڵام باش بوو، نوێژەکە بەشـێک لە گومانەکانی ڕەواندەوە... کە لەنوێژ بوومەوە، دیدارەکەم زۆر بەئاسـایی هاتە بەرچاو، پێویست بە نیگەرانی و چاوەڕێبوون ناکات.
پێشتر لەگەڵ دەیان مەلا و شێخ دانیشتووم، چەندان قسە و باس و پرسـیار و وەرام و گفتوگۆ لەنێوانماندا هەبووە، بۆ دەبێ دیدەنیی ئیبن ڕوشـد لەوان جیاواز بێت؟ لە مزگەوت هاتمە دەرەوە، سـواری

ئەسپێکی بەزین بووم، بەردەستەکە جڵەوی ئەسپەکەی ڕاکێشا و بەرەو لای پردەکە کەوتینە ڕێ.
خانووەکەی زۆر لەوە بچووکتر بوو، کە بیرم لێ دەکردەوە، بە پێچەوانەی خانووەکانی قورتوبە، داروبارێکی زۆری لە دەوروبەر ڕووابوو. بە خانووەکانی دییەوە لکابوو، نەتدەتوانی بە تەواوی بە دەوری حەوشەکەیدا بسووڕێیتەوە. خزمەتکارەکەی پێی گوتم، شێخ دوو فەقێی لایە، دوای کەمێکی دیکە دەڕۆن. منیش چوومە ژوورەوە و سەلامم لێ کردن و خۆم پێ ناساندن، ئیبن ڕوشد هەستا و زۆر بە گەرموگوڕیی بەخێرهاتنی کردم و لە تەنیشت خۆی دانیام. زۆر بە گڕوتینەوە قسەی بۆ دوو فەقێیەکەی دەکرد، ئاماژەی بۆ نەخشەوێنەیەکی سەر ڕووپەلێک کرد، نەمزانی مانای چی دەگەیێنێت. ئاوڕێکی لێ دامەوە و بزەیەکی کرد:
- یاخوا بەخێر بێیت. چۆن لە قورتوبە مەقامی خۆت دۆزییەوە؟
بە لووتفی خۆی کەمەندکێشی کردم، ناچاری پێداهەڵدان و مەدحی خۆی کردم. قسەکانی دوێنێم لە پرسەکە بیرکەوتنەوە، کە فەزلی قورتوبەی بەسەر ئیشبیلیا دادا، گوتم:
- ئەم شارە لە چڵەپۆپەدایە، خەڵکەکەی ماخۆی زانست و زانیاریین، ڕەچەڵەک پاک و دانان.
- خودا خێرت بنووسێت. لەو شارە هیچ سۆفییەک دەناسیت؟
- هەموویان نا، بەڵام بە خزمەت یوونسی کوڕی سەففار و عەبدورەزاق غەزنەوی و چەند سۆفییەکی دیکە گەیشتووم.
- ئەی لەبارەی ئەهلی فەلسەفە، هیچ شتێکیان لێ فێربوویت؟
ئەوسا هەستم کرد، چوونی من لەگەڵ ئەحمەد حەریری بۆ لای فرێدریک، بە تەگبیر و فەرمانی خودا بووە، بەوپەڕی باوەڕبەخۆبوونەوە گوتم:
- بە زانستی ئیمبادزقلیس و، فیساگۆرس و، ئەفلاتوون ئاشنا بووم.
ئەبرۆکانی تێکهەڵدان و بەسەرسامییەوە سەری خۆی بادا و گوتی:

- گەیشتییە ئەو ڕایەی، کە فەیلەسووفەکان لە قانوونگەلی سروشتی لەبارەی حاڵەتی کەشـــف، لەگەڵ ڕووانگەی ئەهلی تەســـەووف هاودەنگن؟
- بەڵێ.
- ئەمە زۆرباشە... هەروەها....
قسەکەم پێ بڕی:
- نەخێر هەروەها.
نەختێک سەری بۆ پشتەوە برد و نێوچاوانی وێکهێنا و پرسی:
- مەبەستت چییە؟
- مەبەستم، نەخێر و بەڵێیە.
- چۆن نەخێر و بەڵێ؟
- بەڵێ، ئەوان لەبارەی ئەو جیهانە هاودەنگن وەک ئێمە دەیبینین. نەخێر هاودەنگ نین، چونکێ جیهان دەگۆڕێت و لەســەر حاڵی خۆی نامێنێت.
- کوڕەکەم جوانتر ڕوونی بکەوە... من ئەوە پیر بووم، کەســـێکی وەک تۆ زیهنتیژ و زیرەکم نەدیوە.
- قوربان! قانوونگەلی فەلســەفە، یاســای دەســتکردن، ڕابردوو شــی دەکەنەوە، بەڵام وەک حاڵەتی کەشف، ناتوانن داهاتوو لێک بدەنەوە.
- بەڵێ قانوونگەلی فەلسەفە هەواڵی غەیبت پێ نادەن، بەڵام یاسایەک دادەنێن ئەگەر هەواڵە غەیبییەکە هاتە دی، دژی ناوەستنەوە.
- هیچ یاسایەک نییە.
- چۆن هیچ یاسایەک نییە؟
- بەڵێ، هیچ یاســـایەک نییە. تەنیا خەلق هەیە، ئەویش گرێدراوی ئیرادەی خودایە و تەواو.

## ٢٠

**"هەر نوورێك تاریكییەك ڕانەماڵێت، حیسابی بۆ ناكرێت"**
**ئیبن عەرەبی**

کە لە قورتوبە گەڕاینەوە، مامم لە ئاویلکەداندا بوو. گونەکانی هێندە ئاوسابوون، لە کاتی دانیشتن وەک بالیف لەپێشە خۆی دایدەنان. زۆر ئازاری پێوە دیتبوون، هیچ دەرمانێکی بۆ چارەسەرکردنیان دەست نەکەوتبوو، بە وێنەی ئەولیایان خۆی تەسلیمی خودا کردبوو. وەختێک لەگەڵ باوکم چووینە لای، بە دەنگێکی نزم دەینالاند، نەمانزانی ئاخۆ خەوتووە یان بەخەبەرە.

باوکم قسەی لەگەڵ کرد:

- سەلامەتییە برالە! ئینشاڵڵا خوا شیفات دەدا.

مامم چاوەکانی کردنەوە و تەماشایەکی کردین و گوتی:

- لە هەموو بارێکدا هەر سوپاسی خوا دەکەم.

- برام حاڵت چۆنە؟

- بەدەست خودایە، ئەگەر باشی بکات، خۆی ڕەحیمە، ئەگەر خراوی بکات، هەر خۆی ڕەحمانە. سەرمان ماچ کرد و بەبێدەنگی لەکنی دانیشتین. باوکم بەولاوئەملای ژوورەکەدا هات و چوو، لاحەولە و وەلا قوەتەی دەکرد. لە تەوێڵی لۆچاوی و دەموچاوی وشکهەڵاتووی ڕامام، وەک وشکەهەنجیری لێ هاتبوو. سەرنجی قاچەکانیم دا،

لەژێر لێفە لێک بەش بووبوون، بەم بارە ناخۆش و خەمناکەی مامم دڵم وێکهات. لەناکاو بەرلەوەی ئاوڕ بۆ لای ئێمە بداتەوە، شـیعرێکی گوت:

- کات وا دەڕوات و ژیان گوزەر دەکات
چەرخی زەمانەیش خۆشـیت تاڵ دەکات

باوکم بە داخ و نیگەرانییەوە گوتی:

خودا شیفات بدا برالەی شیرینم، شادی و بزەشت بۆ بگەڕێنێتەوە.

چاوەکانی باوکم پڕ ئاو بوون، خەریک بوو بگریت. لەپی دەسـتی مامی بە دەستی ڕاستەیەوە گوشی و ماچی کرد، پاشان هەستایەوە و گوتی:

- هیچ شتێکت ناوێت؟

مامم بەسـەربادانەوە ئاماژەی نەخێری بۆ کرد. باوکم ئاوڕێکی لێ دامەوە و گوتی:

- مامت هیچ خزمەتکارێکی نییە، تۆ لەلای بمێنەوە.

من و شکاز شازدە ڕۆژ بە سەروکاریەوە بووین، باوکیشم سەری لێ نەدەبڕین. تاکوو مرد ئێمە لە خزمەتیدا بووین. باوکم، کە زانی حاڵی مامم شـڕبووە، شـەوێک لەکنمان مایەوە. لە نوێژی عیشـا بووینەوە، مامم ڕوو لە قیبلە ڕاکشا و خۆی بۆ خەوتن ساز کرد، بە دەنگێکی کز بە ئێمەی گوت:

- ئێوەیش پشوو بدەن و بخەون.

ئێمەیش لە دەوری خەوتین. بەرەبەری سەحەر لە خەو هەستام. لە هەموویان پتر لە مامم نزیک بووم، دەبینم هەناسـە نادات! دەسـتم خستە سـەر تەوێڵی، وەک بەفر سارد و سڕ بووبوو. دەستم بردە نێو سینەی بۆ ئەوەی بزانم هەناسە دەدا یان نا، سینەیەکی گەرم و دڵێکی لە ترپەکەوتوو. زانیم تازە ڕووحی دەرچووە، دەسـتم بە چریکە و هاوار کرد، باوکم و شـکاز لە خەو ڕابوون. باوکم نێوچاوانی خۆی لەسـەر سـینەی مامم دانا و بە ناڵەناڵەوە گریا و

گوتی:" براله‌ی خۆشه‌ویست و ئازیزم، تۆ له جێگه‌ی باوکم بووی."
هێنده گریا، به ئه‌سرینه‌کانی کراسی مامی ته‌ڕ کرد. شکاز بڕیاری دا خۆی ته‌رمه‌که‌ی بشوات. مامم به‌ر له چه‌ند ڕۆژێکی که‌م، کفن و که‌لوپه‌لی شۆردنی خۆی ئاماده کردبوو، شکاز چوو هێنانی و بۆی ڕێکخستن. هه‌ڵمانگرت و له‌سه‌ر ته‌خته‌دارێک دامانا، هه‌موو جله‌کانمان له‌به‌ر داکه‌ناندن، ته‌نیا نێوان ناوک و ئه‌ژنۆمان به داپۆشراوی هێشته‌وه. شکاز ده‌سته‌کانی مامی شوشتن، دواتر په‌ڕۆیه‌کی له ده‌ستی خۆی لوول دا و له‌ژێر په‌رده بردی شه‌رمگه‌ی پێ بشوات، له‌ناکاو وه‌ستا و نیشانه‌ی سه‌رسامیی به ڕوخسارییه‌وه به‌دی کرا. سوبحانه‌ڵلای کرد و په‌رده‌ی له‌سه‌ر شه‌رمگه‌ی مامم لادا، گونه‌ئاوساوه‌کانی مامم گه‌ڕابوونه‌وه باری ئاسایی پێشووتر، وه‌ک ئه‌وه‌ی هیچ ستووری و ئاوسانێک ڕووی تێ نه‌کردبن. گوڕگوڕ ڕۆندکمان به چاودا هاتنه خواره‌وه، شکاز گوتی:
- ئه‌مه که‌ڕامه‌تی ئه‌ولیاکانه، په‌ند و وانه‌یه‌ک له‌مه‌دا هه‌یه، گوناهـ نییه ئه‌گه‌ر ته‌ماشای بکه‌ن. شکاز و باوکم به فنکه‌فنک ته‌رمی مامميان ته‌واو ڕووت کرده‌وه و شۆرد. دوای ئه‌وه‌ی ته‌رمی مامم بوو به جه‌نازه‌یه‌کی سپی و هیچ به‌رزی و نزمییه‌کی نه‌ما، شکاز به گریانه‌وه خۆی به‌سه‌ردا هێنا. باوکیشم زه‌نگوڵ زه‌نگوڵ ئه‌سرینی ده‌ڕشتن... به‌ڵام چاوه‌کانی من له‌و بیابانه وشک و برینگتر بوون، که موه‌حیده‌کانی لێ هاتبوون. خستمانه سه‌ر شان و به‌ره‌و مزگه‌وت بردمان. خه‌ڵک ورده‌ورده بۆ نوێژی به‌یانی ده‌هاتن، هه‌ر که‌سێک جه‌نازه‌که‌ی ده‌بینی، (لاحول ولاقوة)ه‌ی ده‌کرد. دوای ئه‌وه‌ی نوێژی له‌سه‌ر کرا، بۆ گۆڕستان چه‌ند که‌سێک جه‌نازه‌یان له‌گه‌ڵ هه‌ڵگرتین، له‌گه‌ڵ ژماره‌یه‌کی که‌م له خه‌ڵکه‌که به خاکمان سپارد. خۆرهه‌ڵات و ئیشبیلیا بێ مامم مانه‌وه.
ڕۆژانی به‌رایی، باوکم به له ده‌ستچوونی مامم، خه‌مناک و نیگه‌ران بوو، به‌ڵام هه‌وڵی دا خۆی بگریت، وه‌لێ ڕۆژانی دوایی،

خەمەقوولەکەی سەری کرد و بڕستی لێ بڕی. ئاخر کۆتا دیوارێک، کە ئەو پشتی پێ دەبەست ڕووخا، نیگەرانی و دڵەڕاوکێ تەنگیان پێ هەڵچنی و ئێمەیشی خستە ناو ئەو چوارچێوەیە، هەموو شتێک دەبوو بە حیساب و وادەی خۆی بێت. تاکوو دەرگەی دانەخستبا نەدەخەوت، تا بە دەوری ماڵ نەسووڕابایەوە، نەدەڕۆیشت، بە ئەندازە دەیبەخشی، کەمێک نانی دەخوارد و دەکشایەوە. بەشی منیش لەو وەسوەسە و هەستیارییەی وی، دەبوو لە کاتی خۆی دەرچم و لە کاتی خۆیشی بگەڕێمەوە. هەستم دەکرد لە ئیشبیلیا وەک زیندانی وام. هەر کاتێک باسی سەفەرم لەگەڵ دەکرد، ئەو باسی مەترسیی پرتوگالییەکانی بۆ دەکردم. دوای ئەوەی قەڵای (شنقیلە)شیان بەر لە چەند هەفتەیەک کەوتە دەست، قوڕەکە خەستر بوو، سەدان موسڵمانیان بە دیل گرت. مەلای مزگەوت داوای لە خەڵکەکە کرد کۆمەک و هاوکاریی برایانیان بکەن. باوکم دە دیناری کردە خێر و بەمنیدا نارد، بردم خستمە سەر پەڕۆیەکی گەورە، کە لە مزگەوت ڕاخرابوو، خەڵکەکە پەیتا پەیتا دەهاتن و دینار و دەرهەم و بەشێک لە زێڕ و خشڵی خۆیان دەخستە سەر.

لە چەند ڕۆژێکی کەمدا، کۆمەکێکی باش کۆکرایەوە، خەڵکەکە هەمووی لە کارەساتی هاوشێوە دەترسان. لەو بارە لەسەر خوانی ئێوارە قسەمان لەگەڵ باوکم کرد، هەر وشەیەک لەدەمم دەردەچوو وەک چەکووشێک وابوو بە سەری دایکم بکەوێت. پرسیاری کرد:

- قەڵای (شنقیلە) لێرەوە چەند دوورە؟

- چەند ڕۆژێک.

(لاحول ولاقوة)ی کرد و دەستی کەوتنە لەرزە و ئەسرین بە چاوەکانیدا هاتنە خوار، سەری خستە سەر لەپی دەستی. باوکم بە میهرەوە ڕووی تێکرد و لێی پرسی:

- نوورخانم! ئەمە چیتە؟

- چیم بێت؟ کافر موسڵمانان دەگرن و بە چەند ڕۆژێکی دیکە دەگەنە ئێرە و من و کچەکانیشم دەبەن!
- دڵنیابە کەس ئازار بە تۆ و کچەکانت ناگەیێنێت. ئەعوزوبیللا بکە و خۆت لە شەیتان چەپاڵە بدە و واز لەمە بێنە.
دایکم تاوێک بێدەنگ بوو، بەڵام باوکم هەستی بە ترس و نیگەرانیی ئەو کرد و گوتی:
- بۆ تۆ پێت وایە خەلیفە لەو بەدکارییەیان بێدەنگ دەبێت؟
- ئەی چاوەڕێی چی دەکات؟
- چاوەڕێی هاتن و تەواوبوونی سوپا دەکات، دواتر بەرەو ئەندەلوس دەپەڕنەوە، بەو نزیکانە وانەیەکی باشی ئەو کافرانە دادەدات! لە کۆتاییدا خەلیفە لەگەڵ سوپاکەی لە دەربەندی جەبەل تاریق پەڕینەوە و بەرەو ئیشبیلیا ڕۆیشتن. باوکم لەنێو باخچە ئەو هەواڵەی بۆ عەبدوسەمەد باس کرد، هەردووکیان دانیشتبوون. باوکم ترێی دەخوارد و عەبدوسەمەدیش بەهەرتک دەستەکانی خۆی بەسەر گۆپاڵەکەی داهێنابوو، زۆر بە بایەخەوە گوێی بۆ باوکم هەڵخستبوو:
- پێشتر قەت ئەندەلوس هەواڵی سوپایەکی وا زلی نەژنەوتووە! زیاتر لە پەنجا هەزار سەرباز بە وشکانیدا دەڕۆن و بیست هەزاریش لە ڕێگەی دەریاوە دەچن.
عەبدوسەمەد ئەبرۆکانی تێهەڵدان و لەنێوچاوان ڕای گرتن، بە سەرسامی و دەنگێکی گەورە گوتی:
- سوبحانەڵڵا!
باوکم بەسۆزەوە باسی سوپاکەی کرد:
- ئەمساڵ بەر لەوەی باج و داهات بۆ سوپا بنێرین، بۆ خەلیفەمان نارد: لەجیاتی زێڕ، زرێ و شمشێر و قووتمان نارد. عەبدوسەمەد دەزانی بۆ؟

وا دیاربوو عەبدوسەمەد دەیزانی بۆچی، بەڵام خۆی لە خەتی مەیلان دا و بێئاگایی خۆی دەربڕی، ئەمەیش بۆ ئەوەی باوکم لە چێژی قسەکەی بێبەش نەبێت:

- باوکی موحی بۆچی؟

- چونکە ئەگەر ئێمە زێڕمان ناردبا، قورتوبە و غەرناتە و بلنسیەیش زێڕیان دەنارد، کە لەبەر زۆرییان بەهای نەماوە، هەر بۆیە خەلیفە بڕیاریدا هەموو شارێک ئەو شمەک و کەلوپەلانە بنێرن، کە سوپاکەی پێ ساز و پڕ چەک دەکرێت.

عەبدوسەمەد وەک سەرسامبوون و تێگەیشتن لە باسەکە، سەری خۆی ڕاهەژاند و دووبارە گوتی:

- سوبحانەڵڵا!

- بەڵێ. بەڵێ. هەرچی زری و شمشێر و زین و تیر و کەوانێک لە بازاڕ هەیە، دەیانکڕین و بە سێ قافڵە بۆیان ڕەوان دەکەین. هیی یەکەم بۆ سوپای وشکانی، کە خەلیفە خۆی لە جەبەل تاریق سەرپەرشتییان دەکات. دووەم لە ڕووباری گەورە بۆ کەشتیگەلی دەریا، کە ئەبووعەباسی سقلی مشووری دەخوات. سێیەم بۆ کەشتیگەلی دووەمی دەریا لە دۆڵی ئانا، کە ئیبن ربتیر فەرماندەیی دەکات.

- عەلی کوڕی ربتیر؟

- بەڵێ.

- کوڕی زرتە زەلامە شەلەکە؟

- بەڵێ.

- ئەی سوبحانەڵڵا! گاورێک فەرماندەیی کەشتیگەلی موسڵمانان دەکات!

- موسڵمان بووە، دیارە تۆ نەتزانیوە؟

- نەمزانیوە. لەکوێ بزانم؟

- با موسـڵمان بووە. باوکیشـی پێش ئەو، فەرماندەی سـوپای ڕۆم بووە و خزمەتی مورابیتەکانی کردووە.
- وەی سوبحانەڵڵا!
- عەبدوسـەمەد، گرنگ ئەوەیە خەلیفە دەیەوێت مەترسـی پرتوگاڵییەکان لە ڕەگوڕیشـەوە بێنێت. عەبدوسەمەد بە گۆپاڵەکەیەوە هەستاوە و مۆڵەتی ڕۆیشتنی خواست و گوتی:
- خودا سەرکەوتووی بکات. ئەمن دەبێ ئێستە بڕۆم.
- عەبدوسەمەد هەر ساخ و سەلامەت بیت.

## ٢١

**"هەقیقەت دژی چەقبەستن و قەتیسبوونە"**

**ئیبن عەرەبی**

خەڵکی ئیشـــبیلیا هەریەکەو بەگوێرەی بیرکردنەوەی خۆی دەچووە بازاڕ و خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکرد. بازاڕی ئاسنگەران لە ئاپۆڕەی موسـڵمانان جمەی دەهات، هەر بابابوو شـمشـێری تیژ دەکردەوە و زرێ و خودەی بۆ خۆی و ناڵی بۆ سـمی ئەسـپەکەی دەکڕی، ئاخر ترسـی ئەوەیان هەبوو خەلیفە لەناکاو جیهاد ڕابگەیەنێت، سـوپا زرێ و خودەی بەگوێرەی پێویسـتیی سـەربازان نەبێت. نەسـڕانییەکانیش قووت و دانەوێڵە و مێوژ و زەیت و هەرچییەک، کە توانای کڕینیان هەبوایە دەیانکڕی و لە ماڵەکانیان دایاندەکرد. دەترسـان جەنگ دەسـت پێ بکات و گەمارۆ بدرێن و قافڵەکان بوەسـتن. هەروەها بەهۆی مەشق و ڕاهێنانی سوپای موسڵمانان نەتوانن کێڵگەکانیشیان داچێنن و پەرە بە کشتوکاڵیان بدەن.

عەبدوڵڵا قەتتان، لەگەڵ سـوپا بەپێیان بەڕێ کەوت، ئەگەرچی وڵاخیش ئامادەبوو. قەتتان ئەو کەسـەی پێشـتر ڕیشـی باوکمی ڕاکێشا و ئامۆژگاری کرد و سوودی لێ وەرنەگرت... ئەو گوتی:

- زیاتر لە وڵاخەکان قاچەکانم حەوجەی پاداشتن.

هەرچەند دەمزانی لەلای (قەوسـولحەنییە) بەردەوام لە چ ڕاسـتێک دیدەنیی دەکـەم، لێ ئـەو کـەڕەتـە خوداحـافیزیم لێ نـەکرد. قـەتتـان هەمیشـە ئامۆژگاریی ڕێبوارانی دەکرد، دڕکوداڵ و بەرد و داری لە لەسـەر ڕێگەدا لادەبردن، سـەگ و پشـیلەی ئاو دەدان. شـەوان دەرگەی دووکانەکانی بەسـەر کڕیار و فرۆشـیاران دادەخسـت و بانگەوازی نەسـڕانییەکانی بۆ سـەر ئایینی ئیسـلام دەکرد. ئێسـتە دڵنیام دەپرسـی بۆچی ناچم بۆ جیهاد، پرسـیارەکەیشـی پتر سـەرکۆنەکردن و ڕووشـکێنی کردنە نەوەک پرسـێکی ڕووت بێت، هیچ پاساو و پۆزشێکیش نییە ئەوی پێ ئیقناع بکرێت. ڕاستییەکەی ئـەمن لـەژێر بـەیداخێک جیهاد ناکەم، کە باوەڕم پێی نییە. پیاو هەق بڵێ، من نامەوێت سـوپا تێکبشـکێت، بەڵام تەماخوازم بە ڕێکەوتن و ئاشـتەوایی پاشـەکشـە بکات. ئاخۆ دەبێ بزانن، کە ژیان لەپێناوی خودادا زۆر لە مردن لە ڕێگەی ئەودا دژوارترە؟

لە کۆتاییدا سـوپا ڕۆیشـت و ئیشـبیلیا هێور بووەوە، بەڵام ئەمن لە جاران پتر نیگـەران و بێمـەیل بووم. هـەموو ئـەو کتێبـە یۆنـانی و بەشـێک لەو کتێبە ڕۆمانیانەی فەلسـەفەیان تێدا بوو، لای فرێدریک خوێندنمـانـەوە. داوام لـە کتێبفرۆشـێک کرد، لـە قورتوبـە چـەند کتێبێکمان بۆ بێنێت، جگە لە کتێبێکی پەڕپووتبووی (شکانکارا هیندی) هیچ کتێبێکی تری بۆ نـەهێنـاین، ئەویش بە دوو ڕۆژان خوێندمانەوە و بێ کتێب گەڕاینەوە. دیسـان ملمان دەبەر ئەو کتێبانە نایەوە، کە پێشتر خوێندبوونمانەوە. دوو ڕیز بەرانبەر یەکتر دادەنیشتین، ڕیزی یەکەم چەند لاپەڕەیەکی لە کتێبێک دەخوێندەوە، ئەوسا نۆرەی ڕیزی دووەم دەهـات، ئـەوانیش دەبوو لـەو کتێبانەی لەبەر دەسـتیان دان شـتێک بخوێننـەوە، کە پێوەندیان بەوەی ئێمەوە هەبوایە. هێندێک شـەوان گفتوگۆ و دەمەتەقێ درێژەی دەکێشـا و لەسـەر هیچ ڕێک نەدەکەوتین. هەندێک جار بە ئەنجامێک دەگەیشتین، فرێدریک سەری پێ سـوڕدەما و تۆماری دەکرد، تا لە دواییدا کتێبێکی زۆر بەردڵ و

ژیکەڵە دەرچوو: تێیدا زەینوون پەرچی ئەبیقووری دەدایەوە، ئەفلاتوون ڕەخنەی لە سوقرات دەگرت، ئیبن سینا گفتوگۆ و دەمەتەقێی دەگەڵ ڕازی و گالینۆس و ئیبن مسرە دەکرد. دوای چەند هەفتەیەک، فریدریک هەواڵی پێگەیشتنی بەرهەمی باخەکەی پێ داین، گوتی ئەو مانگە لەوێ بەسەر دەبەم و ئێوەیش وەرن. ئێمە حەوت کەس بووین، لەوێ خێوەتمان لەبن ئەو دارمێوانە هەڵدا، کە شەڕاب لە ترێیەکەیان سازدەکرا. عوودژەنێک و تەپڵکوتێک و دوو ژنەسەماکەری بۆ بەکرێ گرتبووین. هێشتا خۆر بە تەواوی ئاوا نەبووبوو، بەزموڕەزم دەستی پێ کرد. بەر لە خۆراوابوون خەریکی خوێندنەوە و قسەکردن و پیاسە بووین. هەر وەختێک بادەی مەی بەتاڵ دەبوو، مەیگێڕ لە کوندەیەکی گەورەی نزیک عەسارەکە پڕی دەکردەوە. خەریک بوو مەست دەبووین، من و حەریری و ئەوانی دیش دەستمان بە سەما کرد، گالا و جیدۆیش وەسەما کەوتن. گۆرانیبێژ، لێک لێکە گۆرانیی عەرەبی بۆ چڕین، دواتر ستران دوای سترانی قشتالیی بۆ گوتین. هەرکە بادەم بەتاڵ دەبوو، بۆ مەیگێڕ دەمترینگاندەوە تا بۆم پڕ بکاتەوە. دواتر خۆم گەیاندە کوندەکە و دیسان و پڕم کردەوە و بۆ ئەوانیش بوومە مەیگێڕ. گالا بەپێی پەتی لەسەر سەکۆی خشتڕێژکراو و لووس سەمای دەکرد. هەرکە پێیەکانی سارد دادەهاتن بەسەر مێز دەکەوت، یەکێک لە سەماکەرەکانیش لەگەڵیدا سەر دەکەوت، ڕاستییەکەی ئەمن زۆر دەترسام مێز لەژێریاندا شەقوپەق بێت و گالا خۆی هەڵبداتە ناو مەجلیسەکەمان.

ئۆخەیش! لەوەتەی گالا دەناسم، ئەوە جاری یەکەمیە بزەم بۆ بکات. ئەو بزەی کرد و منیش بزەم بۆ کردەوە. هەر وەختێک ڕوومان دەکەوتە بەرانبەری یەک، خەندەیەکم بۆی دەکرد... تا زەردەیەکی بۆ بکەم بە ئەنقەست چاوم دەچاوی دەکردن، بەو ڕەوتارەی من دەموچاوی وەک جاران گرژ و مۆن دەبووەوە. چووم لە تەنیشتی

دانیشـــتم، هەســـتا و ڕۆیی. فەرمووی مەیخواردنەوەی زیاترم لێی کرد، داوای لێبووردنی کرد. هەســتام لەگەڵی ســەما بکەم، دانیشــت. هـەر وەختێک ئـەو ڕووی لێ وەردەگێڕام، بـادەم هـەڵدەقوڕاند، کـە لەوێ نەدەما دیســـان پڕم دەکردەوە. هەر گاهێک داوام لێ کردبا لە نزیکم دانیشـــێت و ڕەتی کردباوە، ئەوە داوام لە مەیگێڕ دەکرد بێت لەجێی ئەو دانیشـێت و بۆم تێ بکات. ئەگەر لەبەر وشکی و دڵڕەقیی کچان نەبوایە، مەیگێڕمان بۆچی بوو؟ ئەگەر هەر کاتێک ئارەزوومان لێ بوانە خۆیان بەدەســـتەوە دابایە، هەر وەختێکیش تاســـەمان لێ شکابانە پشتیان تێ کردباین، شەڕابمان بۆ چی بوو؟
فرێدریک لەناوەڕاست وەستا و داوای لە هەردوو گۆرانبێژەکە کرد، واز بێنن. دنیا بێدەنگ بوو، گوێمان هەڵخست:
- با گوێ لە (ئۆرفیۆس) بگرین، کە گیتارەکەی کەلووی ئاســـمانە:
"من (ئۆرفیۆس)م، گۆرانیم بۆ بـاهۆزان چڕیوە، تـا خـەویـان لێ کەوتووە، بەندم بۆ گاشەبەردان گوتووە تا خۆیان لە کەشتییەکانمان دوور بگرن، چوومەتە قوللـــــەی قاف، شـــتی وام بینیوە، قەت بە خەیاڵمدا نەهاتووە."
- بەخوای ئەمە کارێکی زۆر باشە!
دەنگی دروشـمکێشـان و چەپڵە و چەقەنەلێدان بەرەو کەشـکەڵەی ئاسـمان دەڕۆیشـت ... بادەکانمان بەرەو فرێدریک بەرزدەکردنەوە، ئەویش بەردەوام بوو: " یا ئیلاهی! تۆ ئەو کەسە خەڵات دەکەیت، کە جـەرگســـۆز و وەفاداری ئـایینـەکـەتـە. ئێمـە نەختێک لە زەوین خاو دەبینەوە، دواتر تا ئەبەد بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە. هەمیشـــە هیی تۆ دەبین، بۆ تۆ دەژین... بـەڵام پـەروەرێنم! خۆشـــەویســـتـەکەم زۆر بەخێرایی هاتە لات. بەر لەوەی شکۆفەی سەر دەربکات، هات. دوای چەند ســاڵێکی کەم، بەیەکەوە دەگەڕێینەوە لای تۆ." ئەم وشـانە دڵی حەریرییان پێکا و گوتی: " خودا هەمیشـە زیندوو و دەییانە." پاشـان ویســـتی بەبێ دەهۆڵکوتان و مۆزیک، ســـەما بکات، کەوتە پێکەنین.

فرێدریک ئاماژەی بە دەهۆڵکوتان کرد و بەزمورەزم دەستی پێ کردەوە. هەموومان لە حەلقەیەکی بازنەیی، کە حەریری لە نێوەڕاستەکەی بوو، وەسەما کەوتین. هەتا نزیکی بەیانی هەر پێکەنین و سەما بوو، فرێدریک داوای لە مۆزیکژەن و سترانبێژان کرد ئاهەنگەکە ڕابگرن. ئینجا گوتی:

- موسڵمانمان لەگەڵن، کاتی نوێژکردنیان هات.

من و حەریری و سێ موسڵمانی دیکە چووین لە کانیاوێکی ناو باخەکە دەستنوێژمان هەڵگرت. خزمەتکاری فرێدریک بەرماڵی بۆ ڕاخستین و وەک ئیمە خۆی بۆ نوێژکردن ئامادە کرد. حەریری ئاوڕێکی لێ دامەوە و گوتی:

- بەو سەرخۆشی و مەستبوونە دەبێ نوێژمان بەرکەوێت؟

- دەزانی چیی دەڵێیت؟

- بەڵێ.

- کەواتە نوێژەکەت دروستە. ئایەتەکە دەڵێت: ( لاتقربوا الصلاة وانتم سکاری حتی تعلموا ما تقولون.) دواتر منی بۆ ئیمامەتی پێشخست و نوێژم کرد. لە ڕکاتی یەکەم: (إنا أعطیناک الکوثر)م خوێند، لە ڕکاتی دووەمیش: ئایەتی (مدهامتان)م خوێند. نوێژەکەمان تەواو کرد و دیسان هاتینەوە نێو کۆڕی یاران.

لەو کاتەی سوپا، لە وشکانی و دەریادا گەمارۆی (شنترین)ی دابوو، ئێمەیش دەوری (جیدۆ)مان دابوو نزای (شانکارا)ی بۆ دەخوێندینەوە: "خودایە لەو سێ گوناهەم ببوورە: بۆ لای تۆ هاتم، بیرم چوو تۆ لە هەموو شوێنێکیت. بیرم لە تۆ کردەوە، نەمزانی تۆ لەسەرووی بیرکردنەوەی. نوێژم بۆ کردی، بیرم چوو تۆ لە سەرووی هەموو نوێژێکیت." گاوێک ئاو هەستا و باهۆز هەڵی کرد، سوپاکە ترسا ئاو ڕایانماڵی، ئەمن لە ناوەڕاستی هاوەڵانم وەستام و گوتم :"لە ڕەحمەتی ئەو خودایە ڕامێنن، کە بەدیهێناوین. بیر لە خۆشەویستیی ئەو بکەنەوە، کە لە نەبوونەوە هێناوینیە بوون."

کاتێک سوپا خێوەتەکانیان هەڵگرتەوە، وایانزانی خەلیفە فەرمانی کشانەوەی پێ کردوون، نەک گەمارۆدانی قەڵا... لەو کاتەدا حەریری داوا لە گۆرانیبێژەکان دەکات قەسیدەی قەیرەوانی: "یا لیل صب متی غده." بڵێن. کاتێک لەکن شوورەکانی (شنترین) بە شمشێر هێندێک پێکران، جەنگ گەرم بوو، گالا وەک پەروانە سەمای دەکرد و دەخولایەوە. ئەو کاتەی خەلیفە لەژێر ناوکیەوە پێکرا و خوێنی لێ چۆڕایەوە، پاسەوانەکانی ڕایانکرد... لەو ساتەدا، نۆرەی سەمحی کوڕی ساڵح هات، کە فەرموودەکانی شانکارامان بۆ بخوێنێتەوە: "بۆ وەی لە کۆتوزنجیری بەندایەتیی ڕزگارت بێت، دەبێ سەرەتا ئەوە جیا بکەیتەوە ئاخۆ چی هیی دەروونی تۆیە و چی هیی ئەو نییە. خۆت لە دەستی باوەڕەکەت ڕزگار بکە، خۆت تۆپەڵەگۆشتێکی، کەپێی دەڵێن جەستە. دەروونی هەقیقی خۆت جودا بکەوە ، لە دەرەوەی زەمان دەیبینییەوە، ڕابردوو، ئێستە و ئایندەی پێوە نامێنێت، ئەوسا ڕووحت دەگاتە کەناری ئارامی."

کاتێک سوپا شکا و تەرمی خەلیفەیان هێنایەوە، من لەناو هەمواندا هەستام: "گوێ بگرن. گوێ بگرن." گۆرانیبێژ وەستا و سەماکەر دانیشت، هەموو گوێیان ڕاگرت، منیش بە شیعر کەشفی خودام بۆ بەیان کردن:

وحق الهوى أن الهوى سبب الهوى * ولولا الهوى في القلب ما وجد الهوى

بە دەنگی بەرز ئافەرینیان لێ کردم. فرێدریکیش هەستا و و گوتی:

- مەیگێڕ، بە خۆشی ئەو شیعرە پڕ مانایە، شەڕابمان بۆ تێکە با بینۆشین!

## ٢٢

**" شەونخوونی بێ شەوارە، کەڵکی پشتپێبەستنی نییە"**
**ئیبن عەرەبی**

چەند ڕۆژێک لە باخەکەی فرێدریکدا خەوتم. ژوورێکی بۆ من و حەریری سازکردبوو، بەسەر چیمەنێکی چکۆڵەی گوڵوگوڵزاردا دەیڕوانی، تۆوی گوڵەکانی لە وڵاتی قوت هێنابوو. سەر لە بەیانییەک لە خەو ڕابووم، سەرم وەک مەشکەی دۆ دالەنگابوو. خزمەتکاری فرێدریک کە شەوان مەیگێڕمان بوو، خواردنێکی باشی بۆ هێناین، لەگەڵ حەریری بایی ئەوەمان خوارد هێزمان بێتەوە بەر و سەرئێشەمان بڕوات. بە سواری دوو ئەسپ لەو دەوروبەرە پیاسەمان دەکرد. تیر و کەوانمان پێ بوو، دەمانویست ڕاو بکەین، بەس زۆر بە کەمی ئامانجمان دەپێکا. دەگەڕاینەوە لای فرێدریک، لە چۆڵەوانی ئاگرێکی دەکردەوە، دەفرێکی پڕ لە تووی سووری تازە لە دارتووە پەرشەکانی دەوری باخەکە لێ دەکردەوە، ئا بەم جۆرە پێشوازیی دەکردین.
کە کاتی نوێژ دێت، ئاگادارمان دەکاتەوە، داوا لە خزمەتکارەکەی دەکات بەرماڵمان بۆ ڕابخات. کاتێک شەو دادەکەوێت و تاریکی باڵ دەکێشێت، ئەوانەی دوێنێ شەو لەگەڵمان نەمانەوە، پەیتاپەیتا دێن. گاوێک کۆڕی یاران تەواو دەبێت، دەنگی کوتەکوتی دەهۆڵ دێت،

دواتر لەرەلەری عوودیش دەســـت پێ دەکات، شـــەوێکی دیش لە دهلیزی مەســتی و بێئاگایدا بەســەر دەبەین. لە کەوڵی جەســتەمان دەردەچین، دەرگەی دەرفەت بۆ ڕووحمـان والآ دەکەین، بەشـــکم نەختێک لەم پەشێوی و ئاڵۆزکاوییە بمانشواتەوە.

ئەوە دوانزە ڕۆژە قاچەکانم بە خاکی ئیشــبیلیا نەکەوتوون، خزموخوێش و کەســوکارم وا دەزانن لە کێوی (منتیار) دەگەڵ شێخێک لە خەڵوەتدام. حەریری دەگەڕێتەوە و بە درۆ هەواڵی منیان بۆ دەبات، ئەوانیش بە ســـەلووم دەڵێن خواردنێکی بەچێژ بۆ من و فەقێ و شـێخە خەڵوەتگرەکانی منتیار ئامادە بکات، نازانن مەسـت و سەماکارانی باخی بەهەشیەی فرێدریک نانەکە دەخۆن. بەهارێکی زۆر خۆش و دڵگیرە، کەشــوهەوا زۆر لەبارە، خواردنەکە زۆر بەتامە، قسەکان زۆر خۆشن، بەزمورەزم گەرمە، شەڕاب زۆرە. هەستم کرد لێرە دڵم زۆر گەورە بووە، سینەم فراوان بووە. کاتێک وەخەبەر دێم، سەوزایی و، بەروبووم و، کانیاو و، مەل و، جوانیی ئەوناوە، مەستم دەکەن. وەختێک شـــەو ئەوانە دەشــارێتەوە، بە شـــەڕابی فرێدریک مەســـت دەبمەوە. ئەو خۆی، لەنێو چەند بەرمیلێکدا ئەو شـــەڕابەی ساز دەکرد و هیچیشی لێ نەدەفرۆشت، هەمووی بەسەر مێوانەکان دابەش دەکرد. هەر ڕۆژێک دەڕوات، وەرچەرخانێک لەمندا ڕوو دەدات، هەر دەڵێی بەرەو مەقامەکانی ئاســمان بەرز دەبمەوە، یاخۆ قۆناخەکانی ســـەر زەوین دەبڕم. هەر ڕۆژێگ گوزەر دەکات، وا هەســـت دەکەم هیی تەمەنی من نییە، وەک ئەوەی لە پیاوێکم وەرگرتبێت، کە حەز بە بەختەوەری نەکات.

هەموو ئەو پارەیەی هەمبوو بە بیســـت بەرانی قەڵەوم دا و بۆ فرێدریکم بردن، پێم گوت هەموو ئێوارەیەک بەرانێکمان بۆ ببرژێنن. ســەرەتا بە پاســاوی ئەوەی ئێمە مێوانین و نان لەســەر خانوخوێیە، ئەو دیارییەی ڕەتکردەوە، بەڵام من ســـووربووم و ئەویش ناچار قبووڵی کرد.

ئەو چەند ڕۆژەمان بەخۆشـــی بەســـەر برد، تا ڕۆژێک حەریری لە ئیشـبیلیا گەڕایەوە، دەموچاوی ڕەش هەڵگەڕابوو. هات دانیشـت. بەر لەوەی پرسیاری هیچی لێ بکەین، گوتی:

- لەشکری موەحیدەکان شکا! پرتوگالییەکان بەڕێوەن.

فرێدریک ڕەنگی زەرد بوو، شـڵەژا. جیدۆ بەبێدەنگی دەسـتی گالای گرت. (ســـەمح) ســـەری خۆی گرت، ئەو هەواڵە ناکاوە ورتەی لێ بڕی. بێدەنگی چەند چرکەیەک باڵی خۆی بەســەر مەجلیسـدا کێشـا. بێوەی حـــەریری لام بۆ بکـاتـــەوە، پرســـیـــارێکی لێ کردم:

- موحی، ئێستە چی ڕوودەدات؟

هەموو ڕوویان لەمن کرد، وەک کۆدەنگییەک لەسەر ئەوەی، کە تاقە کەسێک شتێک لەوبارەوە بزانێت منم، ئەمەیش بەهۆی ئەوەی باوکم لە کۆشـــک کار دەکات. ڕاســـتییەکەی من هیچ شـــتێکم لەبارەی جەنگەکە نەدەزانی، تەنیا ئەوە نەبێت پێشتر لە باوکم باسی چەک و تفاقی زۆری سوپای خەلیفەم بیستبوو. ئەو سوپایە چۆن هەرەسی هێناوە و شکاوە؟ چ کارەستێکە ئەگەر پرتوگالییەکان ڕوو لە ئیشبیلیا بکەن؟ تەماشای دەموچاویانم کرد و گوتم:

- خەلیفە سوپایەکی زۆری وەگەڕخستووە. پێم وانییە پرتوگالییەکان بتوانن شکستی پێ بهێنن. لەوانەیە لە هێرشێکدا سەرکەوتبن نەک لە تەواوی جەنگەکە...

دیاربوو دڵیان بە قســـەکانی من ئاوی نەخواردەوە. چاوی هەموان ترس و پەشۆکاویی پێوە دیاربوو، بەتایبەتی چاوەکانی گالا و جیدۆ. حـەریری (لاحول ولاقوة)ەی دەکرد و بـە چپـە نزای دەکرد. چووم لەنێویاندا وەستام و گوتم:

- هـاوڕێیـان! پرتوگالییـەکـان قـەت جـەنگیان لەگەڵ ئێمەدا نەکردووە، هەموو ئەوەی بووە، بەرگرییان لە شار و وڵاتانی خۆیان کردووە و نـەیـانهێشـــتووە ئێمـە بچینـە نـاویان، هەر ئەوە و بەس! ئەوەیش بە مانای بەزینی ئێمە نایەت.

فریدریک هەستا، وەک ئەوەی کۆتایی بە دانیشتنەکە بهێنێت:
- خودا چیی پێ باش بێت، هەر ئەوە دەکات. موحی لە هەموو هەواڵ و قسە و باسێکی تازە ئاگادارمان دەکاتەوە... وانییە موحی؟
- بەڵێ، بەڵێ...
- ئێستەیش وا بزانم مانەوە لە دەرەوەی سنوورەکانی شار باش نییە، با بگەڕێینەوە ئیشبیلیا.
هەموومان بەرەو ئیشبیلیا هاتینەوە. شار ئارام بوو، وا دیارە تا ئەو کاتەی سوپای تێکشکاو دەست بە گەڕانەوە دەکات، هەموو ماڵێک بەو هەواڵە نازانێت. سوپا پەرشوبڵاو بوو، هەریەکەو لە کون و کەلەبەرێک دەگەڕایەوە. مەغریبییەکان بە ڕێی دەریا، تەرمی خەلیفەیان هێنایەوە. خەڵکەکە کەوتنە نێو ترس و چاوەڕوانی. موەحیدەکان لە ڕاگەیاندنی خەلیفەیەکی نوێدا دواکەوتن. والیی هەر چوار شارەکە، کە کوڕانی خەلیفە بوون، بۆ مەراسیمی بە خاکسپاردنی باوکیان چوونە مەغریب. ماوەیەک ئەندەلوس بێ خەلیفە و والی و سوپا مایەوە. هەر دەڵێی موەحیدەکان لەو شارەدا کۆچیان کردبوو. وەزیرەکانی کۆشک هەستیان بەم درزە کرد، داوایان لە پاسەوانەکان کرد دەروازەکانی شار دابخەن. وەک ئەوەی لە حاڵەتی جەنگدا بن، ڕۆژانە تەنیا دوو سەعات دەروازەکانیان دەکردەوە، پاسەوانەکان لەوپەڕی ئاگایی و هەستیارییدا بوون. ژمارەی قافڵەکان بە شێوەیەکی بەرچاو کەمیان کرد، تەنیا قافڵەکانی نێوان ئیشبیلیا و قورتوبە نەبێت، بە شێوەیەکی ئاسایی دەهاتن و دەچوون. بە هۆی چۆڵبوونی کورسیی خەلافەت، کاری بنیاتنانی خانووبەرە بە تەواوی وەستا. هەرچی وەستای بیناکردن و، دارتاشی و، کوورەچی و، کەسی لێزان و کارزان هەبوو، ئیشبیلیایان جێ هێشت و گەڕانەوە مەغریب.
حاڵی باوکم وەک حاڵی ئەو ڕۆژە وا بوو، کە موەحیدەکان لە مورسییە گەمارۆیان دابووین. نیگەران و تووڕە، سەر و سەلیقە

تێکچوو. بەتەنیا نانی دەخوارد و بە درێژایی چەندان سەعاتیش بەبێدەنگی لە باخچەکەی دادەنیشت. سەلوومیش بەشێک لە توورەیی باوکمی بەرکەوت. پێی گوتبوو بڕۆ دار و چیلکەم بۆ بکرە ئەویش لەبیری کرد، زللەیەکی لە پشتەملی دا.
باوکم هەر لە خۆڕایی ڕێگەی لە کچێکی دراوسێمان گرت و نەیهێشت بێتە لای خوشکەکانم. خاتوو دوڕەیش واقی وڕما، ئاخر قەت ئەوی وا نەبینیبوو. دایکم وازی لە پرسیارکردن هێنا، چونکە زانی پرسیارەکانی وی، زیاتر دەیجۆشێنن. بەرەبەرە هەموو ئەندامانی خێزان ڕاهاتن، کە چۆن خۆیان لە باوکم دوورەپەرێز بگرن. ئیتر باوکم کەوتە ئامێزی گۆشەگیری، نەمانزانی کاتەکانی چۆن و بە چ بە ڕێ دەکات.
لە ئاخری موەحیدەکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە یەعقووبی کوڕی خەلیفەی کۆچکردوو بکەنە خەلیفەی ئیشبیلیا، خەلیفەیش بڕیاری دا ئەبووئیسحاقی برای هەر بە والی ئەم شارە بمێنێتەوە.
دوای ئەوەی خەلیفە دەستەڵاتی گرتە دەست، دەنگی جاڕدەر لە ڕێگەوبان و کوچەوکۆڵانان بەرز بووەوە:" خەڵکینە! مەی پیسە و کاری شەیتانە، بۆیە داواتان لێ دەکەین قلْپی بکەنەوە. هەر کەسێک لەمەودوا مەی پێ بگیرێت، دەکوژرێت. خەڵکینە! گۆرانی و دەهۆڵ و زوڕنا کاری شەیتانن، کەسێک دەم و دەستیان بۆ ببات، دەخرێتە زیندان. خەڵکینە! بەرگی ئاوریشم، یان دیباجی ئاوزێڕکراو، بۆ هەموو پیاوێک قەدەخەیە. هەرکەسێک جلی ئاوریشم بپۆشێت لێی دەسەنرێت و جەڵدەی لێ دەدرێت."
دوای بانگەوازەکە پیاوانی ئەمن و ئاسایش بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خەلیفە، کەوتنە خۆ. مەی لە ڕێگەوبان و کۆچەکان دەگۆڕێ کرا، تا ماوەیەک بۆنی شەڕاب لەپێش مەیخانەکان هەر دەهات. گۆرانیبێژ و بەندبێژان بەزموڕەزمیان جێ هێشت و خۆیان لەنێو ماڵ و باخ و باخچەکانی دەوروبەر حەشار دا. نرخی ئاوریشم و دیباج

دابەزی، تایبەت ئەو قوماشـــەی بۆ پیاوان دروابوو، بە نرخێکی زۆر هەرزان دەفرۆشـراوە، هەر بە زوویی هەڵدەوەشـێنراوە و بۆ جلکی ژنان ڕێک دەخراوە. باوکم جلێکی ئاوریشـــمی هێنایە دەر، پێشـــتر خەلیفەی باوک پێشکەشی کردبوو، ئێستەیش بە گوێڕایەڵیی خەلیفەی کوڕ، دەبێ لەناوی ببات. بردی لە بازاڕ لای بەرگدروویێک داینا، تاکوو هەڵیوەشێنێتەوە و بۆ کچەکانی جلی لێ دروست بکا. گوستیلە زێڕەکەیشی لای زێڕنگەر تواندەوە، بۆ ئەوەی جارێکی دی بۆ دایکم بیکاتەوە گوسـتیلە. خۆیشـــی بە جلێکی زۆر ئاسـایی و بە خۆکەشخەکردنێکی کەمتر لە جاران هاموشۆی کۆشکی دەکرد، ئاخر دۆخە نوێیەکەیش هەر ئەمەی لێ دەخواست.

ڕۆژێک لەنێو باخچە دانیشـتبوو، بانگی کردم، کاغزێکی بەدەسـتەوە بوو، نیوەی پڕ کردبووەوە، کە منی بینی گوتی:

- دانیشە موحی.

ئەمنیش دانیشـتم، نەمزانی چی لە من دەوێت. تەماشـای پەڕەکەم کرد، ناوی چەندان کتێبی تێدا بوو، نووکی قەڵەمی دەخستە سەر ناونیشـانی کتێبەکان و بە چپەوە دەیژماردن. وەختێک تەواو بوو، لای بۆ کردمەوە و گوتی:

- دەمـەوێت نـاوی ئـەو کتێبانـەم پێی بڵێی، کـە لـە مزگـەوتـەکان دەگوترێنەوە.

- هەموو کتێبەکان؟ ئاخر خۆ سەدان کتێب دەبن!

- زۆرباشە، زۆرباشە، تۆ تەنیا کتێبەکانی مەزهەبی مالیکیم پێ بڵێ...

نـاوی هـەر کتێبێکم زانی، پێم گوت. نـاوی هـەر کتێبێکم دەگوت، دەگەڕایەوە سەر ئەو لستەی دروستی کردبوو، ئەگەر نەینووسیبا، ڕای دەگرتم و دەینووسـی، ناوی ئەو مەلایەشـی لەتەنیشـت دەنووسـی، کە لە حوجرە یان مزگەوت دەیگوتەوە. پێم گوت ئەم کارەت لەپای چی؟

- خەلیفە فەرمانی دەرکردووە کار بە فیقهی مالیکی ڕابگیرێت.

- بۆچی باوکە؟
- نازانم بۆ! خەلیفە بەر لە چەند ڕۆژێک قاسیدێکی ناردووە، داوای کردووە مەزهەبی زاهیری جێگەی مالیکیی بگرێتەوە، دەمەتەقێی موتەکەلیمەکانیش قەدەخە بکرێت. والییش داوای لەمن کرد ناوی هەموو کتێبەکانی مەزهەبی مالیکی کە لە مزگەوتەکاندا دەگوترێنەوە بۆ بنووسم.
- بۆ ئەوەی قەدەخەیان بکات؟
- بەڵێ.
- باوکە ئەوە زانستە. چۆن دەبێ لە خەڵک قەدەخە بکرێت؟
باوکم قەڵەمڕیشەکەی لەنێو شووشە حوبرەکە دانا، فووی لە نووسینەکە کرد تا وشک بێتەوە. بەر لەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە، گوتی:
- ئێمە چیمان پێ دەکرێت؟ ئەوان فەرمان دەکەن و ئێمەیش جێبەجێی دەکەین.
- پێویستە ئەهلی کەشف و زانست، ئامۆژگاریی ئەو خەلیفەیە بکەن، ئاخر ئەو هێشتا تەمەنی بچووکە و هیچ نازانێت.
باوکم بەم قسەیەی من دای لە قاقای پێکەنین و بە گاڵتەوە سەری بادا و گوتی:
- پێت وایە بچووکە؟ بە چەند ساڵان لە تۆ گەورەترە.
پەڕاوەکەی پێچایەوە و داوێکی لێ بەست و هەستا. منیش لێم پرسی:
- چی لەو لستەی بەردەستت دەکەیت؟
بەرەو لای ماڵەوە ڕۆیشت و لەبەر زۆر دانیشتن پێیەکانی سڕبووبوون و بە سووکیی دەشەلی، گوتی:
- دەیخەینە بەردەستی پیاوانی ئەمن و ئاساییش، ئەوان بەسەر مزگەوتەکاندا دەگەڕێن تاکوو لە پابەندبوونی شێخ و مەلاکان بەو بڕیارە دڵنیا ببنەوە.

## ٢٣

"هەرترووسکەیەك نەبێتە مایەی فێربوونی زانست، ناشێ پشتی پێ ببەسترێت"
ئیبن عەرەبی

نیوەڕۆ لە ماڵ دەرچووم، هەستم بە تەنگەتاوییەکی زۆر کرد. هەر دەڵێی تەنگەبەری پێشووتری شار بەس نەبوو، تا خەلیفەیش بە خۆی و ئەمر و نەهیەکانیشی بێتە سەرێ و هێندەی تر ناحەزی بکات. تەنیا کتێبەکانی مەزهەبی زاهیری ماون بیانخوێنینەوە، ئەوانیش نە دڵ دەجۆشێنن، نە هۆش دەخرۆشێنن. خەڵک تاقەت و توانای شاری ئیشبیلیای نەماوە. چاوەکانیان پڕ ترس و پەروا و باژێڕەکانیان وشک و برینگ و دەروونیشان شڵەژاوە.
لە کەناری ڕووبارەکە، کێشمەکێشم و دەمەدەمێی نێوان گەنجانی موسڵمان و گاورەکان چەندان جار پاتە دەبێتەوە. ژنە ئارایشکەرەکان دەنگۆی سەیروسەمەرەیان لەبارەی تەسلیمبوونی ئەندەلوس بە فەرەنگان بڵاو دەکردەوە. واتەواتێکی دی بڵاوبووەوە: کەشتیگەلی دەریایی خاچپەرستان، بەرەو بەندەرەکانی پورتوگال دەڕۆن. یاخیبوونێکی زۆر لەنێو ئەفریقا سەری هەڵداوە، هەڕەشە لە موەحیدەکان دەکرێت. تەنانەت وەرزی زستانیش لەبەرژەوەندیی ئێمەدا نییە، هەتا بڵێی ساردە، بەردەوام ڕەشەبا هەڵدەکات، بەم

کەشە تووش و ناخۆشە، ناتوانم بچم لە کەناری ڕووبارەکە پیاسەیەک بکەم، یان لە بازاڕەکاندا بۆ خۆم بگەڕێم.
تاکە پەناگەی من، ماڵی فریدریک و باخچەکەیەتی، هەرچەند ئەم پەنایەش وەک خۆی نەماوە. دوای دەرچوونی یاسا نوێیەکانی خەلیفە، زۆر حەزەر دەکەن، لە یەک مانگدا، تەنێ چەند ڕۆژێکی کەم کۆڕ دەبەستن. بەدەر لە چەند کتێبێکی کەم، هیچ کتێبێک نەماوە بیخوێنینەوە... لە ترسی ئەوەی بسووتێنرێن، یان دەستیان بەسەردا بگیرێت، لەناو چەند سندووقێکی ناون و بە پێست دەوری پێچاون و بە قافڵەیەکدا ناردوونی بۆ لای براکەی لە (مورسیلیا). جارێک بۆ باخەکەی بانگهێشتی کردین، نیوەی خەڵکەکە ئامادە نەبوون. دەهۆڵژەن نەهاتبوو. گۆزەی مەیش، لەجیاتی شەڕابی ترێ، (شەڕابولڕوب)ی[4] تێدا بوو. لەمە بترازێ هیچ شەڕابێکی دیکە نە دەهات و نە هەشبوو. من و حەریری و فریدریک و گالا و جیدۆ و سەمح و خزمەتکارە سەقلەبییەکەی فریدریک، کە لە گەورەکەیەوە بەکرێی گرتبوو، دانیشتین. لەبارەی شتگەلێک دوان، ئێستا بیرم ناکەوێتەوە، ئاخر کەم و زۆر پێوەندی بەمنەوە نەبوو. بادەیەکی شەڕابم بۆ خۆم ساز کرد و خواردمەوە. پاشان دووبارە خواردمەوە، دیسان خواردمەوە. دواتر قسەکانم پێ بڕین و دەستی (جیدۆ)م گرت، بە سەرسامی و بزەی پەستبوونەوە، تەماشای یەکتریان دەکرد. سترانبێژ بێ دەهۆڵژەن، بەزمەکەی گەرم کرد. حەریری هات بادەکەم لە دەست دەربێنێت، کە خەریک بوو لار دەبووەوە و دەڕژا، سەرگەرمی سەماکردن بووم... بادەکەم بەرزکردەوە و بە لێوەکانمەوە نووساند، وەک بابای تینوو، دەمم پڕ دەکرد و فڕم دەکرد. بادەکەم لە دەمی (جیدۆ) نزیک خستەوە، کشایەوە و بە لووتفەوە لە خۆی دوورخستەوە. سەمح و گالایش

---

٤- ناوی شەڕابێکی کۆنی ئەو کاتە، لە نێو ئینگلیزەکان پێی دەگوترێت Rum.

کەوتنە سەما، بە بەینی من و جیدۆدا هاتن و لێکیان دوورخستینەوە. تەواوی بادەکەم هەڵقورتاند، چووم بادەیەکی دی بهێنم. فریدریک دەستێکی لە شانم دا و بە پێکەنینەوە گوتی:

- هێواش هێواش... هێشتا هەر ئێوارەیە.

لاربووومەوە، سەمح گرتمیەوە و لێ نەگەڕا بکەوم. بادەیەکی دیکەم هێنا، بێوچان و فڕم کرد، مەی بە هەردوو لالێوەکانمدا چۆڕکەی کرد. خەریکی سەما بووم. توووند جیدۆم گرت، ویستم گاڵایش بگرم، وازیان لە سەماکردن هێنا و لە گۆشەیەکی مەجلیس دانیشتن. حەریری و سەمح سەمایان پێ کردم، بە تیلەچاوێکی مانادار تەماشای یەکتریان کرد، بەپەشۆکاوی بزەیان بۆ یەک کرد. هەوڵیان دا بادەکەم لە دەست ڕاپسکێنن، بەڵام وەک ئەوەی ئیکسیری ژیان بێت، توووند دەستم پێوە گیرساند. کەوتمە سەر مێزەکە، دەستم دایە دەهۆڵەکە و بە کەیفی خۆم کوتام، بانگی عوودژەنەکەیشم کرد:

- بەرزتر، بەرزتر...

بە دەوری خۆمدا دەسووڕێمەوە. دەخولێمەوە، تل دەخۆم. دەستی ڕاستەم کە بادەکەی گرتبوو، بۆ سەرەوە بەرز کردەوە، دەستی چەپەیشم بەخۆمدا بەردایەوە. هەستم کرد وەک پەڕەمووچ سووکەڵە بووم، وەک شاهەنگ بۆ ئاسمان دەفڕم. چاوەکانم توووند چووقاندن، سپیایەتییەکی زۆر هاتە بەرچاوە چووقاوەکانم. تا دەهات سپیایەتییەکە زێتر دەبوو، خولانەوەی منیش هەر پتر دەبوو. هەستم کرد داخڵی ناو هەور بووم و پێچەی سەریشم بوو بە هەور. پێم وابوو لەناو نوورێکی وەک پرشنگی خۆر، نقووم بووم. ئەستێرە و هەسارە بە دەورمدا دەخولانەوە. ئەستێرەیەکم گرت و ماچم کرد، هەسارەیەکم ڕاگرت و لە باوەشم گرت. هەموو لە بەردەمم خۆیان ڕووت کردەوە، خۆم هەڵدایە سەر یەکەبەیەکەیان.

لە هیکڕا لە پشتەوەی پەردەی گەردوون پیاوێک هاتە دەرەوە، هیچ ئادگار و شکڵێکی نەبوو، بانگی کردم و زۆر بەتووندی جەزبی کردم

و بەربوومەوە. ئەو مێزەی سەمام لەسەر دەکرد، وردوخاش بوو، شەرابی دەستم بەگۆڕێ وەربوو، گەدەیش هەرچی تێیدابوو هێنایەوە. چاوەکانم بەسەر دەموچاوی ترسناک و گرژومۆندا کردنەوە. هەستم بە ترس و لەرزێکی زۆر دەکرد، قەت لە ژیانمدا شتی وام بەسەر نەهاتبوو. ئاویان بەسەر دەموچاومدا ڕشاند. پێچەیان هەڵوەشاندمەوە و قۆپچەکراسیان کردمەوە و سینەیان ئاوڕشێن کردم. هەموویان ناوی منیان بەسەر زمانەوە بوو. هەڵیان گرتم و دایاننیشاندم. کە دانیشتم و لە دەوروبەرم ڕامام، هەستم کرد کەشەکە زۆر تەنگ و خنکێنەرە، خەریک بوو گیان بدەم. دیوارەکان نزیک بوو فیراقی ڕەشم لەبەر ببڕن، دەموچاویان درندەئاسا بوون، خەریک بوو قەپیان لێ دەگرتم. هەڵوەستەیەکم کرد و لە دەستیان ڕام کرد، بەرەو دەرگە چووم. لەنێو مەجلیسەکە ڕام کرد، نەمزانی بەرەو کوێ دەچم؟ کەسانێکی سەرخۆش و مەدهۆشم لە دوای خۆدا جێ هێشتن، نازانن چیم بەسەر هات!

لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا، لەم باخ بۆ ئەو باخ ڕاکەڕاکەم بوو. گوێم لە دەنگیان بوو، دواتر دەنگیان کپ بوو. بەسەر خاکی ڕەق و نەرمدا ڕۆیشتم، بەسەر خۆڵ و گژوگیادا ڕەتبووم. زەوینی ڕاست و خێچم بڕی، بە هیچ شێوەیەک تەماشای بەرپێیەکانی خۆم نەکرد. چەندان جار گلام و هەستامەوە، دیسان غارم دەدایەوە، هەر دەڵێی هەموو شەیتانەکانی دنیا دوام کەوتبوون. ڕام دەکرد و دەگریام، تنۆک تنۆک ئەسرین بەسەر لاجانگ و گوێچکەمدا دەهاتنە خوارەوە. ئاخری خۆم لە کەوشەنی ئیشبیلیا بینییەوە. بەدەم شین و هاوارەوە ڕام دەکرد، هانکەهانکم بوو و دەکۆکیم. گوێم لە باڕەی مەڕێک بوو، بەرەو لای چووم، شوانێکم بینی، کۆنەکراسێکی شڕوشیتاڵ و جڕبەجڕی لەبەردا بوو. بێجامەیەکی پیس و چەپەڵی لێ هەڵکیشابوو. دەستم خستە سەر شانی و بە هەناسەبڕکێوە پێم گوت:

- ئەمە چییە... جلی خۆتم بدێ و جلی خۆمت دەدەمێ.

چاوەڕوانی وەڵامی ئەوم نەکرد، ڕێک خۆم ڕووت کردەوە، ئەویش تەماشای کردم. کراسێکی لۆکەی نەرم و جوبە و بێجامەیەکی نوێم دایێ. دەستی پێداهێنان، زانی ئەو جلانە کەشخە و جوانن، وابزانم لە ژیانیدا جلی وای نە پۆشیبوو. سەری بەرزکردەوە، تەماشایەکی منی ڕووت و قووتی کرد و خێرا جلەکانی خۆی بۆ داکەندم و دانی پێم. کراسە دڕاو و بێجامە پیسەکەیم پۆشین. جێم هێشت، نەمزانی ئەوە ئینسان بوو یان جنۆکە، خەو بوو یان ئاگایی. بە ئاڕاستەی شوورەکەدا ڕۆیشتم، لەنێو سینەیشم دەنگێک هەبوو، بێ هەژمار پاتە دەبووەوە. دواجار گەیشتمە گۆڕستانێک، سڵاوم لە مردووی نێو گۆڕەکان کرد، بەنێویاندا هاتم و چووم، هەستم بە ئۆخژن و ئارامی کرد. چاوم لە گۆڕێکی وێرانبوو هەڵەنگوی، وەک ئەشکەوتێکی بچووکی لێ هاتبوو. چوومە نێوی دانیشتم، دەستم بە قورئانخوێندن کرد.

## ٢٤

"هەر حاڵێك تا دوو زەمەن درێژەی کێشا، کەڵکی پشتپێبەستنی نامێنێت"
ئیبن عەرەبی

بەیانی ڕۆژی پێنجەم، سەلووم منی دۆزییەوە. هەتا بڵێی نیگەران و خەمناک بوو. قسەی دەکردن و ئومێد و شەکەتیی تێکەڵ بە چاوە پڕ ئەسرینەکانی بووبوون. ئەگەر لە گۆڕستان دەرنەچووبام و نیازی گەڕانەوەی شارم نەبوایە، ئەوە چاوەڕوانیی کەسوکارم پتر درێژەی دەکێشا. باوکم بە ئیزنی والی، دە سەربازی بۆ گەڕان بەشوێنمدا لە دەوروبەری ئیشبیلیا تەرخان کردبوون. حەریری دوا ساتی منی لە باخی فرێدریک بۆ باوکم باس کردبوو، وەسفی ئەو حاڵەیشی کردبوو، کە لەوێ ڕام کرد... هەموو شتێک، بەڵێ هەموو شتێکی پێ گوتبوو... تەنانەت لێکدانی بادە و بەزمورەزمی گۆرانیچڕینیش...
بە جلوبەرگی شوانەکە، گەڕامەوە ماڵەوە، چڵکن و پیستر بووبوون. دەموچاوم خۆڵاوی و، ڕەنگم هەڵپچکوڕابوو، لە برسان چاوم قووڵ چووبوون. دایکم، کە منی بەو حاڵەوە بینی، دڵی پارەپارە بوو، دانیشت و وەک هەمیشە، کە دەگریا قاچێکی درێژ کرد و قاچێکیشی خستەوە ژێر خۆی، وەک دایکی ڕۆڵەمردوو دەیناڵاند. باوکیشم بە دەورمدا دەهات و دەچوو، هێشتا نەیدەزانی داخوا دیل بووم، تا بەزەیی پێمدا بێتەوە، یان وێڵ بووم، تا شەفەقەتم لەگەڵدا بنوێنێ،

یاخود مەست و سەرخۆش بووم، تا بەسەرمدا ببۆڵێنێت. خوشکەکانیشم توونید خۆیان بە دەرگەوە نووساندبوو، لە شێوە و شکڵیان ترس و دەهشەت بەدی دەکرا، تا چوار ڕۆژان ترس بەرۆکی وانی بەرنەدا.

لەتەنیشت دایکم دانیشتم، ئەوەندەی کرا وەڵامی پرسیارەکانی باوکمم دایەوە. دواتر گازی دادەدوڕەی کرد، بچێت گەرماوم بۆ ساز بکات. دادەدوڕە سابوون و شووشە گوڵاوێک و، لیفکەیەکی نوێی بۆ دانابووم. سەلوومیش مەنجەڵی گەرماو، کە عادەت نەبوو پڕ ئاو بکرێت، بۆی پڕ کردبووم. چەند توانیم خۆم شووشت، جلم پۆشین و بە سەر و پێی تەڕ هاتمە دەرەوە، چوومە ژوورەکەم و هەتا نوێژی نیوەڕۆ لێی خەوتم. کاتێک وەخەبەر هاتم، قاپێکی پڕ میوەجات و پەنیر و نان دانراوە، وا دیارە لە کاتی خەوتنم دایکم بۆی هێناوم. بەهێیەک و چەند دەنکە ترێیەکم خوارد، ڕیوەڵۆکەکانم وەئاگا هاتن، چوومە ئەدەبخانە ماوەیەک مامەوە، سکم هەڵگوشی و هەستم بە ژانی گەدە کرد. ئەمەم لای دایکم باس کرد، سەلوومی نارد سرکەی سێو و ڕووەکی (قیرفە) و (مەریمیە) بێنێت. (قیرفە)ـی تێکەڵ بە سرکەی سێو و زەیتی زەیتوون و زەعفەران کرد، هەرکە لە گەرماو هاتمە دەرەوە، ڕاستەخۆ گیراوەکەی دامێ. پاشان گەڵای (مەریمیە)ـی لەنێو ئاوێکی گەرمدا کوڵاند، پشت و شانی پێ شێلام، دەستی بە دەموچاومدا هێنا، سەرم خستە سەر سینەی، گریا و تنۆک تنۆک ئەسرینی گەرمی بەسەرمدا باراند.

ئێوارە باوکم لە کۆشک گەڕایەوە، ڕێک بەرەو ژوورەکەی من هات. لەسەر جێخەوەکەم دانیشت و لە تەندروستیم دڵنیابووەوە و لێی پرسیم:

- ڕۆڵە لەکوێ بوویت؟ کێ ئەمەی پێ کردیت؟
- باوکە لە گۆڕستان بووم.
- چوار ڕۆژ لە گۆرستان بوویت؟ وامانزانی ڕفێنراویت...

- ســــوێند بە خودا، تا ئێوە باســــتان نەکرد، نەمزانی چوار ڕۆژ لە گۆڕستان ماومەتەوە!
- چۆن بوو؟ چی ڕووی دا؟
خۆم لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دزییەوە و ڕووم وەرگێڕا، باوکم هەمان پرسیاری دووبار کردەوە... منیش وەڵامم نەدایەوە. چەناگەی گرتم و ڕووی منی بۆ لای خۆی وەرسووڕاند، چاوی لەچاوی بڕیم و هەمان پرسیاری کردەوە:
- ڕۆڵە! پێم بڵێ کێ ئازاری داویت...
پاشان سۆزی لە دەنگی خۆی بڕی و بە توندی گوتی:
- نەکەی هیچ چتێک لە من بشاریتەوە.
هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و دیسان ڕووم لێ وەرگێڕاوە و گوتم:
- جەزبە بوو باوکە، جەزبە!
- جەزبە چییە؟
- جەزبەی سۆفییان.
باوکم بەم وەڵامانەی من ئۆقرەی لێ هەڵگیرا، چونکە لای ئەو، ئەم جۆرە قسانە وەڵامگەلێکی ئاڵۆزبوون، بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:
- پێم بڵێ جەزبەی سۆفیان چییە؟
- ســــەرنج و عینــایــەتی خودایــە بۆ بــەنــدەکــانی، بۆ لای خۆی کەمەندکێشیان دەکات.
- ئەمە چۆن؟
- خودا ســــەرنجی حــاڵی دام و بــە عینـایـەتی خۆی جـەزبی کردم. جەزبەی خودا مرۆ شــــێت و دێوانە دەکات. ئەدی وەختێک مەلا ئامۆژگارییەکی بەکەڵکت دەکات، دەروونت ناشــــڵەژێت و دڵت سامگرتی نابێت؟
- با.
- ئەی چی ئەگەر خودا خۆی ئامۆژکارییت بکات؟
- بۆچی خودا تەنیا ئامۆژگاریی تۆ دەکات؟

- چونکە من وەلیی ئەوم.
قەیرێک باوکم بێدەنگ بوو، دواتر چاوێکی بەڕاســت و چەپیدا گێڕا، لە ژوورەکەم بەدوای شتێکدا دەگەڕا نەختێک فشاری توورەییەکەی کپ کاتەوە. یەک بە دەمی خۆی هاواری کرد:
- کوڕەکەم! وەئاگا وەرەوە، چیتر خۆت لە خەتی مەیلان مەدە. تەمەنت بیستودوو ساڵە، شەوت لەگەڵ چاوەش و سەماکەران بەڕێ کردووە، پێم ناڵێی تۆ چ وەلییەکی؟
- خودا وای داناوە من مەست و سەرخۆش بم و ڕابوێرم، تا شایانی جەزبە و تۆبە بم.
- هەروا بەو ئاسانییە کەیل و مەست بین تاکوو ببینە وەلیی خودا؟
پرســیارەکەی باوکم توورەیی و ســووکایەتیی تێدابوو، بۆیە وەڵامم نەدایەوە. هەر بەبێدەنگی مامەوە، سەرکۆنەکردنی ئەوم قووت دا، کە چەند جارێک بە ڕوومدا هەڵشاخی. لێی پرسیم:
- ئەی بۆچی لە گۆڕستان مایتەوە؟ بۆ نەهاتییەوە ماڵەوە؟
- لە گۆڕســتان دڵم بە هەق تەعالا گرێ دا. هەزار هەزار جار داوام لێ کرد بمخاتە ژێر باری کارێکەوە لێم ڕازی بێت، نەمخاتە ژێر باری شتێک لە خۆییم دوور بخاتەوە.
- هەزار هەزار جار؟
- بەڵێ باوکە، هەزار هەزار جار. کاتێک لەو ژمارەیە بوومەوە، هاتمەوە لاتان. ئێوە بە حیســابی خۆتان دەڵێن چوار ڕۆژت پێچووە، بەڵام من بەگوێرەی خەڵوەتی خۆم، هەزار هەزار نزام کردووە. ئەوە زەمەنی منە، دەگەڵ زەمەنی ئێوەدا، ئاسمان و ڕێسمانە نێوانیانە.
باوکم وەستا، بە تەواوی ئۆقرەی لێ هەڵگیرا، ویستی دەرچێت، لەکن قاپییەکە وەســتا و ئاوڕێکی لێ دامەوە و بە دەنگێکی ئومێدلێبڕاو گوتی:
- ڕۆڵە! بەخوا کەســانی چاک و خراپ و تۆبەکار و گوناهکار و چاکەکار و تاوانبارم بینیون، ئێســتە نازانم تۆ لە کامیانیت؟ پێم وایە

کەڵکەڵەی لە خۆبایبوون لە عەقڵی داوی، وا دەزانی بوویتە وەلی، وەلی چی و حاڵی چی؟ بانگەشـــەی تەقواداری دەکەیت، کەچی هیچ تەقوایەکت نییە! ســـوێند بە خودا هەموو ئەوانە لە بێکاری و کاتی زۆرتەوەیە.

- نا باوکە، من بە زیکری خودا ســـەرقاڵم، فەراغی من، بە نووری خودا پڕبووەتەوە.

- هـەی ڕووت ڕەش بێـت یـاخوا. ســـەرقـاڵی کۆڕی گۆرانی و مەینۆشـــینی، ســـەرئێشـــەیش بۆ مردووی نێو گۆڕەکان دروســـت دەکەیت...ئەی نەتزانیوە، خەلیفە یەعقووب فەرمانی داوە هەرکەسێک مەی بخواتەوە، جەڵدەی لێ بدرێ، ئەگەر دووبارە گەڕایەوە سەری، بکوژرێت. ئەو ئەنجامەی من لێی دەترسم، هیی هیچ وەلی و شێخێک نییە، جا بیر لە حاڵی خۆت بکەوە.

دەنگی ئومێدلێبڕاوی باوکم هانی دام پێی بڵێم:

- کەواتە ڕێگەم بدە سەفەر بکەم.

باوکم بەو داخوازییەی من زیاتر تووڕەبوو، لە ناوەڕاستی ژوورەکەم وەستا و دەستی بەرزکردنەوە و هاواری کرد:

- ســـەفـەر دەکەیت؟ لەنێو ئیشـــبیلیا لەبەرچاوی خۆم متمانەم پێ نەکردی، دەتەوێت لە شـــوێنی دیکە بڕوات پێ بکەم. بەســـە هەی ڕووت ڕەش بێت.

لە ژوورەکەم چووە دەرەوە و لەناکاو وەژووکەتەوە و گوتی:

- بزانە لێرە بەدواوە، چەند چاودێرێکت بەســـەرەوە دادەنێم، ســـوێند بە خودا شتێکی خراپت لەبارەوە ببیستم، دەردێکت پێ دەکەم کەس بە کەسی نەکردبێت.

# ٢٥

**"تۆ، هەوری بەر خۆری خۆتی، دەی کەوابوو خۆت بناسە"**
**ئیبن عەرەبی**

لە ماوەی چوار ساڵدا، شتگەلێک ڕوویاندا قەت بە خەیاڵمدا نەهاتبوون: لای خەلیفە بوومە کاتیب، دەگەڵ کچێک بەناوی مەریەمی کچی عەبدوون زەماوەندم کرد. ئەوەی خودا ویستی لەسەربوو، کردی. هەرچییەک خواستی لێ بوو، سازی کرد. ئەمن هیچ جێدەستێکم لەو کارە نەبوو. خودا بۆ ئەوەی کارەکانی بەجێ بگەیەنێت، دوو کەسی هەڵبژاد، یەکەم: سانشۆی یەکەمی پاشای پرتوگال. دووەم خوشکە بچووکەکەم.
کەسی یەکەم، دوای ئەوەی سوپاکەی دەپەڕێنێتەوە و بۆ ئەوەی لای (شلب) لەگەڵ سوپای خەلیفە ڕووبەڕوو ببنەوە، داوا لە خەلیفە دەکات سوڵح بکەن. کەسی دووەم، خوشکە بچووکەکەم، لەگەڵ دایکم و خوشکەکەی دیم ڕێک دەکەون، کە ژنێکم بۆ بدۆزنەوە، تاکوو چیتر نەچمە گۆڕستانان و لەسەر گۆڕی مردوان دانەنیشم. کارەکە بە ئارەزووی وان کۆتایی هات، ڕۆژانە هاودەمی خەلیفە و شەوانەیش هاونشینی هاوژینەکەم بووم. چوونە گۆڕستان و سۆفیایەتیش هیچ باسێکیان نەما. ئەمن هێشتا بەندکراوی نێو

ســـنوورەکانی ئیشـــبیلیا بووم، دوو زنجیری دیکەیشـــم تیکران، بەتەواوی بەسترامەوە.
دوای ڕێککەوتن و ئاشـــتەوایی، خەلیفە بڕیاری دا لەبری ئەوەی بگەڕێتەوە مەغریب، لە ئیشـــبیلیا بمێنێتەوە. هەر لەگەڵ بەیانکردنی نیازەکەی، والی سوپای جێ هێشت و لەگەڵ سێ لە پاسەوانەکانی بە ئەسپی خۆشڕەو بەرەو ئیشبیلیا هاتنەوە و ئامادەسازییان بۆ گەیشتنی جەنابی خەلیفە کرد. هەر لە ئانی گەیشتنی والی، داوای لە باژێڕوان و شورتە و ڕیشسپی و دەمڕاست و مەلا و نووسەرانی کۆشک و قازییەکانی ئیشبیلیا کرد، ڕۆژ و شەو لە یەک گرێ بدەن، تا کاروباری خەڵک ڕاهی بکەن و بۆڵەبۆڵی خەڵک ببڕن، بۆ ئەوەی لە وەختی هاتنی خەلیفە، کەس سکاڵا بۆ مەقامی ئەو بەرز نەکاتەوە.
والی هەموو لایەکیشی لەوە ئاگادار کردەوە، کە:
- خەلیفە لە مەراکیش دەچێتە بازاڕ و قسـە لەگەڵ خەڵک دەکات، لە ئاتاج و پێویستییەکانیان دەپێچێتەوە. هەر ستەم و زۆرداریەکی بەرچاو بکەوێت، لە هەمان سەعاتدا بەدواداچوون و کاری پێویست دەکات...بۆیە تکاتان لێ دەکەم وریا و لەسەر هەست بن!
دواتر والی داوای لە مجێوری مزگەوت کرد بەرەکانی مزگەوت بە بەرەی نوێ بگۆڕێت و دیوار و دوانگەکەی میسکپڕژێن بکات. هەروەه داوای لە باخەوانەکان کرد، دارەکانیان هەڵپەردێون، گوڵ لە کێڵگەکان بێنن و لە دەوروبەری ئەو ڕێگەیەدا بیانچێنن، کە خەلیفە پێیدا تێ دەپەڕێت.
باوکیشم لەوەتەی والی گەڕاوەتەوە، بۆ شەوێکیش لەماڵەوە نەخەوتووە. هەموو شەوێک لای خۆی دەمهێڵێتەوە، تاکوو هەموو ئەو بڕیارانەی پێشتر دەرچوون و جێبەجێ کراون بەیەکەوە تۆماریان بکەین، چونکە خەلیفە وەختێک جڵەوی خەلافەتی گرتە دەست، فەرمانی دەرکرد، هەر بڕیارێک لە حوکمەکانی خودا جێبەجێ کرا، پێویستە بەڵگە و شایەتی و هەموو وردەکارییەکانی تۆمار

بکرێن. پێشـــتر والی گرنگیی بەم باســـە نەدەدا، چونکە پێی وانەبوو خـەلیفەی برای لێپێچینـەوە و پشـــکنین لـەو بـارەوە بکات، بەلام ها ئەوەتە براکەی دیکەی، هێشـــتا پێی نەناوەتە خاکی ئیشـــبیلیا، داوای تۆماری دادگایی دەکات. ئەگەر ئەو کارەی کردبێت و کەســـێکی وردبین بێت، تێبینیی ئەوە دەکات، کە دەرەجەی حوبرەکە لە ڕووی قوولّی و ڕەنگ و هەلّمژیندا یەک شـــتە، خەتەکەیش بەیەک شـــکلّ نووسراوە. کتێبی تۆماری بڕیاری چەندان سالّ دادگایی لە ئیشبیلیا، لە ماوەی دوو شەو، بە دەستی کەسێک نووسراوە ئەویش باوکمە.

بەهەرحالّ، شـــەوێک خەلیفە گەیشـــتە ئیشـــبیلیا، بەرەو کۆشـــکەکەی چوو، سوپاکەیشـی لە دەرەوەی شوورەکانی شار، جێ هێشتبوو. لە بەیانی ڕۆژی دواتر، لەناکاو لەگەلّ دوو لە پاسەوانەکانی لەنێو بازاڕ دەرکـەوت. هـەر لـەگـەلّ بلاوبوونـەوەی ئـەو هـەوالّـە، بـازێڕوان و دەمڕاستانی ئاوایی لە دەوری جەم بوون، پرسیاری نرخ و کەلوپەل و کالاو و خواردەمەنیی لێ کردن. خەلّکەکە لە دەوری گردبوونەوە، سلاویان لێ کرد و دەستیان بە سینە و جلوبەرگیدا هێنا. چوو لەلای دوو پیاو وەستا و پرسیاری لێ کردن:

- والییەکەتان پێ چۆنە؟

- هەتا بلّێی باش و بەخشندەیە.

- هیچ سکالایەکی دادگاییتان هەبووە؟

بە نەخێر وەلامیان دایەوە. خەلیفە دەنگی خۆی بەرزکردەوە:

- خەلّکینە! کێ لەو نزیکانە سکالای هەبووە؟

کەسێک وەلامی خەلیفەی داوە:

- قوربان! من.

- نزیک بەوە.

هاتە پێشەوە و خەلیفە پرسیاری لێ کرد:

- سکالاکەت چی بوو؟

- چەند بەدکارێک لە بازاڕ لێیان دام.

- قازی دادوەرانە لەگەڵت جولایەوە؟
- بەڵێ، بڕیاری شکاندنی ددانی یەکێکی دەرکرد، بەڵام بە پێنج دینار ددانەکەی کڕیبوو.
- ڕازی بوویت؟
- بەڵێ.
خەلیفە گوتی:
بزانە لە ڕۆژی پەسلاندا تۆ لەو قسەکردن و شایەتیدانەی خۆت بەرپرسی.
- مەولام هەرچی گوتم ڕاست و دروست بوو.
ڕۆژی دوایی باوکم گوتی خۆت ئامادە بکە بچینە کۆشک بەخێرهاتنی خەلیفە بکەین. کاتێک گەیشتینە کۆشک بینیمان کۆمەڵێک خەڵک بۆ هەمان مەبەستی ئێمە سرەیان گرتووە، چاوەڕێمان کرد تا نۆرەمان گەیشتێ. باوکم سلاوی لە خەلیفە کرد و منیشی ڕەپێش کرد:
- ئەمەیش کوڕەکەمە، موحیەدینی بن عەرەبی.
تەوقەم لەگەڵی کرد و ویستم بڕۆم، دەستی بەرنەدام، لە دەموچاوم ڕاما و گوتی:
- ئیبن ڕوشد باسی تۆی بۆ کردووم.
بێدەنگ و خامۆش مام، نامزانی چ بڵێم، خەلیفەیش هێشتا هەر لە ڕوخسارم ڕاماوە. دواتر دەمی کردەوە و گوتی:
- تۆ لە مەجلیس بمێنەوە، تا خەڵکەکە دەڕۆن.
بە دڵی دەهشەتبارەوە دانیشتین، باوکیشم حاڵی لە من باشتر نەبوو، ترس و چاوەڕوانیی پەڕیبووە سەر و سیمای. هیچ کاممان پێمان وانەبوو ئەو دیدارە کەمەی من بە ئیبن ڕوشد لە قورتوبە هێندە گرنگ بوو بێت و لە یادگەیدا مابێتەوە و باسم بکات. چاودێری هەڵسوکەوتی خەلیفەم کرد، بە دەمی بەخەندەوە، بە شێوەیەکی زۆر خاکییانە سلاوی لە خەڵک وەردەگرتەوە. جلێکی زاهیدانەی خوری لەبەردا بوو، وەک جلی ئاسایی خەڵکەکە وابوو. بیرم لەوە

دەکردەوە، ئەگەر خەڵکەکە ئێرە چۆڵ بکەن دەبێ چی لەنێوان من و خەلیفەدا ڕوو بدات.
لەناکاو باوکم دەستی گرتم و بە سرتە پێی گوتم:
- کوڕەکەم قســـەی جوان بکە و ئەدەب بنوێنە، نەکەی دەمەتەقێی لەگەڵ بکەیت. ئەگەر فەرمانی شتێکی پێ کردی، بڵێ بەسەر چاو.
ســـەعاتێک تێپەڕی، بەر لەوەی دەرگەوان خەڵکەکە لە مەجلیســـەکە بەڕێ بکات، ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی: خەلیفە بانگتان دەکات.
چووینە لای و لە تەنیشتی دانیشتین، بەبێ هیچ پێشەکییەک گوتی:
- ڕاستە بە ئیبن ڕوشدت گوتووە فەلسەفە غەیب کەشف ناکات؟
- بەڵێ. جیهان لەسەر هەمان دۆخی خۆی نامێنێت.
- هەروەها گوتووتە لە ئیرادەی خودا بەولاوە، هیچ یاســـایەک لە گەردووندا نییە؟
- بەڵێ، وام گوتووە.
خەلیفە بزەیەکی هاتێ و بەدەســـت بزاوێکی کرد، وەک ئەوەی بڵێ منیش تەواو لەگەڵ بۆچوونەکەی تۆدام. پاشان گوتی:
- خودا بەرەکەت بخاتە ژیانت. ئەی کەوابوو فەلســەفە چ ســوودێکی هەیە؟ پێت وا نییە پێوە خەریکبوونی کاتکوشتن بێت؟
- پێشـــەوای باوەڕداران، فەلســـەفە واتای خۆشــویســتنی حیکمەت دەگەیەنێت، خۆ هەر کەسێک دڵبەرەکەی خۆشویست، مانای وا نییە پێی دەگات.
- ئەڵڵا ئەڵڵا لەم قسە جوانەی کە کردت!
- بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمە دەستەڵاتی ئەوەمان نییە دڵ لە جۆشان کپ بکەین، دەروون لە خرۆشان و ئەویننداری مت بکەین.
- بەڵێ، ڕاست دەکەن.
- خودا کۆمەکی خەلیفە بکات.
- هەتا لە ئیشبیلیا دەڕۆم، لە مەجلیسی من هەڵمەستە.

# ٢٦

**"هەقیقەت بەهۆی ژنەوە، دەگاتە پلەی کەماڵ"**
**ئیبن عەرەبی**

بیستوشەش ڕۆژی خشت یاوەر و هاودەمی خەلیفە بووم. ڕۆژانە دادەنیشت و کاروباری خەڵکی ڕاهی دەکرد، منیش لەکنی دادەنیشتم ، گوێم لێیان دەگرت و چاوم لەسەریان بوو. سەرەتای هەموو دانیشتنێکی بە قورئان دەست پێ دەکرد، پاشان یەکدوو لاپەڕەی فەرموودەی دەخوێندنەوە و بەشێکیانی ڕاڤە دەکردن، دواتر بە کاری خەڵکەوە خەریک دەبوو. کاتێک خەڵکەکە دەڕۆیشتن و دەرگاکانی کۆشکیان دادەخست، کەمێک پشووی دەدا، ئەوکات دەرفەتی دەرچوونم لە کۆشک بۆ دەڕەخسا و دەگەڕامەوە ماڵە. دوای نوێژی عیشا، دیسان دەگەڕامەوە کۆشک، دەمدیت لەگەڵ وەزیر و دەرگەوانەکان دانیشتووە و خەریکی خوێندنەوەی بەریدە، یان لە ڕێگەی کاتیبەکانیەوە، سەرقاڵی نووسینە، منیش مۆڵەتم دەخواست و دادەنیشتم، نانی ئێوارەمان لەسەر خوانی ئەو دەخوارد. دوای نوێژی عیشا، خەلیفە زۆر ئێشکگریی ناکات، پونگاوێکی گەرم دەخواتەوە و دەخەوێت. ئەمنیش هەڵدەستام و بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە، باوکیشم چاوەڕێی دەکردم و بە ڕەنگ و خولقی خۆشەوە پرسیاری لێ دەکردم، ئاخۆ ئەمڕۆ لەگەڵ خەلیفەدا چیتان کرد؟ منیش پێی دەگوت:

ئەوە و ئەمەمان کرد و فلان و فیسار سەردانیان کردین، باوکیشم دەیگوت:

- هەر ئەمە و بەس، ئەی بەدرێژایی ڕۆژ لە مەجلیسی ئەودا چیت دەکرد؟

- ئاخر ئەو بەردەوام خەریکی دابینکردنی خۆراکە بۆ سوپا. ئەو ماوەیە بازرگانەکان لە هەموو خەڵکی پتر لە مەجلیسی ئەو ئامادە دەبن.

- مادەم سوپاکەی پەرت نەکردووە، دیارە دەیەوێت جارێکی دیکە بۆ جیهاد بڕواتەوە، ئەوە گومانی تێدا نییە. بەڵام ئەمجارە کەس نازانێت بەرەو کوێ دەچێت. لەگەڵ پرتوگالییەکان لە سوڵح و ڕێککەوتندان. لەگەڵ قشتالییەکان هودنەی کردووە، هەموو شۆڕشەکانی توونسیش خامۆش بوون.

- بەرەو پورتوگال دەڕوات...

- دەشێ، بۆنا؟ دەکرێ بشڵێین بەرەو خۆرهەڵات دەچێت، دەریا دەبڕێت و دەچێتە (میورەقە)، کە تا ئێستە لەژێر چەپۆکی (بەنوغانیە)دایە.

شەوێک خەریک بوو خەوم لێ دەکەوت، خوشکەکەم (ئوم سەعد) ئیزنی خواست و هاتە ژوورەکەم و گوتی:

- دەزانم گوێم لێ ناگریت، بەڵام دەمەوێت باسی مەریەمی کچی عەبدوونت بۆ بکەم.

- ئەو کێیە؟

- ئەدیبێکی ڕەوشتبەرزە، زانایەکی چاوکراوەیە، هەروەها جوانیشە.

- بۆچی باسی ئەوم بۆ دەکەیت؟

- بۆ ئەوەی زەماوەندی لەگەڵدا بکەیت! هەر بۆ ئەمە و بەس!

بە قسەکەی پێکەنیم و بەلووتفەوە ڕووی خۆم وەرگێڕا و گوتم:

- ئوم سەعد وازم لێ بێنە با بخەوم، ئەمن ژن ناهێنم نا.

خوشـکەکەم ڕۆیشـت، منیش خەوتم. خەونم بە مەریەمەوە دیت، بە بزەوە خـەریکی خوێندنـەوەی کتێبێک بوو. هـەر لـەو خـەونـەدا بـە شـێوەیەکی دیکە خۆم و ئەوم بینی، ناتوانم لێرە باسـی بکەم. ڕۆژی دواتر بە سـەلاپیتەی خەیاڵمەوە نووسا، بە باران لێ نەبووەوە. زانیم ئەوە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی، کە دڵم کەسـێکی لە ڕێگەی ناوەکەیەوە هـەڵبژارد، دەنا بۆچی لە جیاتی هەموو کچانی دنیا، هەر ئەو لە خەو دەبینم؟

چەند شـەوێکی تریش، هەمان خەونم بینییەوە، تێگەیشـتم ناتوانم بەتەنیا ئەو کارە ببڕێنمەوە، پێویسـتە پرسـوڕا بکەم. دادە فاتیمەی کچی موسـەننا، واری خۆی بۆ ئیشـبیلیا گواسـتبووەوە، وام بەباشـم زانی بچم ڕاوێژی پێ بکەم، چوومە لای و دەستیم ماچ کرد:

- دایەگیان، لەبارەی مەریەم چی دەڵێیت؟

- وەک مەریەمی کچی عیمرانە، داوێنپاک و ڕەوشـتبەرزە، خودا بە وێنـەی ئـەو، لـەنێو هـەموو ژنی دنیـا هـەڵی بژاردووە و پـاکی کردووەتـەوە. وەک وی گوێڕایـەڵ و کڕنووشـبـەر و ڕکووعبـەر و خوداناسە.

- دایە دەیناسێنیت؟

- نا کوڕە شیرینەکەم، وەک هاوژینی داهاتووی تۆ باسی دەکەم.

لەوبارە قسـەم دەگەڵ باوکم کرد، ئەویش زوو سـۆراخی باوکی مـەریـەمی کرد، پاش چـەند ڕۆژێک لە ماڵی خۆی مێوانداری کردین، خواردنێکی زۆری بۆ چێ کردبووین، بـە بینینی مـە زۆر دڵخۆش بوو. چوومە بازاڕ، شـانە و عەتر و قوماشـی ئاوریشـم و کەتان و پێڵاوم بۆ کڕین و لەگەڵ سـەت دیناری موەحیدی، وەک مارەیی بۆم برد. چـەنـد هـەفتـەیـەکی کـەمی پێ چوو، گواسـتمـەوە. بـاوکم لـە دەوربەری لە (ئیقلیمی شـەڕەف) خانوویەکی بۆ بەکرێ گرتم. چوار ژووری تێـدا بوون، ژوورێـک بۆ دەرس و دەور، ژوورێـک بۆ

هاوژینەکەم، ژوورێک بۆ دایە فاتیمە، ژوورێکیش بۆ بەندەیەک بەناوی (عەداد)، کە باوکی مەریەم، بە دیاریی دابوویە مەریەم.
ئەمن مەریەمم خۆشویست. چەناگەیەکی تیژ و دوو چاوی مەست و جەستەیەکی خڕکەڵە و خرپنی هەبوو. لەپەدەستەکانی گۆشتن بوون، کاتێک زۆر تەماشام دەکردن، شەرمی دەکرد، مەیلەوخێچ دادەنیشت و لەژێر خۆی دەیشاردنەوە، منیش پێدەکەنیم. لەگەڵم زۆر گەرموگوڕ بوو ، وەک درەختێک، کە تازە چرۆ دەربکات، وا بوو. دڵی ڕازی کردم، بادەی خۆشی پێ نۆش کردم، سەرجێیەکی ئارام و ئاسوودەی لەگەڵ کردم. ڕاستییەکەی ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە، ئەمن تاقەتی ئیشبیلیام نەمابوو.
وا بەرەو ماڵ دەگەڕێمەوە. ڕێوبانەکانی ئەو شارە، تەنگیان پێ هەڵچنیوم، شووورە بەرزەکانی زیندانییان کردووم. یارەکەم بالیفێکی لۆکەی بە قوماشێکی جوان و ڕازاوە دروست کردووە، دەیخاتە پاڵ پشتم، ئینجا سەری خۆی دەخاتە سەر ئەژنۆکانم و چاوەکانی، لە چاوەکانم دەبڕێت. دەموچاوی لە من نزیک دەخاتەوە و دەڵێت: "ئازیزەکەم، قسەم بۆ دەکەیت، یان قسەت بۆ بکەم؟ "کاتێک قسەی بۆ دەکەم، وەک بخووری هیندی وایە، بە تاسەوە گوێی بۆ دەگرم، بە جوانی گوێم بۆ هەڵدەخات. گاڤێک ئەو قسەم بۆ دەکات، میچی ژوورەکەم چەند کڵاوڕۆژنەیەکی بۆ ئاسمان تێ دەبێت، ئەستێرە و هەسارەکانیش فزووڵی دەکەن و بە تاسەوە گوێ لە حیکایەتی ئەو دەگرن.
خەبەری ژنهێنانی من گەیشتە خەلیفە، شەوێک بانگی کردم و دەباوەشی گرتم و پیرۆزبایی لێ کردم، دڵخۆشانە بزەیەکی بۆ کردم. پاشان بانگی دەرگەوانەکەی کرد و گوتی:
- (موستەعنی)م بۆ بێنە.
دەرگەوان نەختێک ونبوو و هاتەوە، کتێبێکی پانوپۆڕی هێناو و لەبەردەم خەلیفەی دانا و گوتی:

- ئەوە کتێبی ئیبن بکلارشە، دەیناسی؟
- بەڵێ دەرمانسازە، لە جوولەکەکانی (ئەلمێریە)یە.
- کوڕە! بەزەییت پێدا بێمەوە! ئەوە چییە هەمووشتێک دەزانی!
بزەیەکم کرد و تەماشای کتێبەکەم کرد. خەلیفە پەڕەکانی هەڵدەدانەوە، ڕاستییەکەی ئەو کتێبەم نەخوێندبووەوە. لەکۆتاییدا خەلیفە گەیشتە ئەو لاپەڕەیەی، کە بەدوایدا دەگەڕا، بە دەنگێکی بەرز خوێندییەوە:
- کۆمەڵە دەرمانێک هەن تووی پیاو زیاد دەکەن، ئارەزوو و شەهوەتی جنسیی دەخرۆشێنن، وەک: نۆک، پاقلە، سنەوبەر، هەنجیر، جەرجیر، هلیون، گونەڕێوی، سەقنقور، زمانەچۆلەکە، شەقاقل و زەنجەبیل. سەرم سووڕما و چاوەکانم ئەبڵەق بوون. لێوەکانم دەکرۆشتن تاکوو بزەی شەرمنیم حەشار بدەم، کەچی خەلیفە یەک بە دەمی خۆی بە گاڵتەوە پێدەکەنی، لە خوێندنەوە بەردەوام بوو:
- بەڵام ئەو دەرمانانەی تۆواو کەم دەکەن، خیار و پاقلەی یەمانی، پاقلەی بندراق، پاقلەی زربیج، کولەکە و گندۆرە و توو و شەقلەح و جمار و بیبەر و بەنجەنکوشتن.
پاشان زۆر بە ڕووخۆشی بانگی دەرگەوانی کرد:
- دەرگەوان! هەموو ئەوانەی گوێت لێ بوون، بە ئاشپەز بڵێ بۆ ئێوارە بۆمان حازر بکات، هەڵبەت ئەوانەی کە دەست دەکەون، با ئیبن عەرەبی ئەوانە بخوات، کە هێزی جنسی زیاد دەکەن، ئەمنیش ئەوانە دەخۆم، کە جنسم کەم دەکەنەوە.
هەستم کرد خەلیفە پتر لە ڕۆژانی ڕابردوو، لەگەڵم کراوە و ڕووخۆشە. پێچەی کردەوە و جوبەی دانا، وەک ئەوەی لە ماڵی خۆی دانیشتبێت. پاشان داوای لە پۆستەچی کرد هەموو ئەو نامانەی بۆ بێنێت، کە لە شار و ویلایەتەکان و خەڵکی ڕەشۆکەوە بۆی هاتوون. خەلیفە قاچی بەسەر کورسییەکی پێشەخۆ داهێنا،

وردەوردە نامەکانی خوێندنەوە و لە ڕێگەی نووسەرەکانی بەردەستی، وەڵامی یەکبەیەکی نامەکانی دایەوە. نامەیەک زۆر سەرنجی ڕاکێشا، بە قووڵی خوێندیەوە و لێی ڕاما، دوایی لە لایەک داینا و گوتی:

- موحی، ئەوە بۆچی فەقیهەکان دانویان لەگەڵ فەیلەسووفان ناکوڵێت؟

- قوربان! خەڵک لەسەر ئایینی پاشاکانیانن.

- چۆن؟ مەبەستت چییە؟

- بڕوانە! لە هەموو پۆستەیەکدا خەڵک شکایەت لە ئیبن ڕوشد دەکات، لە زەمەنی باوکتدا ئەوە نەبوو!

- سوبحانەڵڵا! چۆن زانیت ئەو شکایەتەی بەردەستم لە ئیبن ڕوشدە؟

- قوربان! خودا بۆی کەشف کردم.

خەلیفە هەموو نامەکانی وەلانان و دەستی خستە ژێر چەناگەی و بەگومانەوە تەماشای کردم و گوتی:

- ڕاستم پێ بڵێ، تۆ غەیبت پێ کەشف دەکرێت؟

سەری خۆم بادا و بە بەڵێ وەڵامم دایەوە. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئێستە لەناکاو بە ڕوومدا هەڵدەشاخێ و بەرپەرچم بداتەوە. منیش هەر بێدەنگ بووم، تاکوو پرسیاری لێ کردم:

- ئەدی لەبارەی قشتالییەکان هیچی بۆ کەشف نەکردوویت؟

- نەخێر.

- بۆچی خودا ئەوەت بۆ کەشف ناکات؟

- میری ئیمانداران، خودا ئەوەی بیەوێت بۆم کەشف دەکات، ئەوەی نەشیەوێت، لێم دەگرێتەوە. ئەمە نە ئەستێرەگرتنەوەیە، نە بەرچاوڕوونییە، نە ئەفسوون و فاڵگرتنەوەشە. نە گوێم بە هیچ دەزرینگێتەوە، نە چاوم بە هیچ ڕەشکەوپێشکە دەکات، تەنیا هەر

ئەوەیە کە لەنێو حاڵێکدام، خوا شتێکم بۆ کەشف دەکات، بێ ئەوەی داوای لێ بکەم، ئەوەیش حاڵی ئەولیا و تەریقەتی سۆفیانە.
خەلیفە پاڵی بە کورسییەکەی دا و بە دەنگێک، کە ئاوازی تەسلیمبوونی لێ دەبیسترا، گوتی:
- موحی، ئەمن لە هەموو قسەکانت تێ ناگەم. سۆفی فەیلەسووفە یان فیقهزان؟
- هیچیان.
- جیاوازیی ئەوانە چییە؟
- فەیلەسووف ماخۆی فیکر و ئیستیدلالن، فیقهزانەکان شوێنکەوتە و گوێڕایەڵن.
- ئەی سۆفییەکان؟
- سۆفییەکانیش خودان زەوق و ئەحواڵن.
- چۆن جیایان دەکەیتەوە؟ هەموو دێنە مەجلیسی من و لەتەکم دادەنیشن، نامەم بۆ دەنووسن و سکاڵا دەکەن. من بە ڕەنگ و مەشرەبیان ئاشنا نیم. دەی پێم بڵێ: چۆن لێکیان بکەمەوە؟
- فیقهزان کتێب دەخوێنێتەوە، هەر ئەوە دەڵێت، کە تێی گەیشتووە. فەیلەسووف بیر دەکاتەوە، ئەوە دەڵێت، کە لە ئەنجامی بیرکردنەوە پێی گەیشتووە. سۆفی خەڵوەت لەگەڵ خودای خۆی دەکات، هەر ئەوە دەڵێت، کە خودا بۆی کەشف کردووە.
- بۆچی خودا شتی خۆی تەنیا بۆ سۆفییەکان کەشف دەکات و خەڵکی دیکەی لێ بێبەش دەکات؟
- خودا تەنیا بۆ ئەو کەسانە شت کەشف دەکات، کە بەتەواوی پشتیان پێی بەستووە، بەباشترین شێوە خەڵوەتیان لەگەڵدا گرتووە، ئەو کەسانەی خودان چێژن، تێدەگەن کەشف و تەجەللا مانایان چییە.
- زۆرباشە، سەرم لێ مەشێوێنە. زۆر بە ڕوون و ڕەوانیی پێم بڵێ: کامیان بۆ خەلیفە بەکەڵکن؟

- قوربان! ئەگەر پشت بە فەقیهەکان ببەستیت، عەقڵت لەکار دەخەن، ئەگەر پشت بە فەیلەسووفەکان ببەستیت دڵت ویران دەکەن، ئەگەر مەیلی ئەولیای خودایش بکەیت، ئەوە دڵ و عەقڵت دەخەنە ژێر شەپۆلی نووری خودا.

- تۆ چونکە لەوانیت، بۆ وان بادەدەیتەوە، وا نییە؟

- میری ئیمانداران، تێگەیشتنی من لە ئایین لە سەرووی تێگەیشتنی فەقیهەکانە، تێگەیشتنم لە فەلسەفە لە سەرووی فەیلەسووفەکانە... ئەگەر حەزم کردبایە وەک ئیبن حەزم دەبوومە فەقیهـ، وەک ئیبن توفەیل دەبوومە فەیلەسووف، وەک ئیبن ڕوشد، دەبوومە هەردووکیان، بەڵام خودا کردمیە ڕێبواری ئەو ڕێگەیە، بەڵێ خودا گوتی ببە، منیش بووم.

- پێم گوتی قەت مەجلیسم جێ مەهێڵە، لەگەڵ ئێمەیش وەرە مەراکیش.

زۆر بەخێرایی دڵم لێی دا، وەک ئەوەی مژدەیەکی پێدابم، گوتم:

- وەی بەسەر چاو.

# ٢٧

"ڕێگەی هەق، ڕاست و بازنەییە"
ئیبن عەرەبی

سپێدەی دواتر، خاتوو مەریەمی هاوژینم بە ناسکی سەرەپەنجەکانی دەسـتی بە گۆنا و تەوێڵمدا هێنان و لە خەو هەڵیسـتاندم. کاتێک چاوەکانم کردنەوە، بینیم بزە دەکات و ددانەکانی دەرکەوتوون، چاوەکانیشـی پڕ گریان بوون. سـەفەری من بۆ مەراکیش نزیکبووەتەوە و دڵنیاشـە لەگەڵ خۆمی نابەم، دوو هەفتەیە خەو نەچووەتە چاوەکانی. چەند جارێک بە ڕوویدا هێنام، کە پێشتر چەند کەڕەتێک سەفەری بۆ (بیجایە) و (تلمسان) کردووە، توانای خۆگری و بەرگەی ئازاری ڕێگەی هەیە، هەروەها پاساوی ئەوەی هێناوە، کە من پێویسـتم بە کەسێکە بە سـەروکارمەوە بێت و خزمەتم بکات، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەی بێئاکام بوون. ڕاسـتییەکەی ئەمن دەمویسـت خزمەتی دایەفاتیمە بکات، کە پەکی کەوتووە. هەروەها حەزیشم دەکرد، لە گەشتی یەکەممدا ئەرکی سەرشانم سووک بێت، تایبەت، کە من دەبێ پابەندی مەجلیسـی خەلیفە ببم و لە هۆکاری چوونیشم زۆر ئاگادار نیم.
مەریەم لێم نزیک بووەوە، منیش گەردەنم ماچ کرد، خۆی بەسەردادام و کەوتینە نێو ئەوینێکی قووڵ. دەستی بە هەموو لەشم

داهێنا، وەک ئەوەی بیەوێت بەر لەوەی سـەفەر بکەم، خوداحافیزیی لە بستبەبستی جەستەم بکات. قژی ڕەش و چڕوپڕی بەسەر ڕوومدا هاتە خوارێ، وەک بڵێی کتوپڕ شـەو گەڕابێتەوە، تاکوو ئەوەی لە شـەوانی ڕابردوو لە دەسـتم چووە، بۆم قەزا بکاتەوە. وای خودایە جەستەی مەریەم چەندە جوان و نەرمونۆڵە، چەندە ساف و بێگەردە! ڕوخساری بازنەیی، چاوە داچووەکانی، هەمیشە وایان نیشان دەدا بە هومێدەوە دەڕوانێ، تەنانەت لە کاتی تووڕەیی و هەڵچوونیشـدا. ئەو جەسـتەیەکی نەختێک خڕکەڵەی هەبوو، زۆری پێ سـەرسـام بووم.

وەختێک لەگەڵ ئەوینی مندا مەدهۆش بوو، هێندێک قسـەی کردن، لە کاتی دیکە بوێریی ئەوەی نەدەکرد بیانکات. هۆشـی بردم، سـڕی کردم، ئارەزووی تەقاندمەوە، زۆر لە دوێنێ خۆشترم ویست، دڵنیام بەیانیش لەمڕۆ خۆشـترم دەوێت. لەسـەر سـینەم بێئاگا بوو، ئەسرینەکانیشی جۆگەلەیان بەستبوو، وامزانی ئەسرینی خەمناکین، بەڵام دواتر زانیم خەم و خۆشـی لە دڵیدا تێکەڵ بووە. دواتر ئەوەی خودا بۆی کەشف نەکردم، ئەو بۆی ڕوون کردمەوە.

دایە فاتیمە دەسـتی لە سـکی مەریم کوتا، دڵنیای کردمەوە، کە ئەو سـکی هەیە و لە مانگی سـێیەمدایە. کە گوێم لەو مژدەیە بوو، توووند مەریەمم گرت و دەباوەشـم گرت، تاکوو لەخۆمم نزیک ببمەوە، واتا لەو کۆرپەیەی لە سـکی ئەودایە. وەک دوو منداڵ پێکەنین. بیر و خەیاڵی مەریەم بەو سـکە پاکبووەوە، چونکە تازە دەبێ لە ئیشـبیلیا بمێنێتەوە، ئیتر ڕۆیشتنی مێردەکەیشی نابێتە جەفا و خەمباری.

ڕاستییەکەی ئەمن نەمدەزانی بەچی زیاتر دڵخۆشبم: بەو سەفەرەی، کە لەمێژە لە چاوەڕوانی دام، یان بەو کۆرپەیەی لە سـکی دایکی گەورە دەبێت؟

هەر لەو کاتەی خەلیفە هەواڵی سـەفەری مەراکیشـی پێ ڕاگەیاندم، لەگەڵ مەریەم جانتای جلوبەرگ و کتێبەکانم ڕێکخست و لە گۆشەی

ژووریکی دیکه لەسەریەکمان دانان... بەڵام دواتر خەلیفە تووشی گرانەتا بوو، سەفەرەکەی دووجار دواخست. بەڵام وا ویدەچی سبەی بەڕێ بکەوین، ئاخر دوێنێ سەردانم کرد، زۆر باشتر بووبوو، ئەگەرچی هێشتا بەتەواوی چاک نەبووبووەوە. گومانەکەم ئەنگاوتی، قاسیدی کۆشک ئێوارە هات، پێی گوتم خەلیفە دەیەوێت سبەی دوای نوێژی بەیانی بڕۆین، ئەمنیش کەلوپەلەکانم پێدان، تا لە ولاخەکە باریان بکات. بۆ خوداحافیزی چوومەماڵی باوکم، ڕەنگوڕووی دایک و باوکم گرژبوو، خوشکەکانم دەستیان بە گریان کرد. منیش بۆ ئەوەی دڵیان خۆش بکەم و ئەو خەمەیان بڕەوێنمەوە گوتم:

- مژدەتان لێ بێت، مەریەم سکی هەیە.

ئوم سەعد و ئوم عەلا لە خۆشییان هاواریان کرد. دایکم توونددەمی خۆی گرت، تاکوو دەستەکانی بەرز نەکردنەوە و نزای نەکرد، واماندەزانی هەواڵەکەی پێ ناخۆشە. باوکم چەند جارێک ڕەنگی گۆڕا، پەشۆکابوو، دواتر دڵخۆش بوو، ئینجا نیگەران بوو، ئینجا هێور بووەوە ، کەیفخۆشی لە دەموچاوی بەدی دەکرا. لە ماڵی دایکم دەرچووم و بەرەو ماڵی حەریری چووم، ئێرەیی بەو سەفەرەی من برد، لەبارەی ئەولیا و مەلا و شێخی مەراکیش قسەی بۆ کردم، کە ناوبانگمان بیستبوون، بەڵام قەت نەمان بینیبوون. دوایی گەڕامەوە ماڵ، چوومە ژووری دایە فاتیمە، بینیم نوێژ دەکات، چاوەڕێم کرد تا لە نوێژ بووەوە، لەنێو قاچەکانی دانیشتم و دەستم ماچ کرد، پێم گوت ئامۆژگاریم بکە، ئەویش گوتی:

- ڕۆڵە! سوورەتی فاتیحە بخوێنە، من ئومێدم بە هەر کارێکی خێر هەبووبێت ئەو سوورەتەم خوێندووە و پێی گەیشتووم. بەنیازی لادانی هەر شەڕ و ناخۆشییەکیش خوێندبێتم، لێم دەکەلی هاتووە.

- ئەمە ئامۆژگاریی تۆ بوو، با منیش ئامۆژگارییێکت بکەم.

- چ ئامۆژگارییەک؟

- نابێ لەو سەفەرە بگەڕێمەوە تاکوو دەکەویەوە سەر قاچەکانت و تەندروستیت باش دەبێت و وەک خۆر بە دەوری ئەو ماڵەدا تیشک دەدەیت.

هێشتا قافڵەکەمان نەگەیشتبووە دۆڵی (لکە)، خەلیفە حاڵی تێکچووەوە، نەخۆشییەکەی لێ تیرتر بوو، ناوەناوە لەهۆش خۆی دەچوو، تەنانەت هێندێک لە پزیشکان پێیان وابوو نەخۆشیی سەرەمەرگیەتی. لەبەر شەکەتی و شپرزەبوونی، چیتر سواری وڵاخەکەی نەکرایەوە، بەڵکوو لەسەر تەختێرەوان درێژیان کرد، دوو هێستریش ڕایان دەکێشا تاکوو گەیشتینە ڕۆخ دەریا، لەوێ چوار بەلەمی گەورە چاوەڕێیان دەکردین. کە دەریام دیت، دڵم وشک بوو، هەتا ڕۆیشتنی کۆتا بەلەم، ئەمن هێشتا لە وڵاخەکەم نەهاتبوومە خوار. لە کۆتاییدا سواری بەلەمەکە بووم و دەستم بە قورئانخوێندن کرد، دوای ڕۆژ و دانێک گەیشتینە قەسری مەجاز، ئەمن بۆ یەک سەعاتیش خەوم لێ نەکەوت. خەلیفە لە بەلەمەکەی هاتە خوارەوە، بەهۆی هەڵچوون و داچوونی بەلەم لەنێو دەریا، حاڵی شپرزەتر بووبوو. پزیشکەکان داوایان لێ کرد، لە (فاس) لا بدا، دوای چاکبوونەوە و تەندروستییەکی باش، بچێتە مەراکیش، ئەویش ڕازی بوو.

بەرەو فاس ڕۆیشتین، هەموو پێمان وابوو بەر لەوەی بگەینە فاس دەمرێت. لەڕێگەی بەلەمەکان نامەیان بۆ براکانی خەلیفە نارد لە ئەندەلوس، هەواڵی تێکچوونی تەندروستی خەلیفەیان پێ ڕاگەیاندن. لەوێش لە ڕێگەی پۆستەوە، ئەو هەواڵە گەیشتە قورتوبە و ئیشبیلیا و غەرناتە و مورسیە. زۆر بەخێرایی و بەرەو فاس دەڕۆیشتین، بۆ تاوێکیش وچانمان نەدا، تەنیا مەگەر خۆر ئاوا بوابایە، شەو سرەوتمان دەدا و بەیانی زووبەزوو بە گورجی ڕێگەمان دەگرتەوە بەر. تێشوومان زۆر پێ بوو، لە هیچ شوێنێک نەدەوەستاین. لە دەوری ڕێگەوە درەختی زۆرم بینین، بەشێکیانم دەناسین،

هێنـدیکیشـــم قـەت نـەدیبوون. زەیتوون و کـالبتۆس و برنجم بەرچاوکەوتن، هەموویانم ناسـینەوە، مەغریبییەکانیش، کە لە قافڵەکە هاوەڵمان بوون، درەختی مەستیخان و دارمەریەم و حەلفایان نیشان دام. چەند گەڵایەکم لێ هەڵپچرین، لەســـەر لەپی دەســـتم دانان و تێیانەوە ڕامام، هەڵمگوشــین و بۆنم کردن، هەسـتم بە خۆشـی و شادی دەکرد.

دوای چەند ڕۆژێک، لە دەروبەری شـــاری (فاس)، کارگەی قاپ و ئامـان و کارگەی زەیتوون و کارگەی دارتاشــیمان بینی، ڕیزێکی دووررودرێژی دووکانی گچکەیان بەدوادا دەهات، کەســێک داخڵی شـار بووبایە هەر لە هەوەڵەوە هەتا ناوەڕاسـتەکەی، بەو دووکانانە دەورە دەدرا. هەمووشتێکیان تێدا دەفرۆشرا، بەشێک لە کەلوپەلەکان نەمزانی چین، بڕێکیشــیانم دیتبوون، هەموو ئەوانە لە شــارێکی بێ شووورەدا بوون.

خەلیفە گەیشــتە کۆشــکەکەی خۆی و قافڵەیش پەرت بوو. یەک لە کرێکـارەکـان منی بردە مێوانخـانـەی خـەلیفـە و پێی گوتم ئێرەت بۆ گیراوە، بـەڵام ئەگەر حەســـیری پاکتر و بالیفی نوێت دەوێت، بڕێک پـارە بدە و خزمـەتکـاران بۆت دێنن. بـەیـانی زوو هـەســـتام، لـە حـەوشــــەی مێوانخـانـە هێندێک پێخۆرم خوارد. هەســـتام نەختێک بەپێیان بڕۆم، زۆر دڵخۆش و مەسـت بووم. ناشـیرینم بە جوان و بێبەهـایشـــم، بەهـادار دەبینی. ئاو لە چەشـــمەکان هەڵدەقوڵی و لە نیهالەکان دەهاتە خوارەوە، بە جۆگەلە بۆ هەموو ســووچێکی شــار دابەش دەبوو، ئەو دیمەنە تەواو منی مەســـت و حەیران کرد. چۆن بـابـای تینو بە خواردنەوەی دەحەســـــایەوە، گوێچکەیش بە خوڕەی شیرینی، دەسەکنایەوە.

زۆربەی دیوارەکانی شـار بە نەخشـونیگار ڕازێنرابووەوە، لەکاتێکدا ئەو نەخشونیگارە لە ئەندەلووس تەنێ لە نێو کۆشک و مزگەوتەکاندا کرابوو. دیمەنی ئەو خانوانەی باخی بێ پەرژینیان لە دەوردا هەبوو،

دڵیـان ڕفـانـدم، هـەر دەڵێی هـەموو خـانوویـەک لـە ڕازانـدنـەوە و جوانکردنی ئەو شارەدا هاوبەش بوون.
کۆڵانەکان هێندێک جار هێندە بەرتەسک دەبوونەوە، پێڕۆ بە ئاستەم دەیتوانی تێیاندا تێپەڕێت، گەلێک جاریش لێژ دەبوونەوە، دەبوو خۆم بە دار و دیوارەوە بگرم و بە وریایی هەنگاو بنێم.
لە مێوانخانە هەواڵی خەلیفەم لە خزمەتکارەکان دەبیست، کە ڕۆژانە خواردنیـان بۆ دەهێنـاین و بـە ســـەروکارمانەوە بوون. پێیان گوتم خەلیفە ناتوانێت خەڵک ببینێت، ناشکرێ سـەردانی بکەم. پزیشکەکان داوایـان لێ کردبوو لـە ژوورێکـدا بمێنێتـەوە، بۆ ئـەوەی لـەگـەڵ نزیکبوونەوەی پایزدا سەرمابردی نەبێت. حەوت مانگم لە (فاس) بەڕێ کردن، بـەدرێژایی هـەموو ئـەو کـاتـە، ڕۆژێـک ئـەوم نـەبینی، یـان دانیشـــتنێکی بۆ ڕێک نەخرا، ڕاســـتییەکەی ئەمن ئەوەم پێشـــبینی نەدەکرد. لەو ماوەیەدا چەندان مزگەوتی (فاس)ـــم بەسەرکردنەوە، ئـامـادەی چـەنـدان وانـە بووم، بە دیداری چەندان ئەولیا گەیشـــتم، چەندان کتێبیشـــم خوێندنەوە. لەو حاڵەدا ، کە دڵ بە هەر چوار لادا کراوەتەوە، خودا زانستی خۆی بەسەردا ڕشتم، میعراجی عەقڵی پێ کردم، پێشـتر میعراجی وام نەبینی بوو. هەروە بۆ مەقاماتی ڕۆحانی بردم، پێشـــتر قەت پێی نەگەیشـــتبووم، وەک چۆن تیشـــکی خۆر گـەردوون ڕوونـاک دەکاتەوە، مەرتەبە باڵاکانیش وەها ڕێگەی منیان ڕۆشن کردەوە. هەر زوو ئەولیا و ئەهلی تەریقەت هەستیان بە حاڵی من کرد. ئـەوان دێنـە مێوانخـانـە و لەبارەی منەوە پرســـیار دەکەن، کاتێک دیدەنیم دەکەن، بزە دەکەن و بزەیان بۆ دەکەمەوە، شـــەئن و حاڵم دەزانن، ئەمنیش دەزانم چ باسـە. نۆ ئەولیا منیان بردە باخچەی ئیبن حـەیون، تـەنێ ئـەو وەلییـە بژاردانەی لێ بوون کە لە تەریقەتدا بـە مـەقـامێکی بـەرز گـەیشـــتبوون. چـەنـد هەفتەیەک لەوێ ماینەوە.
خۆرێـک هـەڵات، چ خۆرێک؟ خۆری دنیـا نـەبوو! هـەیڤ، شـــەوانی زولّمـەتی ڕوونـاک دەکردەوە، بـەدرێژایی یـەک مـانگی ڕەبـەق، لـە

کورتی نەدەدا. هەر وەختێک یەکێک لە ئێمە نهێنییەکی قودسی کەشف کردبا، گوڵەستێرەیەکی درەخشاو تاریکیی ئاسمانی شەق دەکرد و دەهاتە خوارەوە. گاهێکیش یەکێکمان باسی لەتائیفی عەلەوی دەکرد، دوو ئەستێرە دادەڕژان. گاوێکیش کەسێکمان فووی ڕۆحانیی لێ دەدرا، هەموو خۆمان بەسەر دەستەکانی دادەدا، بۆ وەی ئەو حاڵە عیرفانییەی ئەو پێی گەیشتووە، ئێمەیش پێی بگەین. خیرقەی یەکترمان دەپۆشی، خۆشی یەکدیمان دەنۆشی، بەر لە جەستە و ئازامان، دڵ و ڕووحمان بەیەک دەگەیشت و ئۆخژنیان دەگرت.

# ٢٨

"خەو ئەگەر مزگێنی نەهێنا، بەهای چڵەپووشێکی نابێت"
ئیبن عەرەبی

منداڵبوونی مـەریـەم نزیک بووەوە. خەونم پێوە بینی، ســـکی وەک ســـــەدەف لێک کرابووەوە، مرواریێکی زۆر جوانی تێدا بوو، زانیم کچێکمـان دەبێت. داوام لـە جەنابی وەزیر کرد، مۆڵەتم لەلای خەلیفە بۆ وەربگرێت بگەڕێمەوە ئیشـــبیلیا و ســـەرێک لە هاوژینەکەم بدەم. وەزیر هـــەم مۆڵـــەتی بۆ وەرگرتبووم، هـــەمیش دیـاریـەک و دوو وڵاخیشـی بۆ هێنام. کەلوپەلم خسـتنە سـەریەک و خۆم بۆ ئیشـبیلیا ڕێکخســت. هێشــتا مانگێک نەبوو گەڕابوومەوە، مەریەم کچۆڵەیەکی خوێنشـــــرینی بوو، ناوم نا زەینەب. کاتێک هەڵم دەگرت، بەقووڵی لە چاوەکانم ڕادەما، وەک ئەوەی بەنێویاندا بچێتە ژوورەوەم و بەدوای خاڵی هاوبەشـی نێوانماندا بگەڕێت. دەموچاوێکی هێلکەیی ڕێک وەک دەموچاوی دایکی وابوو، قژی ڕەشــی قەترانیشــی هەر لەو دەچوو. زۆر هۆگری بووم، تەنانەت وەختێک لە ماڵ دەردەچووم، وام خەیاڵ دەکرد لـە باوەشـــــمـە و پێدەکەنێت، ڕێک بـەرەو مـاڵ دەبوومەوە، ســـــەعـاتێک گـەمـەوگـەپم لـەگەڵ دەکرد. مەریەم بەو ڕەفتارەی من گەلێک دڵخۆش و شــادبوو، ترســی ئەوەی ڕەوییەوە، کە بەهۆی لە دایکبوونی کچێک بەربینگی گرتبوو.

سەروفیسالّی باوکم وا هاتە بەرچاو، کە چەند سالّێک بێت نەمبینی بێ، نەک چەند مانگێکی دیاریکراو. پیر و بێتاقەت بووبوو، بێدەنگی و غەمگینی برستیان لێ بڕی بوو، مەگین بانگیان بکردایە، دەنا قسەی لەگەلّ کەس نەدەکرد، بۆ کۆشک نەبوایە، بۆ هیچ شوێنک نەدەچوو. لەگەلّ نەخۆشکەوتنی خەلیفە، باوکم نە هیچ شتێکی بۆ کەس دەنووسی و نە کەسیش هیچ چتی بۆ دەنووسی. لەو ماوەیەدا بۆ خوێندنەوەی قورئان و کتێبی (صەحیح) و زۆر لە کتێبە فیقهییەکان، کە بەشێکیان لای من بوون و بەشێکیشان لە کتێبخانەی کۆشک بوون، لێ بڕابوو. هەستی بیستنی زۆر لاواز بووبوو، تەنها لە دووریی گەزێک لێت تێ دەگەیشت و وەرامی دەدایەوە. لەو حالّەیدا، ئوم سەعد زۆر لێی نزیک بوو، بەردەوام لەگەلّی دادەنیشت و خواردنی دەدایێ و دلّی دەدایەوە، لە دوڕە زیاتر بە سەروکاریەوە بوو. باوکم سێبووریی بە ئوم سەعد دەهات و هۆگری بووبوو، چەند کتێبێکی بۆ خوێندبوونەوە و چەندان زانستیشی فێرکردبوون. هێندەی لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا فەرمووده و قورئانی پێ ئەزبەر کردبوو، بەدرێژایی هەموو تەمەنی ئەوەندەی پێ لەبەر نەکرابوو. دایکم پێی گوتم ئوم عەلا لەبارەی دەرنگکەوتنی پێڤاژۆی شووکردنی نیگەران بووە، هەرکە بەیەکەوە دادەنیشین و باسی زەماوەندی بووکێکی گەڕەک دەکەین، یان باسی منداڵبوونێک دەکەین، ئەسرین هەلّدەڕێژێت، خەو لە چاوەکانی دەتورێت و خەم بەوە دەخوات قەیرە بێت و شوو نەکات.

فاتیمەی کچی موسەنایش وەسیەتەکەی منی لەگوێ نەگرتبوو، کە پێش سەفەری فاس بە گوێمدا چرپاندبوو. زۆر کزۆلّ و لاواز بووبوو، بە ئاستەم خۆی پێ هەلّگێڕ و وەرگێڕ دەکرا. خەوی زۆر بووبوو، دەنگی نزم و هەناسەی تەنگ بووبوو، سیخەسیخی لە سینگەوە دەهات. لە ئانی ئاویلەکەدان، من و دایکم و هاوژینەکەم دەورمان دا، قسەم لەگەلّ کرد و وەلامی نەدامەوە. دەستم گرت و

ماچم کرد و گریام، لە ئاخری نەختێک سـەری خۆی بزاوت و ڕووی لە دایکم کرد و گوتی:

- نوورە، ئەمە کوڕی منە و وەلیی تۆیشـە، لەگەڵیدا چاکبە و ئازاری مەدە.

فاتیمە وەفاتی فەرموو، کەلوپەل و ئاتاجەکانیم کۆکردنەوە، شـتێکی وای تێدا نەبوو دوو دەرهەم بێنێت، لەسەر وەسیەتی خۆی هەموویم بەخشـی. بەیانی بردمانە گۆڕستان، لەو گۆڕەدا ناشتمان، کە پێشتر چوار شـەو و ڕۆژان لەنێویدا خەڵوەتم کێشـا و زیکری خودام کرد، هەڵبەت دوای چاککردن و ڕێکخستنی.

پرسـەمان بۆ دانا، جگە لە حەریری و خەیات، کەسـی تر نەهاتە پرسەکەی.

دوای چەند هەفتەیەک ماتەم و شـین چووە ماڵی حەریری و خەیات، منیش سـەرپرسـە و دڵنەواکاریان بووم. کاتێک من و حەریری دادە فاتیمەمان سپاردەی خاک کرد، خەیات لەبەر گریە و زاری نەیتوانی هیچ هاوکارییەکمان بکات. وەختێک هێنامانەوە ماڵەوە، قاچەکانی لەدوو دەخشـان و توانای ڕۆیشـتنی نەبوو. شـەوانە لەگەڵیان دەخەوتم، دڵنەوایی خەیاتمان دەکرد، بەڵام بێسـوود بوو. لە دواییدا بڕیاریان دا خانوو و ئەو دووکانەی خەیات کاری تێدا دەکرد، بفرۆشن و بەیەکەوە حەج بکەن.

لەو سـەینوبەینەیشـدا خەلیفە چاکبووەوە و وەک جاران پێشـوازیی خەڵکی دەکرد، ئەمنیش نیازی ئەوەم هەبوو بڕۆمـەوە فاس و سـەردانی بکەم و ئەحواڵی ببپرسـم، ئاخر سـەرباری ئەو پەیمانەی لەنێوانمادا هەبوو، بەخشـشـێکیشـی پێ داوم و وەک دەڵێن چاوبەرەژێری کردووم. چوومە لای کومی، سـڵاوم لێ کرد، ویسـتم بزانم هیچ کارێکی لە فاس نییە. کاتێک نیازی سەفەرەکەی خۆمم پێ گوت، گوتی:

- ڕۆڵە، نەختێک چاوەڕێ بکە، وا نازانم ئێســـتە خەلیفە کەیفی بە چارەت بێت.
- بۆچی باوکە؟
- هەواڵیان پێ دام، ئیبن ڕوشدی دە زیندانێ کردووە.
- بەرەو ماڵ بوومەوە، بەم هەواڵە دنیایەک خەمبار بووم. لە هەموو ئەو بەخشش و مەجلیسانەی خەلیفە، پەژیوان بوومەوە. خۆ هێشتا خودا بەتەواوی شـــیفای نەدابوو، وا بەگوڕ خەڵک دەخاتە زیندان! هەستم بە تەنگەتاوی و سینەتەنگی کرد. پێشـتر ئەندەلوس زیندان بوو، ئەوە مەغریبیشی بەسەردا هات. چەند تەماخوازم بچمە وڵاتێک، موەحیدە دڵڕەق و هاوڕەفتارەکانیان تێیدا دەســتەڵاتدار نەبن... بەڵام تازە بەرەو کوێ بچم، بابە و دایە پیربوون و کچەکەیشم زۆر منداڵە. مادەم جەنگ لەگەڵ فەڕەنگان هەر بەردەوام بێت، هیچ گومانێکم نییە، خەلیفە دوای خەلیفە، ئاســـۆ لێڵ و ڕەشـــتر دەبێت. ئەو خەلیفەی سەردەکەوێت، هەوای سەرکەوتن لە سەر و کەلـلەی دەدات، هەموو خەڵک ناچار دەکات بکەونە ژێر بۆچوون و بیرکردنەوەی ئەو... ئەو خەلیفەیەی نســـکۆ دێنێت و ژێردەکەوێت، خۆی لە تانەوتەشـــەر و گلەیی دوور دەگرێت، خەڵک و ژێردەســـتەکانی لۆمەباران دەکات و بە لاڕێبوون لە هەق، تۆمەتباریان دەکات.
ڕشتەی ڕۆژەکان یەکبەدواییەکدا دەڕۆن و منیش سات دوای سات دڵتەنگ و پەریشانتر دەبم. خەمێک تەسلیمی خەمێکی دیکەم دەکات، حوزن لە سینەمدا هێلانەی دروست کردووە، نازانم چۆن لە چنگی ڕزگار بم. ئەو دڵەی دادە فاتیمەی پێی گوتم پاکی بکەمەوە، ئەوێستا چڵکی لێ دەچۆڕێتەوە. ها ئەوەتە لەگەڵ خەلیفە دانیشتم و خووم بە نانی کۆشـکەوە گرتووە. مەریەمم هێنا، بە لەزەت و چێژی جەستە ڕاهاتم. بەخشـــشـــم وەگرت و لەگەڵ گیرفان ئاخنیندا مەدارم کرد. کەواتە ئێستەیش، کە لەشکری خەمان دەوریان داوم و تەنگیان پێ

هەڵچنیوم، هیچ سەیر و غەریب نییە. تازە چارەی من تەنیا گۆڕستانە و بەس.
جارێکی دی ڕێی گۆڕستانم گرتەوە بەر، بە ئومێدی ئەوەی ڕووحم پاک بکەمەوە، وا مشـــتومالّی بکەم بە کەڵکی جەزبەی خودایی بێت. هەرکە خۆر ئاوا دەبوو، وەک جەســـتەیەکی بێگیان دەچمە خزمەت مردووەکان و لەنێویاندا دادەنیشـــم... تا بەرەبەیان بە تاقی تەنیا دەمامەوە. هەموو شـــەوان داوام لە خودا دەکرد خەڵوەتەکەم پیرۆز بکات و بمباتە حزووری خۆی، دڵم پاک بکاتەوە و بێدەنگی و برســـیەتی و تەوەکولم پێ عەتا بکات. بەرەبەرە خووم بە دیداری مردووانەوە گرت، باســـی مەرگ و بەرزەخ و مەقامات و جیهانی ئەودیومان دەکرد. شـــەش مانگ تێپەڕین، لەبەر چێژی هاونشـــینی مردوان و ئۆخژنی خەڵەوەتم، وامدەزانی تەنیا شەش ڕۆژم بەســەر بردووە. هیچ شـــتێک هێندەی زایەڵەی بانگی مەغریب دڵخۆشـــی نەدەکردم، دەزانن بۆ؟ چونکە زەنگی چوونە گۆڕســـتان لێی دەدا. هەروەها هیچ شـــتێک بەقەد کازیوەی بەیان، خەمباری نەدەکردم، دەزانن بۆ؟ چونکە کاتی ئەوە دەهات هاوڕێ مردووەکانم جێ بهێڵم و لەوێ بڕۆم.
شـــەوێک لەو گۆڕســـتانەدا هەســـتم بە جوڵەی زیندوویەک کرد، تەماشام کرد جەنابی شێخ کومییە، بە دارعەساکەیەوە بەرەو ڕووم دێت. بەپەشـــۆکاوییەوە ســـڵاوم لێ کرد، نەمزانی چۆن منی دۆزیوەتەوە! هات بەبێدەنگی لای من دانیشت، هەستی بە ئارامی و تەجەللای ئەو شوێنە کرد. پاشان گوتی:
- هاونشینی زیندووەکانی گۆڕستانت پیرۆز بێت. ئەوان زیندوون و خەڵکانی دەرەوەی گۆڕســـتانیش مردوون، بەڵام ئەوان هەســـتی پێ ناکەن. ڕێگە دەدەیت منیش هاوەڵت بم؟
- شێخی من، زۆرم پێخۆشە هاوەڵیم بکەیت، چونکە بە بەرەکەتی تۆ ئێرە ئاوەدانتر دەبێتەوە.

کومی حەفتاوحەفت ڕۆژ لەو گۆڕستانە یارم بوو، لەگەڵ زەردەپەڕی ئێواران دەڕۆیشتین و هەتا بەرەبەیان لەوێ خەڵوەتمان دەکێشا، بۆ سەعاتێک چییە لەو جێژوانە دانەبڕاین. دەمێک تەسبیحاتمان دەکرد، دەمێکیش دەمانخوێندەوە، دەمێکیش لەو بوونەوەرە ڕادەماین. شەوی بیستوحەفتی ڕەمەزان شێخ تاخیربوو، دوای نیوەشەو دەرکەوت، هات لەکنم دانیشت، بەسەر دەموچاویەوە جۆرێک لە خەمناکی بەدی دەکرا، پێشتر قەت وام نەدیبوو. کەمێک بێدەنگ بوو، پاشان ڕووی تێکردم و گوتی:

- موحی وەڵامم بدەوە: ئەگەر لە حەزووری شهوودیی خوا دوو عارف کۆبوونەوە، حوکمیان چییە؟

- ئەمە ئەگەرەو نابێت.

- بۆ نابێت؟

- چونکە حزووری خودا دوو کەسان وەخۆ ناگرێت. عارف لە حزووری خودادا خۆی پێ نادیترێت، جاچۆن دەتوانێت عارفێکی دیکە ببینێت!

- ئەی چۆن دەکرێ ببێتە ئەگەرێک؟

- بە تەجەللا دەبێتە ئەگەر. هەر عارفە و زەوق و سەلیقەی لە عارفێکی دیکە جیایە، بە شکڵی جودا تەجەللای بۆ دەکرێت. هەروەو بێتەوە دەشێت لە حزووری شهوودیی خودا کۆببنەوە، چونکێ ئەوان لە وێنەی سروشت و ڕۆحانییەت و جێگەدا لە یەکتر جودان.

- دەی ڕۆڵە موحی وەڵامم بدەوە: گڵکۆی سێزدەم، لە سەرەتای شوورەکە هیی کێیە؟

- هیی ئیبن زەیدوونی شاعیرە.

- کەواتە کوڕی شیرینیم گوێ بگرە.

- قوربان لە خزمەتتمدام.

- من مێخی یەکەمی تۆم. مێخی دووەمیش لە ئەفریقایە، بڕۆ

## ٢٩

**دەستنووسێك لە دیمەشق**
٦٥٨ك/١٢٦٠ز

لە كۆتاییدا دژوارترین دۆخی ژیانم، لە دەروازەی ڕەیحانە تەی كرد. منێك كە قەت دەستم بە بادەی مەی نەكەوتووە، لە ماوەی هەشتا ساڵ، لەوەتەی خودا منی ئافراندووە، هەرگیز تامم نەكردووە، كەچی ئەمڕۆ بۆنی شەڕاب لە جلەكانم دێت، تنۆك تنۆك وا لە قژم دێتە خوارەوە، بەنێو ڕیشمدا چووە و سینەی تەڕكردووم. ئیتر بەرگەی ئەو هەموو شەڕ و شەپڕێوییە ناگیرێت. گەوجگەلی گاوران، هەر لە بەیانی زووەوە بەنێو شەقام و كۆڵانەكانی دیمەشق وەربوون. هەر دەڵێی دەجاڵ خۆی بەنێودا كردوون، ئازاریان دەدەن و تێیان هەڵدەدەن... تێكهەڵدایی و تاڵان و بڕۆیەكە، كەسبەكەس نییە. سەڵیبێكیان بە دەست و دانەكیشیان بە گەردەنەوەیە. بە زمانی عەرەبی و سریانی هاوار دەكەن و دەنەڕێنن. دەستەیەك شەقاوە و سەرسەری، دەروازەكەیان گرتووە، مەگەر خەڵكەكە خۆیان لەژێر ئەو خاچە دارینەدا بنوشتێننەوە، كە خاچپەرستان لەسەر دەروازەكە دایانناوە، دەنا دەرچوون محاڵە!
- تۆ ئەی پیرەپیاو...

تەماشــام کرد منداڵێکە بانگم دەکات، پێم وایە تەمەنی بیســت ســاڵان دەبوو. کزۆڵ و ســـــووربـاوێک بوو، خوێنتـاڵ و دزێو بوو، دەتگوت ناشــرینیی هەموو دنیا خۆی بە ڕوویدا ئاڵاندووە. پیاوێکی زل و زرپە و سینەپان و ڕیشنیشـی لە پشتەوە وەستابوو، گەمژەئاسا بەچێژەوە زەردەی دەکرد و چـاودێریی ئـەو منـداڵـەی دەکرد، کـە ڕێبوارانی ڕادەگرت، هێمای بۆ خاچەمسـەکەی بەردەمیان دەکرد و کۆڵەمستێکی لە کەلەکەی خەڵکی بێدەرتان و هیچ لەبارنەبوودا دەســـــرەواند. ئەمن هەر لەگەڵ یەکەم هەنگاومدا، ســــەرنجی ئەو بارە نالەبارەم دا. کاتێک یـەکێک ویســـــتی بـەبێ گەردەنکەچی لە دەروازە ڕەت بێت، منداڵەکە لەگەڵ کۆمەڵە منداڵێکی دیکەی لەخۆی هەراشــتر، پشــتملیان دایە بەر زلـــــە و دایانهێناوە. وەختێک هەولێ دەسـتوەکەری دا، دەستەپیاوێک لێی هاتنە دەســت و بە دەوریدا هەڵخولان، پیاوەکە بە ناچاری پشــتی هەڵکردوو و ڕۆیشت.

- پیرەپیاو، گوێت لێ نەبوو! گوتم: هۆ پیرەمێرد...

منداڵەکانی دەوری لە قاقای پێکەنیان دا. وەســـــتام و تێمڕوانی، بەڵام هیچ قســـەیەکم لەگەڵدا نەکرد. گۆزەڵەیەکی بچووکی بەدەســتەوە بوو، بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- حەزناکەی شەڕاب بخۆیتەوە و دڵی خۆت گوشاد بکەیت؟

ڕووم لێ وەرگێڕا و ڕۆیشتم، دەنگەدەنگێک لەپشتمەوە بەرز بووەوە:

- یا شــــێخ! بەر لەوەی بادەیەک مەی فڕبکەیت و گەنجیت بگێڕییەوە، نەکەیت بڕۆیت...

قاقای پێکەنین هەتا دەهات لەپشــتەوەم پتر دەبوو، منیش دەمویســـت بـەقـەدەر توانـا خۆم لـەوان پـەنـا بـدەم و ئـەو نـاوە جێ بهێڵم و هیچ ئـازارێکم پێ نـەگـەیـنن... گـەیشـــتمـە نێو دەروازەکـە... ئـەو پیـاوەم بیرکەوتەوە کە بەر لەمن چییان بەســــەر هێنا، خۆم لەوە بەگەورەتر دەزانی لـەو تـەمـەنـە بـە دەردی ئـەوم بـەرن، بەهـەرحـاڵێک بوو خۆم کووڕ کردەوە و وردەوردە ڕێم کرد. دەروازە و خـاچی ســــەرەوەم

تێپەڕاند، لەنێو سینەیشم خەریکی پاتەکردنەوەی زیکری " لا إله إلاالله" بووم. "وماقتلوه وماصلبوه ولكن شبه له." خەریک بوو لەوێ دەربازم بێت، شەڕاب وەک سوولاوکە بەسەرمدا هاتە خوارەوە. هەموویان لە قرتەی پێکەنینیان دا، هەر دەڵێی لەنێو مەیخانەدا بوون. دارعەساکەم تێ فڕەدا و بە دەستەکانم سەری خۆم گرتبوو، بەشکم لەو شەڕابە پیسە چەپاڵەی بدەم، کە وەک چۆڕاوکە لەنێو کوندەیەک دێتە خوارەوە، بەدەستی کەسێکەوەیە، لەسەرەوەی دەرەوازەکە خۆی مەڵاس داوە، هەر کاتێک هێمای بۆ دەکەن، بەسەر سەری ڕێبوارندا هەڵی دەڕێژێت. خۆم داهێنایەوە تا دارعەسایەکەم هەڵگرمەوە و خۆم لەو شەڕابە ڕزگار بکەم، هێندەی دیکەیشیان بەسەر پشتمدا هەڵڕشت، جلەکانم لە تەڕیان شرینگەیان دات. لەکۆتاییدا بە هانکەهانک و سیخەسیخ خۆم دوور خستەوە. بۆنی مەی لە جلەکانم دەهات، بێوەی هەستی پێ بکەم، فرمێسک بەسەر ڕوومدا بارییوون. ئەسرینی زەلیلی و شەڕابی خاچپەرستان لە ڕوومدا کەپکەیان کردبوو، قەت شتی وام بەسەر نەهاتبوو. وام دەزانی هیچ شتێک نەماوە ئەزموونی نەکەم، کەچی ئەوە لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا ئەو خوزەعبەلاتە دەبینم... خودایە بەزەییت پێدا بێمەوە. بەرەو مزگەوتی (ئیبن عەبدان) چووم، بەردەوامیش زیکری "یا حی یا قیوم... برحمتک أستغیث"م بەسەر زمانەوە بوو. هەتا نەچوومە نێو مزگەوتەکە نەمدەزانی دەنگم هێندە بەرزکردووەتەوە. وەختێک بە کڕنووش و سووجدەدا کەوتم، بەتەواوی جۆشام و کەوتمە نێو گریە و زاری، لە ژیانمدا هێندە نەگریاوم. نوێژخوێنان لە دەورم جەمبوون و قیتیان کردمەوە، کە بۆنی جلەکانیان کردم، زانیان چییان بەسەرهاتووە. هەموو یەک بەدەمی خۆیان (لاحول ولاقوة)یان دەکرد و پەنجەی هەڕەشەیان لە خاچپەرستان درێژ دەکرد. لە ئاخری هاتمەوە سەرخۆ و لام لە کەسێکی نزیکی خۆم کردەوە:

- ئەمڕۆ یەحیازەکی هاتووە؟

پیاوەکە وەڵامی لانەبوو، بەڵام پرسیارەکەی منی ، کە بە سرتە کردم، بە دەنگێکی بەرز لە ئامادەبوان کرد، منداڵێک، کە وا پێدەچوو مجێوری مزگەوت بێت، وەڵامی دایەوە:

- لەپشت مزگەوت، لە حوجرەکەی خۆیەتی.

بەدوای منداڵەکەدا ڕۆیشتم، تا گەیشتینە حوجرەکەی یەحیا. منداڵەکە لە دەرگەی دەدا، منیش بیرم لەوە دەکردەوە، چۆن بەو حاڵە بچمە لای قازیی دیمەشق، ئەوەتە بۆنی شەراب لە جلەکانم دێت! دەرگەی کردەوە. لەوەتەی یەحیا دەناسم، دەموچاوی ڕووناک و درەوشاوەن. زەمەنێک لەبەر دەستی من وەگاگۆڵە کەوت، بەسەر شانەکانم هەڵدەبەزی، کاتێکیش شەکەت دەبوو لە باوەشی من خەوی لێ دەکەوت. بە بینینی من دڵخۆش بوو، گوتی:

- مامەگیان بەخێر بێیت.

بەرلەوەی وەڵامی سەلامی بدەمەوە، منداڵەکە گوتی:

- یا شێخ! خاچپەرستان لێیان داوە.

یەحیا گوتی:

- چی؟ تخوا لێیان داوییت؟ خۆ سەلامەتی مامەگیان؟

- نا قوربان! کەس لێی نەداوم، بەڵام شەرابیان بەسەردا ڕشتووم و جلەکانیان تەڕکردووم، دەبێ لە بۆن و پیسیی جلەکانم ببووریت.

یەحیا من و منداڵەکەی بەجیا بردە ژوورەوە، دواتر ڕووی لە منداڵەکە کرد و گوتی:

- ئاوی بۆ گەرم بکەن و گەرماوی بۆ ساز بکەن، دەستەجلێکی پاکی منیشی بۆ دابنێن.

- قوربان پێویست بەو ئەرکە ناکات، دەچمەماڵەوە و خۆم پاک دەکەمەوە.

- مامە ئەوە ماڵی خۆتە. فەرموو دانیشە، پێم بڵێ چی ڕووی داوە؟

- ڕۆڵە شارەکەمان ئاڵۆزاوە. ئەو گاورانە لە پڕێکدا شێت و هار بوون، نازانین چیان دەوێت.

یەحیا هەناسەیەکی قووڵی حەسرەتاوی هەڵکێشا و گوتی:
- حەز دەکەم ئەوە بزانیت...
- ڕۆڵە! چی ڕوو دەدات، دەڵێی هەواڵێکت لایە؟
- کەس هەواڵێکی ڕاستی لا نییە. ئەو میرەی کە تەتەرەکان لە دیمەشقیان دامەزراند هاوکاری گاورەکان دەکات و بۆ ئەو کارانە دنەیان دەدات. لەوەتەی جڵەوی دەستەڵاتی وەرگرتووە، قەشە و دەمڕاستەکانیان لە مەجلیسی ئەو هەڵناستن.
- بەڵام ئەمە بۆچی، ئاخۆ دەبێ ئەو بەچکە تەتەرە چی دەنیاز گرتبێت؟
- نهێنییەک لەو کارەدا هەیە، ئێمە هیچی لەبارەوە نازانین، بەڵام بە ڕواڵەت وا دەردەکەوێت گاوردۆست و نزیکەکانیان واز لەو کارانەیان نەهێنن.
- ئەی ئێمە چی؟ نابێ قسەیەک بە ڕووی ئەو تەتەرانەدا بکەین؟ ئاخۆ دەبێ نەزانن، کە زۆربەی خەڵکی دیمەشق موسڵمانن؟
- ئێمە تەواوی قازییەکان و هەشت فەقیهـ و ئیمامی مزگەوتەکان و شێخەکانی تەریقەت، لە قەڵاتەکەی چووینە لای و سکاڵای حاڵی خۆمان لەلا کرد، هەر گوێشی پێ نەداین.
- چۆن یانی؟
- هەرکە سکاڵایەکمان دەکرد، ڕووی لە قەشەکانی مەجلیس دەکرد و دەیگوت: ئەوەی ئەوان دەیڵێن ڕاستە؟ ئەوانیش دەیانگوت: ئەوانە زێدەڕۆیی دەکەن. "موسڵمانان خوویان بەوە گرتووە، کە ئێمە بە کەم و زەبوون تەماشا بکەن. هەربۆیەش ئەگەر شتێکیان نەگاتە دڵ، بۆڵەبۆڵ دەکەن و هەراسان دەبن." ڕەنگی میر زەردهەڵگەڕا و گوتی: "شتی وا لە وڵاتی منکۆخانی مەزن ڕوونادات، پیاوی گەورە تەنێ منکۆخانە و بەس، ئەوەی دژایەتیی دەکات بچووک و هیچ لەباردا نەبووە." پاشان هەموومانی لە مەجلیسەکە وەدەرنا.
- قازی و ئیمام و فەقیهەکانی وەدەرنان؟ ...لاحول ولاقوة الا بالله.

- کاروباری ئێستە و داهاتوو هەر بەدەست خودایە. تۆ دەزانی دایکی ئیمپراتۆر نەسرانییە؟
- نەخێر نەمزانیوە.
- برایەکەیشی هۆلاکۆیە، بۆ خوڕاسان گەڕایەوە، هەموو سوپایەکەیشی خستە ژێر دەستی فەرماندەیەکی خاچپەرستان بەناوی کتبگا...
- ئەوانە لە هەموو لایەکەوە دەوریان داوین.
- مامە گوێیان پێ مەدە، خودایش دەوری ئەوانی داوە.
لەو وەختەدا منداڵەکە هاتە ژوورەوە، گوتی:
- یا شێخ گەرماو ئامادەیە.
یەحیا هەستا و قیتی کردمەوە، تا گەرماو لەگەڵم هات، دواتر منداڵەکەی لا جێهێشتم تاکوو سەرم بشوات و هاوکاریم بکات. بیر لەدوای بیر بە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون، گێژەڵۆکەی خەمان هەڵیان دەپێچام. ئەمن بۆ ئەوە هاتبوومە لای قازی تاکوو دڵنیام بکاتەوە، کە ئەو دۆخە زۆر ناخایانێت بەهۆی هەڵاتنی ناسر و هاتنی تەتەر بۆ دیمەیشق ڕووی داوە... نەمزانی ئەو خەمی زیاترم دەداتێ و لە لێواری نائومێدی نزیکم دەخاتەوە. منداڵەکە بەپەلە سەری شوشتم، بە قەمیسێکی کەتان و سیروالێکی لۆکە و مێزەرێکی نوێ، پۆشتەی کردمەوە. لە گەرماو هاتمە دەرەوە، قازی یەحیا دانیشتبوو.
- قوربان! ئیزن لە جەنابتان دەخوازم...
- ئیزنی چی مامە....
- ئەوە زیاتر لە چل ساڵە خزمەتی خاک و ئاوی ئێوە دەکەم، بە دەستی خۆم نەنک و باپیر و باوکت و شەش مامتم ئەسپەردەی خاک کردوون. هەر بە دەستی خۆم شێخی ئەکبەر و دوو منداڵەکەیم ناشتوون. هەر لە خاک و خۆڵی خۆیانم نیشتەجێ کردن، لەگەڵ ڕۆحانیەتی پاکیاندا ژیاوم. لە گڵکۆی شەریفیان بەرەکەتم وەرگرتووە. بە بۆنی خۆشی لەتیفیان خۆم بۆندار کردووە.

- مامە! تۆ یەکێکی لە ئێمە، نەک خزمەتکار.
- دەمەوێـــــــت پێت بڵێم پیربووم و لێ کەوتووم، چیتر بەرگەی ئەو پاشـاگەردانییە ناگرم. بە چاوی خۆم بینیم بەدکاران چۆن شـەڕابیان لەکن دەرگەی مزگەوتان دەڕشـت و لە دەوری گڵکۆی شـێخەکانمان چۆن کشـوفشـیان دەکرد. ئەگەر بگەنە خاکی ئێوە، ئیتر ناتوانم لایان بدەم و ڕێگرییان لێ بکەم.
- مامەگیان! خودا پارێزەرە. دڵنیابە کەس سەرکۆنەت ناکات.
- دەمەوێت دیمەشق جێ بهێڵم.
- لە دیمەشـق دەڕۆیت؟ بۆ هیچ جێیەکی دیکە لێرە زیاتر پێ دەزانیت؟ بەرەو کوێ دەچیت؟
- ڕۆڵە! دەچمە (کەرک). ئامۆزاکانم لەوێن.
- ئاگایان لێت دەبێت؟
- خودا ئاگادارم دەبێت، ئـەو منی لـە نـەبوونەوە هێناوەتە بوون. بۆیە داوای ئیزنم لێ کردی، دەمـەوێت هـەندێک کتێب و نـامـە لەگەڵ خۆم ببـەمـە (کـەرک)، بـە ئومێدی ئـەوەی لـەوێ جێیـەکی ئەمینیان بۆ دابین بکەم. دەزانم ئەگەر تەتەر بێنە ئێرە هەمووشـتێک تێک هەڵدەشـێلن و وێرانی دەکەن.
- تۆ بۆم هـەڵدەگری مامە... وڵاخێک و ڕێوانێکت دەگەڵ دەنێرم، هەوڵ دەدەم دوو پاسـەوانیشـت بۆ دابین بکەم، با تا کەرک یاوەریت بکەن، چونکە ئەو ڕێگەیە مەترسیدارە.
باوەشـی پێدا کردم، جەستەی وەلەرەلەر کەوت، گریانێکی قەتیسماوی بەرێوە بوو. مزگەوتم جێ هێشت و خۆم لە دەروازەی (ڕەیحان)ــــە لادا. دەنگێک لە دوورەوە هاتە بنگوێم، نەمزانی ئاخۆ دەنگی ناقووسـە، یـان وەهم بوو، وەلێ بـەدڵنیـایی گوێم لـە هـاوارێکی بـە کۆمـەڵ بوو، تێکڕای دەروازەی لەراندەوە:
ئایینە ڕاستەکە دەرکەوت، ئایینی مەسیح هاتە پێشەوە.

# ٣٠

## "ناکرێ پشت بە سەفەری بێئاکام ببەستیت"

ئیبن عەرەبی

حەز ناکەم بچمە فاس تاکوو ئەو چەڵەمە و ناخۆشییەی سەر ئیبن ڕوشد کەشف نەبێت و نەزانم خەلیفە چ کارێکی بەرانبەر کردووە. مادەم وایە باشترە ڕێگەی (بیجایە) بگرمە بەر. هەستێکی قووڵ لەناخمەوە پێم دەڵێت مێخی دووەمی من، غەوسی ئەبوومودینە. دەبێ لە ئەفریقا جگە لەو، کێ شایانی ئەوە بێت ببێتە مێخی من؟ ئەگەر بڕیارە من لە مێخی دووەمی ئەفریقا بێت، دەبێ هەر ئەو بێت و بەس. پێم باش بوو لە ڕێگەی دەریاوە بە (ئەلمێریە) بەرەو (وەهران) بچم، پاشان بەرەو خۆرهەڵات بڕۆم تاکوو دەگەمە خزمەتی. چوومە لای باژێروان پرسیاری قافڵەکانی بازرگانیم لێ کرد، کە بەرەو (ئەلمێریە) دەڕۆن، ئەویش پێی گوتم قافڵەی (لەتیمە) لە ماوەی یەک هەفتەدا لە بازاڕی زێڕنگەران دەردەچێت و چەندان سەربازی والیشیان لەگەڵ دەچن. چوومە لای ئەمینداری بازاڕی زێڕنگەران و ئەویش ڕێنوێنی کردم، دواتر ڕۆیشتمە لای سەرقافڵەو پارەکەم دا و بەڵێنی دا بەر لەوەی بڕۆن، بەدوامدا بنێرێ.

پاش چەند ڕۆژێک کاڵەوپێڵاوم پێچاوە و ڕۆیشتم، نیوەی ڕێگە، یادەوەریی گەشتی یەکەمم بوو. کە لە مورسییە چوومە ئیشبیلیا

منداڵێکی گچکە بووم. لووتکە و تەپۆلکە و ئاوەڕۆی نیهال و بۆن و بەرامەی چڕستان و بێشەڵان و ڕێڕەوی ڕووبارەکانم بیرکەوتەوە، خۆ هەر دەتگوت دوێنێیە. دوای هەشت ڕۆژ، گەیشتینە (ئەلمێریە)، ڕاستەوخۆ چوومە مورسییە، سۆراخی کەشتییەکم کرد کە بەرەو (وەهران) بڕوات. باش بوو زووبەزوو کەشتییەکم دەست کەوت، بە پێنج دینار ڕازی بوو من و ئەسپ و کەلوپەلەکانم بگەیەنێتە شوێنی مەبەست. ئەو گەشتە دەریاییەم زۆر لە گەشتی یەکەمی نێوان ئەندەلوس و مەغریب دوورتر بوو. بایەکی زۆر بەهێز هەڵی کرد، کەشتییەکەیش هێندەی کەشتییەکانی خەلیفە توندوتۆڵ نەبوو، کە کەڕەتی یەکەم بەسەریانەوە گەشتم کرد. ڕووبەری نێوان (ئەلمێریە) و (وەهران) بە دوو ڕۆژ دەبڕدرێت، کەچی ئێمە ئەوە سێ ڕۆژ و نیوە بەسەر پشتی کەشتییەکەوەین. هێڵنجم دەهاتێ و سەرسوورکێم گرتبوو، لە نانەوشکە و کەمە سەوزەیەک بترازێ، هیچ نەچووبووە هەناوم. هەر وا مابنەوە، هەتا بەتەواوی لە پەڕوباڵ کەوتم، کە هەڵدەستامەوە سەر پێیان، بەملاولادا لار دەبوومەوە و هاوسەنگیی خۆم پێ ڕانەدەگیرا. زۆرینەی کاتەکانی نێو کەشتییەکە لەسەر تەنیشت پاڵ دەکەوتم و لێفەیەکم لە خۆم لوول دەدا و نزام لە خودا دەکرد ڕێگەم بۆ کورت بکاتەوە.

سەرباری ئەو حاڵەیش سکێشە دەستی پێ کرد، خەریک بوو بڕشێمەوە، هەستام و چوومە لێواری کەشتییەکە، سەرنشینانی کەشتییەکە هەموو خەویان لێ کەوتبوو. تەماشای دەریای پانوپۆڕم کرد، ترسناک و شێتانە بوو، لەبەر تریفەی مانگەشەو پیاوێکم لە دوورەوە هاتە بەرچاو، بەسەر ڕووی ئاوەوە، بەرەو ڕووم هات.

لە ترسان قوڕگم گیرا، هیچ قسەیەکم پێ نەکرا، تەنانەت توانای ئەوەم نەبوو بانگی هیچ کەسێک بکەم بێت ئەو دیمەنە ببینێت. گەیشتە لێواری کەشتییەکە، قاچی ڕاستەی بەرزکردەوە، تەماشام کرد وشکەو تەڕ نەبووە، قاچی چەپەشی قیت کردەوە، ئەویش بە

هەمانشێوە وشک بوو، پاشان سڵاوی لێ کردم و پشتی هەڵکرد و بەسەر ئاودا ڕۆیشت، وەک چۆن هات، وایش گەڕایەوە. میلێکی بە هەنگاوێک و دوان، دەبڕی. دەستەی کەشتیوانیم بانگکردن و ڕووداوەکەم بۆ گێڕانەوە، دەستیان بە گوتنی (لاحول ولاقوة) کرد. دواتر یەکێک یارمەتی دام و منی هێناوە سەر جێگەکەم.

لەکۆتاییدا گەیشتینە (وەهران). دوای چەند ڕۆژێک قافڵەیەکەم دەستکەوت بەرەو جەزائیر، دەڕۆیشت، خۆم ڕەگەڵ دان، زۆربەی خەڵکی قافڵەکە جوولەکە بوون، کراسی فشوفۆڵیان پۆشی بوو، بەرکەکانیان تا سەرپێیان هاتبوون. هەروەها کڵاوی شینیان بەسەرەوە بوو، پێشتر خەلیفە فەرمانی دەرکردبوو ئەم کڵاوە لە جیاتی مێزەر بکەنە سەریان. قافڵە لە ترسی ئەوەی بکەونە دەستی چەتە و شەقاوەکانی (بەنی غانیە)، لەتەک کەناراوەکە ڕێیان دەکرد. ئەو چەتانە هەر وەختێک قافڵەیەکیان بکەوتایە دەست، دەیان ڕووتاندەوە، بەمە شۆڕشی موەحیدەکانیان لاواز دەکرد. دوای ئەوەی هەواڵ هات، کە کەشتیگەلی بەنی غانیە بەنێو دەریادا دێن و دەچن و هەڕەشە لە کەشتیی خەڵک دەکەن، قافڵەکە لە کەناراوەکە دوورکەوتەوە.

بەهەرحاڵ، گەیشتینە جەزائیر، دوای حەوت ڕۆژ خۆم لەگەڵ قافڵەیەکی دیکە ڕێکخست کە بۆ (بیجایە)، دەچوو، پاش سێ ڕۆژ، گەیشتینە جێ. لە پاشکۆی گەرماوێک، ژوورێکم بەکرێ گرت، شەوێکیشم لەوێ بەسەربرد، دواتر چوومە قەلەندەرخانەیەک زۆر لەو مزگەوتەیە دوور نەبوو، کە غەوس وانەی تێدا دەگوتەوە. قەلەندەرخانەکە شەوان هەتا بڵێی هێمن و ئارام بوو، تەختەبەڕ و حەسیری زاهید و خواناسانی لێ ڕاخرابوون، سەرینی سووفی دڕ و تووندی لێ دانرابوون، وەختێک لەسەریان ڕاکشام، جەستەم تریواندی و ڕووحیشم حەسایەوە.

****

دوای دوو ڕۆژ مانەوەم، بەرەو ماڵی غەوسی ئەبوومودین ڕۆیشتم. لەبەر قاپیەکەی ماڵیان وەستام و لە دەرگەم نەدا، چاوەڕوانی هاتنەوە، یان دەرچوونیم دەکرد. ئاخر ئەمن کێم تا لە دەرگە بدەم و شێخ لەبەرم هەستێت و بێت وەڵامی موریدێکی هیچی وەک من بداتەوە. دوای چەند سەعاتێک دەرگە کرایەوە، شێخ بە ڕووی نوورانی و درەوشاوەی دەرکەوت، هەر دەتگوت پارچەیەکی سپێدەیە و شەو پێی نەگەیشتووە. ڕیشێکی سپی، سەر سینەی داپۆشی بوو. تەنیا یەک دەستی هەبوو، دەستەکەی دیکەیشی لە جیهاد پەڕی بوو. بە ڕووی بەبزەوە تەماشای کردم، منیش سڵاوم لێ کرد و دەستی چەپەیم ماچ کرد، پاشان کوتمەکەی ڕاستەیشم ماچ کرد و گوتم:

- من موحیەدینی ئیبن عەرەبیم، لە ئەندەلوسەوە هاتوومە خزمەت جەنابت، بۆ ئەوەی کۆمەکم بکەیت و ببیە فریادڕەس و وەژێر بەرەکەتی خۆمم بگریت.

لە بیجایە چەند هەفتەیەکم بەسەربرد، بۆ یەک ڕۆژیش لە وانەی غەوسی ئەبوومودین دانەبڕام. هەر پرسیارێکی بکردایە، وەڵامم دەدایەوە، هەر مەسەلەیەکم لێ ئاڵۆز بووایە پرسیارم لێ دەکرد. هەر کاتێک وانەگوتنەوەی تەواو بوایە، بۆ ماڵەوەی یاوەریم دەکرد. بەیانیان زوو لەبەر قاپییەکەی ماڵیان دەوەستام، تا لە ڕێگەی چوونە مزگەوتێ یاوەریی بکەم. کاتێک دەستنوێژی دەشوشت خوفەکانیم هەڵدەگرتن و نێوان پەنجەی پێیەکانیم پاقژدەکردەوە، ئەنیشک و تەوێڵیم بە پارچەپەڕۆیەکی لۆکە بۆ مەسح دەکردن، هەموو شەوانەیش ئەو پەڕۆیەم بۆ دەشۆری. کاتێک لە نوێژ دەبووەوە، تەسبیحم بۆ دەبرد و دەمخستە دەستی چەپەی، تاکوو تەسبیحاتی پێ بکات، کاتێک تەواو دەبوو تەسبیحەکەم لێ وەردەگرتەوە و تا کاتی نوێژێکی دیکە دە ملم دەکرد. زۆر چاوەڕێم کرد مێخی دووەمم بۆ کەشف بکات و شوێنی مێخی سێیەمیشم پێ بڵێت. هەر شەوێک

زیاتر مابامەوە، فەرموودەی دادە فاتیمەم بیر دەکەوتەوە، کە لە مورسییە بەڕێی کردم: "ڕۆڵە دڵت پاک بکەوە... وێجا شوێنی بکەوە." دەبێ دڵم چڵکن نەبووبێت و مێخی دووەمی لێ ون نەبووبێت؟ دادە فاتیمە لە ئیشبیلیا بۆ مێخی دووەم ڕێنوێنی کردم، دوای چەندان ساڵی دوورودرێژ، پاش چەندان خەلوە و جەلوە و حزوور و چوونە گۆڕستان، دۆزیمەوە. باشە ئەی مێخی دووەم لە کوێی ئەفریقا ببینمەوە؟ کێیە ئەو کەسەی دڵم بەو ئەندازەیە پاک دەکاتەوە؟ زۆر چاوەڕێم کرد، ناهومێدی گەمارۆی دام. دواتر بڕیارم دا نیازی خۆم لە خزمەتی غەوسی ئەبوومودین بترووکێنم. تا وانەکەی تەواو کرد چاوەڕێم کرد، پاشان پێم گوت شتێکم هەیە دەمەوێت بەتەنیا پێت بڵێم. شێخ سەری خۆی بادا و گوتی:

- ڕۆڵەی شیرینم! هەر مورێدێک پرسیاری لێ کردبم، پێش ئەوەی دەمی هەڵبێنێ، تێی گەیشتووم، زانیومە چیی دەوێت، بەڵام ئێستە هیچ لەوەی تۆ نازانم! پێم وایە پرسیاری شتێکم لێ دەکەیت، کە نایزانم، یان ناتوانم وەڵامت بدەمەوە.

بێدەنگ بووم، ئەسرین بە دەموچاومدا هاتنە خوار، داوای ئیزنم لێ خواست، ئیزنی دام... گەڕامەوە سۆفیخانەکەم، یەک بە قوڕگی خۆم گریام. پاشان ئەسرینەکانم سڕین و کەلوپەلەکانم کۆکردنەوە، ئەگەر بەیانی قافڵە بڕوات و نەڕوات ئەمن خۆم ساز و تەیار کرد. دوای دوو هەفتە، جارێکی دیکە خۆم لە ئیشبیلیا بینییەوە. خۆ ئەمن تەنێ یەک مێخم وەدەست هێناوە، هەر وەک چۆن قەڵەم بەدوای چەقی بازنەدا دەسووڕێتەوە، منیش وا بەدوای مێخەکانمدا دەخولێمەوە. ئەوەندەی فیکری لێ دەکەمەوە و مێشکی خۆم دەگوشم، بەدەر لە غەوس، هیچ مێخێکی دی بۆخۆم شک نابەم. تازە کەڵکی ئەوەم نەما سەفەری ئەفریقا بکەمەوە، ئاخر خاوخێزان بێ کەسوکار و مەغریبیش بێ ئەنوا دەمێنێتەوە. دەی گرفت نییە، ئەوە نییە دادە فاتیمە پێی گوتم: "خۆیان دەتدۆزنەوە." بەڵام واباشە

ســـەرەتا دڵم پاک بکەمەوە. یا ئەڵڵا! خۆزیا دادە فاتیمە ئەوە تێ دەگەیشـــت، کە گەڕان و ســـووڕان بۆ دۆزینەوەی مێخ بە هەموو ئەفریقادا، زۆر ئاسانترە لە پاقژکردنەوەی دڵ!

****

هەرکە گەیشتمەوە ئیشبیلیا ڕاستەوخۆ گەڕامەوە ماڵەوە، بینیم باوکم لەسەر جێگە نەخۆش کەوتووە. دایکیشم لە وەختی سەفەرەکەی من، لەنێو پێخەفەکەی لە گەرمەی خەودا، وەفاتی فەرموو بوو.

خوشکەکانیشم لەوپەڕی دڵتەنگی و ناڕەحەتییدا بوون. هەردووکیانم دەباوەش گرتن، بەسەر سینەمەوە گریان، بە دیدەنی من، برینەکانیان کولانەوە و ئاگری خەمەکانیان بەجۆشـــتر بوو. لەگەڵ گریانی بەسۆزی ئەواندا منیش دەستم بەگریان کرد، زۆر لەو سەفەرە بێمانا و بێپاســـاوەم پەژیوان بوومەوە، ڕاســـتیت دەوێت، ســـەفەرەکەی من هیچ نەبوو، تەنیا نەخۆشی و خەموخەفەتی دایە و بابەم زیاتر کرد.

باوکم لەســـەر جێگە کەوتووە و بزە و بزاوی لێ بڕاوە، هەتا بڵێی شـــەکەت و ماندووە، لەبەر حاڵی دژوار و ســـەختی، هەواڵی مەرگی دایکمیان پێ نەداوە. دایە دوڕەیش شـــەوانە هەتا بەیانی لەلای دەمایەوە، ئوم ســـەعدیش بەدرێژایی ڕۆژ لەتەکیەوە بوو. ئەوان نەیاندەزانی لە ماوەی شـــەو و ڕۆژێکدا چ ســـەعاتێک دێتەوە هۆش خۆی بۆ ئەوەی خواردن و خواردنەوەی پێ بدەن و دەســـتاوی پێ بکەن.

ســـەر و شـــانم ماچ کرد، هیچ ئاگای لەمن نەبوو، بانگم کرد، وەڵامی نەدامەوە. داوام لە دایەدوڕە کرد بەتەنیا جێمان بهێڵێت. لەژوور ســـەری دانیشـتم و دەسـتم لەسـەر تەوێڵی دانا، دەسـتم بە خوێندنی سورەتی یاسین کرد. دوای چەند جار خوێندنی ئەو سوورەتە وەئاگا هاتەوە، بە هەردوو چاوەکانی تێم ڕاما، هەقی موبینم تێدا بەدی کرد. پێم گوت:

- باوکە تا ئەو کاتەی هەواڵی فیراقی تۆم پێ دەگات، دەچمە مزگەوت.

چوومە مزگەوت، هەر نوێژی (تەحییەتولمەسجید)م تەواو کرد، بینیم سەلووم بە چاوی پڕ گریانەوە لەپشتمەوە وەستاوە:

- قوربان! "عظم الله أجرک" باوکت کۆچیدوایی کرد.

## ٣١

" وەختێك ئارەزوو خۆی بەسەر یەقیندا هەڵکێشا، کەڵکی ئەوەی نامێنێت پشتی پێ ببەستیت"
**ئیبن عەرەبی**

پێشـــتر، کە ویســـتم ســـەفەری فاس بکەم، جەنابی کومی بە چەند هەواڵێک ئاگاداری کردمەوە، ئێستە هەموو ئەو هەواڵانە یەکبەدوایەک ڕاست دەردەچن. ها ئەوەتە کابرای جاڕدەر لە بازێڕ بانگەواز دەکات و دەڵێـــت خەڵکینە هەر کەسێک دەستنووسێک، یان کتێبێکی ئیبن ڕوشدی لەبارەی زانستی لۆژیک و فەلسەفە لە لایە با بی سووتێنێت، دەنا والی سەنگەساری دەکات، بەڵام بیرتان نەچێت، کتێبگەلی بواری پزیشکی و ماتماتیک و ئەستێرەگەری لەو باسەدا هەڵاوێر دەکرێن. کتێبفرۆشەکان هەر کتێبێکی ئەویان لابوو، فڕێیاندایە گۆڕەپانی بازاڕ. کتێبە توورڕدراوەکان بەســـەریەکەوە بووبوون بە گردۆڵکە، ئەوەی بەدرێژایی چەندان ساڵ خەریکی بوون، وا ئێستە بەئاسانی لەبەینی دەبەن. دواتر خەلیفە فەرمانی کرد ئیبن ڕوشد لە زیندان دەربهێنن و بۆ گوندی ئەلیسانە دووری بخەنەوە. دەبێ ئەو هۆکارانە چی بن کە وا لە خەلیفە بکەن دۆســتێکی وەک ئیبن ڕوشــد، بە چاوی دوژمن تەماشا بکات؟ ئەم پرس و دەنگۆیانە هەموو ئەندەلوسیایان مژووڵ کردبوو. ئەمن هەستم بە گوناهـ دەکرد، ئاخر چۆن هەست بە گوناهـ

نەکەم؟ لەلایەک بە تەرمی دایکم ڕانەگیشتووم و لە ناشتنیدا بەشدار نەبووم، لەلایەکی دیکە بوومەتە هۆی نەخۆشکەوتنی باوکم. هێشتا هەست بە گوناهکردن بەرانبەر دایە و بابە بەری نەداوم، هەستکردن بە گوناه بەرانبەر ئیبن ڕوشدیشی هاتە سەر. هەستێک لە ناخەوە پێم دەڵێت من بوومە هۆکاری ئەوەی خەلیفە ئەو بەڵایە بەسەر ئیبن ڕوشددا بێنێت، ئاخر پێشتر خەلیفە لەبارەی فەیلەسووف و موتەکەلیمەکان پرسیاری لێ کردم، منیش بە شێوەیەکی خراپ باسی فەیلەسووفەکانم کرد.

تخوا ماقووڵە لە مەجلیسی خەلیفە و سوڵتانەکاندا ئەو بەدفەڕییە بکەم؟ زمان لە خەڵک بدەم و بیانخەمە کونجی زیندان؟ بیری خۆم بۆ دۆخی دیکە وەردەگێڕا و بە شتی دیکەوە خۆم دەخەجڵاند، بەشکم هەستی خۆبەگوناهبارزانین لە دڵدا لابدەم، یان هیچ نەبێت سەرکۆنە و ئازاری دەروونم کەم بکەمەوە، لێ سوودی نەبوو. زۆر ڕوونە خەلیفە لەوەتەی جڵەوی دەستەڵاتی گرتووەتە دەست، ڕقی لە فەیلەسووفان دەبێتەوە. فەقیهەکانیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دێنە لای و سکاڵای حاڵی خۆیان لە ئیبن ڕوشد دەکەن. نا، ناکرێ خەلیفە هەر تەنیا لەسەر بۆچوونی من ئەو بڕیارەی لەبارەی ئیبن ڕوشد دابێت، بەڵام بۆ نا؟ ئەی پێم نەگوت ئەمن کەشفی خوداییم هەیە؟ لەوانەیە باوەڕی بەم قسەیەی من کردبێت. دەشێ خەلیفە دوای چاکبوونەوەی، میزاجی تێکچوو بێت! دەنگوباس گەرمە، دوای ئەوەی لە یەحیای برای وەشک دەکەوێت، ملی دەپەڕێنێت.... مادەم شمشێر لە گەردەنی برا و خزمەکانی بدات، هیچ دوور نییە گەردنی فەیلەسووف و سۆفییەکانیش بقرتێنێت. فەقیهەکان ماتوول لە زمانلێدانی ئیبن ڕوشد سەرکەوتوو بوون، دەیان کەسی دیکەیشی بەدوادا دێت، دڵنیام ڕۆژێک زمان لە منیش دەدەن.

هەست بە گوناهکردنم گۆڕا بە ترس و وەهم. ئەرێ باشە من لە ئیشبیلیا چی دەکەم لە کاتێکدا مێخی من لە ئەفریقایە؟ ئەی چی لە

خوشـــکەکانم بکەم، خۆ لەمن زیاتر کەســـی دیکەیان نییە؟ ئەی ژنەکەم؟ ئەی کچۆڵەکەم، کە تازە خەریکی گڕوگاڵە؟ بەدەر لەمە، هەموو شتێک لەو شارە ئارامە، تەنێ دڵی من نەبێت. خانووەکەم، کە باوکم مانگانە کرێی بۆ دەدام، چۆل کرد و لەگەڵ ژن و کچەکەم گەڕاینەوە خانووی ماڵی باوکم. لەو دوو ژوورەی باوکم و دادەدوڕە، نیشتەجێ بووین. دوای ئەوەی ئوم سەعد پێی گوتم باوکم وەسیەتی کردووە دادەدوڕە لە کەنیزەیی ئازاد بکەین، ڕاستەوخۆ ئازادم کرد، دواتر نەمانزانی بەرەو کوێ سەری خۆی هەڵگرت. هەستم کرد لە قەسدی دڵم لام داوە، ڕێگەی ڕاستم گۆڕیوە، بۆیە خودا سزای داوم و دەروونی پڕ ترس و نیگەرانی کردووم. ئەو دڵارامییەی لە مەجلیسی مەشایخ و دەرس و دەور دەستەبەرم کردبوو، ئەوێستا بۆنسۆی لێ دێت. ئەو سەکینەتەی دڵۆپ دڵۆپ لە خەڵوەتی خودا و هاودەمیی گۆڕستاندا وەدەستم هێنابوو، هەموویم لەکیس چوو.

ڕۆژێک لە دەرگە درا، کە چووم قاسیدێکی کۆشکی والی بوو، گوتی والی داوای کردووە دوای نوێژی هەینی بچیە لای. منیش هەمان ڕۆژ چوومە کۆشک، لە مەجلیسی والی کەسێکم بینی نەمدەناسی. سڵاوم کرد، والی بە پیاوەکەی تەنیشتی گوت:

- ئەوە موحییەدینە، تاقە کوڕی خوالێخۆشبوو: عەلیی ئیبن عەرەبییە.

پاشان لای لێم کردەوە و گوتی:

- موحی، ئەوە ئەحمەد ئیبن بەقیی قاسیدی خەلیفەیە بۆ لای تۆ هاتووە.

هەستا و تۆقەی لەگەڵ کردم و گوتی:

- میری ئیمانداران بۆ پرسەی سەرەخۆشیی دایک و باوکت ناردوومی.

- خودا پاداشتان بداتەوە.

- داوای کردووە بێیتە مەراکیش و لای وی ببیە ڕازنووس.

ئەمنیش بێ منجەمنج وەڵامم دایەوە:

- هیچ ئاتاجێکم بەمە نییە.
کابرای قاسید تێکهەڵقژا، وەک ئەوەی پێشبینیی ئەوەی نەکردبێت، کە من ڕەتی بکەمەوە. والی هاتە نێو بابەتەکە و گوتی:
- باوکی زەینەب، خەلیفە بۆیە بەدوای تۆیدا ناردووە، چونکە لای ئەو پایەداری، باوکیشـــت باشـــترین پیاوی ئەو کۆشـــکە بوو. ئەگەر بە قسەی من دەکەیت بەدەم داواکەی خەلیفەوە بڕۆ.
- جەنابی والی، خۆ من ئەوە لەبەر لووتبەرزی و خۆبەگەورەزانییەوە ڕەت ناکەمەوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە بۆ ئەو نەخولقاوم. ڕاستییەکەی ئەوەی باوکم دەیزانی، من نایزانم.
- من داوات لێ دەکەم چەند ڕۆژێک بیر لەو بابەتە بکەیتەوە، ئەگەر هەر ســـوور بوویت لەســـەر بۆچوونەکەت ، با قاســـید ئەو هەواڵە نەبات، بۆ دڵئاوخواردنەوەی ئەو، باشترە خۆت بچیت.
- چۆن فەرمووتان بیری لێ دەکەمەوە و دواتر دێمەوە خزمەتتان.
پاشان والی هێمای بۆ ئەحمەد بن بەقی کرد و گوتی:
- لە میوانداری ئێمەدا بمێنەوە و لەپێش ئیبن عەرەبیدا مەڕۆوە، هیچ شتێکیش لەوبارە بۆ خەلیفە مەنێرە، تاکوو خۆی سەردانی دەکات.
- بەسەر چاو.

****

لە ڕێگەی ماڵەوە، هەســـتم بە هەڵەیەک کرد. ئەو داوایەی خەلیفە هەلێکە جارێکی دیکە ســـەفەری ئەفریقام بۆ دەڕەخســـێنێت، ئەو جێگەیەی، کە مێخی دووەم چاوەڕێم دەکات. ئەرێ بۆچی ئەو ســـەفەرەم ڕەت کردەوە؟ ناشـــێ خەلیفە بۆ کارێکی خراپ بەدوامدا بنێرێت. خۆ ئەگەر کارێکی خراوی لەنیازدا بوایە، فەرمانی بە خەلیفە دەکرد، کە کۆت و زنجیرم بکەن و بە شـــەق بمنێرن. ئەی کەواتە بۆچی لە ئیشـــبیلیا بمێنمەوە، کە چیتر جێی ئەهل و زانست و مێخی من نییە؟ نا، خوشـــکەکانیشـــم دەبەم و جارێکی دیکە ناچار بە گەڕانەوە نابم. مەراکیش چەندان شـــێخی هەیە هێشـــتا بە دیداریان

شـــاد نەبووم، چەندان کتێبی لێیە، هێشـــتا نەمخوێندوونەتەوە، وێڕای ئەوانەیش، مێخی منی لێیە، نازانم کەی خودا بۆم کەشف دەکات.
گەیشتمەوە ماڵەوە، بە مەریەمم گوت بەو نزیکانە دەڕۆینە مەراکیش. خێرایش خۆم گەیاندە خوشـــکەکانم و هـەواڵـەکـەم بـەوانیش دا، ســـەرســـووڕمـان و نیگـەرانی و دڵخۆشـــی لـە ڕوخســـار و ئادگارەکانیانەوە نیشت.
لەوبارە زۆریان پرســـیار لێ کردم، منیش پەیامی خەلیفەم بۆ باس کردن. هێندێک پرسیاری دیکەیان کرد، هیچ مانای نەبوو:
- سـواری ئەسـپ بین یان وشـتر؟ بە دەریا بڕۆین یان بە وشـکانی؟ دوایی کێ دێتە خانووەکەمان؟ بەیانی ڕۆژی دواتر، چوومە کۆشـک، دیاربوو والی ئـەو ڕۆژە هیچ مـەجلیســـێکی دانەنابوو. ســـۆراخی قاســـیدی خەلیفە کرد، بۆ شـــوێنی حەوانەوەی ڕێنوێنییان کردم، هـەواڵی ڕازیبوونی خۆمم پێدا، پێشـــم گوت بـە خـاوخێزانەوە دێمە مەراکیش. بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو. پرسـیاری ئەو قافڵەیەی لێ کردم، کە لـە بـازاڕ بینیبووم. خۆیشـــی بڕیاری دا لەگەڵ ئێمە بێت. دوای چەند هەفتەیەک بە پێنج وڵاخ، کە والی بە کەژاوەوە ناردبوونی، بەڕێ کەوتین. من و هاوژینەکەم و کچەکەم و دوو خوشـــکەکانم و ســـەلووم و عەداد، ڕێگەمان گرتە بەر. بە وەرزی هاوین گەیشـــتینە مەراکیش. خانوویەکی فراوانم بە کرێ گرت، پێنج ژووری تێدا بوون، حەوشـێک و باخچەیەکی خۆشـی هەبوو. من و مەریەم لە سـەرەوە و خوشـکەکانیشـم لە خوارەوە، سـەلووم و عەدادیش لە پاشـبەندی خانووەکە دەمانەوە.
دوای چـەنـد ڕۆژێک چوومـە مـەجلیســـی خەلیفە، هەرکە منی بینی، بزەیەکی کرد و دەسـتێکی لە شـانم دا، بەڵام هیچ قسـەیەکی لەگەڵدا نەکردم. مەجلیســـی خەلیفە لە ئەندازیار و وەســـتا جمەی دەهات، چەندان نەخشـە و ڕووپەلیان بەدەسـتەوە بوو، وێنەی خانووبەرە و باڵەخانەیان بەسـەرەوە بوو. ژمارەیەکی زۆری ڕازنووسییش لەوێ

بوون، فەرمانەکانی خەلیفەیان دەنووســـــیيەوە. گوێم لێ بوو خەلیفە دەیگوت بەو نزیکانە دەســــت بە بنیاتنانی: شــــوورەیەکی گەورە لە دەوری شـــــاری ڕیبات دەکەین، حەفتاوچوار بورج و پێنج دەرگەی تێدا دروســـت دەکەین. هەروەها بیمارســـتانێکی گەورە لە مەراکیش دورســــت دەکەین. پڕۆژەیەکی ئاوی خواردنەوەیش هەیە، دەگاتە هەموو ماڵێک. بۆڕیەکی گەورەیش بۆ مزگەوتی (کتبیین) ڕادەکێشین، ڕێک وەک ئەوەی بۆ مزگەوتی (قەصبە)ــــی ئیشبیلیا ڕاکێشراوە. قەڵایەکی بەرگرییش لەسەر ڕووباری ئیشبیلیا بە گومبەتی گەورەوە بینا دەکەین. مزگەوتێکی گەورەیش لە (ســـلا) دورســــت دەکەین و حوجرەیەکیشــــی لە ڕۆخ دەبێت. ناعوورێک بۆ هەموو مەراکیش، لە باکوورەوە بۆ باشــــوور، چێ دەکەین. چەند کۆشــــکێکی نوێش بۆ خەلیفە و میرانی موەحیدە لە مەراکیش و فاس و ســــبتە و ســــلا دروست دەکەین.

یەک لە نووسەرانی خەلیفە داوای کرد هاوەڵیی بکەم. منیش لەگەڵیدا چوومە خانەی کاتیبان لە کۆشکی خەلیفە، لەپشت مێزەکە دانیشت و کتێبێکی گەورەی دەرهێنا و کردیەوە و گوتی:

- پاداشــــتی مانگانەی خەلیفە بۆ کرێ خانوو و وانەگوتنەوەکەت لە مزگەوت، دە دینار دەبێت.

- خودا پاداشتی تۆ و خەلیفە بداتەوە.

# ٣٢

"ئەوەی ڕێگەی بینینی هەقیقەتت لێ دەگرێت، تەنیا هەر خۆتی "
ئیبن عەرەبی

لەو کاتەی قاسیدی خەلیفە لە ئیشبیلیا لە چاوەڕوانی وەڵامی مندا بوو، ڕێک لەو وەختەیشدا قاسیدێک لە کێوی جیلیزی مەغریب چاوەڕوانی وەڵامی شێخ ( سبتی)یە. ئەمن لە ماوەی یەک شەودا، وەڵامی قاسیدم دایەوە و بۆ مەراکیش وەڕێ کەوتم، بەڵام قاسیدەکەی دی، سێ شەو لە ئەشکەوت لەگەڵ شێخ خەڵوەتی کێشاوە، تاکوو لە کۆتاییدا شێخ وەڵامی دەداتەوە و خەڵوەتەکەی دەشکێنێت و بەرەو مەراکیش دێت.

دوای چل ساڵ خەڵوەتکێشانی شێخ لە ئەشکەوت، لەگەڵ خەڵکەکە لەبەر دەرگەی (ئەکناو) چاوەڕوانی هاتنەوەی بووین. پاش چەند سەعاتێک چاوەڕوانی، هێسترەکەی گەیشتە بەر دەروازەکە. خەڵکەکە ڕایەخیان دەخستنە ژێر سمی هێسترەکەی، دوای تێپەڕبوونی، هەڵیان دەگرتنەوە و جارێکی دیکە دەیانخستەوە ژێر پێیەکانی. تا جەنابی شێخ نەگەیشتە مێوانخانەکەی، کە خەلیفە بۆ خۆی و قوتابییەکانی چۆڵی کردبوو، سمی هێسترەکەی بە زەوی نەکەوت. شێخ لە هێسترەکەی هاتە خوارەوە و پریاسکە خەتزیوینەکەی دەرهێنا، کە عادەتەن بەخشش و موچەی خەلیفەی تێدا دەهات،

هەموو ئەو پارەیەی تێیدا بوو بەسەر هەژار و نەدارەکانی دەوروبەری دابەش کرد. هەر چەند ماوەیەکی دوورودرێژ بەسەر خەڵوەتەکەیدا تێپەڕیبوو بوو، بەڵام دیمەنێکی زۆر جوان و قژ و ریشێکی درێژ و خەندەیەکی بێگەردی هەبوو. ئەگەرچی پیر بووبوو، بەڵام نێوشان پان و عەزەڵاتەکانیشی وەک ئەو کێوەی ساڵانێک هاودەمی بووە، توونـد و بەنـد بوون. خەڵکێکی زۆر ڕوویـان لـە مێوانگەکەی دەکرد و بەخێرهاتنیان دەکرد، لەبەر قەڵەباڵغی نەمتوانی خۆمی پێ بناسێنم، وەک خەڵک بەخێرهاتنم کرد و دەستم ماچ کرد و هاتمە دەرەوە. خەلیفە مێوانخانەیەکی بچووکتر لە هی شێخی بۆ وانەگوتنەوەی من، دابین کردبوو. سەرلەبەیانیان وانەی فیقهـ و تەفسیرم بۆ گەنجەکان دانابوو، پایەی زانستی ئەوانەم بەرز کردەوە، کە خاوەنی ڕەئی بوون. لە حەلقەی تەئویلکاری، کە دوای نیوەشەو دەمانبەست، کەمێکیان دەمانەوە. لەنێویاندا دوو گەنجی فاسی عەقڵدامەزراو و زانستدۆست هەبوون. هەر لە ڕۆژانی سەرەتاوە، سەرنجی منیان کێش کرد، ڕۆژێک دوای خوێندنی دەرسەکەیان لای خۆم هێشتنەوە، ڕۆژێکی دیکە بردنمەوە ماڵ. لە زۆر بواردا قسەم لەگەڵدا کردن، لەبارەی دین و دنیا تاقیم کردنەوە. پاشان بڕیارمدا هەردوو خوشکەکەمیان لێ مارە بکەم، هەر چواریان لە خۆشیان خەریک بوو دەکەوتنە هەلەکەسەما. چەند هەفتەیەک ڕۆیشتووە، کەچی هێشتا دەرفەتی دیداری شێخ (سبتی) نەڕەخساوە. ئەمن هەموو ڕۆژێک دەچمە مەجلیسی وانەگوتنەوەکەی، چاوەڕێی ئەوەم پرسیار و کاروباری خەڵک تەواو بێت و هەلێک بۆ دیداری بڕەخسێت، دواتر درەنگ دادێت، سڵاوی لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە. دوای چەند ڕۆژێک دەچوومە ژوورەوە، ئەگەر خەڵکێکی زۆری لێ بوایە، دەمزانی کاتەکە بەش ناکات، بۆیە ڕاستەوخۆ دەگەڕامەوە. بڕیارم دا دوای یەک مانگی دیکە بچمەوە لای، بە ئومێدی ئەوەی لە فەقێکانی زیاتر، کەسی لە دەور، نەمێنێتەوە. سەرگەرمی وانەگوتنەوە

بووم، سـەرباری ئەوەیش دەسـتم بە نووسـینی کتێبێک کرد، هەموو کاتەکانی لێ گرتم. نیوەشـەوێک ئێمە خەریکی وانەی تەئویل بووین، لە دەرگە درا، فەقێیەک دەرگەکەی کردەوە، بینیمان (سبتی) بە ڕووی شەرمندە و خەجاڵەتەوە لەپشت دەرگە وەستاوە:

- کوا شێخەکەتان؟

بەپەلە خۆم گەیاندێ و دەستیم ماچ کرد، بە ناورانەوە گوتی:

- لە سەرمان خەوم لێ نەکەوتووە.

- بەڵام یا شێخ ئێمە لە وەرزی هاویندایین!

- بەڵێ. سەرما، واتا ئەو خیرقەیەی بەسەر جەستەمەوەیە و هیی من نییە. تاکوو داینەکەنم بۆ کەسـێک، کە شـیاویەتی، ئەویش خیرقەی خۆیم بۆ دانەکەنێت، جەستەم لە سـەرما و لەرزین ناکەوێت. هەستم کرد نائومێدی وەک مەل بەسـەر سـەرمەوە دەسـووڕێتەوە، خەریکە بەسەرمدا بکەوێت. دوا تەقەلای خۆم دا، بەشکم خودا وەلای بنێت و لێم لابدا:

- یا شێخ کێیە ئەو کەسەی شیاوی خیرقەی تۆیە؟

- تۆ! مەگەر لە تۆ زیاتر کێ هەیە؟

مـەلی نـاهومێدی بـەربووەوە. قـەت بـەبیرمـدا نـەدەهـات داکـەنـدنی خیرقەی وەلییەکی سالْح وەها بێمەیل و داڕماوم دەکات... ئاخر ئەمن تـەمـاخوازی ئـەوە بووم ئـەو ببێتـە مێخی من، بـەڵام تـازە مـادەم خیرقەی خۆی داکەند، ئیتر بە مێخ ناشێت. باشە مادەم ئەبوومودین و سـبتی مێخ نـەبن، دەبێ کێ لـەو ئـەفریقایە هـەوبێت؟ لـەو وڵاتە فراوان و کاکی بە کاکییە، لەکوێ مێخی خۆم بدۆزمەوە؟

لەبەرانبەرم وەسـتا و خیرقەی خۆی داکەند، منیش خیرقەکەم لەبەر کردەوە. لە کاتی خۆیدا گەڕایەوە، منیش گەڕامەوە مەجلیسی خۆم و نەمزانی چی دەکەم و چی دەڵێم. بە فـەقێیـەکانی خۆم گوت بـەیانی دەرسـەکەتان تەواو دەکەم. گەڕامەوە ژوورەکەم و هەوڵمدا لەکوێ دەسـتم هەڵگرتبوو، لەوێ دەسـت پێ بکەمەوە، هەرچەند هێنام و

بردم، خوا دەرگەی یەک پیت و ژمارەی لێ نەکردمەوە. بەناوی خەوتن لەجێخەوەکەمدا پاڵ کەوتم، بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر دادەفاتیمە سەرەتا هەواڵی ئەو چوار مێخەی بە من نە دابوایە، بۆ من زۆر باشتر دەبوو. چاوەڕوانیی ئەو مێخانە، منیان وردوخاش کرد، ئەو چاوەڕوانییە، هەتا بڵێی تاڵ و تەفروتووناکەرە. ئەی ئەو مەرجە سەخت و زەحمەتە"دڵت پاک بکەوە!". وای خودایە ئەو مەرجە چەند ئاڵۆز و بێسنوورە! چۆن بزانم دڵم پاکبووەتەوە؟ ئەی چۆن بزانم پیس و چڵکن بووە؟ ها ئەوەتە بە هەمان مینوالی جاران ئەگەر پیس و ئەگەر پاک، خەریکی ترپەترپیەتی. خۆر لە هەمان جێی جارانی سەر دەردێنێتەوە، ئەگەر باش و ئەگەر خراو. شەو بەیەکسانی باڵی خۆی بە سەر ئەولیا و بەدکاراندا دەهێنێت و پووک و پاکیان هەڵناوێرێ.

بەهەرحاڵ، بە بیر و خەیاڵێکی ئاڵۆزەوە، بە خیرقەی سبتییەوە، کە بۆنی داری سووتاوی لێ دەهات، خەوتم. بەیانی بە مەیلەو تووڕەبوونێکەوە لە خەو ڕابووم، نەشمدەزانی بۆچی و لەکێ تووڕەم؟ من سەرکۆنەی سێ مێخەکەی دیم کرد، دەشێ هەر لەبەر ئەوەیش تووڕە و بێحەوسەڵە بم. ئەرێ ئەوان چاوەڕوانی چین؟ بۆچی گەرەکە چوار جار دڵی خۆم پاک بکەمەوە؟ ئایا یەک جار دڵ پاککردنەوە بۆ هەر چوار مێخەکە، بەس نییە؟ هاتمە دەرەوە بۆئەوەی ئاگری ئەو تووڕەبوونەم دامرکێنمەوە، نەمزانی لەنێو شاردا گڕەکەی بە جۆشتر دەبێت، ئەگەرچی بەهۆی چەند شتێکی دیکەی جیاوازەوە بوو. بۆ گردبوونەوە لە گۆڕەپانە گەورەکەی بازاڕ، خەڵک بانگی یەکتریان دەکرد، دەمێکی دی جاڕدەر ئاگادارکردنەوەیەکی خەلیفە بە گوێیاندا دەچرپێنێت. لەگەڵ خەڵکەکە بەرەو پێشەوە چووم، لە نزیک ئەو پێپلقانەی جاڕدەر لەسەری دەوەستێت، وەستام. جاڕدەر هات، ماوەیەک بێدەنگ بوو، چاوەڕێی

هاتنی زیاتری خەڵکی دەکرد، پاشـــان هێمایەکی بۆ ڕووپەلێکی پانی بەردەستی کرد و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خەڵکینە! ئەمە نامەی (ئەلفۆنسـۆ)ـــیە بۆ میری ئیمانداران. خەلیفە فەرمـانیدا بـەنێو خـەڵکدا بڵاوی بکـەینـەوە، بۆ ئەوەی بزانن چی تێدا نووسـراوە. پاشان بزانن چییان پێ باشە بکرێت. نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە:

- " ئەی خەلیفە! پێت گوتم تۆ سـاڵ دوای سـاڵ خاووخلیسـکی دەنوێنیت، پێیـەک دێیـە نواوە°، پێیـەک دەچیـە دواوە. هـەروە پێیان گوتم هیچ پاسـاوێکت بۆ شـەڕکردن نییە. خۆت دەزانی چیم بەسـەر سـەرۆکەکانی ئەندەلوسـدا هێناوە، چۆن شـەرمەزار و بێدەسـتەڵات بوون. بزانە! زەلیل و ملشـۆڕیان دەکەم، کچەکانیان دەکەمە سـەبایە، ئابڕووی پیاوەکانیان دەبەم و گەنجەکانیان دەکوژم.... ئێسـتە هیچ بیانوێکت بەدەسـتەوە نەما تاکوو لە سـەرخسـتن و ڕزگارکردنیان خۆت دوا بخەیت، لە کاتێکدا خودان هێز و دەستەڵاتیت..."

جاڕدەر نەختێک لە خوێندنەوەی نامەکە وەسـتا و دەنگ و هاواری خـەڵک بۆ شـــەرمەزارکردنی نامەکە بەرزبووەوە. لە چەند لایەکی ئاپۆڕای خەڵکەکە، دەنگی تەکبیر بەرزبووەوە. جاڕدەر کەمێک وازی لە خەڵکەکە هێنا بۆ وەی هەسـتی تووڕەیی و خرۆشـاوی خۆیان دەرببڕن. پاشـان دەسـتی بەرزکردەوە، بۆ ئەوەی ڕێگەی بدەن قسـە بکات، دەنگی خەڵکەکە خامۆش بوو، ئەوسا پێی گوتن:

- خەڵکینە! گوێتان لە ناوەرۆکی نامەی (ئەلفۆنسۆ)ی دڕندە گرت، کە بۆ جەنابی خەلیفەی ناردبوو، ئێسـتەیش کاتی ئەوە هاتووە گوێ لە وەڵامی میری باوەڕداران بگرن.

خـەڵکەکە بێدەنگ بوون و گوێیان هـەڵخسـت. جـاڕدەر تـاوێک لە قسـەکردن وەسـتا تاکوو خـەڵکەکە بە تاسـە و تامەزرۆییەوە گوێ لە

---

°-پێشەوە

وەڵامی خەلیفە بگرن. پاشـــان چاوەکانی نوقاندن و ئایەتێکی سوورەتی نەملی خوێندەوە:

- " إرجع اليهم فلنأتينهم بجنود لاقبل لهم بها ولنخرجنهم منها اذلة وهم صاغرون".

خەڵکەکە وەک زەیتی گەرمی نێو تاوە قرچەقرچیان دەهات. وەڵامی خەلیفە، هەموویانی ورووژاند، بەناوی ئەو هوتافیان دەکێشا. تەکبیر و دروشملێدان، بانگەوازی جیهاد و نەفرەتکردن، تێکەڵ بەیەک بوون و خاچپەرستانیان پێ داشۆری. بزەیەک کەوتە سەر ڕووی جاڕدەر، هەوڵی شاردنەوەی دا، دواتر دابەزی و ڕۆیشت.

دوای چەند ڕۆژێک جاڕدەر بەنێو کوچە و کۆڵان و مزگەوتەکان وەربوون، خۆبەخشـــەکانیان ناونووس دەکرد و بۆ نێو ســـوپا دەیاننادرن. خەلیفە جلێکی شـەڕی پۆشـی، لە هەموو مەجلیسـەکانی هەر ئەو جلەیەی لەبەردا بوو. نامەکەی (ئەلفۆنسـۆ) ڕۆڵێکی گرنگی لە پەخشکردنی ڕووحی تۆڵەسەندنەوە لەنێو خەڵکدا هەبوو. ئەوانەی، کە قەت کاری خۆبەخشییان نەکردبوو، ئەمڕۆ بێ سێودوو هاتنە نێو بەرەی خۆبەخشـــان. خەڵک بەبێ تیر و شـــمشـــێر بەرەو جیهاد دەچوون. ســەدان پیاوگەلی مەراکیش لەبەردەم دیوانی ســەربازی وەســـتاون، ئامادەن بۆ مەشـــق و ڕاهێنان و چوونە نێو لەشـــکر. بازاڕگەی ئاســـنگەران پڕبووە لە باژێڕوان، هاتوون بۆ ئەوەی لە نرخی جارانی شـمشـێر دڵنیا ببنەوە، تاکوو هەموو کەسێک دەستی پێ ڕا بگات. دواتر خەلیفە هەمووشـــتێکی نێو کۆگەی بازرگانەکانی کڕیوە و بەسـەر خۆبەخشـەکانیدا دابەش کردووە. قاسیدانی خەلیفە بە هەموو لایەکی مەغریبدا چوون، خەڵکیان بۆ جەنگ و جیهاد دنە دا. کۆگەی چەک و تفاق و ئەســـپی ڕاهێنراو و زرێ و زینیان کڕی. دوای چەند هەفتەیەک خەلیفە خۆی، دوو هەزار سەربازی لە سودان و بەربەر و عەرەب و سەقالیبە و دووڕە و ئەغزازەکان بۆ ئەندەلوس هێنا.

# ٣٣

"گومان، بۆ پشتپێبەستن ناشێت"

ئیبن عەرەبی

کابرایەکی حەبەشی هاتە ناو حەلقەی وانەگوتنەوەکەم، لە ژیانمدا بۆ هیچ کەسێک هێندە سەرچیغ نەچووم. پێم وابوو لە وانە سەرەتاییەکانی فیقهـ دەوستێت و ناڕوات، کەچی بە چەند مانگێکی کەم گەیشتە حەلقەی دەرسی تەئویل و لێکدانەوە. وا گومانم برد هیچ لەو ئاماژە و ڕەمز و ڕاڤە و کەشفانەی من تێ ناگات، کەچی هەموو ئەوانەی لە کتێبێک کۆکردبوونەوە و شەرحی کردبوون. وامدەزانی ئەو دەیەوێت یاوەریم بکات، چونکە لە بەندایەتی ڕاهاتووە و حەزی بەژێر دەستەییە، بەڵام نەمزانی لە ناخیدا کەسێکی ئازادبووە، ئەگەرچی بە دیمەنیش بەندە بووبێت. لام وابوو چەند ڕۆژێک هاوەڵیم دەکات و دەڕوات، کەچی بیستوپێنج ساڵی ڕەبەق یاوەریی کردم. ئەمن پێم وابوو نابێ بەدر ڕەش بێت، کەچی نەمزانی هۆشم نسکۆی بردووە، ئەوەتە بەدری حەبەشی کامڵترین و پڕ نوورترین مانگە، لە هەموو مانگەکانیش پتر ئاسوودەیی و شادمانیی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

- تۆ لەکوێ هاتوویت؟

سەرەتا هیچی نەگوت، وەک ئەوەی نەزانێت خەڵکی کوێیە و لەکوێ هاتووە. پاشان گوتی:

- ئەمن بەندەی ئازادکراوی ئەبووفتووحی حەڕانیم. لە قاهیرە و دیمات و مەککە و بیجایە و مەراکیش و فاس لەگەڵیدا بووم. ئێستە نازانم لە کوێ هاتووم!

- لە زەویندا خولقاون و هەر بۆ ئەوێش دەگەڕێنەوە.

سەری ڕەزامەندبوونی لەقاند و بە ئاسوودەییەوە بزەیەکی کرد، وەک ئەوەی ئەو گرفتە گەورەیەی، کە دوای ئازادبوون تووشی هاتبوو، ئێستە بۆی حەل بووە. باش نەیدەزانی تەمەنی چەندە، لێ وا دەفامراوە لەسەرەتای چلساڵی دابێت. کەسێکی هەتا بڵێی شەریف و لەتیف و خزمەتدۆست بوو. دوای ئەوەی ئەبووفتووح پیر دەبێت، ئازادی دەکات، ئاخر ترسی ئەوەی هەبوو بمرێت و کوڕەکانی ئازادی نەکەن. کاتێک کتوپڕ ئەو هەواڵە دەبیستێت نازانێت چی بکات، نە کارێکی هەبووە، نە هیچ پارەیەکی بەدەستەوە بووە. قاپیەی مزگەوتان دەگرێت و لە حەلقەی دەرس و دەوران دادەنیشێت، گوێ بەوە نەدات ئاخۆ سەر بە چ مەزهەب و فیکرێکن. پاشان باسی منی دەکەوێتە بەرگوێ، دەبێنی فەقێ پۆلپۆل دێنە حەلقەی دەرسم و گوێ دەگرن، مۆڵەتی هاتنە نێو حەلقەی خواست و منیش ڕێگەم پێ دا، هەرچەند سکم پێی سووتا، چونکە پێم وانەبوو لە سەختیی مەسەلەکان و ئاڵۆزیی تەئویلکاری تێ بگات.

چەند هەفتەیەک بەسەرچوو، ئەو، بەبێ ئەوەی ڕۆژێک قسەم لەگەڵدا بکات، لە حەلقە دادەنیشت و گوێ دەگرێت. ڕۆژێک لە دوای دەرسخوێندن گوتی:

- یا شێخ شوێن ڕێبازت دەکەوم و خزمەتت دەکەم... وابزانم هیچ کەسێکت دەگەڵدا نییە؟

- بەدری حەبەشی لەبەرانبەر ئەوەدا چیت دەوێت؟

- تەنیا زانست و بەرەکەتی تۆ و بەس.

ڕەزامەندیم دەربڕی، وەک سـێبەر بەشـوێنمەوە بوو، لە ماڵەوە بۆ دیوەخان، لە دیوەخـان بۆ مزگەوت، لە مزگەوت بۆ بازێڕ، لە بازێڕ بۆ کۆشـک. شـەوان لە مزگەوت، لە ژووری غەریبە و غەوارەکان دەخەوت، بەیانی زوو دەهات لەبەر قاپیەی ماڵمان هەڵدەکورما تاکوو دەهـاتمـە دەرەوە. هۆگری بووم و خووم پێیـەوە گرت. متمانـەیـەکی زۆرم پێی کرد و کردمـە ڕێکخـەری کاروبـاری فەقێیان و چۆنیەتیی دابەشکردنی بەشـەوانەکانیان، هەروەها نووسینەوەی کتێبەکانم دایە دەسـت ئەو. دوای چەند مانگێک بووە دەسـتەڕاسـتی من و لە هەمووشـتێک پشـتم پێی بەسـت، لە هیچ چتێک خەجاڵەتی نەکردم. هەر لەسـەرەتاوە درکم بەوە کرد، ئەو مژدەبەخشـیشـە. مژدەی سـەرکەوتنێکی گەورەی سـوپای موەحیدەکانی لە ئەندەلوس پێ دام، ڕاسـتییەکەی هەر وایش بوو، قافڵەکانی ئەندەلوس دنیایەک هەواڵی سـەرکەوتنی لەشـکری موەحیدەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. هەر ڕێبوارێک دەهـات ژمـارەیـەکی زۆری کوژراو و دەسـتکـەوتێکی بێهەژماری قشـشـتالییەکانی باس دەکرد. هێندێک دەیانگوت ژمارەی کوژراوەکان بیستهەزار کەسە. بەشێکی دیش دەیانگوت پەنجاهەزار کوژراوە. بە گوێی خۆم بیستم کابرا سـوێندی دەخوارد، دەیگوت لە سـەتهەزار تێی پەڕاندووە. شارەکانی ئەندەلوس پڕبوون لە ئەسیر و گیراو، هـەر بـابـایـە و دوو بـەنـدە یـان زیـاتری پێیـە و بـە بـازێڕدا دەیانسـووڕێنێتـەوە. گیراوەکان قژیان کەژ و چاویان شـین بوو. دەنگۆی ئەوە هەبوو زۆر لە دەسـتکەوتەکان لەبەر نەبوونی وڵاخی بارهەڵگر، لە جێی خۆیان مابنەوە. دەشـگوترا ئەلفۆنسـۆ لەبەرەکانی جەنگ هەڵاتووە و ڕیش و قژی خۆی تاشـیوە و بەڵێنی داوە تاکوو تۆڵەی ئەو شکستە گەورەیە نەکاتەوە ڕیشی نەهێڵێتەوە.

لەکۆتاییدا دەستکەوتەکانی جەنگ گەیشتنە مەراکیش، ئەسیر بەیەک دەرهەم و شـمشـێریش بەنیو دەرهەم، ئەسـپ بە پێنج دەرهەم، گوێدرێژ بـە دەرهـەمێک، دەفرۆشـران. خـەڵکێکی زۆر ڕوویـان لـە

کۆیلەکڕین کرد، دەیانبردن فێری پیشـــەیەکیان دەکردن و دواتر بە نرخێکی زۆر دەیانفرۆشـــتنەوە، هەر یەکە و بە گوێرەی پیشـــە و کارەکەی. زۆربەی کۆیلەکان بۆ دروســـتکردنی خانووبەرە و بینای نوێ دەبران، هەقدەســـتەکەشـــیان بۆ خاوەنەکانیان گل دەدرایەوە. بـازێڕ و خـانـە بـازرگـانییـەکـان بـە دابـەزینی نرخی کۆیلـە و پێڕۆ، بووژابوونـەوە. خـەڵـک ئومێـد و بـاوەڕبوون بـە داهـاتوویـان بۆ گەڕایەوە.

هەرکە خەلیفە گەیشـتەوە مەراکیش، خەڵک تێکڕا چوونە پێشـوازی، گوڵبارانیان کردن و میسـکیان لە جێ سـمی ئەسـپەکەی دەڕشـت. فەرشیان لەبەردەم ڕادەخست و دەوسی ئەسپەکەیان ماچ دەکرد... تا گەیشتەوە کۆشک بەم تەرزە بەخێرهاتنەوەیان کرد.

لە شـارەکانی مەغریب، شـاند دوای شـاند دەهاتن و پیرۆزبایی ئەو سـەرکەوتنە مەزنەیان لێ دەکرد. لەگەڵ هاتنی هەر شـاندێک، خەڵک لـە شـــەقامـەکان بـەناوی ئـەو هوتافیان لێ دەدا. حیکایەتخوانەکان بەبۆنەی ئەو سـەرکەوتنە چەندان حیکایەتی نوێیان داهێنابوو. دەنگی دەهۆڵ لـەنێو گۆڕەپانـە گـەورەکـاندا، هـەموو کوچـە و کۆڵانـەکـانی کـاس کردبوو، تـەنـانـەت لـە شـــوێنی دووریش دەبیســـترا. خەلیفە فەرمانی دا هەموو منداڵە هەتیوەکان بۆ خەتەنەکردن لە کۆشـک کۆ بکەنەوە، هەر منداڵە و گرامێک زێڕ و دەســـتەجلێک و کولێرەیەک و هـەنارێک و دوو دەرهـەمیـان پێ بدەن. بـازرگـانـەکـان بـە بۆنـەی ســـەرکـەوتنی ســـوپـا، لـە بـازاڕەکـان خوانیـان بۆ هـەژار و بێنەواکان ڕازاندەوە. هەر بەم بۆنەیەوە قوماشـفرۆشـەکانیش سـەت ئاڵای موەحیدەکانیان بەخشـی، لە دەروازەی بازێڕ و ڕێڕەو و، تاقی مزگەوتەکاندا چەقێنران و شەکانەوە.

لە کۆشـکیش ئاهەنگێکی گەورە سـازکرا، خەلیفە لەسـەر سکۆیەک وا دانیشت، کە بەسـەر گۆڕەپانی شـار و خەڵکەکەوە دەیڕوانی. شـاعیران یەکبەدوای یەک دەهاتن، بە قەسیدە چڕ و پڕەکانیان ئەو سەرکەوتنە

مـەزنـەیـان دەلاوانـدەوە. دوای گـەیشـــتنـەوەی خـەلیفـە، هـەموو دوانیوەڕۆیـەک مـەجلیســـی خـەلیفە جمـەی دەهـات. ئەمنیش بەر لە بـانگی نیوەڕۆ، دەرس و دەوری فەقێیانم تەواو دەکرد، نوێژم دەکرد و دەچوومە مەجلیسی خەلیفە. مەجلیسی خەلیفە لە مەراکیش جیاواز لەوەی ئیشـــبیلیا بوو، وەزیرەکان لە مەراکیش بەر لەوەی خەڵکەکە بچنە ژوورەوە، جێگەیان دەستنیشان کردبوون، هەر کەسێک دەهات پیرۆزبایی لە خەلیفە دەکرد، ئەوان ئاماژەیان بۆ شـــوێنەکەی دەکرد و لـە جێگەی خۆیان دایاندەنیشـــاند... بەڵام لە ئیشـــبیلیا وا نەبوو، مەجلیسەکە بچووک و بەرتەنگتر بوو، وەزیرەکانیش هێندە گرنگییان بە ڕێســـای دانیشـــتن نەدەدا... بۆیە لە مەراکیش نەمتوانی لە نزیک خەلیفە دانیشم، لێ هێندە هەبوو هەر جارێک سڵاوم لێ دەکرد، ناوی دەهێنـام و بزەیـەکی بـە ڕوودا دەکردم، بـە پێچـەوانـەی زۆرینـەی خەڵکانی دیکە، کە نە قسەی دەگەڵ دەکردن و نەناویشی دەزانین.

ئـاهـەنگ و بـەزموڕەزمی ســـەرکـەوتن کۆتـایی هـات، تـەنیـا خەلیفە مەجلیسی دادەنا و منیش دەگەڵ دەیان کەسایەتی وەک سوپاسالار و ســەرۆکخێڵ و وتاربێژی مزگەوت و قازییەکانی شــار و میرەیلی موەحیدەکان، لەوێ ئامادە دەبووم. خەلیفە کاروباری خەلافەتی باس دەکرد، گوێی بۆ بۆچوون و قســـەکانیان ڕادەگرت. خەلیفە لە بەنی غانیـە زۆر پـەســـت بووبوو، ئەوان ســـەرقاڵبوونی ســـوپایان لە ئەندەلوس بە دەرفەت زانی بوو، فتیلەی شـــەڕ و شـــۆڕشـــیان لە توونس هەڵگیرســـاندبووەوە، چەندان شــار و قەڵایان داگیرکردبوو. خەلیفە بەتووڕەییەوە دەیگوت:

- شـەڕمان لەگەڵ کردن تەمێ نەبوون، بانگهێشتمان کردن، وەڵامیان نەبوو. ئەبووحەفس وەزیری خەلیفە هەڵی داێ و گوتی:

- بەڵام خەلیفە شـانوشـەوکەتی شکاندن، ڕیسی لێ کردنەوە خوری. هـەموویـانی تـەفروتوونـا کرد، ئـەوانـەی مـاون کۆمـەڵێک گـەجـەر و

گوجەرن، خەلیفەیان لەلا بێزاندوون. هەروەها هەندێک مورتەزەقەی بێ بەندوبارن، شمشێرەکانیان لەبەرانبەر پارەدا هەڕاج کردووە.
خەلیفە بەتووڕییەوە وەڵامی ئەبووحەفسی دایەوە:
- ئەبووحەفس ئەوەم پێشـــتریش بیســـت. هەمووتان گوتتان ئەوان کـەمینـەن و هێز و پێزیـان نییـە، کـەچی وەختێـک ڕووبـەڕوویـان بووینـەوە، ژمـارەیـان لەســـەروو بیرکردنەوە و چاوەڕوانیی ئێمەدا بوو.
- خودا خەلیفە ســـەربخات. ســـوپای ئێمە حازر و پڕ چەک و تفاقە، ئەگەر حەز دەکەیت پەلاماریان دەدەین و ڕیشەکێشیان دەکەین.
خەلیفە تاوێک بێدەنگ بوو، دەستی بە ڕیشی داهێنا و بیری کردەوە. بەر لەوەی وەڵام بداتەوە، پیاوێکی دیکە ئیزنی قسـەکردنی خواسـت، لە سەر و شکڵدا لە فەرماندەیەکی سوپا دەچوو:
- جوڵاندنی ســـوپا لـە جـەنگێکـەوە بۆ جـەنگێکی دیکـە بـە کـارێکی عەقڵانە نازانم. سەربازەکان ماندوون، بیمارستان پڕبوون لە بریندار و نەخۆش، لە ئێستەدا ئەو کارە هۆشمەندانە نییە.
خـەلیفـە دەمێکی خۆش لـە دەموچـاوی پیـاوەکـە ڕامـا، وەک ئـەوەی قســـەکانی ئـەو پیـاوە ڕێڕەوی بیکردنـەوەی گۆڕی بێت، بەڵام هەر بەبێدەنگیی مایەوە و ورتەیەکی نەکرد. ئەبووحەفس ڕووی قســـەی لەو پیاوە کرد و گوتی:
- بەڵێ ڕاســت دەکەن. بەڵام بۆ جەنگی ئەوان پێویســتمان بە هەموو سوپا نییە، ژمارەی ئەوان زۆر کەمترە لە هیی قشتالییەکان.
کـابرا بێدەنـگ بوو و وەڵامی نـەدایەوە، وەک ئەوەی نەیەوێت لەگەڵ خەلیفە و دەستەڕاستەکەی بکەوێتە دەمەقرێ.
پیـاوێکی دیکـەی ڕیشـــــدرێژ، لـەنزیـک منـەوە هـەســـتـا و بـە دارعەسایەکەوە، لە مەقامی خەلیفە نزیک بووەوە و وەستا و گوتی:
- خودا خەلیفە شـکۆمەند بکات. خەڵک لەژێر ئاڵای ئەو کۆبوونەتەوە و لە سایەی دەوڵەتی ئەودا یەکیان گرتووە... لێ هێشتایش کەسانێک

هەن دەیانەوێت ڕیسمان لێ بکەنەوە خوری و لە یەکترمان بترازێنن. ئەگەر خەلیفە ڕێگە بدات، بەئیزنی ئەو باســـی دانەیەکیان دەکەم، ناشمەوێت زمان لە هیچ کەس بدەم.
خەلیفە بە قسەی ئەو پیاوە ئارامی لێ هەڵگیرا و ئەبرۆکانی پێکدادان و ڕوخســـاری وشـــک بوو، هێمایەکی بۆ کرد، پیرەمێردەکەیش کەوتەوە قسەکردن:
- قوربان! شوعەیبی کوڕی حەسەن، لە هەموو وڵاتێک شوێنکەوتەی هەن، لە هەموو مزگەوتێک موریدی هەن. ئەوەی ئەو دەڵێت کەم و زۆر دانوی لەگەڵ مەزهەبی زاهیریی، کە ئێمە لەســـەری دەڕۆین ناکوڵێـــت. هەروەها ڕێبازێکی دوور لە ڕێبازی ئێمە پەیڕەو دەکات. دڵم کەوتە لەرەلەر، ئەیڕۆ ئەوە لە مەجلیســـی خەلیفە گوێم لە ناوی غەوس ئەبوومودین دەبێت زمانی لێ دەدرێت. گوێی خۆم قوڵاخ کرد بۆ ئەوەی بزانم وەڵامی خەلیفە چییە؟ بەڵام خەلیفە بەدەســـت هێمایەکی کرد، وەک ئەوەی بە قســـەکانی ئەو پیرەمێردە زمانلێدەرە ڕازی نەبووبێت. بەرلەوەی خەلیفە سەرنجی خۆی لەسەر ئەو پیاوە لابدات، دیسان دەستی بە قسەکردن کردەوە:
- لەنێو خەڵکی بیجایە وا بڵاوبووەتەوە کە ئەو، خۆی بە محەمەدی مەهدی چوواندووە.
خەلیفە ڕووی تێ کرد و گوتی:
- ئەو خۆی گوتوویەتی من محەمەدی مەهدیم؟
- نا، بەڵام دوور نییە وا بڵێت.
- چۆن دەزانی وا دەڵێت؟ هەواڵی غەیبت پێیە؟
- مەولای! هیچ دووکەڵێک بێ ئاگر نییە.
- ئەگەر ئاگرت بە چاوی خۆت بینی، ئێمەیش ئاگادار بکەوە، ئەگەرنا زمانلێدان قبووڵ ناکەین... تکایە لە خودا بترسە!

# ٣٤

"ئازاد کەسێکە مشووری کاروبار بخوات، نەك بەپێچەوانەوە"
ئیبن عەرەبی

هەفتەیەک تێپەڕی، وەک نەریتی هەمیشەم دوای نوێژی نیوەڕۆ چوومە مەجلیسی خەلیفە، سڵاوم لێ کرد و لە سووچێک جێگەی خۆم کردەوە. سەرنجی شاندێکی سەنهاجەم دا، کە تازە بۆ پیرۆزبایی خەلیفە هاتبوون، درەنگ هاتنیان بە نەخۆشبوونی دەمڕاستەکەیان، پاساو دەدا...خەلیفە بەخێرهاتنێکی زۆر گەرمی کردن، پاشان یەکەو دەستەجلی دایە هەموویان.
دواتر باژێڕوانەکانی مەراکیش هاتن، پرسیاری باژێڕ و نرخی شتومەکی لێ کردن، داوای کرد بە فرۆشتنی دەغڵی نێو ئەمبارەکان نرخی جۆ دابەزێنن. دواتر سەفیرەکانی وڵاتی سودان هاتن، لەدەستی بازرگانەکانی مەراکیش دادەدادیان بوو. هێلکەی وشترمرخیان کڕیون و لە ڕێگە شکاون، بەهاکەیان نەداوەتەوە. خەلیفە دۆسیەی ئەوانی ڕەوانەی لای قازی کرد. پاشان پێشوازیی لە دەستەیەک فەرماندەی سەربازیی کرد. لەبارەی سەربازەکان پرسیاری لێ کردن، گوتیان:
- فەرماندەکانی سوپا شەکوای حاڵی خۆیان لای خەلیفە دەکەن.

خەلیفە خۆی ڕێک و راســـت کرد و بەبابەخەوە ڕووی تێ کردن و گوتی:
- شەکوای چیان هەیە؟
- دەڵێن ســـاڵێ تـەنیـا چوار جـار مووچـەمـان پێ دەدرێت، کـەچی ئەغزازەکان هەموو مانگێک مووچەی خۆیان وەردەگرن.
خەلیفە ئـامـاژەیەکی بۆ وەزیرەکەی کرد، ئەویش لێی نزیک بووەوە، بە سرتەوە پێی گوت:
- خودا لێت خوش بێت... ئەوانـە غەوارە  و بێنەوان، لەو وڵاتە جگە لەو مووچەیە هیچی دیکەیان نییە. بڕۆ ئەوە بە ســـەربازەکان بڵێ ... بڵێ سەربازەکان چاوی ئێمەن و لەبیریان ناکەین.
فـەرمـاندەکان چوونە دەرەوە و مەجلیس چۆل بوو. منیش ویســـتم بچمـە دەرەوە، دەرگـەوان بـانگی کردم منیش بـەرەو لای چووم... خەلیفەیش لێم نزیک بووەوە بە چرپەوە گوتی:
- ئەرێ شوعەیبی کوڕی حەسەن دەناسیت؟
- مەبەستت غەوسی ئەبوومودینە، جا کێ هەیە نەیناسێت؟
خەلیفە گەڕایەوە سـەر کورسییەکەی و پشتی دایەوە، ئاماژەیەکیشی بۆمن  کرد، کە لەتەکی دانیشم... یەکێک لە تەنیشتی هەستا و جێگەی بۆمن چۆل کرد، دانیشتم دیسان دڵم بەتووندی لێی دەداوە... زاکیرەم منی گێڕایـەوە  بۆ ئەو کاتەی زمانم لە ئیبن ڕوشـــددا و تووشـــی دەردەســـەریم کرد. ئەگەر خەلیفە لەبارەی غەوسـیش پرسـوڕام پێ بکات، ئەوە دەربازبوون و لەناوچوونی دەکەوێتە دەستی من، بۆنا؟
خـەلیفە هێندێک کاری خەڵکی ڕاهی کرد و دواتر داوای لە دەرگەوان کرد، چیتر خەڵک نەنێرێتە ژوورەوە.  پاشان لە مەجلیسەکەی هەستا و گوتی:
- وەرە لەگەڵم...
- لەگەڵی چوومە کۆشک، دەرگەوانیشمان بەدواوە بوو. لە جێگەیەکی بەرتەسک، کە هەر تەنیا جێی شەش کەس دەبووەوە، دانیشتین... بە

دەرگەوانەکەی گوت برۆ ئەبووحەفس و جنفیسی و ئیبن بەقی بانگی ئێرە بکە. تا ئەوان نەگەیشتن، خەلیفە دەمی نەکردەوە. ئیبن بەقی ئەو کەســـە بوو، کە خەلیفە بە قاســـید بەدوای منی ناردبووە ئیشـــبیلیا، چەند هەفتەیەکی کەمیش دەبێت وەک قازی دامەزراوە. جنفیسیش لە بیجایە و دەوروبەری والی خـەلیفە بوو. بـەخێرهـاتنم کردن، هـەر چوارمان چاوڕێی دەمی خەلیفەمان دەکرد، دواتر ڕووی لە جنفیسـی کرد و گوتی:

- ئەوەی ئەمڕۆ بەیانی گوتت، بۆم باس بکەوە.

جنفیســـی ئحمێکی کرد و چاوەکانی بە ڕاســـت و چەپدا بردن و بە شەرمەزارییەوە گوتی:

- میری ئیمانداران –خودا دەوامی عومری بدات– لەبارەی شوعەیبی کوڕی حەسـەن پرسـیاری لێ کردم. ئەمنیش ئەوەی زانیم پێم گوت. مزگەوتێکی هەیە، پێشـــنوێژی بۆ خەڵکێکی زۆر دەکات، دەم لە زۆر زانست دەگێڕێت...

خەلیفە هەر بەپەلە قسەکانی جنفیسی بڕین و گوتی:

- بە چ مەزهەبێک...

- چەندان مەزهەب... لەوانە حەنەفی و مالیکی.

خەلیفە لای بۆ ئەبووحەفس کردەوە و پێی گوت:

- ئێمە لەبارەی مەزهەبی مالیکی چ بڕیارێکمان دەرکرد؟ دەزانی؟

ئەبووحەفس بێ منجەمنج وەڵامی دایەوە:

- فـەرمـانـەکانی میری باوەڕداران لەســـــەر ســـــەرمانن. بە هەموو والییەکانت ڕاگەیـاند، کـە مـەزهـەبی مـالیکی لـە هـەموو مـەجلیس و مزگەوتێکدا قەدەغەیە. هەرکەسـێک سـەرپێچی بکات، خۆی شـایانی سزا دەکات.

خەلیفە بەرەو لای جنیفسی ئاوڕی دایەوە:

- نووسراوی ئێمەت پێ گەیشت؟

- بەڵێ قوربان! ڕاستەوخۆ جێبەجێم کرد.

- ئەی شوعیب؟
- نووسەرەکانی مە پێیان ڕاگەیاندووە.
- ئەی مادەم سەرپێچی کرد، بۆ سزات نەدا؟
جنفیســـی تاوێک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی بیر و خـەیاڵی خۆی کۆبکاتەوە، تێکشیێوان و سڵەمینەوە بەسەر ڕوخسارییەوە دیار بوو، پاشان گوتی:
- قوربان! میری باوەڕداران، شوعەیب لە بیجایە و تلمسان و قەفسە، بێشۆ مورید و شوێنکەوتەی هەن. بەشێک لە فەقێکانی لە میسر و سودان و شـام و ئەندەلوس ئیقتیدای پێوە دەکەن. پێشـتر جیهادی خاچپەرســتانی کردووە و دەســتێکی پەڕێنراوە، بەم هۆیەشــەوە خۆشـەویستییەکی زۆری لەنێو خەڵک پەیدا کردووە. دەترسـم هەر قسەیەکی بەم ئاڕاستەیە دەگەڵدا بکەم، ببێتە پشێوی و ئاڵۆزی...
خەلیفە بە جۆرێک لە جۆشـان و هەڵچوونەوە، قسـەکانی پێ بڕین و گوتی:
- ئەی بۆچی پێت نەگوتم؟ مادەم لە پشـێوی و ئاڵۆزی دەترســای، دەبوو خەبەرت دابامەوە، ئەوسا قسەیەکی دیکەمان لەبارەوە دەکرد. نەک هەر وا بەردەوام بە ســەر و گوێلاکی خەڵکەوە، ســەرپێچیی فەرمانەکانی ئێمە بکات. جنفیســی بە توندی ســەری خۆی بادا و خـامۆش بوو. خـەلیفـە بـە دەنگێکی بـەرز دەیبۆڵاند و ســەرکۆنەی دەکرد. پێنـەدەچوو ئـەبووحـەفس لـە چـاوســـوورکردنـەوەی خەلیفە ترسا بێت، یان ناڕەحەت بووبێت.
خەلیفە لە هاتوهاوارەکەی بەردەوام بوو:
- دوای ئەوەی ناوبانگی دەرکرد و مورید و موخلیســی زۆر بوون، تازەبەتازە شکایەتی لێ دەکەیت؟ تەنانەت ئەو هەواڵەیشم لە کەسانی دی بیست، تێگەیشتی والیی بەدبەخت؟
لـەو کـاتـەدا دڵم وەک مـامزی ڕاکردووی لێهات. ئـەمن چـاوەڕوانی ئەوەبووم خەلیفە لەبارەی غەوس پرســیارم لێ بکات و منیش پێیدا

هەڵبڵێم و چاکەکانی بخەمە ڕوو... بەڵام تازە وا دیارە خەلیفە بەو پێداهەڵدانەی من، تووڕە دەبێت و هەڵدەچێت. ئەگەر لە زمانی من ئەوە ببیستێت، دەکەوێتە گومان و دەڵێت دیارە لە کۆشک و مەجلیسی منیشدا مورید و شوێنکەوتەی غەوس هەبوون. هێشتا لەنێو ئەو خەیاڵاتانە تەواو نەبووبووم، خەلیفە ڕووی لەمن کرد و بە دەنگێکی ناخۆش گوتی:

- فەرموو تۆیش باسی ئەو پیاوە بکە، کە هەموو بەردەستەکانی من دەیناسن، تەنێ من نەبێت.

- منیش هەر بەقەد والی دەیناسم... بەڵام ئەی میری ئیمانداران، دەمەوێت بڵێم ئەبوومودین و بەشێک لە شێخەکان کاتێک قسەیەک لەو مەزهەب وەردەگرن و قسەیەکی دیکە لە مەزهەبێکی دیکە دەهێنن، بۆ بەراوردکاری و بەڵگەهێنانەوە و لێک نزیخستنەوەیە... خۆ ئەگەر کەسێک قسەیەکی ئیمامی مالیکی یان ئەبووحەنیفەی لێ بیستبێت، مانای وا نییە ئەو بۆ ئەو دوو مەزهەبە لێبڕاوە و لە مەزهەبی زاهیری لای داوە. ئەگەر خۆت گوێی لێ بگرێت، ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە.

خەلیفە تاوێک هێمن بووەوە، وەک بڵێی قووڵ بە قسەکانی مندا چووبێت. پشتی بە کورسییەکەی دا و لە ڕوخساری من ڕاما، وەک ئەوەی ئەمن هێشتا لە قسەکردن تەواو نەبووبم. لەو کاتەیش ئەبووحەفس هەلی قۆستەوە و گوتی:

- ئەبووزەینەب ڕاست دەکات. ئەگەر خۆت گوێت لێ بێت، دڵنیا دەبیەوە. پێت چۆنە ئەگەر بانگهێشتی مەراکێشی بکەین، خۆت گوێی لێ بگریت؟

خەلیفە قسەکانی ئەبووحەفسی پێ باشبوون، بەدەم بیرکردنەوە بە دەنگێکی نزم گوتی:

- ئەرێ، ئەرێ، ئەوە زۆر باشە.

جنفیسی ئحمێکی کرد و بە سیخەسیخەوە گوتی:

- ئەوەی میری ئیمانداران دەیڵێت تەواوە، بەڵام ئەو پیاوە پیر و کەنەفت بووە و توانای سەفەرکردنی نەماوە.
خەلیفە بە تیلەچاوێک تەماشـــای جنفیســـی کرد و بە گاڵتەجاڕییەوە پێی گوت:
- لێت نەگەڕاوە گوێم لە باســـی ئەو پیاوە بێت، ئێســـتایش ناتەوێت بیبینم!
- مەولانا، پەنا بە خوا من مەبەســتی ئەوەم نەبووە، تەنیا حەزم کرد حاڵی ئـەوت پێ بڵێم. لـە ڕابردوو و داهـاتوویش کـاروبـار هـەر لەدەستی تۆیە و بەس!
- کاروبار تەنێ هەر لە دەست خودایە. بانگهێشتی مەراکیشی بکەن...
خەلیفە هەســـتا، ڕۆیی و کەمێک دوور کەوتەوە، بەڵام دەنگی هەر دەهات:
- با دوا نەکەوێت.

# ٣٥

**"ئەوەی دڵم دەخاتە باری ئارامی، سەرچاوەی ترس و تۆقینە!"**
**ئیبن عەرەبی**

چەند شـــەوێکە خەو نەچووەتە چاوانم. مەریەم دەخەوێت و بێدار دەبێتـەوە، بـە پـەژارە و خـەمـەوە چـاودێریم دەکـات. بـە ئومێدی هێوربوونەوە، دەستم دەگرێت و توونـد بە خۆیەوە دەمگوشـێت. خۆ ئـەگـەر خـەلیفـە زیـان بـە غـەوس بگـەیـەنێت، من دەبمـە خراوترین موریدی ســـەر ئـەو زەمینە، ئیتر خودا لـە ویلایـەت و قـەتابـەت و نـەجابـەت بێبـەشـــم دەکـات. چۆن ڕەوەمـامز لـە چنگی دڕندەکـان ڕادەکەن، وەهایش مێخەکان لە من دوور دەکەونەوە. ها ئەوە بوومە دوژمنی ئەولیا باشـەکانی خوا، دەیانخەمە کونجی زیندان و لە وڵات دووریان دەخەمەوە.

دوور نییە دادگەریی خودا، تۆڵەی ئەو شـەڕانگێزیەم لێ نەکاتەوە، لە زیندانێکی تەســـکم باوێت، یان بۆ جێگەیەکی دوور تووڕم هەڵدات... خودایە! بـەس ئـازار بـە شـــێخ نـەگـات، هـەرچ ئـازارێک بەمن بگات بـەرگـەی دەگرم، هـەرچـەند دەزانم لێبووردەیی تۆ بۆمن و ئەو، زۆر بەرفراوانە.

هـەفتـەیـەک، دوان، مـانگێـک، تێپـەڕی هیچ هـەواڵێکی غـەوس نـەبوو. منیش لە کەس پرسیارم نەکرد، گوێم لە کەسیش نەبوو باسی بکات،

خودایش ئەمەی بۆ کەشــف نەکردم... بەڵام ئاخۆ خودا چیم بۆ کەشف بکات؟ ئەمن تازە کەی شایانی کەشف و خەونم؟ کەشف شــایانی ئەو ئەولیا چاکانەیە کە چاکە لەگەڵ شــێخ و پیرەکانیان دەکەن و خودایش چاکەیان دەگەڵ دەکاتەوە. دادە فاتیمە ئامۆژگارییەکی کردم: "دڵت پاک بکەوە و شــوێنی بکەوە." تا نووکە نەپاقژم کردووەتەوە و نە شــوێنی کەوتووم! ئای لە خۆم! ئێســتە زمان لە ئەولیاکانیش دەدەم و هاونیشینی خەلیفەکانیش دەکەم. وەک خەڵکی ڕەشۆک و عەوام یەک بە سکی خۆم دەخۆم و دەخۆمەوە... یا هەق! ئەوە چ پاککردنەوەیەکە!

ڕاســتییەکەی ئەمن چ چیتر بەرگەی ئەو بارە نالەبارە ناگرم. غەوس هێشــتا نەگەیشــتووە، هەبێ و نەبێت بانگهێشــتی خەلیفەی ڕەتکردووەتەوە یان بۆ شوێنێکی دوور لە دەستەڵاتی موەحیدەکان هەڵاتووە. داوام لە خودا کرد ئەوەم بۆ کەشــف بکات، بەڵام نەیکرد. هەموو شەوان هەڵدەستامەوە و شەونوێژم دەکرد، خۆم لە مەریەم دابڕی، نیوەی مووچەی مانگانەی خۆم بەخشــی، زیارەتی ســێ نزرگەم کرد، ئایەتی (ما ودعک ربک وما قلی)م لە ڕکاتی هەموو نوێژە فەرز و سوننەتەکان دەخوێند، دوو شەوان لە گۆڕستانی شار خەوتم. مانگی دووەمیش ڕۆیی، خودا هیچ چشــتێکی بۆ کەشــف نەکردم. ویســتم منداڵەکانم هەراســان نەکەم، وەســەر بان کەوتم و دەستم بە گریە و زاری کرد.

ڕۆژی دووەم چوومە کۆشــک و لامدایە لای ئەبووحەفس، دەمێک بوو نەم بینی بوو. بەقووڵی لێم ڕاما، ســەرنجی خەرمانەی دەوروبەری پێڵوەکانم و خەموپەژارەی نێو چاوەکانمی دا. دەســتی گرتم و بە میهرەبانییەوە لێی پرسیم:

- ئەبووزەینەب تۆ نەخۆشیت؟

تەماشــای دەموچاوم کرد، میهرەبانییەکەی ئازاری دام، وەڵامم دایەوە:

- بەهۆی گوناهەکانم نەخۆش کەوتووم، لەبەر لووتبەرزی و غەفلەتزەدەیی خۆم لێ کەوتووم.
پێکەنی و دەستێکی لە پشتدام و گوتی:
- کەواتە ئەگەر تۆ بەهۆی گوناهەکانتەوە نەخۆش بیت، ئێمە دەبێ بمرین. ئەبووزەینەب وەرە لێرە دانیشە.
لەبەردەمی دانیشتم، بۆ دواجار چاوێکم بە دەروونی خۆمدا خشاندەوە، ئاخۆ ئێستە کاتی ئەوەیە لەبارەی غەوس پرسیاری لێ بکەم، یان نا؟ بڕیارم دا پرسیار بکەم، ئاخر ئەگەر دوو مانگ تێپەڕی بێت و غەوس نەگەیشتبێت، مانای وایە خەلیفە بڕیاری کۆتاییی خۆی داوە و جێبەجێشی کردووە، ئەوجا هەر چۆنێک و هەرچییەک بێت. تازە سۆراخی من لە غەوس، نە زیانی دەبێت و نە سوود.
- ئەرێ غەوس بۆ دواکەوت؟
وەزیر بێوەی بایەخ بە پرسیارەکەم بدات، بەدەم هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی پەڕاوەکانی، گوتی:
- مەگەر نەتزانیوە؟ نەخۆش کەوتووە!
هێوربوومەوە. وەڵامەکەی وەزیر بۆ من، دۆڵچە ئاوێکی ساردبوو بەسەر سینەی گڕگرتوومدا ڕژا، کە لە ماوەی دوو مانگی ڕابردوودا بەردەوام ئاگری گرتبوو. چۆن بیر لەوە نەکەمەوە؟ بەڵێ، تەنیا نەخۆشیی بەربەست بووە. ئەمن چەندان گومانم بە شێخی خۆم برد، وامزانی ڕای کردووە، یان یاخیی بووە، گومانە باشەکەم نەبرد، کە نەخۆشکەوتنیەتی ... ئای خودا! منیش چەند بەدبەخت و چارەڕەشم.
- بەڕاست، خەلیفە ئەمە دەزانێت؟
- بەدڵنیاییەوە. دوای قاسیدی یەکەم، دوو قاسیدی دیکەیشی ناردن. شێخ لە بیجایە بەرەو مەراکیش بە ڕێ دەکەوێت و لە تلمسان نەخۆش دەکەوێت.
- ئەی قاسیدی خەلیفە نەیگوت کەی وەڕێ دەکەونەوە؟

- شێخ هیچ قسەیەک ناکات، پێم وایە نەخۆشی سەرەمەرگیەتی.

دۆڵچە ئاوە ساردەکەی سەر سینەم، بوو بە هەڵم و دیسان ئاگری بە تین و بڵێسە گەڕایەوە و هەموو پەراسووەکانی هەڵلووشیم.

سەفەر، شێخی منی لە پەلوپۆ خستووە.

خوداحافیزیم لێ کرد و ڕۆیشتم. هیچ چتێکم نەکرد و گەڕامەوە ماڵ. مەریەم بەم زوو گەڕانەوەی من هەترەشی چوو، لە ڕوخسارم ڕاما، دەیویست هۆکارەکەی بزانێت. هەواڵەکەی غەوسم پێ گوت. دیتم عەداد ئالیک دەداتە ئەسپان. بڕیارم دا بەرلەوەی شێخ گیان بسپێرێت، بچمە تلسمان و دیدەنیی بکەم. داوام لە عەداد کرد ئەسپێکم بۆ ساز بکات، بە مەریەمیشم گوت تێشووی سەفەرم بۆ ئامادە بکات.

مەریەم گوتی:

- بە تەنیا دەڕۆیت؟ قافڵەیەک نییە لەگەڵیدا بڕۆیت؟

- ناتوانم چاوەڕوانی قافڵە بکەم، دەترسم غەوس گیان بدات و پێی ڕانەگەم.

- بەڵام سەفەرکردن بەتەنیا ترسناکە... تکایە! عەداد لەگەڵ خۆت بەرە.

- ئەسپی زیاد نییە، ئەگەر بە پێیانیش بڕۆیت دوات دەکەوم.

- با سواری هێستر بێت.

- هێستر بۆ ڕێگە سستە.

- مەریەم بەو نکوولیکارییەی من پەست بوو، ڕۆیشت تێشووی ڕێگەم بۆ ئامادە بکات. گوێم لێ بوو بە سرتەسرت هێندێک قسەی بۆ سەلووم کردن، ڕاستییەکەی من تێیان نەگەیشتم. سەلووم ڕۆیشت، دوای ماوەیەکی کورت، لە دەرگە درا، کردمەوە، بینم بەدری حەبەشییە، وەستاوە و جڵەوی ئەسپێکیشی بەدەستەوەیە.

هەرکە منی دیت گوتی:

- ئەمن لەگەڵ تۆ دێم قوربان، ها ئەوە ئەسپیشم پێیە.

ئاوڕێکم بۆ دواوە دایەوە، دیتم سەلووم وەستاوە، لە پشت ئەویش مەریەم دەیەوێت تەماشای من بکات.
تێگەیشتم ئەو، سەلوومی بە دوای بەدری حەبەشییدا ناردووە.
بەهەرحاڵ، مادەم بەدر ئەسپی پێیە، وەختی دەمەقاڵێ و بێنەوبەردە نییە.

****

سواری ئەسپەکانمان بووین و لەشار چووینە دەر، بەدر تاریفی ڕێگەکەی بۆ کردین، کە پێشتر چەند جارێک پێیدا ڕۆیشتبوو. بەدرێژایی ڕۆژان و دووبەشی شەوانیش بە ڕێگەوە بووین. دوای پێنج شەووڕۆژان گەیشتین. ئەو خانووەی شێخی لێ بوو، بە مزگەوتەوە لکابوو. یەک لە فەقێکانی بەسەروکاریەوە بوو. شێخ لەگۆ کەوتبوو. دەست و ڕیش و تەوێڵم ماچ کرد و لەپشت سەری دانیشتم. پرسیارم کرد کاتێک شێخ وای لێ هات کام لە فەقێکانی لا بوو؟ باسی لەخۆچوونی شێخیان لە ڕێگەی مەراکیش بۆ گێڕامەوە. ئەسرین لە چاوەکانم دابارین، ڕووحم بۆ شێخ تلیساوە... ئاخر بەو تەمەنە هیی ئەوەیە خەلیفە تاڵاوی ئەو ڕێگە دوور و درێژەی پێ بچێژێت. داوام لە خاوەن خانووەکە کرد، لای بمێنمەوە و خزمەتی بکەم، ئەویش ڕێگەی دا. بەدری حەبشیم ناردە بازاڕ، خواردنێکی زۆری هێنا، وا دیاربوو ئەو ماڵە هەژاربوون، نەمویست ئەرکباریان بکەم. فەرشێکم لەخوار پێیەکانی شێخ ڕاخست، کە خەوم دەهات لەسەری دەخەوتم، پێیەکانی شێخ تا تەوێڵم دەهاتن. کە وەئاگا دەهاتمەوە دەچوومە کن سەری و چەندان جار سوورەتی یاسینم لەسەر دەخوێند.
چەند ڕۆژێکی پێچوو، حاڵی شێخ هەروەک خۆی وابوو. خاوەنماڵ کفن و کافوور و میسکی بۆ شێخ حازر کرد و لە سووچێکی ژوورەکەی دانا. منیش پێم گوت:

- برا ئەوە چی دەکەیت؟ تۆ دڵنیای لەوەی کە دەمرێت تا کفنی بۆ بدروویت و ئامادەی بکەیت؟
بە چاوی پڕ گریانی وەڵامی دامەوە:
- من نەمهێناوە، لە بیجایە شێخ لەگەڵ خۆی هێناویەتی.
قورگم تاڵ بوو، زمانم لاڵ بوو. پرسیم:
- دەبێ ئەو خۆی هەستی بە نزیکبوونەی ئەجەلەکەی کردبێت؟
- نەک هەر هەستی پێ کردووە، بەڵکە دڵنیابووە. کاتێک قاسیدی خەلیفە گەیشتە بیجایە و داوای کرد غەوس بڕواتە دیدەنیی خەلیفە، خەڵکەکە هەموو دڵیان بە خەلیفە سووتا و پێیان ناخۆش بوو ئەو ڕێگە دوور و درێژە ببڕێت... تکایان لێ کرد نامەیەک بۆ خەلیفە بنووسێت و داوای لێبووردنی لێ بکات و حاڵی نەخۆشکەوتنی خۆی بۆ بەیان بکات، بەڵام شێخ بەقسەی ئەوان پێدەکەنێ و دەڵێت:"مردنی من لە جێگەیەکی دیکە قەڵەمی لێ دراوە، دەبێ بەرەو شوێنی مەرگم بڕۆم."پیاوەکە گریا و چاوەکانی منیشی پڕ ئەسرین کرد. لە قسەکانی بەردەوام بوو و گوتی:
- بەدرێژایی ڕێگە دەیگوت:"سوپاس بۆتۆ خوایە کەسێکت بۆ سازکردم بمباتە جێی مردنم." هەر ئەوەی پاتە دەکردەوە تاکوو بوورایەوە.
پاش ئەوەی ئەو قسەیەم لە کابرا بیست، لە چاکبوونەوەی شێخ تەواو ناهومێد بووم... ئیتر چاوەڕێی ئەوەبووم خودا کەرامەتی وەلییەکەی تەواو بکات و گیانی بکێشێت. دوای چەند سەعاتێک وەفاتی فەرموو، هەواڵی مەرگی ئەو لە هەموو تلمسان دەنگی دایەوە. وەختێک ویستمان بینێژین، گەورە و بچووک لە ماڵ هاتنە دەر، خەڵکەکە هێندە زۆربوون، لە گۆڕستان جێگەیان نەدەبووەوە. تا خۆرئاوابوون خەڵک دەستە دەستە دەهاتن و نوێژیان لەسەر دەکرد... بەردەوام دەگریان و شین و واوەیلایان دەکرد.

خەمبار و لێوبەبار لەگەڵ بەدر گەڕامەوە مەڕاکیش. بەرانبەر خەلیفە ڕقەستوورتر بووم، چۆن ڕقەستوور نەبم؟ ئەو، ئازاری ئەولیاکانی خوا و زانایان دەدات... ها ئەوەتە ئیبن ڕوشد لە مەنفایە و ئەبوومودینیش لەنێو گۆڕدایە.وابزانم دوای ئەوانیش ئەوجارە نۆرەی منە. فوقەها دووزمانەکانیش بوونەتە هاودەم و هاونشینی خەلیفە، سینەیان پڕ لە کینە کردووە، بە هەوای سەرکەوتنیش مەست و سەرخۆش بووە، مادەم ئەوانە شایەت و بەڵگەی ئەون، گرنگ نییە هەواڵەکە لە چ سەرچاوەیەکەوە دێت.

## ٣٦

**"دڵپەشێوان لەخۆڕا پەریشان نابن"**
**ئیبن عەرەبی**

هەواڵی مەرگی شێخ ئەبوومودین بۆ خەلیفە زۆر تاڵ و ناخۆش بوو. سەرکۆنەی ئەبووحەفسی کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم: "ئەی جنفیسی پێی نەگوتی ئەو نەخۆشە؟ ئەی ئەو سەرکۆنەکردنەی ئەبووحەفسی لەپای چی بوو؟" چەند ڕۆژێک بەسەر مەرگی شێخدا تێپەڕی، خەلیفە پێی وابوو خەڵک ئەو باسەیان لەبیرچووەتەوە. ڕۆژێک خەڵکی بیجایە هاتن. کاتێک خەلیفە فەرمانی هاتنی شێخ دەدا، ئەوان بەو خەبەرە زۆر دڵگران دەبن، وەختێکیش لە تلمسان بای مەرگ هەڵی دەپێچێ و کفن و دەفن دەکرێت، هێندەی دیکە پەست و نیگەران دەبن. بەڵێ ئەوان هاتنە مەراکیش و داوای دیداری خەلیفەیان کرد. ئەبووحەفس پێی وابوو ئەوان بۆ پرسە هاتوون، فەرمووی ژوورەوەی لێ کردن، کە هاتنە ژوورەوە بەبێ سەلام و کەلام دادەنیشن و یەکبەیەک قسەی پێ دەڵێن:

- خەلیفە گوێ بگرە، تۆ وەلییەکی خودات ئازار داوە، لەماڵەوە دەرتپەڕاندووە و مشەقەتی سەفەرێکی تاقەتپڕووکێنت داوەتەبەر. لە کۆشک و مەجلیسەکەتدا بە کەیفی خۆت ڕابوێرە، ڕۆژێک دێت

بگەڕێیتەوە لای خودا و هەق و حیســابت لەگەڵدا بکرێت، تۆ دژایەتی و بەربەرەکانێی قوتبی زەمان و، ســـوڵتانی واریســـــان و، ئیمامی ڕاستگۆیانت کردووە.
دواتر یەکێکی دیکە هەستا و گوتی:
- خوا ئاگادارە! هێندەی خەلیفە لە کۆشـکدا ماوەتەوە، غەوسـیش بە قەد ئەوندە لە مزگەوت خەڵوەتی کردووە. کاتێکیش بۆ لای خوا گەڕایەوە، تەنانەت قووتی دوو ڕۆژیشی لە ماڵەوە نەبوو. تۆیش بەو غەدر و ســتەمەی، کە لە شـــێخت کرد دەگەڕێیتەوە دیوانی هەق تەعالا.
خەڵکەکە هەموو ئەو تەرزە قســـانەیان کردن و خەلیفەش بێدەنگ و خامۆش بوو، دەیویســـت بەنمایشـــی دەربڕینی خەم و پەژارە بۆ مەرگی شـــێخ، تووڕەیی و هەڵچوونی وان دامرکێنێتەوە. ئەوان لە گلەیی و ســـــەرکۆنەکاریی هەر بەردەوام بوون، وا دیاربوو تووڕەییەکەیان زۆر و خەمناکییەکەیان قووڵ بوو. ها ئەوەتە منیش لە سووچێکی مەجلیسەکە دانیشتووم و گوێ لە قسە و گازاندەکانیان دەگرم، بریا توانیبام لەوانیش زیاتر قسە بە خەلیفە بڵێم. شاکەشاک و دەنگەدەنگ هەر بەردەوام بوو، تەنانەت یەکێکیان لە کورســـیی خەلیفە نزیک بووەوە و پەنجەی شـــایەتمانی لێ ڕاســـت کردەوە، خەریک بوو بگاتە چمکی کراسەکەی و پێی گوتی:
- ئەرێ ئەوە خودا بەزەیی لە دڵتدا چۆڕاندووەتەوە؟ داوای شـێخکی هەشـتاسـاڵی دەکەیت بەسـەر هێسـترێکەوە بێتە لات، خۆشـت لە مەراکیش لەسەر فینتاس لێی دانیشتوویت؟
یەکێکی دیکە دەم بە هاوارەوە گوتی:
- ئەی ستەمکار! ئێمە هەموو مورید و فەقێ و مەنسووبی ئەوین، بە لە دەستچوونی مامۆستا و شێخ و پێشەوامان، ئازارێکی زۆرمان

چەشت، سوێند بە خودا سکالاَمان بۆ لای ئەو زاتە بەرز دەکەینەوە، کە مافی هیچ کەسێک لای وی ون نابێت.

ئەوەندە لۆمە و ســــەرکۆنەیان کرد تا لە تامێیان بردە دەر، خەلیفە چیتر خۆی بۆ نەگیرا و لەگەڵی کردنە قرەقڕ. تکــای کرد ئەدەب بنوێنن و ڕێزی خۆیان بگرن، لێ ئـەوان گوێیـان پێ نـەدا. بـە نـاوی خۆی بــانگیــان دەکرد و نزای تــەفروتوونــای ســــەڵتــەنــەت و بەهیلاکچوونی ئەویان دەکرد. خەلیفە داوای لە پاســـەوانەکانی کرد ئـەوانـەی دەنگی خۆیـان بـەرزکردەوە و ئـاگری توورەییـان نێڵ دا، حەپســـیان بکەن. پاســـەوانەکان لە دەوریان خڕبوونەوە و بیســـت کەســـیان لەنێو مەجەلیســـەکە پەلکێشــی دەرەوە کرد. بەدەم ڕێگەوە هــاواریــان دەکرد، یـەکێکیـان دوعـای لـە خـەلیفـە دەکرد و ئـەوانی دیکـەیش بـە دەنگێکی بـەرز ئـامینیـان دەگوتـەوە. هێشـــتـا بەتەواوی نەخرابوونە زیندان، خەلیفە قاسیدێکی نارد ڕاستەوخۆ ئازاد بکرێن.

دوای ئـەو ڕووداوە، خـەلیفـە چـەند ڕۆژێـک نـەهـاتەوە مەجلیس، پێی نـاخۆش بوو لـە مـاڵـەوە دەربچێت. تـەمـاشـــای هیچ ســـکـالاَ و داواکارییەکی نەدەکرد، ڕاستەوخۆ ڕەوانەی کۆشکی دادی دەکردن. کوڕەکانی ئەبوویەحیای برای بانگ کردن، بەخشش و خانووی دانێ. خەلیفە پێشـــتر خۆی ســـەری یەحیای برای پەڕاند. هەروەها داوای کرد گەنم لە کۆگاکان بێننە دەرەوە و نرخی نان دابەزێنن، ئەگەرچی نرخی نانیش زۆر نەبوو. هەموو ئەو زیندانیانەی ئازاد کرد، کە لەبەر هـەقێکی خودایی زینـدانی نـەکرابوون. چیتر پێشـــنوێژی بۆ خـەڵک نەکرد، داوای کرد کەسێک لە عەوامی خەڵکەکە، ئیمامەتیان بۆ بکات.

لە ماوەی ئەو ڕووداوە، تەنیا دووجار بەڕێکەوت خەلیفەم بینی، هەر تیلەچاوێکی لێ دەکردم و دەڕۆیشـــت، لەنێو چاوەکانی پەژیوانی و خـەمێکی زۆرم بـەدی دەکرد. ســـەر لـە بـەیـانیـەک بـە هـەواڵی لێخۆشـبوونی خەلیفە لە ئیبن ڕوشـد، دڵخۆش و شـاگەشـکە بووین.

دەستەیەک پاسەوانی خۆی ناردنە ئەلیسانە، داوای لێ کردن بە جوانی ڕەفتار لەگەڵ ئیبن روشد بکەن و بەڕێز و شکۆوە بیهێننەوە مەراکیش. بەم هەواڵە یەکجار دڵخۆش و شادبووم، هەستم کرد خەمێکی دیکە لە قەفەسی سینەمدا دێتە دەرەوە. خەلیفە دەیویست گوناهی گیانلەدەستدانی غەوس، بە لێخۆشبوونی ئیبن ڕوشد داپۆشێت. بێگومان ئەو وا بیر دەکاتەوە، بەڵام با باش بزانێت ئەگەر حەفتاجار لە ئیبن ڕوشد خۆش بێت، هەر نابێتە کەفارەتی گوناهەکەی، وەلێ خودا چیی بوێت هەر ئەوە دەکات.

دوای دوو هەفتە لە عەفوی خەلیفە، ئیبن ڕوشد گەیشتە مەراکیش. بەجۆرێک پیر بووبوو، هەر دەتگوت لە بری سێ ساڵ، سی ساڵ لە ئەلیسانە ماوەتەوە. ڕیشی سپی و تەوێڵی چرچولۆچ بووبوو، پێڵوەکانی خاو و پشتی کووڕ بووبووەوە. گاهێک بەرەو مەجلیسی خەلیفە چوو، لە دوورەوە بەم شێوەیە بینیم. بەهۆی هەستێکی کەفوکوڵ گرتووم، بەخێرهاتنەوەم نەکرد، ئاخر ترسی ئەوەم هەبوو تیلەچاوێکی وی، بۆ دۆخی پەشیمانی و حەسرەت بمگێڕێتەوە، کە بەرەبەرە لێم دەکەلی دەهات، ڕاستییەکەی حەزم نەکرد وەکوو جارانم لێ بێتەوە. لەگەڵ خەڵکی مەجلیسەکە بەپێوە وەستابووین و چاودێریی دۆخەکەمان دەکرد، ئیبن ڕوشدیش وردەوردە دەهات و خەلیفەیش لە پێشوازی و بەخێرهاتنەوەی لەسەرپێ وەستابوو. وا دیاربوو خەلیفە پێی ناخۆش بوو بەم شێوە دەیبینێتەوە، ئاخر لای وانەبوو بەم جۆرە پەریشان بووبێت. هەردووکیان لەناوەڕاستی مەجلیس وەستان، خەلیفە دەیویست تەماشای دەموچاوی ئیبن ڕوشد بکات، بەڵام ئەو سەری بەخۆیدا بەردابووەوە و سەیری پێشەخۆی دەکرد. خەلیفە پرسیاری تەندروستیی لە کرد، ئیبن ڕوشد سەری خۆی بادا و چەند جارێک ئەوەی گوتووە:

- "الحمدلله على كل حال. الحمدلله على كل حال."

خەلیفە لەتەنیشت خۆی داینیشاند و پێی گوت:
- ئـەبوو وەلیـد، ئـەوە ئێمـە لێـت خۆشـــبووین و گـەڕایـەوە مەجلیسەکەمان. خودا لە ڕابردوومان خۆش بێت.
ئیبن ڕوشـــد بێدەنگ بوو، وامانزانی وەڵامی ناداتـەوە و گوێی لـە قسەکەی خەلیفە نەبوو. لەناکاو وەقسە هات و گوتی:
- ئەگەر تۆیش لە دنیادا لە من خۆش بیت، ئەوە من لە ڕۆژی دواییدا لە تۆ خۆش نابم.
خـەلیفە بـەم قســـەیەی ئیبن ڕوشـــد ڕووی گرژبوو، بە پەژارە و تووڕەییەوە سەری لەقاند و گوتی:
- تۆ چاک دەزانی من ســـتەمم لە تۆ نەکردووە. ئەگەر لە خەڵکم گەڕابایە تۆیان دەکوشت. من تۆم بۆ مەنفا دوورخستەوە، تاکوو لە دەســـتی خـەڵک پارێزراو بیت، دوای ئەوەی دەروونی خەڵک ئارام بووەوە، لێت خۆش بووم.
ئیبن ڕوشد سەری خۆی بەرزکردەوە و تەماشایەکی خەلیفەی کرد و سووکەبزەیەکی تاڵی بۆ کرد و گوتی:
- ئـەمن هیچ زیـانێکم لـە مـەنفـا نـەبینیوە، دنیـا هـەمووی مـەنفـای ئیمـاندارانە. دەزانی لە ئەلیســـانە چ شـــتێک بۆ من زۆر ناخۆش و دژوار بوو؟
خەلیفە جوان گوێی بۆ قوڵاخ کرد، ئیبن ڕوشد گوتی:
- لـەگـەڵ کوڕەکـەمـدا چووین لـە مزگـەوتێک نوێژ بکـەین، چـەند گەوجێک، کە تۆ بەسەر منتدا زاڵ کردبوون دەریانهێنام و نەیانهێشت نوێژ لە مزگەوتەکەدا بکەم.
خەلیفە بە تووڕەییەوە سـەری خۆی هەژاند، ئیبن ڕوشد بە دەنگێکی بەرزتر گوتی: ئەوە ماوەی ســێ ســاڵە نەچوومەتە هیچ مزگەوتێکی ئەلیسانە، تۆ ئەوە دەزانی؟

- وەڵڵاهی ئەوەم نەزانیوە. من قەت کەسم لە مزگەوت قەدەخە نەکردووە.
- تازە بزانی و نەزانی چ سوودێکی هەیە.. کە خەلیفە شوێن هەرچیوپەرچییان دەکەوێ، هەر ئەوە ڕوودەدا کە دەیبینین! مافی خەڵک پێشێل دەکرێ و ئاوی ڕوون لە دنیایێدا نامێنێ.
خەلیفە هەڵچوو، قاچێکی بە زەویدا کێشا، بەدەستێکی هێمای بۆ ئەملاوملا کرد و بە ئیبن ڕوشدی گوت:
- قوربان! خاترێکمان بگرە. نە من شوێنکەوتەی هەرچیوپەرچیانم و نەتۆیش ئەو کەسەی بێیت لەسەر حوکمی خودا و پێغەمبەر (د.خ) گازاندەم بکەیت. تۆ لە حوکمی ئەوان بەگومانی؟
- یەعقووب! خودا ڕۆژی پەسڵان حوکم لەنێوانماندا دەکات.
ئیبن ڕوشد هەستا و خۆی دالەنگاندە سەر دارعەساکەی، بۆ دەرەوە هەنگاوی ناو و گوتی:
- بێگومان حوکمی خودا هەمووشتێک یەکلا دەکاتەوە.
ئەوسا ئیبن ڕوشد پشتی لە خەلیفە کرد و وردەوردە بەرەو دەرگەکە ڕۆیشت، خەلیفەیش پەشۆکا، نەیدەزانی چۆن ڕەفتار بکات. بێدەنگ و خامۆش بوو. گاڵەگاڵ کەوتە نێو بەردەست و کاربەدەستەکانی ، وەک ئەوەی بیانەوێت لە جیاتی ئەو، تووڕەیی خۆیان دەرببڕن. دەرگەوان تەماشای خەلیفەی کرد، بۆ ئەوەی خەلیفە فەرمانێکی پێ بکات و ئەویش جێبەجێی بکات، بەڵام خەلیفە هیچ قسەیەکی لەدەم نەهاتە دەرەوە. ئیبن ڕوشد بەبەردەم مندا ڕۆیشت، زۆرنەمابوو دارعەساکەی بە چمکی کراسەکەی من بکەوێت. سەری بەرزکردەوە، ویستی سەیری بکەم، بەم قسانەی ئەو، شیفای سینەم هات. ئەو بزەیەی، کە دەبوو بۆ ڕەزامەندی قسەکانی ئیبن ڕوشدی بکەم، شاردمەوە.

دوای ئەوەی ئیبن ڕوشـــــد بڕیاری دا حوکمی نێوانیان بەرێتە لای خودا ، بەرەو ئەو دادگایە بەڕێ کەوت. دوای چەند هەفتەیەک، خودا ڕووحی بۆ لای خۆی بەرزکردەوە. هەواڵی کۆچیدوایی ئیبن ڕوشـد بۆ خەلیفە، وەک هەورەتریشـــــقە وابوو، خۆ ئەو هێشــــتا تینوتاوی هەواڵی کۆچیدوایی غەوسی لەسـەر لانەچووە، هەواڵی مەرگی ئیبن ڕوشـدیشـی بەسـەردا هات. زەوی لێ وەتەنگ هات. بۆ دڵنەوایی و هێوربوونەوە، بڕیاری دا بچێتە کۆشـکەکەی کەنار دەریای شـــاری (سلا).

# ٣٧

**"ئەمە ئیبن روشد و ئەوەیش کتێبەکانی، خۆزیا دەمزانی ئاخۆ خەون و ئومێدەکانی وەدی هاتوون، یان نا"**
**ئیبن عەرەبی**

ئیبن ڕوشد وەسیەتی کردبوو لە قورتوبە بینێژن. منیش بڕیارم دا لە ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی بەشدار بم، بەشکم لەگەڵ ناشتنی ئەودا هەستکردن بە گوناهیشم بنێژم، لەتەک ئەودا چەقۆی پەژیوانیش ئەسپەردەی خاک بکەم، کە هەر ڕۆژە و پارچەیەک لە دڵم دەکاتەوە و هەر بڕیشی ناشکێت. لەگەڵ بەدردا بەرەو ماڵەکەی چووین، پتر لە بیست کەس لە قاپیەکەی وەستابوون، خێوەتی خەمناکی خۆی بەسەر ڕوخسارماندا هەڵکێشابوو. چەند کەسێک وڵاخیان هێنابوون، بەشێکی دیکەیش، پرێسکەیان دەبن هەنگڵ نابوو، ژمارەیەکیشان بێ تێشوو و وڵاخ بوون. بەدرم ڕەوانی بازاڕ کرد، خواردنی بۆ دە کەس لەوانەی خواردن و پێخۆریان پێ نەبوو، کڕی. لەپشت قاپییەکە وەستاین و چاوەڕوانی هێنانە دەرەوەی تەرمی ئیبن ڕوشدمان کرد. هەردوو کوڕەکەی ئیبن ڕوشد و خادیمی تووڕە و چاوبەئەسرین، تەرمی ئیبن ڕوشدیان هێنایە دەرەوە. گەنجێک وەختێک ئەو دیمەنەی بینی، دەستی بە ناڵە و هاوار کرد و جلەکانی جڕبەجڕکردن و لەخۆچوو و بە زەویدا کەوت. قافڵە بچووک و

ماتەمدارەکە سەر لە بەیانی وەڕێ کەوت. وشترەکەی ئیبن ڕوشد، لە دەستەڕاستی مندا دەڕۆیشت، ئەوەی کە لە دنیادا جێی هێشتبوو، بەسەر پشتی ئەو وشترەوە بوو: تەرم و کتێبەکانی. دوای چەند ڕۆژێک گەیشتینە سەر دەریا، زۆر هێمن و ئارام بوو، هەر دەڵێی شانبەشانی ئێمە، لە مەراسیمی ناشتنی ئیبن ڕووشددا بەشدار دەبێ. دوای یازدە ڕۆژ گەیشتینە قورتوبە، خەڵکەکە بەر لە ئێمەیش، هەواڵی هێنانەوەی تەرمی ئیبن ڕوشدیان بە گوێدا چرپا بوو، خەڵکێکی زۆر لە خزموخوێشەکانی هاتنە پێشوازیمان. هەموو ئەوانەی دەیانناسین و نایانناسین دەباوەشیان گرتین و بەخۆیانەوە گوشین، ئەسرین وەک باران بەسەر ڕوومماندا دەهاتنە خوار، ناڵەناڵ بۆ کەشکەلانی فەلەک دەچوو، بە سەردوولکە دەیانلاواندەوە و پێیاندا هەڵدەگوت. دەستە لەرزۆکەکانیان بە تابووتەکەی دادەهێنا و بە خەم و حەسرەتەوە سەریان بەسەردا دەگرت. قافڵەی تەرمی ئیبن ڕوشد بەنێو شەقامەکاندا دەڕۆیشت و پیاوەکان لەنێو کوچە و کۆڵانەکان (لاحول ولاقوة)ەیان دەگوتەوە و ژنەکانیش لەنێو داڵان و بەرهەیوانەکانیان شین و ڕۆڕۆیان بوو. هەر گەڕەک و باژێڕێکمان دەبڕی، ژمارەی بەشداربوان زێتر دەبوو، کاتێک گەیشتینە گۆڕستان، ژمارەمان بووە سەدان کەس. گاهێک ئەسپەردەی خاکمان کرد، خۆر لە سەروبەری ئاوابووندا بوو. هەموو بڵاوەیان لێ کرد، منیش لەگەڵ بەدر چووینە خانێک، بەڵکە لە خەموپەژارە دوور بکەوینەوە. شەوی یەکەم، من لەسەر فەرش خەوتم و ئیبن ڕووشدیش لە گۆڕەکەیدا پاڵکەوت، من لەبیری ئەوەدا بووم سەر و دڵی خۆم خۆش بکەم و هەستی خەمناکیم وەلا نێم. تا نیوەشەو، خەو نەچووە چاوەکانم. پەڕاوەکانم دەرهێنان بەشکم بتوانم شتێک بنووسم، بەلام مرد و سووتام، هیچم بۆ نەنووسرا، دواتر لەسەر ڕووپەلێکی سپی، بە جوانترین شێوە نووسیم (ئیبن ڕوشد) و بەبێدەنگی تێی ڕامام.

چەند ڕۆژێک لە قورتوبە مامەوە، ئەو کتێبانەی لە مەراکیش نەمبوون پەیدام کردن. چوومە بازێڕی کتێبفرۆشەکان، لە یەکەم دووکانەوە تا دوا دووکانم تەی کرد، تەنیا کەمێک کتێبی ئیبن ڕوشـــد مابوونەوە، ئەوانی دی هەموویان فرۆشرابوون. زۆر پێم سەیربوو مامەڵەیان بە کتێبەکانی ئەو دەکرد و هیچ سڵیشیان لێ نەدەکردەوە. پرسیارم لە کتێبفرۆشـــێک کرد: ئەی ئەگەر بازێڕوانان ئەم کتێبانەیان بینی چی دەکەن؟ وەرامی نەدامەوە، بەڵام دەنگی خۆی بەرزکردەوە و بانگی ڕێبوارانی کرد: "دانراوەکانی ئیبن ڕووشـــدمان هەن: "بداية المجتهد. تهافت التهافت. شـــرح الارجوزة." زۆر ڕوون بوو، ئەوان وەک بەرەنگارییەک ئەو کارەیان دەکرد، کۆتا وێســـتگەی تەمەنی ئیبن ڕوشـد، ئەوانی زۆر پەریشـان و پەسـت کردبوو. سـەردەسـتەی قازییان و هاونشـــینی خەلیفان و فەیلەســـووفی فەقیهان، لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا لە مزگەوتان دەردەکرێت... ئەو ڕۆژەی بڕیاری ســـووتاندنی کتێبەکانی ئیبن ڕوشـــد درا و لەنێو گۆڕەپانی شـارەکان ئاگریان پێ خۆش کرد، ئەوان هێندێک کتێبی ئەو حەشـار دەدەن و ئەمڕۆیش لە داخی ئەو غەدرەی لەویان کرد، کتێبەکانیان هێنانە دەر و بەئاشکرا دەیانفرۆشتن.

لەو کاتەدا کۆسـتێکی تر، خەمی لەدەسـتدانی ئیبن ڕوشـدی خسـتە ژێرەوە، ئەویش کارەساتی ڕووباری (شقورە)ی مورسییە بوو. ئێمە هێشـــتا لە قورتوبە بووین، خەبەری بناوکەوتنی بەشـــی خوارووی شـــاری مورســـەیەمان پێ گەیشـــت. خانوو و مزگەوت و بازێڕ و دووکان ژێر ئاو دەکەون و بەســەریەکدا خاپوور دەبن. ماڵ و موڵک و کتێب و کەلوپەل تەفروتوونا دەبن و خەڵک و پێڕۆیش دەخنکێن. مەرزەکانی شار ژێرئاو دەکەون، بەروبووم لەنێو دەچێت و قووت و بژێویش کەم دەبێت. ئاو ســـەر دەکات و بەرز دەبێتەوە، خەڵک بۆ پەڕینەوە و هاتوچوو بەلەم بەکار دەهێنن. خانووەکەی خۆمانم بیر

کەوتەوە، کە هەر بە منداڵی جێم هێشت بوو. بڕیارم دا سەردانێکی بکەمەوە، بۆ ئەوەی بزانم لافاو چی لێ کردووە.

****

کاتێک من و بەدر گەیشتینە مورسییە، ئاوەڕۆ لەزۆربەی شوێنەکان کەم بووبوو. هێشتا ڕێگەوبانەکان هەر تەڕبوون، قۆرت و چاڵاوەکان بووبوون بە زۆنگاوی بچووک بچووک. کەلەشی ماسیی شەبووت و بۆقەسوورە، کە هێشتایش بۆ پەنایەک بازەبازیان بوو، ڕێگەوبانیان داپۆشی بوو. هەشت ساڵان بووم، کە بۆ دواجار بە شەقامەکانی مورسییەدا ڕۆیشتووم، ها ئەوەتە ئێستەیش بەبێ هیچ ڕێوان و ڕێنوێنێک ماڵەکەم دەدۆزمەوە، هەر دەڵێی دوێنێ بوو ئێرەم جێ هێشتووە. ئاو، پەرژینی باخچەکەی ڕامالی بوو، دەرگەکەی شکاندبوو، دەستەیەک شەقاوەچی لەنێو بوون. گاوێک منیان بەسەر ئەسپێکەوە بە جلی مەغریبی هابوونی بینی، کەلوپەلەکانیان تێکنان و داوای لێبووردنیان کرد و ڕۆیشتن. بەنێو خانووەکەماندا هاتم و چووم، زانیم چاککردنەوەی پارەیەکی باشی گەرەکە. تازە مەحاڵیشە جارێکی دیکە بگەڕێمەوە ئەندەلوس، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەندەلوس بوو بە قۆچی قوربانی، فەرەنگەکان لە باکوور تێیوەڕووهاتن، پورتوگالییەکانیش لە خۆرئاوا بۆی هاتن، موەحیدەکانیش لە باشوور گورزی خۆیان لێ سەرەواند، موریقیەکانیش لە خۆرهەڵات دەستیان تێوەردا. تازە ژیان لێرە هیچ مانایەکی نییە. دوو خوشکەکەم مێردیان بە دوو پیاوی مەغریبی کردووە، پێم وانییە ئیدی حەوجە بەم خانووە ببنەوە. هەر بۆیە بڕیارم دا بیفرۆشم، ڕاستەوخۆ چوومە بازاڕ. بەدوای نووسینگەی خانووبەراندا گەڕام. دوو هەفتەی نەبرد، خانووەکەم فرۆشراو و پارەکەم وەرگرت، بەدەستی خۆم ڕەگ و ڕیشالی خۆم لە ئەندەلوس بڕی. لەگەڵ بەدری حەبەشی، بەنێو شەقامەکانی مورسیەدا ڕۆیشتین، سینەم تەنگ بوو، نەمزانی بەرەو کوێ بچم و لەکوێ

ئۆقره بگرم. بەدر ویستی میزاجم بێنێتەوه سەرخۆ، لەبارەی هەموو ئەو شـــتانەی دەیانبینی پرســـیارم لێ دەکات، منیش بە هەرچییەک بێتـەوه بیرم، وەلامی دەدەمـەوه. ویســـتم بچمـه ئـەو خـانووەی دادەفاتیمەی تێدابوو، دیتم بە خانووەکەی تەنیشـتییەوه لکاوه. لەبەر دەرگە دانیشـــتم، بە ئومێدی ئەوەی پاشـــماوەی ڕووحە پاکەکەی، کەرتولـەته پـەرشـــبووەکانی من بخـاتـەوه ســـەریـەک، ئارامی و ســـکوونەتم بۆ بگێڕێتەوه. شـــنەبایەک هەڵی کرد، بەرچاوەکانم لێڵ بوون، بەکوڵ گریام. بەدر نەیدەزانی چی بکات، وەک من بەتاو گریا. لـەبـەر دەرگە پاڵکەوتم، وەک منداڵی شـــیرەخۆرە وێک هـاتمـەوه، یـەکبەدەمی خۆم گریام و نالاندم. پێچەی ســـەرم خســـته ســـەر ڕوخســـارم و چاوەکانم نووقاندن، وەک ئەوەی بمەوێت لە دەســـتی ئەم جیهانە ڕابکەم. بەدری حەبەشـی ڕانی خســـتە بن ســـەرم و بە پەشـــتەماڵەکەی دایپۆشـــیم، ئاگام لەخۆ بڕا و خەوم لێ کەوت. لە خەودا عەرشـــی خودام بینی، بەســـەر گڕ و بڵێســـەی ئاگرەوه بوو. کە لێی ڕامام، مەلێکی جوان و قەشەنگم کەوتە بەرچاو، ڕاستییەکەی قـەت مـەلی وا جوانم نـەبینی بوو. کلکی لـەخۆی درێژتر بوو. شینییەکەی لە ڕادەبەدەر بوو، هەر دەڵێی یاقووت بوو دەفڕی. چاوم لەســەر هەڵنەگرت، بە دەوری عەرشـدا ســووڕایەوه، پاشـان لەنزیک من کـەوتـە خوارەوه. وەختێک لێی نزیـک کەوتمەوه، وەدەنگ هات و گوتی:

- بگـەڕێوه مەراکیش، لەوێ پیاوێک چاوەڕێت دەکات، پێکەوه دەچنە مەککە.

لـەخـەو ڕابووم، بـەلام هیچ بزاوێکم نـەکرد، بـەو ئومێدەی خـەوم لێ بکەوێتـەوه و خەونەکە ببینمەوه، لێ هەرچەند کردم نەمتوانی. بەدر، کە ناوەناوە دەبۆرژا، سـەرنجی منی دا. هەسـتامە سەرپێیان، ئەویش هەستا، دیسان دانیشتمەوه، نەمزانی بۆچی هەستام و وەستام.

- خێرە قوربان!

- خێر دەبێ ئینشاڵڵا.
- نەگەڕێینەوە خان؟
- دەچینەوە باژێڕ.
- کەمێکی دیکە بانگی مەغریبە، خەڵک دەڕواتەوە و باژێڕەکان دادەخرێن.
- بەڵام خۆ هەژار و بێنەواکان دەمێننەوە.
بەرەو بازاڕ چووین. پریاسکەی پارەی خانووەکەم دەرهێنا. کردمە دوو بەش، نیوەم دایە بەدر و پێم گوت:
- بەدر ئەوە هەقی دوو خوشکەکەمە، لای خۆت تاقەتی بکە. بەدر سەری پریاسکەکەی جوان توووند کرد، پاشان بە داوێک، کە بە بەریەکەیەوە بوو بەستەوە، بەو حاڵەیش لەنزیک سینەی، توووند دەستی بەسەرەوە گرتبوو. گەیشتینە باژێڕ، پریاسکەی خۆم دەرهێنا، بە هەر هەژارێک گەیشتم، دینارێکم دایێ، تا پریاسکەکەم بەتاڵ بوو. باژێڕمان جێ هێشت، لە دوای خۆشمان کۆمەڵە هەژارێکمان جێ هێشت، کە لە خۆشییان پێیان زەوی نە دەگرت. بەرەو خان گەڕاینەوە، بەدر بێدەنگ و خامۆش بوو، بەڵام بەسەر ڕوویەوە خەندەیەکی بێگەرد هەبوو، کە لە بەیانییەکی ساف دەچوو.
پێم گوت:
- بەیانی دەڕۆین؟
- بۆ کوێ؟
- بۆ مەراکیش... ئەمن زۆر تامەزرۆم...
- بۆ کێ؟
- لەوێ پیاوێک چاوەڕوانی منە... ناشزانم کێیە!

## ٣٨

**دەستنووسێك لە كەرك**

٧٠٨ك/١٣٠٩ز

لە ئاخیری باهۆزەكە دامركایەوە. ئەمن پێم وابوو تا پاشـــاكان لە ڕەگوڕیشە نەهێنن و سەری خەڵك نەقرتێنن، هێور نابێتەوە. دوو شەوە زۆر كەم خەوم لێ دەكەوێت، ئێستە هەقی خۆمە لە كتێبخانەی قەلا، تاوێك خەڵوەت بگرم. لەوەتەی لە حەماوە هاتووم، ئاگر لەدوای ئاگر دەكوژێنمەوە. ئاگرێك لەنێو دڵی ناسرپشا، كە لەوەتەی وازی لە دەسـتەڵاتی میسـر هێناوە، لەم قەڵایە گۆشـەگیر بووە. ئاگرێك لەنێو نامەی زاهیر پیبرس، گلپە دەدا، كە داوای لە ناسرپشا كردووە هەموو پارە و سامانێكی شاری كەركی بۆ بنێرێت و هیچ شتێك بۆ خۆی گل نەداتەوە. ئاگرێك لە عەقڵی موغەڵتای نەفرەتی، قاسـیدی پیبرس بەربووە، ئەو كەسـەی بەسـەر شـادا كشـوفش دەكات و بە كەیفی خۆی لە كەرك فەرمانی بكە و مەكە دەردەكات، وەك ئەوەی خۆی لەبیر كرد بێت. ئاگرێكی تر لە دڵی من هەڵگیرســاوە، منێك، كە نامەوێت ناســرشــا بەم زەلیلی و ڕیســوایییە ببینم، ئا ئەوەتە مەمالیكەكانی باوكی، حوكمی بەسەرەوە دەكەن!

دەی نان و هەنگوین و میوەم بۆ ئامادە بكەن، تا لە كتێبخانە بچووكەكە بەتەنیا نان بخۆم، وا دیارە چەند ســاڵێكە جگە لە

خزمەتكارەكانی، كەس سەری پێدا نەكردووە. من وا بەپێوە نان دەخۆم و بەنێو ڕەفەی كتێبە بەسەریەكداكەوتووەكان دێم و دەچم، كتێبەكان نە پۆلێن كراون، نە ڕێكیشخراون. ئەو كتێبانەی سەرنجیان ڕاكێشام، هەڵمگرتن و لەتەك خۆم دامنان، لاپەڕەكانیانم هەڵدەدایەوە و قەپیشم لە بەهێ دەگرت. بەرەبەرە مێشكم ساف دەبوو: ها ئەوەتە دەخوێنمەوە و نان دەخۆم، شنەبایەكی فێنك، كە لە پەنجەرەكەوە دێتە ژوورەوە، هەڵدەمژم. لە نانخواردن بوومەوە، بانگی خزمەتكارەكەم كرد، ئەویش هات پاشماوەی خواردنەكەمی هەڵگرتەوە و ڕۆیشت. لەبەردەمی پەنجەرەكە وەستام و تەماشای كێڵگەكانی دەوروبەری قەلام دەكرد. كاتێك فەردە جۆم بینی بەسەریەكەوە دانرابوون، حەزم كرد قسە لەگەڵ مشوورخۆر (ئیستادار) بكەم، پێی بڵێم بۆچی هێندە زوو جۆتان دروێنە كردووە، بەڵام هیچ كاتێكی وام لەبەر دەست نەبوو. بانگی خزمەتكارەكەم كرد بچێت بانگی مشوورخۆر بكات.

پاش دەمێك، مشوورخۆر گەیشت، ئیزنی خواست و هاتە ژوور:

- ئەبوو فیدا ئەمر بكەن.

- وەرە ئێرە. بۆچی بەم زووە جۆتان دروێنە كردووە، خۆ هێشتا زەرد نەبووە و گوڵەكانیشی كامڵ نەبوونە؟

دەستەكانی ئاوەڵا كردن و ملی خۆی ڕاتەكاند، وەك ئەوەی بڵێ: هیچ وەلامێكم لا نییە. لە وەلامدانەوەكەی پەست بووم، لێی نزیك كەوتمەوە و دەستم خستە سەر شانی و ڕاستەخۆ تەماشام كرد و گوتم:

- تۆ مشوورخۆری شای، بەرپرسی بەروبووم و كشتوكاڵی وی، باشیش دەزانیت زوو دروێنەكردنی جۆ دەبێتە هۆی تەلەفبوونی دانەكەی، ئەی شا خۆیشی ئەمە نازانێت؟

كابرای مشوورخۆر بە چاوەشینەكانی تێم ڕاما، لەوەنەدەچوو هەڕەشە و گوڕەشەی من، ئەوی ترساندبێت، گوتی:

- میر موغەڵتای فەرمانی ئەوەی پێ کردین.
- موغەڵتای؟ کەی وای گوت؟
- هەر لەو ڕۆژەی گەیشتە ئێرە ئەو فەرمانەی دەرکرد. گوتی: نیوەی بەروبووم لەگەڵ خۆم دەبەمەوە قاهیرە.
- شاتان لەمە ئاگادار کردووەتەوە؟
- بەڵێ، هیچ شتێکی نەگوت.

دۆخی ئەو شایە بەستەزمانە ئازاری دام! سولتانێکی بێ سوڵتە و مەلیکێکی بێ مەملەکەت، تەنانەت کاروباری جۆدروێنەیشی لە دەستدا نەمابوو. مشوورخۆرم بەرێ کرد و بیرم لە قسەکانی کردەوە. هەڵبەت موغەلتای ئەگەر پشتیوانیی (پیبرس)ی نەبێت ناتوانێت ئەو کارە بکات، پیبرسیش ئەگەر نیازێکی خراوی نەبێت وا ناکات. لەو نامانە وەگومان کەوتم، کە دوێنێ شەونخوونیم بە نووسینیانەوە کێشا، ئاخۆ دەبێ بتوانن مەلیک لەو دژوارییە ڕزگار بکەن. بیرم لە دووبارە پێداچوونەوەیان کردەوە، ئەوسا ڕەوانیان بکەم، چونکە ئەگەر لە شوورەکانی قەڵا دەرچوون، تازە دەرفەتی پێداچوونەوە هەیهاتە!

ئەمن هەر بیرم لە پێداچوونەوەی ئەو نامانە دەکردەوە، لە هیکڕا دەرگەی کتێبخانە کرایەوە و شا وەژوور کەوت، بە دواشیەوە خزمەتکارەکەی بە سندووقێکی پڕ نامەوە هاتە ژوورەوە. هەستام و بەپەرواوە لەبەردەمی وەستام، ئامازەی کرد دانیشم، لە سەروسیمایەوە دیاربوو دوێشەو، خەو نەچووبووە چاوەکانی. بە چەند ڕۆژێکی کەم پیربووبوو، کەس گومانی ئەوەی نەدەبرد تەمەنی بیستوچوارساڵە. مووی پێشەسەری وەری بوون، چەند تاڵەموویەکی کەم نەبێت، هیچ چتێک کەچەڵیەکەی نەدەشاردەوە. لە ڕۆخ من دانیشت، خزمەتکارەکەیش سندووقی نامەکانی لەبەردەم دانان، پاشان چوو مێزی نووسینی بۆ هێنان. شا گوتی:

- داوام لێ کردن موغەڵتای لە حەپســخانە بێننە دەر، هەر ئەمڕۆیش لـە قـەڵا دەری دەکـەم، پێویســـــتـە نامەیەک بۆ پیبرس ببات. گەرەگە پێکەوە دواجار پێیدا بچینەوە.
- فەرمان دەکەن قوربان!
ســــندووقەکەم کردەوە، ئەو نامەیەم هێنایە دەر، کە دوێنێ لەســــەر پەڕەشینەکەی سەڵتەنت نووسیم، بە شام گوت:
- با بۆت بخوێنمەوە، لەکوێ ویستت بیگۆڕم، پێم بڵێ.
شـا ئەنیشـکەکانی خسـتنەسـەر ئەژنۆکانی، دەسـت و پەنجەکانیشـی خسـتنە نێو یەک و چەناگەی خسـتە سـەریان و ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی، منیش دەستم بە خوێندنەوەی نامەکە کرد:
- ستایش بۆ خودا، ئەو ستایشـەی میزاج چاک دەکات و پشـێوی و ناهـەمواری لادەبات. درووود بۆ پـەیامهێنـەکـەی، کە ڕەئفـەتی هێنا و ڕەحمەتی پەخش کرد. ئینجا، بەندە ناسـڕی کوڕی قلاوون، دەسـتی جـەنـابی مـەلیکی موزەفـەڕ مـاچ دەکـات. نووســـــراوە پیرۆزەکـەتـان گەیشـت، بەندە و ژێردەسـتەتان بۆی هەسـتایە سـەرپێیان و خسـتیە سەر سەر و چاوەکانی. خۆی نووشتاندەوە و زەوی ماچ کرد، وەک ئـەوەی جـەنابتان ئامادەن و بەندەیش لە بەردەمتانە. هەق تەعالا، بە عینـایـەت و هیدایـەتی خۆی، بەندەی بۆ فەزڵ و بەخشـــــندەیی ئێوە ڕێنوێنیی کردووە. بەندە و مەمالیکە موسڵمانەکانیشی لە بەڕ و بەحر و شـام و میسـڕ و دوور و نزیک، خستووەتە ژێر دەستەڵاتی ئێوە... پاشـان بەندە لە کەرک گۆشەنشین بوو، ئەمەیش تەنیا بۆ سـەلامەتی و بـەس. مـەولانـا ســــوڵتـان زاهیر پیبرس پـەروەردەی کردووم و ڕایهێناوم، بەدەر لەو کەس بە باوکی خۆم نازانم. هەرچییەک لە مندا هەیە، هیی ئەوە. نامەکەی ئەوم بەدەســـت گەیشـــت، داوای کردبوو مـاڵ و پارەی کەرکی بۆ ڕەوانە بکەم. ئەو دەزانێت ئەو ماڵەی وەرم گرتووە، بـەرهـەمی نـەفـەقـات و تێچووەکـانـە... من فـەرمـانی پیرۆزی ئـەوم بـەجێ هێنـا، نیوەی مـاڵـەکەی بۆ ڕەوان دەکـەم، ئـەگـەرچی بـە

فەرمانی مەولانا سـولتان هێشـتا لای من ماوەتەوە. بەشـێک لە ئەسپەکانیش سەکەت بوون، تەنیا بەشی من ماون. هیچ بەندەیەکیشم لای خۆم نەهێشـتووەتەوە، تەنیا مەگەر خۆیان حەزیان کردبێت بمێننەوە، تایبەت ئەوانەی کە هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ ئەهل و منداڵەکانیان نەماوە، ئاخر چۆن دەکرێت وەدەریان نێم؟ هەق تەعالا، مەولانا چەپاڵە بدات، کە هەر چاکەی بۆ من هەبووە، ئەگەرچی ئێستە لەگەڵ خۆشەویستانی گۆڕاوە و پشتی لە خزمەتکارەکانی کردووە.

من ئەو نامەیەم خوێندەوە، کە بەدەستی خۆم نووسیبووم، بەڵام دڵم بۆ مەلیکی خەمبار و بێدەرتان دەگوشرا، کە پێشتر تەنیا دوو ساڵان سـولتان بوو، زاهیر پیبرسـیش جێگری بوو، کەچی ئێستە دۆخەکە سـەرنخوون بووەتەوە، زاهیر سـولتانە و ئەویش مەلیکێکی بچکۆلانەی کەرکە... بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا شا خۆی دەبەرخۆ گرت و لە نامەکە ڕازی بوو. نەختێک بێدەنگ بوو، تاوێک داڵغەی لێ دا، پاشان گوتی:

- ئەبووفیدا چی دەڵێیت؟

- ئەوەی دوێنێ ئاماژەم پێ دا، هەر ئەوە دەڵێمەوە. نیوەی پارە و ماڵ دەنێرین و نیوی دیکەیش لای خۆمان گل دەدەینەوە. هەر زوویش وەڵامی موغەڵتای بدەوە، پاشـان نامە بۆ هەموو میرگەلی شام بنووسە.

- ئەی ئەگەر پیبرس بەمەی زانی چی؟

- ئەگەر بە وریایی و وشیاریی بیاننێرین، هیچ ڕوونادات.

- ئەی ئەگەر ئەوان پێی بڵێن؟

- پێم وا نییە شتی وا بکەن، هەموو نوێنەر و میرانی شـام مەمالیکی باوکتن و خۆشەوستی و ڕێزێکی زۆریان بۆ هەیە.

سـەری بۆ لای من قیت کردەوە و لە هەر دوو چاوەکانم ڕاما و گوتی:

- کەواتە تۆ نامەکانیان بۆ ببە، من جگە لە تۆ، متمانە بە کەس ناکەم.
ئەو قســـەیەی ئەو بۆ من، کتوپڕ نەبوو، مەیلەو دڵنیابووم، کە من دەنێرێت. ئەمن خەڵکی شـام و میرە مەمالیکەکان دەناسـم، دەشـزانم لە حاڵێکدا ئەگەر زاهیر پیبرس نیازێکی خراپی هەبێت و بیەوێت زیان بە ناســـڕشـــا بگەینێت، دەتوانم قەناعەت بە خەڵکەکە بێنم کە پشتیوانیی شا بکەن. زۆر بە ئارخەیانانە وەڵامی شام دایەوە:
- مەولام بەسەر چاو.
- ڕۆژێک چاوەڕێ بکە، تاکوو دڵنیا دەبیەوە، کە موغەڵتای لە (کەرک) دەرچووە، ئەوسا بەنهێنی بڕۆوە دیمەشق.
- بەسەرچاو مەولام.
شا هەستا ویستی بڕوات، گوتی:
- بە مشوورخۆر بڵێ با ئەسپێکی ڕاووشکاریت بخاتە دەست، تاکوو بە زووترین کات بگەیە شوێنی مەبەست. پاشان ڕۆیشت، بەر لەوەی دەرچێت بانگم کرد:
- قوربان!
لای کردەوە و هیچ قســـەیەکی نەکرد، منیش ئاماژەم بۆ ئەو کتێبە کرد، کە بەر لەوەی بێتە ژوورەوە بە دەستمەوە بوو، گوتم:
- ئەگەر پێویســـتیت بەو کتێبە نەبێت، من حەز دەکەم لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ (حەما)، ئەگەرچی...
قسەکەی پێ بڕیم و بە جۆرێک لە بێتاقەتی و تووڕەییەوە گوتی:
- ئەبووفیدا کەی کاتی ئەم قسانەیە! هەرچیت دەوێت بیبە..

## ٣٩

**"مومکین بەرزەخێکە لەنێوان بوون و نەبووندا"**
**ئیبن عەرەبی**

خەلیفە ون بوو!
بەیانییەک خزمەتکارەکە لە "سـلا" دەچێتە ژووری خەوتنی خەلیفە، دەبینێ هیچ کەسێکی لێ نییە. هەموو خزمەتکارەکانی بانگ دەکات، کەس نازانێ لەکوێیە و بەرەو کوێ چووە. بەرهەیوان و دالانی کۆشک و ژووری کەنیزە و نوێژگە و کتێبخانە گەڕان، هیچ ئەسەرێکی نەبوو. پاسەوانەکان بە باخچە و دەوروبەریاندا بلاوبوونەوە، نەبادا هاوسەنگیی عەقڵی تێکچووبێت و بەلایەکدا سەرپەڕ بووبێت، بەڵام بێهوودە بوو. بەرەو دەریا چوون، نەخۆ بە پیاسە بۆ کەنار چووبێت، بەڵام جگە لە مەلی نەورەس و قەڵەڕەش، هیچی دیکەیان بەرچاو نەکەوت.
چەند کەسێکیان بۆ ماڵە وەزیر و هاومەجلیسەکانی نارد، بە ئومێدی ئەوەی سەردانی یەکێکیانی کردبێت، بەڵام لەکن وانیش نەبوو. چەند پاسەوانێکیان بەرەو بازاڕ نارد، بەشکم وەک نەریتی هەمیشەی لە بازاڕ بسووڕێتەوە، وەلێ بازاڕ زۆر ئاسایی بوو، هیچ شوێنەوارێکی خەلیفەی پێوە دیار نەبوو. سەربازەکان بە شار و بەندەر، گەڕەک و مەرزەکاندا بلاوبوونەوە، هیچ سۆراخێک نەبوو.

وەک ئەوەی خەلیفە بووبێتە هەڵم و بە هەوادا چووبێت. لە کۆتاییدا قاسـیدێکیان ڕەوانی مەراکیش کرد، تاکوو ئەو هەواڵە بە کوڕەکەی خەلیفە: محەمەد، وەلیولعەهد، ڕابگەیەنێت. محەمەدی تازەلاو، بە هەواڵی بێسەر و سۆراخبوونی باوکی سەری سووڕما. لەگەڵ سوارچاکێک بەپەلە هاتنە (سلا) و هەموو کونوقوژبنێکیان پشکنی. هەرکە گەیشت، فەرمانی پشکنینی هەموو ماڵ و خێوەت و حوجرە و کوخێکی شاری دەرکرد، ئەمەیش هیچ کەڵکی نەبوو. هەموو خزمەتکارێکی کۆشک بۆ لێپرسینەوە لەبەردەم وەلی عەهد ئامادەبوون، بەشێکیان لەترسان دەستیان بەگریان دەکرد و هەموو سەر و سۆراخێکیان لەبارەی خەلیفە ڕەت دەکردەوە. وەلیعەهد هەرچی وەزیر و جەلیس و کەسە تایبەتەکانی خەلیفە هەبوون کۆی کردنەوە، هەڕەشەی لێ کردن و چاوی لێ سوورکردنەوە، ئەگەر یەکێک لەوان خەلیفەی ڕفاندبێت واوەیلا بە حاڵی. داواشی لێ کردن، کە ئەو هەواڵە بەهیچ شێوەیەک نەچێتە دەرەوەی کۆشک، دەنا لە گەردەنتان دەدەم. لەنێو ئەو جۆشان و تووڕەبوونەی کە دەیویست بسەلمێنێ، کە بەڵێنەکەی بەجێ دێنێت، شمشێرەکەی ڕاکێشا و لە ڕووی یەکێک لە بەندەکانی کۆشکی دا، کە ئاوی دەدایێ، بەندەی قەلەندەر لەنێو خوێناوی خۆی گەوزی.
وەلیعەهد بەپەلە ڕاوێژکار و وەزیرەکانی باوکی بۆ مەجلیس بانگ کردن، دەرگەی ژوورەوەی داخست، تەنانەت خزمەتکارەکانیشی وەدەر نا. وەک گورگێکی بریندار لێهاتبوو، نە هێور دەبووەوە و نەدادەنیشت. تەماشای کورسییە کەساس و چۆڵەکەی باوکی دەکرد، دەستەکانی بە یەکدا دەدان، ڕاستییەکەی ئەوە نە باوەڕ دەکرا و نە عەقڵیش قبووڵی دەکرد. خۆ ئەگەر خەلیفە لە ئەندەلوس بوایە، دەمانگوت قشتالییەکان ڕفاندوویانە، ئەگەر لە توونس بوایە دەمانگوت بەنووغانیە ڕەتاندوویانە... ئەی باشە ئەگەر لە مەغریب لەنێو سوپا و بنکە و بارەگاکانی ون بێت، چی؟ ئاخر لە (سلا)، کە

تەواوی وشـــکانییەکەی بە هێزەکانی ســـوپا تەنراوە و دەریایش بە کەشتی بەرزەفت کراوە، چلۆن دەشێ ون بووبێت؟
لـەگـەڵ ئـامـادەبوان بیرورِا ئاڵوگۆرِ کرا، چەند برِیارێکی بەپەلەیان دا. سـوپایان بۆ سـەر رِێگەوبانەکان جوڵە پێ کرد، هەموو ئەو قافڵانەی بە خـاکی موەحیدەکـان تێدەپـەرِین، بـەوردی دەپشـــکێنران. چـەند دەستەیەک لە هەجانە پێکهاتن، کاریان پشکنینی دەشتودەر بوو، هەر ماڵ و خێوەت و رِەشـــماڵێکی بەدوە کۆچەرەکان هەبوو، بە وردی دەپشـکێنران. لە هەر ســەوزایی و دەم ئاوێک، دوو کەســیان شـک بردبـا، دەوریـان دەدان و بـەوردی ئـەو نـاوەیـان لێک دەدا. چـەنـد تـاقمێکی نهێنیـان پێکهێنـا و بۆ مزگـەوتـە بچووک و گـەورەکـانیـان ناردن، بـەئومێدی ئەوەی خەلیفە لە یەکێک لەو مزگەوتانە ئیعتیکافی کردبێت و دواتر شتێکی لێ بەسەر هاتبێت. تاقیبکردن و لێپرسینەوە، گەیشتە گۆرِهەڵکەن و کەشتیوان و قافڵەچی و ئیمامی مزگەوتەکان، بەڵکە شتێک لە قسەکانیان هەڵبکرِێنرێت و سەرەداوێک پەیدا بێت.
لـەمیانی ئـەم پشـــکنینـە ورد و حزووری ئەو هەموو ســـوپایە، لە رِێگـەوبـان و گۆرِەپـان و کوچـە و کۆلانـان، کـە دواتر مـەراکیشـــی گرتـەوە، جۆرەهـا دەنگۆ و واتـەوات بـەنێو خەڵکدا بڵاوبوونەوە. هەر لە رِۆژەکانی بەرایی ماڵی منیشـیان وەک هەر ماڵێکی دیکە پشـکنی. سـەرباز هاتنە ژووری خەوتنم و تەماشـای هەموو سـووچەکانیان کرد، هەموو کەلوپەلەکانیان ســەیر کرد. چوونە ســەرخان و بەنێو باخچـە و حـەوشـــەی مـاڵـەوە هـاتن و چوون. دواتر ئاگام لێ بوو رِۆیشـــتنـە مـاڵی دراوســـێکەمان، بەدرێژایی کۆلانەکەمان گوێم لە زرینگە و ترینگـەی قـاپوقـاچـاخ و زیقە و زریکەی منداڵان و (لاحول ولاقوة)ـــەی پیرەمێردان بوو. ئەوان فەرمانیان پێ کرابوو، کە بەر لە خۆرئابوون هەموو ماڵێکی مەراکیش بپشکنن.
هەفتەیەک رِۆیشت و خەلیفە لە هیچ لایەک سـەر و سۆراخی نەبوو. وەلیعەهد بە پەشـۆکاوی و سـەرگەردانی بەرەو مەراکیش گەرِایەوە.

توورەییەکەی وەلیعەهد، دامرکایەوە و خەم و ترس جێیان گرتەوە. پتر لە وەزیرێک بوێریی ئەوەیان کرد پێی بڵێن ئەو باسە ڕابگەیەنێت، بەشکم شایەتێک پەیدا بێت، یان لێکدانەوەیەک بۆ ئەو حاڵە بکرێت، بەڵام ئەو بە توووندی ڕەتی کردەوە. وەزیرێک لەسەر ئەم بابەتە پێداگریی کرد، وەلیعەهد تێی هەڵدایە سەر زەوی و هاواری بەسەردا کرد:

- ئەی خەڵک ناڵێن تۆ باوکی خۆت بە فەتارە برد!

وەزیرەکان لە ئامۆژگاری وەلیعەهد پاشەکشەیان کرد، وەلیعەهدی تازەلاو کەوتە نێو شەپۆلی سەرگەردانی و مەراق. ئەو ڕووداوە بۆ ئەو، زۆر ناخۆش بوو، هەرچەند بیری لەو کارە دەکردەوە، خۆی بە تاوانباری یەکەمی گومکردنی باوکی دەزانی، بۆ ئەوەی جڵەوی دەستەڵاتی عەرش بگرێتە دەست. هەر بیری دەکردەوە و لە دۆخەکە ڕادەما، لە ئاخری بڕیاری دا کارەکە دیزەبەدەرخۆنە بکرێ، ئەویش خۆی مشووری دەوڵەت بخوات، هەروەک ئەوەی خەلیفەی لە جێگەی خۆی دایبنابێت. فەرمانی کرد دەستەسوارێک بنێرنە بیابان و لەوێ بمێننەوە، بۆئەوەی خەڵک وا گومان ببەن، کە خەلیفە چووەتە ڕاووشکار... چەند ڕۆژێک کارەکە هەروا مایەوە، تاکوو ڕۆژێک وەزیرێکی نزیکی وەلیعەهد، بە یاوەری قازی قوزاتی مەراکیش هاتنە لای، سڵاویان لێ کرد و قازی گوتی:

- جەنابی میر، خەڵک بۆ دیارنەمانی خەلیفە لەسەر هەستن - خودا بە ساغ و سەلامەتی بیگێڕێتەوە- ئێمە ترسی ئەوەمان هەیە هێندێک لەوان، ونبوونی خەلیفە بقۆزنەوە و خەڵک دنە بدەن و دەست بەسەر عەرشی خەلیفەدا بگرن.

وەزیر لە قازیی وەرگرتەوە و گوتی:

- خۆت ئەوانەت بینی، کە بە وجوودی خەلیفەیش هەڵپە و تاسەی دەستەڵاتیان بوو، هەوڵی دەستبەسەر داگرتنیان دا، ئێستە کە خەلیفە دیار نییە، هەلەکە بۆ وان زۆر لەبارترە.

وەلیعەهد بەتووڕەییەوە گوتی:
- ئەگەر پرسیاری خەلیفەیان لێ کردم، دەتانەوێت چی بڵێم؟
وەزیر ئحمێکی کرد و تێکهەڵقژا، بەڵام بەسەرخۆیدا زاڵ بوو، وا دیاربوو پێشتر چەند جارێک بیری لەو بابەتە کردبووەوە:
- دەڵێن بە تاولەرز لە جێگەکەیدا مرد، وەسیەتی کرد مەراسیمی ناشتنی بۆ نەکرێت، هەروەها هیچ قەفەزەیەکیش بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست نەکرێ.
- ئەی ئەگەر گوتیان کوڕەکەی بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات کوشتوویەتی؟
- کەسێک ئەو گومانە ببات، ئەی چ شتێک بەربەستە لەوەی، کە پێی وابێت خەلیفە مردووە؟
وەلیعەهد گوێیەکانی بۆ وەڵامی وەزیر قوڵاخ کردبوون، وەک ئەوەی دڵی بە قسەکانی وەزیر ئاوی خواردبێتەوە و ترسی ڕەوبیبێتەوە. دواتر بە دەنگێکی نزم گوتی:
- ئەی ئەگەر خەلیفە زیندووبوو و دەرکەوتەوە؟
- ئەوکات کارەکە چۆنە وا دەبێت، ئەویش لەو کارەی کردوومانە چاوپۆشیمان لێ دەکات، ئەمەیش لە پێناو نەڕشتنی خوێنی موسڵمانان و پاراستنی پێگەی دەوڵەت.
لە ئاخری قەناعەتی هات. بەناوی خەلیفە میرگەلی موەحیدەکان و سەرانی دەوڵەت و قازی و زانا و وەزیر و والییەکانی کۆ کردنەوە. هەروە بە شوێن دەمڕاست و شێخەکانی (مەسموودیە) و (سنهاجیە) و (زناتیە) و دەستڕۆیشتوانی دیکەیدا نارد. دوای ئەوەی هەموویان لە مەراکیش کۆبوونەوە، تا ڕۆژی هەینی چاوەڕێیان کرد. وەلیعەهد ئەو ڕۆژە لەنێو پاسەوانگەلێکی زۆر، کە هەموو دەستیان لەسەر دەسکی شمشێر بوو، هاتە نێو مێوانان. دواتر وەسەر دوانگە کەوت و وتارێکی کورتی لەبارەی یەکگوتاری و یەکگرتنی ئومەت پێشکێش کرد. پاشان لە دوانگە هاتە خوارەوە و نوێژی بۆ خەڵکەکە

کرد، دیسان وەسەر دوانگە کەوتەوە و مردنی خەلیفە یەعقووبی کوڕی یووسفی لە شاری (سلا) ڕاگەیاند، گوتی: چەند هەفتەیەک لەجێ کەوتوو و پاشان پەکی کەوت. وەسیەتی کرد لە گۆڕستانێکی موسڵمانان، لە گۆڕێکی نەناسراودا بینێژین، کەس نەزانی هیی ئەوە، ئەمەیش وەک زوهد و خاکەڕایی خۆی.

کاتێک دواوشەی لەبارەی مردنی خەلیفە گوت، هەروەک چۆن خۆی ویستی وابوو، ئەو پلانەی دایرشتبوو هاتە دی. پاسەوانەکەی، کە لەپشتی وەستابوو، بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد، دەنگی لە هەیوانی مزگەوت سەدای دایەوە، خەڵک هەموو سەریان سووڕما:

- بەیعەت بۆ میری ئیماندار و خەلیفەی موسڵمانان: محەمەدی کوڕی یەعقووب، خودا دەوامی هێز و دەستەڵاتی بدات. ڕاستەوخۆ پاسەوانەکان لەبەرانبەر خەلیفەدا بوونە دوو ڕیز، بۆ ئەوەی خەڵک بەنێویاندا بێن و بەیعەت لە خەلیفە وەربگرن. وەزیرەکان، کە لە ڕیزی یەکەم دانیشتبوون، زووبەزوو بەیعەتیان پێدا، ئەمەیش بۆ ئەوەی ڕێگریی لە هەموو ئەو کەسانە بکەن، کە تەماعگیری دەستەڵاتن و بەدوای دەرفەتێکی وەهادا دەگەڕێن. خەڵکەکە ڕیزێکی درێژیان بەستبوو، خۆیشی ئاخر کەس لە مزگەوت هاتە دەر. خەلیفە تیلەچاوێکی ماناداری بڕیە مامەکانی، ئەوانیش یەکەوسەر، بەر لە خەڵک هەستان و بەیعەتیان دایێ. منیش لەگەڵ وان وەستام و بەیعەتم پێدا.

## ٤٠

**"کەسێك لەبەر خۆی نا، بەڵکە لەبەر تۆ، بوو بە هاوەڵت، بایەخی پێ بدە"**
ئیبن عەرەبی

بیر و خەیاڵی من هەر لەســـەر ئەو پیاوە نەناس و غەریبە بوو، کە چارەنووســی منی پێوە بەندە. بە خەیاڵ هەموو شـکڵ و شـێوەیەکی گونجـاوم بۆ دادەتـاشـــی، بـە نموونـە: فـەقێیـەک لـە وانـەی منـدا، سـواڵکەرێک لە مزگەوت، سـەربازێک بەڕێگەوە. بازرگانێک لە بازێڕ. جوولەکەیەک بە جلی شـین، وەلییەک بەسـەر کێوێکی دوورەوە. لە خودا پـاڕامـەوە هـەرچی زووە بـە دیـداری یـەک بگـەین. هـەرکـە گەیشـتمەوە مەراکیش بەدوای خوشـکەکانمدا نارد، بەشـەمیراتی خانووەکەی مورسـییەم دانێ، لە خۆشـییاندا کەوتنە هەلەکەسـەما. کاتێک ئەوان خوداحافیزییان کرد، مەریەمی هاوژینم سەیری کردم و ڕووی لێ وەرنـەگێڕام، وەک بڵێی ئـەویش بـەوێنـەی ئـەوان پـارەی بوێت. باســـی کـەلوپـەل و ئـاتـاجی مـاڵـەوەی کرد، وەک: ڕایـەخ و ئاتاجەکانی نێوماڵ... داوەکارییەکانی ئەو، وەقسەی هێنام، پێم گوت:

- ماڵەکەی مەراکیشمان گەورە نییە.
- ئەی بەرەو کوێ بچین؟
- بۆ خۆرهەڵات.
- کەی؟

- وەختێک خودا ئیزن بفەرمووێ.
زانیم چاوەچاوکردن دادم نادات، بڕیارم دا دەستبەکار ببمەوە، وانەیەکی نوێ بە فەقێکانم بڵێمەوە، کتێبێک بنووسم، شەو و ڕۆژ، سەرقاڵ و پڕکار بم، تا ئەو کاتەی خودا کاروبارم ڕاهی دەکات. چووم گۆشەیەکی مزگەوتم گرت، کورسییەکم لێ دانا و بە بەدرم گوت لەنێو مزگەوت ڕای بگەیەنێت. بەیانی ڕۆژی دوایی، دەیان فەقێم بینین لە چاوەنۆڕی من وەستابوون، بەڵام ئەو کورسییەی دوێنێ بۆخۆم دامنابوو، نەمابوو. بەدر گوتی ئەمڕۆ دوای نوێژی بەیانی کابرایەک هات و کورسییەکەی لابرد، مجێوری مزگەوت بە ڕوویدا هەڵشاخی، کابرا گوتی: ئەوە هیی کۆشکی خەلیفەیە. ئەو چیرۆکە هەترەشی بردم، بەڵام بەهەرحاڵ چوارمەشقی دانیشتم و فەقێ لە دەورم کۆبوونەوە و وانەم پێگوتنەوە.
دوای نوێژی نیوەڕۆ مجێوری مزگەوت هات و گوتی هەرکەسێک لە مزگەوت دەرس بە فەقێیان بڵێتەوە، دەبێ کۆشکی خەلیفەی لێ ئاگادار بکرێتەوە. هەرچەند ویستم زانیاریی زیاتری لێ وەرگرم، سەری خۆی بادا و هیچی دیکەی نەگوت. بۆ دروستی و نادروستیی ئەو بابەتە، بەدرم ناردە کۆشک و بۆ خۆشم گەڕامەوە ماڵەوە. دوو هەستی دژبەیەک لە سینەمدا هاتوچوویان بوو: لەمەڕ خۆتێهەڵقورتاندنی ئەو خەلیفە نوێیە لە کاروباری مزگەوت، نیگەران و پەستبووم. لەلایەکی تریشەوە ئاسوودە بووم، چونکێ بۆ ڕۆیشتنی من، هۆیەک پەیدابوو. ئێوارە بەدر بە ڕوویەکی گرژ و دووچاوی پێکداقوپاو گەڕایەوە. بەر لەوەی دەمی بکاتەوە، گوتم:
- دەرکەوت هەواڵەکە ڕاست بوو.
- قوربان! لە سەرووی ئەمەیش...
- چی؟
- بە فەرمانی خەلیفە تۆ و چوار زانای دیکەیش لە وانەگوتنەوەی هەر مزگەوتێکی مەراکیش قەدەخە کراون.

- بۆچی؟
- لەمە زیاتریان نەگوت.
بەیانی لە خەو هەستام نەمزانی چی بکەم. بەدرم بە دوای فەقێیەکاندا نارد، کە پێیان بڵێت تا ماوەیەک وانە ناڵێمەوە. لە حەوشـــەی ماڵەوە بە زەینێکی مژووڵ و ئاڵۆز تەماشــــای باخچەم دەکرد، نەمدەتوانی تەرکیزی خۆم بخەمە ســەر هیچ شتێک. مەریەم پێی گوتم دەڕۆیت، گوتم نەخێر. چوومە تەنیشــتی دانیشــتم، پشــتی شــێلام تا نەختێک ئازارم کەم بێتەوە، گوتی:
- خۆشەویستەکەم، لەوەتەی لە ئەندەلوس گەڕاویتەوە، بیر وخەیاڵت ئاڵۆزبووە، پێم بڵێ شتێک لەوێ خەمباری کردوویت؟
- مەریەمەکەم، بە پێچەوانەوە ئەوەی لە مورســـیە بینیم دڵخۆشـــی کردم.
- چیی بوو؟
- خەون.
- خەونت بەچییەوە بینی؟
- مەلێک لەنێو عەرشــــی خودا هاتە دەرەوە و پێی گوتم بە هاوەڵیی پیاوێکی مەراکیشی بڕۆوە مەککە.
- ئەو پیاوە کێیە؟
- نازانم. چاوەڕێم بە فەرمانی خودا بێتە لام.
مـەریـەم تـاوێـک بێدەنـگ بوو، منیش لـە بنمیچی ژوورەوە ڕامـام. لەناکاو مەریەم ســــەری خۆی خوارکردەوە و لێم ورد بووەوە. بە جۆرێک دڵنیایی، بزەی بۆ کردم و گوتی:
- ئازیزەکەم من دەیناسم.
خۆم ڕاست کردەوە، قسـەکانی مەریەم ڕای هەژاندم. بە دوو چاوی پڕ هومێدەوە تەماشام کرد و گوتم:
- کێیە؟
- پیاوێکە ناوی حەسارە.

- حەسار؟ مەبەستت ئەبووبەکری حەسار، زانای حیساباتە؟
- بەڵێ.
- چۆن دەزانیت ئەو هەوە؟
- پێش چەند ساڵێک، کاتێک هاتینە مەراکیش، منداڵێک لە دەرگەی دا، ئەودەم تۆ لە مزگەوت بوویت. پێی گوتم: پووریێ ئێوە لە ئەندەلوس هاتوون؟ گوتم بەڵێ. گوتی: خەونتان بە حەجکردنەوە نەبینیوە؟ گوتم نەخێر. گوتی: سوپاس پووریێ. بانگم کرد، بۆچی ئەو پرسیارەت کرد، گوتی: ئەبووبەکری حەسار، من و چەند منداڵێکی بەکریێ گرتووە، تا بەو ماڵانەدا بگەڕێین، کە لە ئەندەلوسەوە بەرەو مەراکیش هاتوون.
هەر زوو جل و بەرگەکانم دەبەرکردنەوە و بەدوای ماڵی حەساردا گەڕام، نەمدەزانی لەکوێیە. ڕێبوار بە ڕێبوار پرسیارم کرد، تاکوو لەکۆتاییدا منیان گەیاندە پێش ماڵی ئەو. لەبەر قاپییەی ماڵی ئەو، سەرگەردان بووم، نەمدەزانی چی بکەم. هیچ کەشفێکی خودایش نەهات ڕێنوێنیم بکات. ناشزانم چارەنووس لەپشت ئەو دەرگەیە چی بۆمن گل داوەتەوە. نەختێک دوورکەتمەوە و ڕووم لە ڕووگە کرد، کڕنووشم برد و داوام لە خودا کرد پشت ئەو دەرگەیە بۆ من بکاتە مایەی ئەوەی چاوەکانم ڕوون ببنەوە، دەروونی چەند ساڵ ئازارچەشتەم بحەسێتەوە. لە دەرگەم دا. ژنێک بەرلەوەی دەرگە بکاتەوە، گوتی:
ئەبووبەکر دەرچووە، نەشی گوت کەی دەگەڕێمەوە. چەند هەنگاوێک لە دەرگە کشامەوە و دانیشتم، بڕیارم دا چاوەڕێی بکەم. لەگەڵ چەند ڕێبوارێک نوێژی عەسرمان لەبەر دەرگەی ئەو کرد، دواتر لە چاوەڕوانیی ئەودا دانیشتم.
سەروبەری خۆرئاوابوون بوو، حەسار، بەقەدوقیافەی زراف و ڕیشە چروپڕ و چاوە تیژەکانی دەرکەوت. تەماشایەکی منی کرد، لەکن دەرگەی ماڵەوەیان دانیشتووم، وەستا و منیش هەستام. بەر

لەوەی سـلاو لە یەکتر بەکەین، تێک ڕامایین. لە من نزیک کەوتەوە و دەسـتی خسـتە سـەرشـانم و بە قووڵی لە ڕوخسـارم ڕاما. زۆر ئومێدەواربوو، لێوەکانی لەرزەیان گرتبوو لە چاوەکانی من ئەسـرین داباریـن، لە هیی ئەویشـدا پلووسـکیان کرد. باوەشـی پێدا کردم و بەدەم گریانەوە گوتی:

- ئاخ ئەندەلوسـی، ئاخ! ئەوە چوار سـاڵە... بەڵێ چوار سـاڵە، من چاولەڕێی تۆم!

# ٤١

**"هەر مەعریفەیەك قبووڵی هەمەچەشنیی نەكات، بەكەڵك نایەت"**

**ئیبن عەرەبی**

لە بازاڕ سەلووم و عەدادم فرۆشتن. نرخی سەلوومم دایە خوشکەکانم، بە نرخی عەدادیش، دوو وڵاغ و بڕێک تێشووی سەفەریم کڕی و نیوە زیاتریشم بۆ مایەوە. من و مەریەم و زەینەب و بەدر لەگەڵ قافڵەیەک، کە بۆ بیجایە دەچوو، بەڕێ کەوتین. حەساریش بەتەنێ سواری ئەسپێکی بۆز بوو، تێشوو و کەلوپەلەکانیشی لە هێسترێک بارکردن. بەردەوام لەپێش ئێمەدا دەڕۆیشت، ئەمەیش بۆ ئەوەی ئەگەر مەریەم ویستی، سەربەستی خۆی وەربگرێت و لە کەژاوە بێتە دەرەوە. ئەمن لەپشتەوە حەسارم بینی، بە هالەیەکی پڕشنگدار دەوری درابوو. لەمن بترازێ، کەس ئەو هالەی نەدەبینی. ئەوەندەی بە دیدەنی حەسار دڵخۆش بووم، قەت بە دیدەنی کەس هێندە دڵخۆش نەبووم. ئەویش بە دیدەنیی من، بێشۆ[٦] دڵخۆش بوو، بەقەد ئەو چوار ساڵەی چاوەڕێم بووە، عەودالّ و چاوەچاوی دیداری من بووە. ئەویش هەمان خەونی من دەبینێت. بە هەمان تاسوحەمام، باسی عەرش و مەلەیاقووتییە کلکدرێژەکەی

---

[٦]-بێهەژمار

دەرکرد. بەدرێژایی ئەو گەشتەمان باسی هەمووشتێکمان کرد، وەک ئەوەی دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی بووبین و ماوەیەک لێک دابڕابین، نەک دوو کەســـــی غەریبە بین و بۆ یەکەمجار یەکترمان بینی بێت. نازانم بۆچی هەردووکمان کەوتینە بەر بەســــەرهات و قەوماوی ژیانی خۆمان، هەرچییەک لە منداڵی بەسەرمان هاتبێت، بۆ یەکتریمان گێڕایەوە. من باسی مورسیە و باوکم و ئیبن مەردەنیش و فاتیمەی کچی موسەننا و ئیشبیلیا و جەنابی کومی و ئیبن ڕوشد و فریدریکم بۆ کرد. ئەویش باسی ژمارە و حیساب و کتێب و دانراو و هەندەسە و جەبری خۆی بۆ کردم. قســـەی لەبارەی ئەندازیاری دەکرد و چەندان شــکڵی چوارگۆشــە و بازنەیی لە هەوادا دەکێشــا، دواتر بە یەکی دەگەیاندن و بە نێو یەکتریدا دەبردن، ئینجا ژمارەکانی تێکدەشکاندن...ئەوسا نیشانی دەدام چۆن نیوە دەبێتە نیوە و سێیەک دەبێتە ســێیەک و چوارێک دەبێتە چوارێک. کاتێک گەیشــتینە بیجایە لەوەنەدەچوو چەند ڕۆژێک بەڕێوە بووبین، بەڵکە وامانزانی چەند سەعاتێک بووە.

هەتا بڵێی دڵخۆش و شادبووین، من بە هاوەڵیی حەسار و مەریەمی هاوژینیشـــم بە نزیکبوون لە خزم و کەســـوکاری. گوێم لێ بوو، گۆرانییەکی پڕ سۆز و غەریبی دەچڕی. لەگەڵ زەینەبی کچی، چووە نێو کەســـوکاری، ئێمەی پیاوەکانیش لە مێوانخانەیەکی کەنار دەریا دابەزین، بۆ ئەوەی هەرکاتێک کەشـــتییەکمان دەســـت کەوت، بمانگەیەنێتە ئەســکەندەرییە. دوای چەند ڕۆژێک خەبەرمان بۆ هات، کە ئاوی نیلی میسـڕ دابەزیوە. وڵات تووشـی قاتوقڕی و گرانییەکی زۆر بووە. زۆری لە میســرییەکان لە ڕێگەی قافڵەکانەوە، ڕوویان لە بیجایە کردبوو، هەواڵی زۆر ســـەیر و ســـەمەریان باس دەکرد. دەگوترا خەڵک گۆشـتی مرداربوو دەخۆن، کەسـانی ئازادیش خۆیان دەفرۆشـــن و دەبنە بەندە، هەر نوێژێک دەکرێت و جەنازەیەکی بەدوادا دێت. حەسـار، پێداگرییەکی زۆری بۆ گەشـتی قاهیرە دەکرد،

دەیگوت دەبێ بەر لە حەج بچینە ئەوێ. بڕیارمان دا تا دۆخی میسڕ ئاسایی نەبێتەوە، هەر لە بیجایە بمێنینەوە. قافڵەگەلی میسڕ بەبێ پسانەوە دەهاتن و دنیایەک هەواڵیشان لەگەڵ خۆدا دەهێنا. لەوێ دوو کەسی ئیشبیلیم بینین، لە ترسی ئەو بارە ناهەموارەی میسڕ هەڵاتبوون. هانایان بۆ هێنان و لەگەڵماندا نانیان خوارد و خەوتن، باسی خەڵکی ئەندەلوسی ناو قاهیرەیان دەکرد. لەهیکڕان ناوی حەریر و خەیاتیان بەسەر زماندا هات.

- ئەوان هاوڕێی من بوون، پێم وایە لە مەککەن!

- لە ڕێگەی چوونە مەککە، براگەورەکە نەخۆش دەکەوێت، ئیتر نەخۆشی لە شاری قاهیرە بەندی دەکات.

- ئەی خودایە! نەخۆشییەکەی توند بوو؟

- وەک بڵێی تووشی شەلەل بووە، نانی دەخوارد و ئاوی دەخواردەوە، بەڵام لە بزاو کەوت.

- ڕەحمەت و ڕەئفەتی تۆ خودایە.

سەرەڕای ویستی حەسار بۆ سەفەری میسر، هۆیەکی دیکەیش بۆمن هاتە پێش. هەرچەند جێگەی من لە بیجایە زۆر خۆش و دڵڕفێن بوو، بەڵام لەپێش چاوم لێڵ و تەماوی بوو، چاوەڕێی هەلێکم دەکرد بە زووترین کات بگەمە میسر، وەلێ هەتا دەهات، هەواڵی ناو میسر ناخۆش و دژوارتر دەبوو، ڕاستییەکەی بوێریی ڕۆیشتنمان نەدەکرد. زۆرینەی کاتەکانم لەگەڵ حەسار بەسەر دەبرد، کتێبەکانی خۆم بۆ دەخوێندنەوە و ئەویش کتێبەکانی خۆی بۆ دەخوێندمەوە. فێری حیساباتی ژمارە بەشکراوەکانی سەر تابلۆی کردم، چۆن کەرت دەبن و بەش(جزء) دەچێتە سەر هەمووەکی(کل)، ئەگەر ویستبای دووشەشێک بنووسێت، ژمارە دووی دەنووسی، پاشان هێڵێکی بەژێردا دەهێنا، لەژێرەوە دەینووسی شەش. هەروەها فێری کردم چۆن چوارێک لەگەڵ سێیەک لێک بدەم، یان چۆن شەشێک

لەگەڵ پێنجییک کۆ بکەمەوە و دواتر لە هێندێکان کەم بکەمەوە. دوای ئەوەی بەباشی فێری بووم، پێی گوتم:
- ئێستە کاتی ئەوەیە پاداشتم بدەیتەوە.
- پاداشتی چی؟
- پاداشتی فێرکردنی حیساب و کەرتەکان.
- چ پاداشتێکت دەوێت؟
- زانســـتێکی خۆتم بۆ کورت و پوخـت بکـەوە، ئـاخر ئێمـە ئـەهلی حیسابین حەزمان لە کورتبڕییە.
دەمێـک بیرم کردەوە، نـەمزانی چی پێ بڵێم، لــە هــەموو ئــەو گفتوگۆیانەی لەگەڵ ئەو کردنم، بۆم دەرکەوت ئەو حەزی لە زانستی سۆفیگەری و فەلسـەفە نییە... خوا هەڵناگرێت ئەگەر باسـی ئەو دوو زانســـتەم بکردیایە وەک ئەدەبێک گوێی دەگرت، بەڵام هیچ شــتێکی لەبارەوە نەدەگوتن. بەهەرحاڵ، ئحمێکم کرد و گوتم:
- هاوڕێ گوێ بگرە، لە سروشتدا سێ هێزی غەیبی هەن: سرووش، عەقڵ و دڵ.
سەری خۆی هەژاند، وا دیاربوو حەزی لەو بابەتە بوو، جوان گوێی گرت، منیش بە کورتی بۆم شی کردەوە:
- ئـەگـەر مرۆڤ تـەنیـا مـەیلی ســـــرووش(وحی) کرد، کـەســــێکی ڕووکەشـــــی لێ دەردەچێت. ئەگەر تەنێ بەلای عەقڵدا چوو، دەبێتە فـەیلـەســـــووف. ئـەگـەر تـەنێ بـە جیهانی دڵەوە خەریک بوو، دەبێتە سۆفی.
- ئەی ناکرێت مەیلی تێکڕایان بکات؟
- ئەوکات دەبێت پردێکیان لەنێواندا دروست بکات.
- ئەو پردانە چۆن دروست دەکرێن؟
- لەنێوان عەقڵ و سـرووش دەبێ پردی (تەفسـیر) دروسـت بکرێت. لەنێوان سرووش و دڵیشدا دەبێ پردی (تەئویل) دابنرێت.
- ئەی لەنێوان عەقڵ و دڵ؟

- لەنێوان عەقڵ و دڵیشدا، دەبێ پردی خۆشەویستی چێ بکرێت.
دیاربوو زۆر گرنگیی بەم قسـانە دەدا و بیری لێ دەکردنەوە. ئەو تابلۆیەی، کە لە بازرگانەکانی هیند کڕیبووی دەریهێنا و ڕەشی کرد، پاشان بە جیری سپی هێندێک شتی نووسی و ڕەشی کردەوە. دواتر سێ بازنەی بۆ سرووش و عەقڵ و دڵ کێشان. ئینجا ئەو پردانەی بۆم باس کردن، دروستی کردن، وێجا بەقووڵی لێیان ڕاما. پاشان تەماشایەکی منی کرد، زەردەیەکی کرد، ڕیشە چڕوپڕەکەی جوانتر خۆی نواند. ڕووی حەسـان، وەک ڕووی ئەسپێکی جوان و ئەفسوناوی وابوو. دواتر گوتی:
- تۆ پاداشتێکت دامێ، لەسەرووی داواکاریی من بوو.
- ئەوەندەی دەتەوێت بیبە، تۆیش باقی زانستەکەی خۆتم فێربکە.
بەم تەرزە زانستەکانی حیساب و هەندەسە فێربووم. چەند جار باسێکی پاتە دەکردەوە، تاکوو بەتەواوی فێری دەبووم. ئا بەم جۆرە تا زۆربەی زانستەکانی لێ فێرنەبووم، لە بیجایە نەڕۆیشتین. کاتێک خەو لە چاوەکانم دەتۆرێت، دێم بەسەر تابلۆکەوە چوارێک و سێیەک دەنووسم، بیر دەکەمەوە، ئاخۆ حەسار چۆن ژمارەکانی کۆ و کەم دەکردن... دواتر ئەمەم لەلا دەبێتە مەلەکە و قەت لەبیرم ناچێتەوە. دوای ئەوەی زانستەکانی حیساب فێربووم، زانستەکانی داودەرمانیشی فێر کردم. بەیەکەوە چووینە باکووری بیجایە، کێوی (میسیون). بەدوای گیادەرمانییەکاندا گەڕاین. بەشێک لە گیایەکانمان تێکەڵ بەیەککردن و بە ئاوی شـلەتێن دەرمانێکان لێ ساز کرد و دامان بە زەینەب، کە هەفتەیەک تای دەگرت و هەفتەیەکیش بەری دەدا.
مانەوەمان لە بیجایە بۆ چەند مانگێک درێژەی کێشا. لە میوانخانە گواستمانەوە بۆ خانوویەکی یەکژووریی، بەڵام زۆر فەڕاح بوو، حەوشەیەکی گەورەیشی لەپێش بوو. من و حەسار و بەدر تێیدا دەخەوتین و مەریەمیش لە میوانداریی دۆتمامەکانیدا بوو، ئەوان

زەینەبیان زۆر خۆش دەویست، جلی گەورانیان دەبەر دەکرد و فێری سەما و گۆرانییان دەکرد، ڕاستیت دەوێت دایکانە بە سەروکاریەوە بوون. بڕیارمان دا ئەو مایەوە بۆ نووسین لێ ببڕێین. بەدر لە بازاڕ پەڕاوی بۆ دەهێناین و من و حەساریش بەرانبەر یەک دانیشتبووین. زانست و مەعریفەی یەکمان دەنووسییەوە، هەر وەختێک سەفتەپەڕاوێکمان دەنووسی، بەدر دەهات جزوبەندی دەکردن و لە شێوەی کتێب ڕێکی دەخستن. دوای چەند مانگێک حەسار کتێبێکی دانا، داوای لەمن کرد ناوێکی لێ بنێم، منیش ناوم نا: "البیان والتذکار فی علم مسائل الغبار". هەروەها منیش توانیم کتێبێک بنووسم، داوام لە حەسار کرد ناوێکی لێ بنێت، ئەویش ناوی نا."إنشاء الدوائر والجداول." ڕاستییەکەی ناوەکەم زۆر پێ خۆش نەبوو، بەڵام چۆن دڵم دێت بیگۆڕم، کە حەساری قاسیدی عەرشی خودا ناوی لێ بنێت.

# ٤٢

**"ترس ئەگەر سەرچاوەکەی ناخی مرۆڤ نەبوو، هیچ نییە"**
**ئیبن عەرەبی**

بەگوێرەی هەواڵەکان میسر بەرەو هێوربوونەوە دەچوو. ئێمەیش بەدوای هەلێکدا دەگەڕاین بە زووترین کات بگەینە ئەوێ. خەریکی ئامادەکاری سەفەرەکە بووین، مەریەم گوتی حەزدەکەم لە بیجایە بمێنمەوە، ئەمە بۆمن شتێکی چاوەڕواننەکراو بوو، ئاخر پێم وابوو ئەو ناتوانێت بەرگەی دابڕانی من بگرێت. چەندان پاساوی بۆ هێنامەوە، وەک: تاقەتی ئەو سەفەرەم نییە. دەترسم زەینەب لە وێ تووشی نەخۆشیی بێت. لەگەڵ کچە مامەکانی خۆش هەڵی دەکرد و بیجایەی لێ وەخۆش هاتبوو. پێی گوتم لە هەر شوێنێک نیشتەجێ بوویت، من دەگەمە لات. چەند ڕۆژێک لە داواکەی ئەو وردبوومەوە، پاشان ڕازی بووم، ڕاستییەکی بۆ منیش وا باشتر بوو، نەک لە ڕێگە نیگەرانیی ئەو و زەینەب بم.
کەشتییەکی جەنەوی تووند و مەحکەم و جوانمان گرت و سواری بووین. سەرەتا چەند سەعاتێک زۆر بە هێمنی و ئارامی بەرەو خۆرهەڵات، ڕێی کرد، بەڵام دواتر لەناکاو شەپۆلەکانی دەریا سەرکەش و شێتانە پێکیان دادا، ئێمە بەملاولادا چووین، خەریک بوو ببوورێمەوە. سێ ڕۆژی ڕەبەق کەشتی هێمن نەبووەوە، لە هیچ

شـــوێنێکیش لـەنگەری نەگرت. هەر ڕۆژێک دەڕۆیشـــت، دەمگوت ڕۆژی پێ بچین ئەمڕۆیە. شـەپۆلەکان بەوێنەی کێو بەرز دەبوونەوە و تێک هەڵدەپژان، تەنانەت کەشـتیوانەکە ترسی لە بایەوانی گەورەی کەشـــتییەکە هەبوو، داوای کرد لێی بکەنەوە و لە جێگەی ئەو، چەند بایەوانێکی بچووک دابنێن. کاتێک بایەوانێکیان بۆ کەشـتییەکە دادەنا، بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە، کە یەکێکی دیکەیان بۆ دادەنا، بەرەو پاش دەگەڕایەوە.

سـەرمان لێ شـێوا، هەموو لایەکمان لێ تێکەڵ بوو، نەمانزانی ئەو خۆرهـەڵاتـەی بۆی دەچین، لـە کام لایە! جەنەوییە دەریاوانەکان بە زمانی خۆیان دەدوان، بە دەمەقاڵێ و قسـەکانیانەوە دیاربوو ڕاڕا و ناکۆک بوون. داوامان لە پیاوێکی توونسـی کرد، کە زمانی ئەوانی دەزانی، بچێت گوێیان لێ بگرێت، دوای تاوێک گەڕایەوە و گوتی:

- ئەوان دەگەڕێنەوە بیجایە.

دواتر دیســـان لێیان بوو بـە دەنگەدەنگ و هەرا، خەریک بوو پێکدا هەڵشـــاخێن، دیســـان کابرای توونســـیمان ناردەوە، پاش کەمێک گەڕایەوە و گوتی:

- بەڵام ئەسکەندەریە لە بیجایە نزیکترە. لەوانەیە بچینە ئەسکەندەریە، یان لە توونس بمێنینەوە.

نیگەرانیم گـەیشـــتـە تۆقـەڵان، بۆ جاری ســـێیەم کابرام ناردەوە، گەڕایەوە و گوتی:

- ئـەوان دەیـانـەوێت بـەرەو بـاکوور بۆ (جنوا) بڕۆن، بـەو ئومێدەی دەریا هێندێک هێوربببێتەوە.

هەر کەڕەتێک ئەو پیاوەم دەنارد، هەواڵی ناخۆشـــتری بۆ دەهێناین، ئـاخری ســـوێندم خوارد نـابێ جارێکی دیکە بینێرینەوە. با ڕوو لە خودا بکـەین و لـەبـەری بپاڕێینـەوە، داوای لێ بکـەین وشـــکانیمان نیشـــان بداتـەوە و ئاو لە کەمی بدات و لە جێگەیەک کەشـــتییەکە لەنگەر بگرێت، بەڵام دەریاکە بە شـــەو و ڕۆژ هەر هێور نەبووەوە،

بۆ ســـــاتێکیش چاوەکانم نەچوونە خەو، خواردن و خواردنەوەم لە ســـکدا نەما. لە برســـــان و بێخەویان، هۆش و گۆشـــم نەمابوو، بەتەواوی لێم شـــێوابوو. لە ســـــووچێکی کەشـــتییەکە، لەنێو دوو سندووقی پڕ لە کالا و کەلوپەل پاڵکەوتم، بەو ئومێدەی سندووقەکان توندوبەندم بکەن، زۆری پێنەچوو دانەکیان بەســەرمدا هات و دوو پـەنجـەم کـەوتنـە ژێریـەوە، خـەریـک بوو بقرتێن. هـەڵبـەزیمـەوە و تووڕەبووم، چوومە لێواری کەشتییەکە و هاوارم کرد:

- ئەی دەریـای ئـاو، تکـایـە هێمن بـەوە، مـەگین نـازانی دەریـایـەکی زانستت بەسەرەوەیە!

لەم قسانە دابووم، کەشتی هەڵشڵەقا، خەریک بوو بەربیمەوە. سەرم ســـووڕا و بەســـەر پشـــتدا کەوتم. بە دەنگێکی شـــەکەت و ماندوو هاوارم کرد. دەریاوانە جەنەویەکان ســـکیان پێم ســـووتا، بۆ ئەوەی سەرسووڕکەی دەریام لەسەر بڕوات، بە زۆر گیراوەی زەنجەبیلیان وەســــەر دەم کردم. دوو لـەوان منیـان بردە ژوورەکەی خۆیـان لە دواوەی کەشـتییەکە. دایاننیشـاندم و پشـتیان بە گیشـەپووشـێک دام، کە بەکۆنە لێفەیەک دایانپۆشـــیبوو. دەگەڵ یەکتر بە ڕۆمی قســـەیان دەکرد، هیچیان لێ تێ نەگەیشـتم. لە ئاگردانە بچووکەکەیان ئاوریان کردەوە، خۆشـــــاوێکیـان لـە جۆرە ســـــەوزەیـەک، کـە شـــێوەی بەقەدەنووســـی دەکرد بۆ کولاندم و وەســـەر دەمیان کردم. ویســـتم پاڵ بکەوم نەیانهێشـــت، یەکێکیان ئاماژەی بۆ کردم، کە بە ئەســـتۆ قیتییـەوە دانیشـــــم. منیش بـە زەحمـەت توانیم وا بکـەم، وردەوردە هەستم بە ئاسوودەیی کرد.

لە کۆتاییدا بەدر و کابرا توونســـــییەکە، کە بەزمانی ڕۆمی قســــەی دەکرد، هاتنە ژوورەوە، وا دیاربوو بەدر زۆر بە دوای مندا گەڕابوو. منیان بردەوە شـوێنی خۆم و تەندروسـتیم باشـتر بووەوە. یەکێکیان پارچـەپەڕۆیەکی بۆنگولاوی دامێ، داوای لێ کردم ناوەناوە بیخەمە

ژێر لووتم، منیش وام کرد. هەر کە منیان بردەوە جێگەی خۆم، بۆ یەکەم جار لەوەتەی سەر ئەو کەشتییە کەوتووم، خەوم لێ کەوت.
بەیانی ڕۆژی پێنجەم، خۆر لە ئاسمانێکی ساف و بێگەرددا، خۆی نیشان داینەوە. دەریا هێوربووەوە و کەشتی هاتەوە سەرخۆ، بە ڕوونی گوێمان لە قرچەقرچی دارەکە بوو، کە بە هۆی باهۆز تێک شکا. دەریاوانەکان بەدەم گوتنەوەی سروودێکی حەماسی ڕۆمی، جارێکی دیکە بایەوانە گەورەکیان داناوە. موسڵمانەکان سوپاس و ستایشی خودایان کرد و دەستیان بەسەر ڕوخساری خۆێ لەسەر نیشتوودا هێنا. لە کۆتاییدا گەیشتینە ئەسکەندەرییە، بەڵام دوای چی؟ خەریک بوو شێت بم و لە پەلوپۆ بکەوم. ئیتر دەریام نەفرەتباران کرد و سوێندم خوارد ئەگەر زۆر ناچار نەبم جارێکی دیکە سواری کەشتی نەبمەوە... ڕاستییەکەی سوێندەکەیشم بەجێ هێنا، دوای ئەو گەشتەم، جارێکی دیکە سواری کەشتیی نەبوومەوە. ڕێوانە ڕۆمیزانەکەمان هات و گوتی: دەریاوانەکان داوا دەکەن ئەگەر کالایان پێ بێت، لای بەندەرەکە باج بدەن. حەسار پێکەنی و هێمایەکی بۆ سەری خۆی کرد و گوتی:
- کاڵای من ئەوەیە!
ڕێوان لای لەمن کردەوە و منیش ئاماژەم بە دڵم کرد و گوتم:
- کاڵای منیش لێرەیە.
ڕێوان گەڕایەوە لایان، وایزانی گاڵتەی پێ دەکەین.
وەختێک کەشتی لە بەندەر نزیک کەوتەوە، پیاوگەلێک بانگیان کردین و گوتیان تاکوو باجمان نەدەنێ، دانەبەزن. چوار کەسیان سەر کەشتییەکە کەوتن، لەنێو کەشتییەکە بڵاوەیان کرد. یەکێک گەشتیارەکانی دەژمارد. دانەیەکیان دابەزیە لای ئاژەڵەکان. یەکێکیشان خەریکی تۆمارکردنی کاڵا و لێپرسینەوەی دەریاوانەکان بوو، ئاخۆ لە کوێیان هێناون و چین و چۆنن. چوارەمیشیان

شــمشــێرێکی بەدەســتەوە گرتبوو، چاودێریی هەموومانی دەکرد. داوای کرد سندووقەکان سەف بکەن، پاشان گوتی:

- ئەوانە هیی کوێن؟

- بازرگانێکی جەنەوی هات و بە عەرەبییەکی ڕەکیک هاتە قســە و گوتی:

- ئی منن.

- چی لەو سندووقانە دەکەیت؟

- کاڵای بازرگانین.

- دەی زەکاتیان لێ دەربکە.

کابرای جەنەوی ئاماژەی بە چەند ســندووقێکی جیاکراوە کرد و بە ئەمینداری گوت:

- زەکاتیان لێ دەردەکەم، بەڵام ئەمانە هێشــتا ســاڵیان بەســەردا نەسووڕاوەتەوە.

ئەمیندار بێباکانە سەری خۆی لەقاند. بازرگانەکە گونیەیەکی پڕکوتاڵ و پریاســکەیەکی پارەی دایە دەســت ئەمیندار. ئەویش پشــکنی و دایەوە کەسێکی بەردەستی خۆی. حەسار ئاوڕێکی لێ دامەوە و بە ســەرسووڕمانەوە بزەیەکی کرد و منیش بزەم بۆ کردەوە. وەختێک لە بەندەردەکە دوورکەوتینەوە، بە پێکەنینەوە گوتی:

- ئەو ئەمیندارە چەند ســەیرە، زەکات لە غەیرە موســڵمانیش وەردەگرێت!

بەڵێ، ئەمیندار و پیاوەکانی لە کەشــتی دابەزین، لەبری وان حەمباڵ و بەڕێوەبەرەکەیان ســەرکەوت. بەڕێوەبەر لەگەڵ بازرگانەکاندا لەبارەی کرێبار گفتوگۆیان کرد، دواتر بەزوویی گەیشتنە ڕێککەوتن... ئینجا بەڕێوەبەرەکە فەرمانی بە پیاوەکانی دا و کاروباری بەســەردا بەش کردن. لە زمانی بەڕێوەبەری حەمباڵان لەهجەی میســرییم بەرگوێ کەوت. باری نێو کەشــتییەکەیان داگرت: تۆڕی پڕ لە مەرجانی وشکی توونسی. کۆزەڵەی پڕ لە شلەی دیباغ و زەیتوون

و شــەڕابی شــاری بندوقیە. ســندووقی پڕ لە ئاوریشــم و عەنبەر و ڕایەخی ئەندەلووس. جلی سووف و پێستیی جنوا. شیشی ئاسنین و قەســـــدیڕ لـە ولآتی غـالدا. ئەو بەندانەی لەنێو کەشـــــتییەکە کاریان دەکرد، لـە چـەند ڕیزێکدا وەســــتان، پەتێکی درێژیان لە دەســـــتی هـەموویـان کردبوو، بـەرەو بـەنـدەرەکـە هێنـانیـان. لـە کۆتـاییـدا نێو کەشـــتییەکە بەتاڵ کرا، دوای ئەوەی بازرگانەکان لە ســـەلامەتی و کـەمنـەبوونی کەلوپەل و کاڵاکانیان دڵنیابوون، ئینجا ڕێگەیان بە ئێمە دا بێینـە خوارەوە. مووی وشـــکی ســــەر پێیـەکان، زۆر خۆش و دڵحەسێن بوو.
ئێســـتە وا لەســـــەر هەرد دانیشـــتووم، تاوێک ســـەر بە خۆمدا بەر دەدەمەوە و بێدەنگ دەبم، گاوێک ســـەر بۆ ئاســمان بەرز دەکەمەوە و بە قووڵی هەناســە دەدەم. دوای چەندان ڕۆژ ڕۆیشــتن و وەســتان و خەوتن و دانیشــتن و ڕاســت و چەپکردنی کەشــتییەکە، ها ئەوەتە بـەرەبـەرە هـاوســــەنگیم بۆ دەگـەڕێتەوە. خەڵکەکە بەمن پێدەکەنین، بەڵام من هیچ گوێم پێ نەدەدان. حەسار گوتی:
- ئـەگـەر خودا داینـابێت بگـەڕێینـەوە، ئـەوە بـەوشـــــکانیدا دەچینەوە مەغریب.
بەرەو لای پارەگۆڕ چووین، لەپشت مێزێکی گەورە دانیشتبوو، چەند تەرازوویەک و ژمارەیەک پریاســکەی بچووکی بەتاڵی بەســـەرەوە بوون. چەند کەسێک بۆ پارە گۆڕینەوە، سرەیان گرتبوو. دەرهەم و دینارەکانی (موەحیدیە)ـــی خۆمان هەڵدانە پێش، کێشـانەی کردن و بۆنی کردن، بـەر لـەوەی بیـانگۆڕێتـەوە، گوێی بۆ ترینگە و زرینگەی ڕاگرتن. دینـارە نوێیەکانم لەنێو پریاســـکەکەم کردن، حەســـــاریش هـەروا. دواتر چـەنـد منـداڵێکمـان بینی خورمـا و میوەیـان بـەســــەر هەژاراندا دابەش دەکرد، پرســــیارمان لە یەکێکیان کرد میوانخانە و خانەکان دەکەونە کوێ؟ تەماشـــای جلە مەغریبییەکەم و ســـــەر و هەیکەلی کردم و گوتی:

- ئەگەر خەڵکی مەغریبیت، ئەوە بڕۆرەوە خانی مەغریبییەکان.
بەدەست ئاماژەی بۆ شوێنەکە کرد. گەیشتینە خانی مەغریبییەکان، ژمارەیەکی زۆریان لەوێ بوون. چووینە ژوورێکی فراوان، تەخت بەرانبەر تەخت دانرابوو. چوار تەخت جل و کەلوپەلی خەڵکیان بەسەرەوە بوو، پێنجی دیکەیش جگە لە نوێنی خاوێن هیچیان لەسەر نەبوو. هەریەکەو تەختێکمان گرت، خۆمان شۆرد و نوێژمان کرد و خەوتین. ڕۆژی دواتر لەبەرانبەر خانەکە گوێمان لێ بوو منداڵێک دەیگوت:
- مەغریبییەکان نانم هێناوە نان...
خزمەتکاری خانەکە سەبەتەیەکی بەدەستەوە بوو، چووە لای منداڵەکە و پێی گوت:
- حەوت...
منداڵەکە چواردە کولێرەی بۆ ژماردن و خستنیە نێو سەبەتەکە. خزمەتکاریش یەکەو دوو نانی خستە دەستی هەموان. پرسیارم لێ کرد:
- ئەوە سەدەقەیە؟ من سەدەقە ناخۆم.
- ئەوە نانی مەغریبییەکانە.
- یانی چی؟
خزمەتکار شانی خۆی ڕاتەکاند، وەک ئەوەی هیچ زانیارییەکی لەبارەوە نەبێت. گەشتیارێکی دیکە، کە گوێی لە گفتوگۆی ئێمە بوو، هاتە پێش و گوتی:
- هەر لە سەردەمی سەلاحەدینەوە ئەو نەریتە باوە: بۆ هەموو مەغریبییەک دوو نان.
- بۆچی تەنیا مەغریبییەکان؟
پیاوەکە پێکەنی و ڕۆیشت، بە ورتەورت دەیگوت:
- خودا خۆشەویستیی ئێمەی خستووەتە دڵی ئەو. دەی بخۆ و تێربە.

گەڕامەوە و لەتەک حەسار دانیشتم، دیاربوو ئەویش بەبێدەنگی گوێی بۆ گرتبووین، گوتی:
- لەو کەینوبەینە تێگەیشتی؟
- نەخێر، بەڵام دەزانم نانی سەدەقە دەخۆم.
بەدر خۆی تێهەڵقورتاند و گوتی:
- ئەبووغەنائیم دەڵێت: "سەلاحەدین زۆر کەیفی بە مەغریبییەکانی میسر دەهات، چونکە ئەوان هەم سوننەن و هەمیش سۆفین، دەی بەشکم خودا بەهۆی ئەوانەوە فاتیمییەکان لە ڕیشەوە بێنێت."
- کەواتە نانەکەمان دیاری و بەخششی مێوانە، نەک خێر و سەدەقەی ڕێبوار؟
حەسار گوتی:
- بەڵێ، تەواوە.
ئینجا دەستم بە خواردنی کولێرەکانم کرد.

## ٤٣

**"تا ڕێز لە سەرلەبەری بوونەوەران نەگریت، بە هیچ پایەیەکی ئایینی ناگەیت"**
**ئیبن عەرەبی**

دوای دوو ڕۆژ، قافڵەیەکمان دەستکەوت بەرەو قاهیرە دەچوو. حەسار بەیانییەکەی زوو خەبەری بووەوە، گوتی بەرلەوەی ئێرە بەجێ بهێڵین، پێم خۆشە تاوێک بەنێو ئەسەکەندەریەدا بسووڕێینەوە. بەر لەخۆرهەڵات، لە خانی مەغریبییەکان هاتینە دەر و بەنێو ڕێگەوبانەکانی ئەسکەندەریەدا پیاسەیەکمان کرد، حەسار مەدهۆش بووبوو. ڕووی تێکردم و ئەندازیارانە قسەی بۆ کردم:

- لە هەر ڕێگەیەکی ئەسکەندەریە دەکرێ خانوویەکی مەغریبی فاسی دروست بکرێت، دوو ڕێچکەی لەملاولادا هەبن، بە هەر یەکێکیاندا دوو چێڵ بڕۆن و لەیەکێش نەخشێن.

لەیەکێک لە ڕێگەکانی ئەسکەندەریە وەستا و بە جەستەی خۆی پێوانەی پانییەکەی کرد. بۆ ئەوەی بگاتە لایەکەی دیکە، باسکەکانی کردنەوە، یەک دووجار خولایەوە. ئەمەی لە تابلۆکەی بەردەستی تۆمار کرد، ئەوسا ڕۆیشتین و گەیشتینە زەوییێکی ڕێکوڕاست، بەپێچەوانەی شاری فاس هەوراز و نشێوی نەبوو. لەوێ زۆر گالیسکەمان بینین، کەرگەل بەسێنایی بەنێو شەقامەکاندا ڕایاندەکێشان. چووینەوە ئەو بەندەرەی، کە گەمیەکەمان لەنگەری لێ

گرتبوو. بۆ یەکەمجار، بە بیر و زیهنێکی ڕوون تەماشـــام کرد، بینیم کراوەتە دوو بەش: بەشـی خۆراوا، بۆ کەشـتی خەڵک و ڕێبواران و بازرگانان تەرخان کرابوو. بەشـــی خۆرهەڵاتیش، بۆ کەشـــتیگەلی جـەنگیی ئـەیبوویـەکـان دابین کرابوو. ژووری بچووک بچووک لـە شـــکڵی چەند هێڵێکی یەکســـان لە دەوریان دروســـت کرابوون، ســـەربازەکان لە نێویاندا ســـەنگەریان گرتبوو. هەر هێڵێکی ژوورە بچووکەکان، تاقمێکی کەشـــتیوانییان تێدابوو، بۆ وەی هەر وەختێک بـانـگ کران، بـەزووترین کـات وەڕێ بکـەون. لـە دوای ژووری سـەربازەکان، گۆڕەپانێکی گەورە بۆ چاککردنەوەی کەشـتی تەرخان کرابوو: ئاسنگەر، تەونگەر، دارتاشی تێدا بوون. دوای گۆڕەپانەکەیش خانوویەکی گەورەی وەک زۆربەی خانووەکانی شـار، بەسـەر چەند دینگەیەکی گەورەوە دروســت کرابوو، کە دیوانی کەشـتیگەلیان پێ دەگوت.

خۆر هەڵات، تیشکی بە هەموو لایەکدا پەرشوبڵاو کرد، دووکانەکان کرانەوە و ڕێگەوبان لە خەڵک جمەی هات. بەندەرەکەمان جێ هێشت و بـەرەو نـاوەڕاســـتی شـــار کـەوتینـە ڕێ. بە بـازێڕی فەرەنگیان ڕەتبووین، لـە ســـەرجـەم شـــارەکـانـدا مێوانخـانـەی لێبوون، خزمەتکارەکان بە زمانی وان دەپەیڤین و بە کلتووری وان خواردنیان چێ دەکرد.

مێوانخـانـەی بندوقییە، میوانخـانـەی تســـکانە، میوانخانەی دنمرکە، میوانخانەی ســـکســـونیا، میوانخانەی ڕووســـیا، میوانخانەی جنوە، میوانخانەی نورماندیانی لێ بوون. حەسار گوتی:

- سەرت لەمە نەسووڕما؟

- لەچی؟

- مەلیک عادل، بازێڕێکی تەواوی بۆ ئەوان تەرخان کرد. ســـەرانە و باجی لێ وەرگرتن و سوپای پێ پڕ چەکوچۆڵ کرد...

هێشـــتا قســـەکانی تەواو نەکردبوون، بەربووەوە. بە دڵی خەمناکەوە چوومە ســـەری، دیتم لاجانگی خوێنی لێ دەچۆڕێتەوە، نەمزانی چی بوو، شـــتێک بەر ســـەری کەوت و بەری دایەوە. گەنجێک بە گۆرگەلۆقە لێمان نزیک کەوتەوە، وەک من، پەرێشانانە خۆی گەیاندە حەسار:

- ببوور، ببوورە! بمبەخشە... بە ئەنقەست وام نەکرد.

- حەسار دانیشت، بە دەستەکانی خوێنی سڕییەوە و زیکری خودای کرد. کاتێک دڵنیابووم وەهۆش خۆی هاتووەتەوە، تەماشای ئەو دارە خواروخێچەم کرد، کە پێی کەوتبوو، قەت شـتی وا سـەیرم نەدیبوو. دەستم دایێ و ڕووبەڕووم کردەوە و بە تووڕەییەوە پێم گوت:

- کوڕە ئەمە چییە؟

مێردمنداڵەکە دەســـتی بە کەلەکەیەوە گرت و ترســـا، بە دارعەســـا خوارەکەی لێی بدەم، بەپەرواوە گوتی؟

- ئەوە عەسای فیرعەونە.

- عەسای فیرعەون؟

- بەڵێ عەسـای فیرعەونە، بۆ ئەو کەسـە دەگەڕێتەوە، کە فڕێی دەدا، نازانی چۆنە؟

- حەســـار چوارمەشـــقی لێی دانیشـــت و تەماشـــای ئێمەی کرد و دەســـــتیشـــــی بە لاجانگەکەیەوە گرتبوو، بە بایەخەوە گوێی بۆ ڕاگرتبووین، بە دەنگێکی کز گوتی:

- چۆن بۆ فڕێدەرەکەی دەگەڕێتەوە؟

- منداڵە هەراشـبووەکە عەسـاکەی لەمن وەگرت و بەرەو ئاسـمانی هەڵی دا، بەرەو ئاســـمان بەرز بووەوە و خولایەوە، تاکوو وای لێ هات بەئاستەم دیاربوو، دواتر وردەوردە هاتە خوارەوە و گەورەبوو، پاشـان بەرەو لای ئێمە گەڕایەوە، منداڵە باخۆشـەکە خۆی بۆ هەڵداو گرتییەوە. ئینجا دایەوە دەسـتی من، بۆ ئەوەی منیش تاقیی بکەمەوە، تەماشـــای حەســـارم کرد، بزەیەکی کرد. وەک منداڵەکە تێم هەڵدا، بە

هەوادا فڕکەی کرد، بەڵام بۆمن نەگەڕایەوە، بەڵکە بۆ ئەو شـــوێنە گەڕایەوە کە لێم فڕێ دا. منداڵەکە غاریدا و هەڵی گرتەوە و هێنایەوە و دایە دەستی حەسار، ئەویش بە دانیشتنەوە تێی ڕاما و هەڵگێڕا پێ کرد، وەک ئەوەی دارعەســاکە پێوانە بکات. ســەری خۆی بادا و بە سەرسووڕمانەوە بە گەنجەکەی گوت:

- نرخەکەی چەندە؟

- مامە، لە بازاڕ پێنج دانەی بە یەک دەرهەمن.

- ئەی نرخی دانەیەکیان چەندە؟

- پێنج عەسا، بە دەرهەمێک.

- بەڵێ کوڕی شیرینم. ئەگەر پێنج دانە بە دەرهەمێک بن، ئەوە مانای وایە یەک دانەی دەکەوێتە پێنجیەکی درهەمێک. تێگەیشتی؟

گەنجەکە بێباکانە سەری خۆی هەژاند و دەستی خۆی بۆ دارعەساکە درێژ کرد، بەڵام حەسار درهەمێکی دایێ و پێی گوت:

- ئـەوە بۆمن جێ بهێڵـە، پێنج دانـەی دیکـەت بۆ دەکڕم، ئـەوجا بڕۆ سەروپۆتاڵی مەغریبییەکانی پێ دابهێنە.

منداڵـەکە زەردەیەکی کرد و لە شـــەرمان ملی کەچ کرد. حەســـار بەزەحمەت خۆی قیت کردەوە و بە ئازارێکەوە ســەری خۆی بادا و پێکەنی. ڕۆیشـــتین، هـەتـا گـەیشـــتینـەوە خـانووی مـەغریبییـەکـان دارعەســـاکەی هەر بەدەســـتەوە بوو. بە بەدرم گوت جلێکی پاکی خۆی بۆ حەســار بهێنێت. جلە پیســەکانیشــی، کە لە خوێندا شــەڵاڵ بووبوون، بە منداڵێکی ناو خانووەکەم دان تا بیانشـــوات. برینکەی کەم بوو، هێشـــتا نەگەیبووینە جێ، خوێنەکەی چکی کرد. حەســـار کەمێک خەوت و پاشـــان دوای عەســـر تا خۆرئاوابوون مەشـــق و ڕاهێنانی لەســـەر دارعەســـاکە کرد. لە ڕووپەلێکی گەورەدا، چەندان وتـە و ژمـارەی لـەبـارەوە نووســـین، کـارامـە و هونـەرمـەنـدانـەیش وێنەیەکی زێدەجوان و قەشەنگی بۆ کێشا.

# ٤٤

"هەر بەڵایەك نەبووە ئەزموون، هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێت"

ئیبن عەرەبی

لە ئاخری بە شـــــەوق و ئەوینێکی زۆرەوە، بۆ دیدەنیی خەیات و حەریری وەڕێ کەوتین. ڕێگەی ئەو دوو شارە بە قافڵەگەل تەنرابوو، بێترس، شـــــەوانیش ڕێگـەمـان دەبڕی. چـەنـد لادێیـەک کـەوتبووە نێوانیان، خەڵکەکەی دەهاتن تێشـــوویان بە قافڵەکان دەفرۆشـــت و ئاویان بۆ دەهێنان، بەشێکک لەو گەشتیارانەی، کە تێشوویان لەگەڵ خۆدا نـەهێنـابوو، لـەوێـان دابین دەکرد. دوای کـەمێـک ڕێکردن، گەیشـــتینە دەمەنهوور، میوە و ئاو و چیلەمان دەســـتخســـت و بە گرِوتینەوە کەوتینەوە ڕێ. لە کۆتاییی ڕۆژی ســـێیەم، گەیشـــتینە قاهیرە. چووینە ئەو خانەی، کە بەدر بۆی دەســـتنیشـــان کردبووین، شـــەو لـەوێ مـاینـەوە و خـەوتین. بـەیانی ڕۆژی دواتر بەرەو ماڵی خـەیـات و حـەریری ڕۆیشـــتین. بـەدر لـە خـان زانیـاری تـەواوی وەرگرتبوو. دەیزانی لـەکوێن، هـەرکە گەیشـــتینە وێ، ئەهلی کۆڵان ئێمـەیـان بردە خـانووەکـەی وان. ڕاســـتییەکەی خانوو نەبوو، بەڵکە ژوورێکی بچکۆلانەی پاشـــکۆی خانەقای ســـۆفیان بوو. ســـەردەری دەرگەیان زۆر نەوی بوو، لەگەڵ حەســـار ســـەرمان نەوی کرد و چووینـە ژوورەوە. حـەریری بـە شـــــەوق و زەوقـەوە هـات و بـە

ئەوینێکی زۆرەوە، ماوەیەکی درێژ منی لە باوەش گرت. پاشـــان لە خۆشـی بینینی من، حەسـار و بەدری حەبەشـیشـی لە باوەش گرتن، کە نەیشی دەناسین... وەلێ من و ئەو باوەشمان لێک نەدا! ئاخر ئەو لە سـوووچێکی ژوورەکە خەوتبوو، چەند لێفەیەکیشـی بەسـەردا هەڵکێشرابوو، پەڕۆیەکی تەڕیشی بەسەر نێوچاوانەوە بوو.

- ئەحمەد ئەوە چییەتی؟

- تۆزێکی دیکە وەخەبەر دێتەوە. لەوەتەی ئەو درمە پیسە ڕووی لە وڵات کردووە، ئەوە حاڵیەتی.

- گرانەتایەتی؟

- بەڵێ سەرەتا گرانەتای بوو، دواتر لەپێ کەوت.

لێی نزیک کەوتمەوە، کە بەم جۆرە دیتم، دڵم پارەپارە بوو. نێوچاوانم ماچ کرد، هیچ هەستی بە من نەکرد. دەستیم خستە نێو دەستی خۆم. ئەوسا چوارمەشـقی لەتەکی دانیشـتم. حەسـاریش وەک منی کرد. حەریریش هاتە کنمان دانیشت و دەستمان بە قسەکردن کرد. دوای تێپەڕینی سـەعاتێک، پرسـیاری دۆخی ئەندەلوسـی لێ کردم، منیش باسی لافاوەکەم بۆ کرد، کە چ وێرانە و کاولکارییەکی بەداوی خۆیدا هێنابوو، دەسـتی بە گریان کرد و فرمێسـک لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە. دەسـتم لە شـانی دا تا ئارام بێتەوە، بەڵام گریانەکەی بە جۆشتر بوو.

- هێوربەوە ئەحمەد، هێوربەوە.

- موحی! دنیام لێ وەتەنگ هاتووە.

- بۆچی؟

- نابینی من و برایەکەم چیمان لێ هاتووە؟ نە لە ئیشبیلیا ماینەوە، نە گەیشتینە مەککەیش. لەوەتەی هاتووینە قاهیرە برایەکەم تووشی ئەو نەخۆشـییە بووە. لەم وڵاتەیشـدا کەسـمان نییە. لێرە چەقیوین، لەبەر برایەکەم نە دەتوانم بگەڕێمەوە ئیشبیلیا، نە دەشتوانم بڕۆمە مەککە.

لەگەڵ دەنگی گریاناوی حەریری، خەیات وەخەبەر هات. پرتەیەکی لە دەمەوە هات، تێی نەگەیشتم. حەریری لە جێگەکەی قیتی کردەوە و داینیشاند، بە دەنگێکی بەرز بە بنگوێیدا هاواری کرد، وەک ئەوەی قسە بۆ کەسێکی کەڕ بکات:

- ئەوە موحییەدینی ئیبن عەرەبی و هاوڕێکانینی...

بە دوو چاوی زەق و زۆپ تەماشـای کردین، وەک ئەوەی لە غەیبووبە دابێت. حەریری لێی پاتە کردەوە، ئینجا هاتە گۆ. لای چەپی لەبزاو کەوتبوو، لێوەکانیشی بەرەوخوار داکشابوون، زۆر بە قورسی و ناڕوونی گوتی:

- بەخێربێن، بەخێربێن... بەخێربێن، بەخێربێن.

دەستم گرت و بە سنگمەوە گوشی، ڕوومەت و شانیم ماچ کرد، ئەویش هەر دەیگوت: بەخێربێن، بەخێربێن...پاشـان تاوێک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی بیر و هۆشی خۆی کۆ بکاتەوە.

پرسیاری لێ کردم:

- کەی ... گەیشتی؟

- دوێنێ برام.

پاشـان ورتەیەکی کرد و تێی نەگەیشتم، حەریری پرسیارێکی لێ کرد:

- چیت گوت؟

دیسان قسەکەی پاتە کردەوە، بەڵام ڕوون نەبوو، حەریری قسەکەی بۆ ڕوون کردمەوە:

- دەڵێت زەینەب چۆنە؟

- زۆرباشە، لەگەڵ دایکی لە بیجایە ماونەتەوە.

هەستم کرد، دەیەوێت لێوەکانی بەبزە بخات، بەڵام نەیدەتوانی. سەیرێکی حەساری کرد، بۆ لای وی وەرسووڕا، لێ، نەیتوانی چاوی تێ ببڕێ، منیش هەوڵم دا پێی بناسێنم:

- برا و یاوەرم محەمەد حەســـارە، یەکێکە لە زاناکانی مەغریب، کەســـێکی هێژا و بەڕێزە. خەونم بینی، خودا فەرمانی پێ کردم بە هاوەڵیی ئەو بچمە مەککە.

خەیات بە زەحمەت ســـەری خۆی بەرزکردەوە و تەماشـــایەکی حەساری کرد و گوتی:

- خودا چی حەز بکات هەر ئەوە دەکات...

ماوەیەک بێدەنگ بووین. حەریری باسـی سـۆفییەکانی کۆڵانی خۆی بۆ کردم، کە لە خانەقای هاوسێیان دەمێننەوە و ئیعتیکاف دەکەن.

من دەمێک تەماشـــای ئەوم دەکرد و تاوێکیش لە خەیات ڕادەمام، هەسـتم کرد ڕوانینەکانی غەفڵەتگیرانە و بێئاگایانەن، بێوەی هەسـت بکات، لیکاو بە لالێوەکانیدا هاتە خوارەوە. حەریری بۆی دەسڕییەوە و قسـەشـی دەکرد، لە هیکڕا خەیات قسـەکانی حەریری بڕین و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- من نەخۆشم موحی... من نەخۆشم!

دیسـان چوومە لای و دەباوەشـم گرت و سـەریم بە سـینەمەوە نووسـاند. دەسـتی کرد بە گریان، بێوەی هەسـت بکات ئاو لە دەم و زاری دەهاتە دەر و دەکەوتە سەر جلەکانم.

حەسـار بە بینینی حاڵی شـەپرێوی خەیات، زۆر تێکچوو، ناوەناوە (لاحول ولاقوة)ـەی دەکرد. حەیری بێدەنگ بوو، حەبەشیش بە خەم و حەسرەتەوە لەو دیمەنەی دەڕوانی. پێم گوتن:

- دەکرێ بەتەنێ جێم بهێڵن؟

هەموو هەسـتان و لەبەر قاپیەکەی دەرەوە دانیشـتن. لەتەک خەیات درێژبووم و دە ئامێزم گرت، سـەریم خسـتە سـەر سینەم و دەسـتم خسـتە سـەر تەوێڵی و بەنەرمی فشـارم خسـتە سـەر لاجانگەکانی و دەستم بە خوێندنی سوورەتی یاسین کرد.

# ٤٥

**"دڵ ئەگەر خەمی نەما، وێران دەبێت"**
**ئیبن عەرەبی**

لـەوەتـەی خـەیـاتم بەم حاڵەوە بینیوە، دڵم پڕ ژان بووە، ناتوانم وەک ئەو خەڵکە بەئاسایی لە قاهیرە بخەوم. ئەو نەخۆش و شەپرەلێدراوە، نـاتوانێت دەمی بکاتـەوە و خواردنی بۆ ببات. بۆ من خۆش نییە لەو شـارە بسـووڕێمەوە و پیاسە بکەم، ئەویش بە جێگەیەوە نووسابێت. داوام لـە حـەریری کرد لـەگەڵیاندا بمێنمەوە، ئەویش ڕازیبوو. بەدرم نـاردە بـازاڕ، فـەرش و قـاپوقـاچـاخ و بـەرمـاڵ و خـواردنی نوێیـان بۆ بکڕێت. هەروە داوام لێ کرد سـوراخی چەند پزیشـکێکی زیرەک بکـات، بێن خـەیـات تیمـار بکـەن. خـەیـات دوو پزیشـکی هێنـان، دەرمانێکی زۆریان پێبوو. بە گیراوە و هەتوانەکانیان پشت و پاشوێڵ و ڕانـەکـانیـان چـەور کرد، دوای چـەند ڕۆژێک، گرانەتای نەما، بەڵام هێشـتا هەر نەیدەتوانی جووڵە بکات. هیچ پزیشـێک پێی وانەبوو، کە جارێکی دیکە خەیات وەسەرپێیان بکەوێتەوە و بڕوات. من بە ئێوارە و بەیانیان سـووڕەتی یاسـینم لەسـەر دەخوێند، هێمن دەبووەوە و ئۆخژنی دەگرت، جاروباریش لەگەڵ دەنگی خوێندنی من، خەوی لێ دەکەوت. بە دەستەکانی خۆم، باشترین خواردنم دەدایێ. ئاوی پونگ و لیمۆ و گوڵم وەسـەر دەم دەکرد. هەر گاهێک ویسـتبای، هەڵگێڕ و

وەرگێڕم پێ دەکرد. کاتێکیش بێمەیل و خەمناک بووبایە، دڵم دەدایەوە. هەر وەختێکیش هۆشوگۆشی هاتباوە بەر، ئەو کتێبانەم بۆ دەخوێندنەوە، کە لەگەڵ خۆم هێنابوونم. باسی مژدە و کەرامەت و فەرموودەی ئەولیا و پیاوچاکانم بۆ دەکرد و ئەویش ئاسوودە دەبوو.

پاش تێپەڕینی چەند هەفتەیەک، بە ڕوونی دەدوا و بە زیهنێکی سافیش، گوێی دەگرت. بزەی دەکرد و دەمنادەمیش پێدەکەنی. دەیتوانی خۆی وەرگێڕێت و بە سەکەخشکێش بگاتە ئەوەی، کە دەیەوێت. چەند نەخۆشییەک بەرۆکیان بەردا، بەڵام بەو حاڵەیش هێشتا نەیدەتوانی دانیشێت و هەستێت.

لەو کاتەی، کە من بە چاکبوونەوەی خەیات زۆر شاد و کەیف خۆش بووبووم، حەسار مرد. نەخۆشێک لەبەردەم وەبای قڕکەری نیوەی دانیشتوانی میسرِدا خۆی دەگرێت و چاک دەبێتەوە، کەچی ئەو پیاوە ساغەی لە شاری فاسەوە بۆ قاهیرە، لە وشکانی و دەریادا، ڕێگەی لەگەڵ بڕیبووم، ئێستە زۆر بەئاسانی، لە ماوەی یەک ڕۆژدا، مەرگ پێچایەوە و لەبەر چاوانم ون بوو! بەیانییەکەی تای هاتێ، ئێوارە هەرچییەک لە هەناوی دابوو، هێنایەوە. شەویش گیانی بە خوای خۆی سپارد. حەپەسام! هاوڕێی خوداویستم، بەر لەوەی گەشتی مەککەم لەگەڵ بکات دەمرێت. خودایە، دەتەوێت چیم بۆ کەشف بکەیت؟ چونکە لە چوون بۆ مەککە درەنگ کەوتووم؟ دەتەوێت ئاگادارم بکەیتەوە و بمتاسێنی؟ یان دەتەوێت فێرم بکەیت چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە و زیندوویش دەمرێنی؟ یان بیرم دەخەیتەوە، کە پەیامهێنان، خۆیان دەمرن و پەیامەکەیشیان دەمێنێتەوە؟ بەزەیی و لووتفت خودایە...

بەهەرحاڵ، من و بەدر و حەریری و کرێگرتەکانی گۆڕستان حەسارمان ناشت، بە پێخشکێ و وەرەزی گەڕاینەوە. ناخۆشی و خەمناکی، بەتەواوی بە ڕوومانەوە دیاربوو.

بەدر، زمانی لەگۆ کەوت، پێی سەیربوو هێندە بەخێرایی باهۆزی مەرگ لە حەساری دا و بردی. ترسی ئەوەیشی هەبوو ئەو وەبایە ڕۆژێک تووشی ئەویش بێت و بیکوژێت. بەدر درکی بەو گاشەبەردە ڕەق و تەقە کردبوو، کە دڵی ورد و خاش کردووم. بەدرێژایی ڕێگە دەستی لە شانم دەدا و دڵنەوایی دەکردم، بەنێو گەڕەک بە گەڕەکی شاردا دەیبردم، بێ ئەوەی بزانم بەرەو کوێم دەبات؟ لە کۆتاییدا گەیشتینە لای مزگەوتێک، قەڵەباڵخییەکی زۆر لەکن قاپیکەی هەبوو، ئێمەیش وەستاین و سەرەمان گرت. ئەوکات من وەئاگا هاتمەوە و ئاوڕێکم لە بەدر دایەوە و گوتم:

- کێوە دەچین؟

- دروود بۆ خوالێخۆشبوویەکی باشتر لە خوالێخۆشبووەکەی تۆ دەنێرین.

چووینە ژوورەوە، تەماشام کرد نزرگەی حوسێنی کوڕی عەلییە. بینایەکی لەسەر کراوە بە قوماشی دیباج نێوپۆش کرابوو، بە کۆڵەگە دەوری درابوو، دانەیەکی لە زێڕ و دانەیەکی لە زیو بوو. لەسەرەوە چراگەلێک هەڵواسرابوون، بە شەو و ڕۆژ ڕووناکییان پەخش دەکرد، تیشکەکان لەسەر گڵکۆی مەرحووم تێکەڵ دەبوون و بە شێوەی پەلکەزێڕینە دەردەکەوتن. خەڵکەکە دەستیان لە سووچی گۆڕەکە هەڵدەسوی و دواتر دەستیان بەسەر خاک و خۆڵیدا دەهێنا و دەناڵاندەوە. وەختێک لەپێش گۆڕەکە وەستام، بەبێ هیچ ئامادەکارییەک، یان بێئەوەی بیرم بێتەوە، کە لەسەر گۆڕی هیچ پیاوچاکێک ئەوەم گوتووە، بە ڕوون و ڕەوانی گوتم: "السلام علیک یا حفید حبیبي وربیبه، السلام علی اخیک، وأمک وابیک." لەو کاتە کزەبایەک هەڵی کرد و تیشکی ڕووناکی چراکان، بۆ ئەولاولا شکانەوە و تیشکێکی زەرد کەوتە سەر نێوچاوانی من، ڕاستییەکەی هەستم بە تینی گەرمایی کرد. دوای ئەوەی لەوێ دەرچووین، بە بەدرم گوت:

- دیتت چرا چۆن ئیشارەتی دامیٚ؟ خۆ بە خۆت دیتت؟
بەدر بێوەی تەماشام بکات وەڵامی دامەوە:
- بەڵێ، بەڵێ بینیم. با خێرا بڕۆینەوە تا ئێوارەمان لیٚ دانەهاتووە، خۆتۆ لە بەیانییەوە هیچت نەخواردووە.
حوسـێن بە نووری خۆی، دەسـتی بەنێوچاواندا هێنام، هەر دەڵێی دڵنەوایی لەدەستچوونی هاوڕێکەمی لیٚ کردم. ئەو شەوە تێر خەوتم و دەروونم ئارام بووەوە و ڕووحم فێنکایەتیی بۆ هات. بەیانی، کە هەسـتام بڕیارمدا زیارەتی گۆڕی هەموو ئەهل و کەسـوکاری پەیامهێن (د.خ) بکەم. بەدرم لە خەو هەستاند و گوتم:
- هەستە قیرافەم نیشان بدە.
هەسـتا و بەپەلە دەسـتنوێژی هەڵگرت و بەڕیٚ کەوتین، زۆر پێی خۆش بوو، کە بینی دەموچاوم هێندە ساف و سازە و شوێنەواری ئەسـرین و بێتاقەتیی دوێنێیان پێوە نەماوە. گەیشـتینە قیرافە، بە مزگـەوتی بچووک بچووک و گڵکۆی جۆراوجۆری ئیمـامزادە و پیاوچاکان تەنرا بوو. خەڵک لە ڕێچکە تەنگەبەر و تەسـکەکە، پاڵەپەسـتۆ و فرکان فرکانیان بوو، هێندێکیان لە بن ڕێیان، هەڵترووشکابوون. نەخۆشەکان، کە حەزیان دەکرد لەنێو ئەو مەقامە پیرۆز و موبارەکەنە سەر بنێنەوە، کەوتبوونە بن دەستوپێی خەڵک. هەرکە هاتینە قاهیرە، بەدر هەر زوو خۆی شـارەزای کونبەکونی وڵات کرد. دەسـتی گرتم و لەو گڵکۆ بۆ ئەو گڵکۆی بردم. هێشـتا ئێوارە نەهاتبوو زیارەتی مەرقەدی: مەریەمی کچی عەلی، محەمەدی کوڕی حوسـێن، زەینولعابدین، زەینەبی کچی یەحیا، ئومکەلسـوومی کچی محەمەد، عەبدوڵڵا قاسـم، عیسـای کوڕی عەبدوڵڵا، جەعفەری کوڕی محـەمـەدی پیٚ کردم و سـڵاو و درووودم بۆ گیـانی یەکەبەیەکەیان نارد. وەختێک زیارەتی هەموو ئالوبەیتمان کرد، بەدر بۆ سـووچێکی دیکەی قیرافەی بردم، ڕێک سـەر نزرگەی ئیمام

شافیعی، قەفەزەی سەر گۆڕەکەی ئەو، لە قەفەزەی هەموو نزرگە و ئیمامزادەیەکی دیکە گەورەتر بوو.
گەڕاینەوە ماڵەوە، دیتمان خەیات دانیشـتووە و خەریکی زیکر و تەهلیلە. هەرکە منی بینی، گوتی:
- برام... خودا سەبووریت و بدات و پاداشتت بداتەوە.
- خودا پاداشتی تۆیش بداتەوە برام.
- گوێم لێ بگرە.
لێی نزیک کەوتمەوە و گوێم بۆهەڵخست، پێی گوتم:
- ڕاستە خودا هاوڕێکەتی بردەوە، بەڵام ڕێگەی چوونە مەککەی لێ نەگرتوویت. فەرموو سەفەرەکەت تەواو بکە و دوای مەخە. بەهۆی نەخۆشییەوە، خودا ڕێگەی مەککەی لەمن گرت، بەهۆی مردەنیشەوە، ڕێگەی حەساری نەدا. خودا تۆ ساغ و سەلامەت بکات و، دەوامی عومرت بدات. ئێستە کاتی ئەوەیە بە زمانی ستایش و زیکرەوە وەڕێ بکەویت و نەوەستیت.
- بۆ هەموو قەزا و قەدەرێک ستایشی خودا دەکەم.
- براکەم! تکایە دوا مەکەوە.
ئەوسا منی ڕاکێشا، سەری منی لەدەمی خۆی نزیک کردەوە، لێوەکانی بە گوێچکەمەوە نووساند و گوتی:
- من خۆ دەزانم تۆ چاوەڕوانی مێخی دووەمی لە ئەفریقا، هەر لەبەر ئەوەیش گەشتەکەت بۆ مەککە بە دڵگرانی و کاوەخۆیی دەکەیت.
چاوەکانم پڕ ئاو بوون، هەر دەڵێی دەستی بەسەر برینێکی بێ قەتماغدا هێنا. تەوێڵم خستە سەر شانی و بەکوڵ گریام. بڵێسەی چاوەڕوانیی چەند ساڵەم بۆ مێخی دووەم، گەیشتە چەڵەمەشکێنە و ترس و گریانی تێدا جۆش دام. خەیات بەو دەستەی جووڵەی پێ دەکرد، منی بەخۆیەوە گوشی و دیسان لێوەکانی بە گوێمەوە نا و گوتی:
- مێخی تۆ مرد.

هەسـتم کرد شـەپرە لێی داوم. گێژەڵووکەیەکی بەهێزی گریان، لە ناخی ناخـەوەم هـەڵی کرد. دەمی خۆم لـەنێو سـینـەی خـەیات شاردمەوە، هەستم کرد بە پەراسووە لاوازەکانی فشارم بۆ دێنێ و دەمگوشـێت، زۆر زۆر گریام. بەڵێ ئەو ڕۆژە هێندە گریام، قەت لە ژیانمدا بۆ هیچ شـتێک هێندە نەگریاوم. خەیات بەو گریان و خەم و حەسرەتەی من، زۆر دڵگران بوو، لە دڵەوە بۆم هەڵدەکڕووزا. هاوار و واوەیلا بۆ ئەو وەلییەی هەر خەریکی خۆ درەنگخسـتن بوو، تا مێخـەکەی مرد. واوەیلا بۆ تۆ وەلیی بەدبەخت ، هەر دڵی خۆت پاک نـەکردەوە، تـاکوو مێخـەکـەت لێ کـەوتـە جـەفا و پشـتی تێ کردی. گریانم بوو بە هاتوهاوار و قورپێوان، خەیاتیش هێشتا هەر دەیگرتم و نـەیدەویسـت لـەو جیا ببمەوە، تاکوو دەنگم هێوربووەوە، بەڵام ئەسرینم نەوەستان، خەیات گوتی:

- ئەبووزەینەب! لەسەرخۆبە و هێندە خۆت قەڵس مەکە.

ئەی ڕێگەچارە چییە؟ چۆن بە مێخەکەم بگەم؟ چلۆن بە تاقە مێخێک ژیان هەڵبکەم؟

من دەزانم لەمەودوا گێژەڵووک لوولم دەدەن و زەمانە فڕکان فڕکان بە دڵم دەکات. ئەی خودایە چیم کردووە، تا مێخەکەم پەست و بێزار بێت لێم و پشتم تێ بکات؟ خەیات لە سرتەسرتەکەی هەر بەردەوام بوو:

- لەسـەرخۆبە. هەر مێخێک بمرێت، مێخێکی دی جێی دەگرێتەوە. بە قسـەکانی ئەو، دڵم ئاوی نەخواردەوە، لەوپەڕی پەستی و پەشێویدا بووم. ڕێگەیەکی تاریک و تولانی لەبەردەمم کرایەوە. هەموو شـتێک سـەخت و دژوار بوو، ئومێدەکان بوونە ئەسـتەم، ڕێگەی ئامانج، گرفتڕێژ کرا. گریـانم بوو بـە نـاڵەناڵەیەکی کپبوو. بە توندی خەیاتم دەباوەش گرت و چاوی پڕ ئەسرینم تێ بڕین و بە ئومێدەوە گوتم:

- ئەگەر ئەو مێخی من بووە، بۆچی چەند ساڵە نەمدۆزیوەتەوە؟

- مێخ، هیچ شـــتێکی خۆی ناشـــارێتەوە، مەگەر شـــتێکی دزێو لە خاوەنەکەی بەدی بکات، یان پێی وابێت هێشـــتا نەبووەتە ئەهلی ئەو کارە.

ڕووم لە ســـینەی ویدا ڕووچوو، هەناســـەیەکی ســـاردی پڕ خەم و حەســـرەت و زەلیلبوونم هەڵکێشـــا. خەیات جارێکی دیکەیش ســـەری خستەوە بن گوێم، ئەگەرچی گوێم بۆ گرت، بەڵام لەبەر پەریشـانیی حاڵی خۆم، باش تێی نەدەگەیشتم، بە چپەوە گوتی:

- باوکی زەینەب، من جێگری ئەوم.

قیتبوومەوە، هەر دەڵێی سەرەڕمێکی تیژ بە کەلەکەم کەوت و هاوارم کرد:

- چیت گوت؟

خەیات یەک بەدەمی خۆی بزەیەکی کرد و گوتی:

- من مێخی دووەمی تۆم.

## ٤٦

**دەستنووسێك لە سەمەرقەند**
**٨٠٤ک/١٤٠١ز**

لەوەتەی کارگەکەمان کردووەتەوە، پەڕاو بەرمان ناگرێت. خۆ ئەگەر لەبەر کەمنرخیی بەندەکان نەبوایە، ئەوە نەماندەتوانی وەک پێویست پەڕاو بۆ نووسەرانی حوجرە و مزگەوتەکانی سەمەرقەند ئامادە بکەین. چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستە، بەندەی سێیەمیشم کڕی، ئەو عەرەبە و خەڵکی (حەما)یە. لەنێو حەفتا بەندە، کە لە باژێڕ بەڕیز وەستابوون، بژاردەم کرد. بەندەفرۆشەکە بە هەر نرخێک بووایە دەیفرۆشتن، چاوەڕوانی هاتنی تاقمەبەندەیەکی تر بوو، کە دەگەڵ قافڵەی نوێدا بۆی بێن. چووم وەرگێڕێکم لەگەڵ خۆمدا برد، پرسیارم لە هەموویان کرد ئاخۆ چ پیشە و کارێک دەزانن. گشتیان سەرباز و کرێکار بوون. هەر بەندەیەک پیشەیەکی زانی بێت، ئەوە کارمەندانی ئەلقانی مەزن، بەر لەوەی بێنە بازاڕ، بۆ خۆیان گێراویانەتەوە. ئەمن نازانم ئەمە چۆن لە دەستیان ڕای کردووە و گەیشتووەتە ئێرە. نا، دەکرێ درۆی کردبێت و گوتبێتی هیچ پیشەیەک نازانم، یان خواردنی بەندەفرۆشەکەی بە دڵ نەبووە، کە ڕۆژانە تەنێ یەک ژەم خواردنی پێ داون. بە بەندەکەم گوت:

- تۆ لە (حەما) پەڕاوساز بوویت؟
- بەڵێ.

- ئێوە باشترین پەڕاوتان هەیە.
بە شــەرمەوە بزەیەکی کرد و چاوەکانی بریســکانەوە، ئەمەی وەک شانازییەک نیشان دا. من لەمە زیاتر پرسیارم لێ نەکرد، وا دیاربوو ئەو لە هەموو ئەو بەندانەی لەوێ وەستابوون باشتر بوو. نرخەکەیم دایە بەندەفرۆشـــەکە، زنجیری پێیەکانی کردنەوە و بەرەڵای کرد و گوتی:
- سبەی ئێوارەیش قەواڵەکەت بۆ دەنێرمە کارگە.
بەندەکە بۆ کارگە دوام کەوت، تەماشـــای بینا و نزرگە و ئیمامزادەکانی دەکرد. لە بازاڕ ، جل و نەعلم بۆ کڕین. پاشان بردمە گەرماوی بەندان، تاکوو بیشۆن و خاوێنی بکەنەوە، ئەسپێ و کێچی لە قژ داوەشـێنن... تا تەواو بوو، چاوەڕێم کرد. بە جلێکی نوێ هاتە دەرەوە، بەو خۆشـــۆردنە گوردێکی هاتەوە بەر و دەموچاوی شەوقیان دایەوە.
بۆ کارگە چووین، خەریک بوو لەپشت فەردەی پڕ قینەب و کەتان و گالیسکەی پڕ لە لۆکەی شانەکراو، دەرگەیش ون بێت. ڕاستییەکەی من بۆ ئەوانە ناچمە بازاڕ، کاســبکاران بە گوێرەی داوای خۆم بۆم دەهێنن. هەردوو بەندەکەی دیکەیشم هەموو ئەو شتانە بۆ نێو کارگە دەکێشـنەوە، کلابازیش سـەرپەرشـتییان دەکات. یەکێکیان بە زمانی ئۆزبەکی و تورکی دەدوێت. ئەوەی دیکەیان ڕۆمییە و زمانی عەرەبی و ئۆزبەکی نازانێت، بەڵام کەسـێکی بە شـانوشـەکەوت و بەهێزە. کلاباز فێری شـکاندن و دەرهێنانی قینەب و کەتان و لۆکەی کردبوو. ئەو لۆکەی دەخستە نێو جیراو و گرێوگۆڵی نەدەهێشت و ئەوەی تریش بە مەقەس لەتوپەتی دەکرد و بەســـەر دیواریدا دەدا.
ئەگەر لەو بەندە نوێیە حەموییە ســـەرچیخ نەچووبم، کارێکی زۆر گرنگ و قورســـتری پێ دەســـپێرم، ئەویش مشـــتومالدانی کاغەز و ڕێکخستنیەتی. دەخوازم لەو کارەدا کارا بێت و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

کلاباز لەسەر گیشەی کەتان خۆی تێ فەڕەدا و بەرەو ڕووم هات و پێکەنی، تەماشای بەندەکەی کرد و گوتی:

- ماشائەڵلا پیرۆزە!

- کلاباز، لەمڕۆ بە دوا هیچ پاســـاوێکت بە دەســـتەوە نەما، هەموو خواست و داواکارییەکان دەبێت لە وادەی خۆیان بەجێ بێن.

کلاباز دەستی خستە سەر شانی بەندەکە و گوتی:

- برا چۆنت پێ خۆشە وا دەکەم.

پاشـــان لەگەڵ بەندەکە چوونە نێو کارگە و ونبوون. منیش چوومە نووسینگەکەم، وەک پیشەی ڕۆژانەم خەریکی تۆمارکردنی کارنامە و پێشـــوازیی میوانەکانم. وەختێک بینیم لە لســـتی داواکارییەکانی دوێنێ، دوو داوای دیکەیش لە دامێنی لستەکە بە دەستخەتی کلاباز زیادکراون، هیچ پێم ســـەیر نەبوو، داوای یەکەم: حەفتا بەلگی[٧] مشـــتومالدراو و خۆشـــکراو بۆ قورئان و کتێبە پیرۆزەکان. کڕیار: بەڕێوەبەری حوجرەی ســـۆفییەکانی ســـەمەرقەند. ســـی بەلگی داوکراوەیش بۆ نامەنووســـین. کڕیار: دیوانی تەتەر. قەڵەم دەســـت دایێ و هەر دوو داواکەم بە حوبر ڕەش کردنەوە، پاشـــان داوای حوجرەی سۆفیانم سەرلەنوێ لە سەرووی لستەکە نووسییەوە.

بانگی کلابازم کرد، بە بزەوە هات، پێشـــتر تەنیا مووچەم دەدایێ، بەڵام ڕاســـتییەکەی لەوەتەی پلەم بەرزکردووەتەوە و لە کارگە بە دەیەک کردوومەتە شـــەریکەبەشـــی خۆم، بزە لەســـەر لێوەکانی نەبڕاوە. گوتی:

- کەی بەڕێوەبەری حوجرەی سۆفیان هات؟

- خۆی نەهات، یەک لە کارمەندەکانی ناردبوو.

- بەر لە هەموو کەسێک، داواکەی ئەو جێبەجێ بکە.

- بەڵام کاکە چەندان داوای دیکەیشمان بەسەردا کەڵەکە بوون.

---

[٧]-بەندکاغەز.

- هەموو داوایەک دوا بخەیت، نابێ داوای حوجرەی سۆفیان دوا بخەیت.
کلابان، بزەیەکی مەیلەو خۆشکەڵەی کرد و گوتی:
- تەنانەت داواکاری کۆشکی ئەلقانی مەزن تەیموریش بێت؟
- هەموویان لە یەک ئاستدان. خوشکە ئاخوندەکانی ئەلقانی مەزن، مشووری حوجرەکەیان گرتووەتە دەست.
کلاباز لە قرتەی پێکەنینی دا، بەدەم ڕۆیشتنەوە گوتی:
- برام هەموویان لە وادەی خۆیان دەگەن. من خۆم دەیانبەم.
- نا، تۆ خۆت ئامادەیان بکە و بیانخە نێو گالیسکان و من دەیانبەم.
خودایە ئەمن چەند بەختیارم کە برایەکەم دوای خۆشڕابواردن و شەڕاب و حەشیش، ئیستە بە کارکردنەوە خەجلاوە[8]. ڕاستییەکەی هێشتایش هۆشی هەر شپرزە و مشەوەشە، تەنێ لەو شتانە نەبێت، کە فێرم کردوون، دەنا لە هیچ پشتی پێ نابەستم. ئەو بۆ کاری بازرگانی و فرۆشتن و مامەڵەی کڕیاری دەست نادات. ئەوەندەم بەسە، کە چاودێریی کرێکار و بەندە و کارگەی لە کۆڵ کردوومەتەوە. نۆزدە ساڵە ئەو کارە دەکەم، ئێستە پەنجەکانم بە تەواوی تامی جیر و ئاوونگ و قەمیشی وشک دەزانن. باش دەزانم چۆن شلاوی کاغز دەگیرێتەوە و دەکوڵێت و توووند و ڕەق دەکرێت. ئەوە بۆمن بەسە... ئێستە کاتی ئەوەیە قۆڵی خۆم لە کڕین و فرۆشتن هەڵماڵم و واز لە کاری کولاندن و مشتومالکردن بێنم، بەتاییەتی لەو مەوسیمە پیرۆزەدا. ها ئەوەتە سەمەرقەند لەسەر دەستی ئەلقانی مەزن تەیموور، فراوان و گەورە دەبێت. شوورەکانی شار توونوبەند کراون، جۆگەی ئاو، بۆ هەموو ماڵەکان هەڵبەستراوە، گومبەزی مزگەوتەکان، لە گومبەزی ئاسمانی شین دەچێت. هەموو شتێک لەو شارە بینادەکرێت و بەرز دەکرێتەوە،

---

[8]-خەریکاوە.

سـيما و جوانيی تێكڕای دنیایان لەسـەر نەخشـاوە: بەرد لە سـەند، ئاوریشـم لە چین، یەشـم لە ئەنازۆڵ . هەموو ئەو بینایانە بە دەستی ئێمە و دەسـتی ئەو كەسـانە دروسـتكرابوون، كە میر لە فتووحاتی شیراز و شام و ئەسفەهان لەگەڵ خۆی هێنابوون.
جـارێكی دیكـە كلابـاز وەک نـەریتی گـەمژانـەی خۆی، بـەبێ مۆڵـەت وەژوور كەوت و گوتی:
- ئیسـتە پەنجا بەلگ ئامادەیە، دوای دوو ڕۆژی دیكەیش، بیسـتی تریش حازر دەبێت.
- هەر زۆرباشە. بیانخە نێو گالیسكەیەک هەر ئێستە بۆیان دەبەم.
- برا، ئێستە لەنێو گالیسكەدان.
لەنێو گالیسـكەكە دانیشـتم و بەندە ڕۆمییەكەیش هێسـترەكەی دەنگ دا و وەڕێ كەوتین. گەیشـتینە كۆشـكی شـین، شـوێنی مانەوە و حەسانەوەی ئەلقانی مەزن، دابەزین و ئەرزی پێش قاپییەكەمان ماچ كرد و وەڕێ كەوتینەوە. دوای كەمێک، گەیشـتمە بەردەم دەرگەی حوجرەی سـۆفیـان ، فـەقێیـەک دەرگـەی كردەوە و ئـامـاژەی بـە مێوانخـانـەكە كرد. چووم بەڕێوەبـەر و سـێ فـەقێی دیكەی لەكن دانیشـتبوون، دەسـتنووس و كتێب تا میچی مێوانخانەكە بەسەریەكدا كەڵەكە كرابوون. دوو فەقێی زیتەڵ و زیرەک ڕووپەلێكی گەورەیان لەپێش بوو، بە نووسـین خاوا بوون[1]. فەقێی سـێیەمیش كتێب بە كتێبی دەهێنایە خوارەوە و دەیدان بە بەڕێوەبەر، ئەویش تەماشایەكی ناونیشان و لاپەڕەكانی سەرەتای دەكردن و دەیدانەوە بە فەقێیەكەی تـەنیشـتی، ئـەویش بـە گوێرەی نـاونیشـان و جۆری بـابـەتەكە و زمانەكەی، كتێبەكەی تۆمار دەكرد.
- سڵاو لە مامۆستای گەورەمان (ترغای).
جەنابی بەڕێوەبەر سەری بەرزكردەوە و گوتی:

---

[1]-مژوول بوون.

- سلاو له تۆ بێت تقتنش. فەرموو.
وا دیاربوو داوای هەناردەکردنی کاغەزی بیرکەوتەوە، بە بایەخەوە گوتی:
- ئەمڕۆ داوای کاغەزم کردبوو...
- مامۆستا لەگەڵ دەستی خۆمدا هێنام.
- هەر زۆرباشە، دە دانیشە شتێکمان لەگەڵ بخۆوە.
منیش کەمێک دانیشـــتم و لەو هەموو کتێبە کەڵەکەبوانە ڕامام و پرسیم:
- ماشائەڵڵا! حوجرەکەتان بە کتێب و دەستنووس ئاخنراوە.
- خۆ ئەوانە کتێبی ئێمە نین، قافڵەگەلی ئەلقانی مەزن لەگەڵ خۆیاندا هێناویانن.
- ماشائەڵڵا! لە چ زانستێک دەدوێن؟
- ئێســـتە خەریکی پۆلێن کردنیانم. جەلال، کتێبەکانی ئایین و شـــەریعەت و مەزهەبەکان تۆمار دەکات. میرزا، کتێبەیلی زانسـت و پزیشکی و سروشتی داخیل دەکات. تەغلووقیش کتێبگەلی مێژوو و جوگرافیا ناونووس دەکات.
- ئەی ئەو پەڕاوانەی داواتان کردبوو بۆ چیتانە؟
- تقشـــتین بۆ نووســـینمانن. هەموو ئەو کتێبانە، جگە لە کتێبەکانی بەغدا، کاغەزیان زۆر خراوە. هێندێکیان لەســـەر پێســـتی ئاژەڵان نووسراون، بەشێکی دیکەیان لەسەر توێکڵی دار نووسراون، خۆیان ناگرن و پاش چەند ساڵێک لەبەین دەچن.
- بە دەست ئاماژەم بۆ گردی کتێبان کرد و گوتم:
- من پێم وایە پتر لە حەفتا بەلگتان پێویستە...
- بێگومان، بێگومان...
- مامۆســـتا من ئامادەم هەرچەندێکتان بوێت بەباشـــترین جۆری کاغەز، بۆتان دروســـت بکەم، بە نرخێکی زۆر هەرزانتریش لە بازاڕ بتاندەمێ.

- نەرمە بزەیەکی کرد و گوتی:
- تقشتین دەزانم، مەترسە تەنێ هەر لە تۆ دەکڕین.
- هیچ شـــتێک لای من لە خزمەتکردنی زانســـت و زانایان گەورەتر نییە، ئێستەیش دەمەوێت لە خزمەتتان مەرەخەس بم.
بەدەم هـەســـتـانـەوە، بیرم لەوە دەکردەوە هەرتەنیا لەو حوجرەیە دنیـایـەک قـازانج دەکـەین، ئەگـەر کلاباز ئەوە بزانێت لە خۆشـــییان خەنی دەبیت. بەر لەوەی لەوێ ئۆغر بکەم، گوێم لێ بوو مامۆستا بە فەقێیەکەی دەگوت:
- جەلال ئەو کتێبەیش لە لستەکەی بەردەستت تۆمار بکە، دانەرەکەی موحییـەدین محـەمـەد ئیبن عـەرەبی حـاتـەمی ئەندەلوســـییە. گاهێک ئەلقانی مەزن لە ساڵی ٨٠٣ـــی کۆچی فەتحی (حەما)ـــی کرد، ئەو کتێبەمان بۆ هات.

# ٤٧

"سەفەر پردێکە بۆ چوونەوە ناو خۆمان "

ئیبن عەرەبی

لەگەڵ بەدر لە سـینـاوە بەرەو مەککە وەڕێ کەوتین. زۆرینەی ئەوانەی لەگەڵماندا بوون سەربازبوون، مەلیکی عادل سەیفەدین ئەبووبەکر، بۆ ڕاگیرکردنی دەوڵەت، لەبەینی هەردوو جەمسەری شام و میسر، جووڵەی پێ دەکردن. لە هەڵبژاردنی قافڵەی سەربازی، بۆ بڕینی ئەو بیابانە تاقەتپڕووکێن و سەختەدا، ددانم بە فەزڵی بەدردا هێنا. بینیم سمی وشترەکان چۆن لە لمی نەرمی ئەو بیابانە ڕوودەچوون و لە ڕۆیشتن خاو و سستی دەکردنەوە. هێندێک هێستر هەتا سکیان دەکەوتنە نێو لمەکە و سەکەت دەبوون، بەم حاڵەیش جێیان دەهێشتن. شازدە ڕۆژ بوو ئەو ڕێگە دوورودرێژەمان دەبڕی، لە دوو جێگە بترازێ، لە هیچ شوێنێکی دیکە، ڕێکەوتی ئاومان نە کرد. بە ڕێنمایی قوچەکەبەردان، کە لە زەمەنی فاتیمییەکان بۆ ڕێنوێنیکردنی ڕێبواران دانرابوون، ڕێگەمان دەبڕی. هەروەها چەند دەستەو تاقمێکی ئێشکچی بچووک بچووکیش، کە ئەیووبییەکان لە چەند مێرگوڵەیەک بڵاوەیان پێ کردبوون، چاوساغی و ڕێوانییان کردین.

له " ئیلیه" به قافڵەی حاجیانی میسڕ و شام گەیشتین، وێجا لەوێ، له قافڵەکەمان جیابووینەوە. بەیانی بوو، که گەیشتینه ئەوێ، زۆر ساردبوو، نوێژمان لەنێو مزگەوتێک کرد، که به کەپر دروست کرابوو. دواتر خواردنگەیەکمان بەرچاو کەوت، خەڵکێکی زۆری له دەور ئاڵابوون. چێشتلێنەرێک و نانەوایەک و دوو خزمەتکار، نیسکاو و میوه و زەیتی زەیتوونیان بەخۆڕایی دەدایه خەڵک. لەگەڵ ڕێبواران و حاجیان، هەتا تێربووین خواردمان. بەدر، هەموو خان و تەوێڵ و گەوڕەکانی ئەوێ شارەزابوو، بەیەکەوه پیاسەیەکمان بەنێودا کردن، هەموو خانەکان ئاوەدان و گشت تەوێڵ و هۆڵ و گەوڕەکانیش پڕبوون له ئاژەڵ و وڵاخ. له مەرزی شارەکە، دەوارمان هەڵدا و شەوێک لەوێ ماینەوە. بەیانی هەستاین و نوێژمان کرد، بەدر به سواری ئەسپ چوو خانێکمان بۆ ببینێتەوە، دوای سەعاتێک هاتەوە، به ڕوخساری بێئومێد و ماندووی، پۆزشی هێنایەوە. ویستم هەستی خۆبەکەمتەرخەمزانینی لەلا برەوێنمەوە، دەستم له شانی دا و پێم گوت:

- خوا دەیەوێت هەتا زووه به دیداری ماڵی وی بگەین و لێمان ڕازی بێت. بڕۆ به دوای قافڵەیەکدا بگەڕێ، با به زووترین کات بچینه مەککە.

- بەڵام قافڵەی حەج به مانگێک دەگاته مەککە، واتا مانگێک بەر له مەوسیمی حەج دەگەینه مەککە.

- بەدر پێم وانییه به مانگێک بگەینه مەککە.

- نا نا قوربان! من پێشتر لەگەڵ ئەبووفتووح ئەو گەشتەم کردووه.

بەدر خەریکی بژاردنی قۆناخ و ئەو شوێنانه بوو، که پێیدا تێپەڕبووبوون، زۆر به متمانەوە باسی ئەو شوێنانەی دەکرد. له دڵی خۆمدا سوپاسی خودام کرد، که ئەو پیاوه دەستپاک و چاوتیژ و ئەسمەرەی کردووەته هاوەڵ و یاوەری من. تا قسەکانی تەواو کردن تەماشام کرد، دواتر گوتی:

- ... به مانگێک کەمتریش دەگەینە مەککە. دەستم لە گەردەنی وەرهێنا و گوتم:
- بەڵام من بە پیادەیی حەج دەکەم نەک سواری...
بەدر وەک نەریتی هەمیشەی، دەستی بە تەسبیح و تەکبیر کرد، هەر وەختێک حاڵەتێکی تەقوای لەمن بەدی بکردبایە وای دەکرد. ئەوسا بەدر ڕۆیشت وڵاخەکانی ساز و تەیارکردن و بەرەو بازاڕ چووین. لە بازاڕ ئاگام لێ بوو بە تیلەچاوێکی مانادار تەماشای کردم، تاکوو پارەی پێ بدەم و تێشووی سەفەری پێ بکڕێت. ئەمن لەو جیابوومەوە و چوومە لای کەمالیاتفرۆشێک، لای ئەو مزگەوتەی، کە پێشتر بۆ یەکەمجار نوێژمان لێ کرد، هاواری دەکرد:
خۆتان بۆ گەرمای موزدەلیفە و سەرکەوتنی عەرەفە و تەواف ئامادە بکەن.
وەرن خوفی حاجیانمان لا دەست دەکەوێت.
پەرستشەکانتان بەجێ بێنن...
خۆتان لە نەخۆشیی مەدینە بەدوور بگرن.
بەڵێ، خوفی حەجیانمان هەیە.
تەماشایەکی خوفەکانم کرد، ستوور بوون، بە لۆکە و قوماش و پێست، هەردوو لای نێوپۆش کرابوون. پێم گوت ئەگەر بکرێت جووتەخوفێکی ستوورتر و مەحکەمترم بۆ دروست بکات. خوفەکەی دەستمی وەرگرت و سەری خۆی خوراند و بە دەمی کراوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، تەماشایەکی منی کرد، وەک ئەوەی بیر لە نرخەکەی بکاتەوە، گوتی:
- ئەگەر دەتەوێت نێوپۆشەکەی دەکەمە تەختەدار، بەر لە چەند هەفتەیەک جووتەخوفێکی وام بۆ بازرگانێکی میسری دروست کرد.
- بە چەند؟
- حەوت درهەم.

وردەفرۆش جووتەخوفەکەی بۆ دروســـــت کردم و لە (ئیل)ـــــــە دەرچووین. هەڵبەت جووتەخوفێکی دیکەیشم لەنێو بار نابوو، ترسی ئەوەم هەبوو لینگەخوفێکم بدڕێ و مەیلی ســــواربوونی ولاخ بکەم. لــەتــەک ولاخــەکــەی بــەدر دەڕۆیشـــتم، وەلاخــەکــەی دیکــەیش بەبەســـتراوەیی بە دوامانەوە دەڕۆیشـــت. وردەوردە دەڕۆیشـــتین و پشـــــووی زۆرمـان دەدا. قافڵەکە تێپەڕی، زۆری پێنەچوو قافڵەیەکی دیکە دەرکەوت. ترسـی ڕێ گومکردنمان نەبوو، چونکە سەربازگەلی ئەیووبییەکان بەدرێژایی ڕێگە سـەنگەریان داکوتابوو. خەڵکی گوند و دەشـت، چەند بازاڕگەیەکەی بچووکیان دروست کردبوو، کەلوپەل و کالایان بە حاجییەکان دەفرۆشت. حاجییەکان پشتیان بە سەربازەکان دەبەســت و ئەوانیش لەم هاموونە کاکی بە کاکییە ســەبووریيان بە ئێمە دەهات. ڕاستییەکەی حاجییەکان لە هەموو ئەو شـتانە کەڵکیان وەردەگرت. بە درێژایی ئەو ڕێگەیە، نە ئێمە هەســتمان بەبرســێتی کرد، نە ولاخەکانیشمان ئالیکیان لێ بڕا.

لە کۆتـاییدا گـەیشـــتینە میقاتی جەحفە، لەو دەوروبەرە بارەکانمان خســتن، پێش ئێمەیش چەند کاروانێکی دیکە گەیشـتبوون. خەڵکەکە پێچەی ســەریان هێنایە خوارەوە، ڕووپۆشــەکانیان وەلانا و خۆیان تەنها کرد. گەورە و بچووک ئیحرامیان پۆشـی، لێرە و لەوێ گوێمان لــە تــەکبیرلێدان دەبوو. ئـەو حـاجیـانـەی لـە جێگـەی جۆراوجۆر هاتبوون، خێوەتەکانیان لە دەوری میقات هەڵدابوون... ڕاســتییەکەی میقات وەها جمەی دەهات، دەتگوت شــــاری مەدینەیە و لەناکاوێک دروســت بووە. من و بەدریش ئیحرامەمان پۆشــی و خێوەتمان هەڵدا و ئالیکمان دایە ولاخان... دانیشـــتین و لە زەردەپەڕ ڕامایین، دەنگی جۆربەجۆر لە دەورمان دەهات: ترینگە و ڕەقەی قاپوقاچاخ، ناڵەناڵی وشــتر. دەنگ و ژاوەژاوی خەڵک، تومەز لە تاریکی لێک دابڕا بوون، بە بانگکردن، یەکتریان دەدۆزییەوە. بەدر لای چێشـتلێنەرێک، نان و

مـەلی برژاوی هێنـابوو، لـەبـەردەم خێوەتـەکـەمـان دانیشـــتین و خواردمان، شنەبایەکی هێمن و دڵفڕێنی شـەوانەیش هەڵی کرد.

## ٤٨

**"هەق تەعالا وەسف دەکرێت و پێناسە ناکرێت"**
**ئیبن عەرەبی**

بەیانی، کە وەخەبەر هاتین، زۆر بە خێرایی هەواڵێک بەنێو خەڵکدا بڵاو بووەوە، بەشێک بە پستەپست و هێندێکیش بەئاشکرا بە گوێی یەکتریاندا دەدا. یەکێکیان پەسندی دەکرد و پێی سەرسام دەبوو، ئەوانی دیش نکوولّییان دەکرد و وەدرۆیان دەخستەوە. بەدرێژایی ئەو بەیانییە بەدوودڵی ماینەوە و ڕاستیی هەواڵەکەمان بۆ یەکلا نەبووەوە. خۆر ئاوابوو، بیستمان دەستەیەک بە دەوری خێوەتی قافڵەکاندا دەسووڕێنەوە و دەڵێن:" خەڵکینە! پایەداری بۆ قەتادەی کوڕی ئیدریس...". هەندێک لە خەڵکەکە تەکبیریان لێ دەدا و بەشێکی دیش خۆیان لێ لە خەتی مەیلان دەدا. بەدر لەمە زۆر سەری سووڕما، گوتی:

- لە حەجی یەکەممدا لەگەڵ مەولانا ئەبووفتووح چووینە ماڵی ئیبن مووسا و چاومان پێ کەوت، پێم وابوو جگە لە خوا کەس نییە دەستەڵات و شکۆ لەو بسێنێت.

- بەڵێ بەدر، ئێستە خوا جڵەوی دەستەڵاتی لەدەست دەرهێناوە.

دوو سەدەیە دەستەڵات تەنێ لەژێر دەستی بەنی مووسادایە، بە گەیشتنی مە، دۆخەکە بەراوەژوو بووەوە و دەستەڵات لە دەستی

وان دەرهات. ڕۆژگارە و تێدەپەڕێت، خوا دەستاودەست بە دەستەلاتی خەڵک دەکات. ڕاستییەکەی ئەو گۆڕانکارییە هیچ بەهایەکی لای من نەبوو، ئەمن خەمی پێیەکانمە وا دەتریوێن، هیی ئەوەن شینیان بۆ بگێرم و بیانلاوێنمەوە. هەست بە ئازاری ناخم دەکەم، لەڕووی دەرەوەیشم خەریکە پێست فڕی بدەم. بەدرێژایی ڕێگە ئازاری پشت و حەوزم زیاتر دەبوو. لەبەر ئازاری ئەژنۆکانم هەنگاوەکانم کورت بووبوون، ڕۆژانی دوایی، زۆر بە سستی ڕێگەم دەبڕی. نیوەڕۆیەک بەدر هەستی بە ورێنەی من کرد، تکای لێ کردم سواری وشتر بم، ڕەتم کردەوە. دوو وشترەکەی خستن و لیفێکی بەسەر کۆپارەکانی دادا و سێبەرێکی بۆ دروست کردم. کوندەئاوێکی تەواوی بەسەردا کردم. وێجا لێی خەوتم، بەدر دەیگوت زۆر بانگم کردی و قسەم لەگەڵ کردی، بەڵام بێ دەنگ و هەست بوویت. پاشان سەعاتێکی دیکە ڕۆیشتین، دیسان ڕاهەژام و بەربوومەوە. من لەنێوان ئاگایی و نائاگایی بووم، بەدر گوتی گەیشتووینەتە سنووری حەڕەم، بەمەیش بەڵێنی خۆم بەجێهێنا. سواری وشترەکە بووم، بەدریش بۆ وەی بەرنەبمەوە، تووند بەستمیەوە. نازانم چەندی دیکەمان پێ چوو. وەختێک چاوەکانم کردنەوە، سەرم لەسەر ڕانی بەدر بوو، لێکدالێکدا پارچە پەڕۆیەکی تەڕی بە ئاوی زمزم، بەسەر نێوچاوانمدا دەهێنا، خەڵێکی زۆر لە بەردەمم جمەیان دەهات. هەر کۆمەڵە خەڵکێک دەڕۆیشتن و دەستەیەکی دی دەهاتن. لە کۆتاییدا چاوم دە کەعبەتوڵڵای سەوز، هەڵنەگووت. دانیشتم، بەدر زەردەیەکی کرد و منیش با ئاستەم بزەیەکم بۆ کرد. منی هەستاندەوە، چوومە پاڵ کەعبە و ڕوومەتی خۆم پێوە نووساند. دەستم بە ورتەورت کرد، بەڵام سەیربوو هیچم گوێ لێ نەبوو، دەمم دەبزوی، وشەیش بە ڕەتڵ لە دەمم دەهاتنە دەر، لێ هیچم نەدەژنەوت. تەماشای بەدرم کرد، گوێی قولاخ کردووە، ئەوسا دڵنیابووم قسە دەکەم. زارم کراوەتەوە، زمانم دەجووڵێت. قورگم

جۆشـاوە، کەچی نە هیچ دەبیسـتم و نە درک بە هیچ شـتێک دەکەم. دانیشـــتین، نانمان خوارد و ئاومان خواردەوە، وردەوردە لەشـــم دەهاتەوە ســـەرخۆ و چاک دەبوومەوە. بەدر گوتی دانەڕۆژێک و کەمێکیش لە شـەو خەوم لێ کەوتووە. لەپاڵ شـانی ئەو، بە دەوری کەعبەدا ســـووڕاینەوە و پاشـــان چووینە خانی حاجییەکان. ئەمن خەوتم و بەدریش ژوورێکی زۆر نزیکی لەکن حەڕەم بەکرێ گرت، ئەو شـەوانەی نە دەخەوتم، بە ئاسـایی گوێم لە دەنگی بانگ دەبوو. بەڕی بۆ ڕاخسـتم و لەسـەری درێژ کردم، لەپاشـا لەتەک مندا پاڵ کەوت. جارێکی دیش زۆر بە قووڵی خەوتمەوە. بەدر بەر لە من وەئاگا هاتبوو، بەیانیش ڕۆژی هەینی بوو. بردمیە گەرماوی خان و لە چڵک و چەپەڵی ڕێگە پاکی کردمەوە. جەســـتەی بە زەیت چەور کردم و جلێکی نوێی ئیحرامی دەبەر کردم. پاشان نان و هەنگوین و شیرێکی گەرمی بۆ هێنام و خواردم. خۆشی بۆ گەرماو چوو. دواتر بۆ نوێژکردن چووینە مزگەوتی حەڕام.

لە نزیک مەقام دانیشـــتم، خەڵک دەســـتیان بە مینبەرەوە گرتبوو، چاوەڕێی هاتنی وتاربێژیان دەکرد، زۆری پێنەچوو بە جلێکی ڕەشی قەترانی دەرکەوت، دوو پیاوی بەدواوە بوون، ئالای ڕەشـــیان بە دەستەوە بوو. بەرەو لای بەردەڕەشـەکە چوو و ماچی کرد، پاشان سەر دوانگە کەوت درووودی بۆ پەیامهێن و ئالەکەی نارد و نزای بۆ چوار خەلیفە و خاوخێزان و ناســـڕ خەلیفەی عەباســـی کرد. دواتر دوعای بۆ میری نوێی مەککە، قەتادەی کوڕی ئیدریس و مەلیک عادلی ئەیووبی کرد. ئینجا نوێژی کرد و ڕۆیشـــت، خەڵکەکە دوای ئەو، دوانگەکەیان لابرد. دانیشـتم تەماشـای پۆلەکۆترەکانی حەڕەمم دەکرد، کە چۆن ئاســـمانی ئەوێیان پڕ کردبوو، لەگەڵ ئەو کۆترانەدا دڵم لەســەر کەعبە دەنیشـتەوە. بەم جۆرە، تاکوو بانگی عەسـر درا، چەند ســـەعاتێک لەوێ مامەوە. پاشـــان هەســـتام و چوومە مەقامی ئیمامی مالیک تا نوێژی لەدواوە بکەم.

لە دەسـپێکی حەجدا، چەند ڕۆژێکم بەم چەشـنە بەسـەربرد، مەککە ڕۆژ دوای ڕۆژ، جـەنجـاڵتر دەبوو. بـازاڕی بـەرانبـەر مـەسـعـا جووڵـەیـەکی زۆری پێ کەوتبوو، بەتـەواوی بووژابووەوە. حـاجیـان کاڵا و کەلوپەلی نوێیان هێنابوو، دەنگی کڕیار و فرۆشیار بە هەموو لایەکدا دەچوو. دووکانەکان شـەوان بە هیچ جۆرێک دانەدەخران. دووسـێ کەس لەسـەر یەک دووکان دەبوون و بە نۆرە دەخەوتن، تـاکوو مـەوسـیمی حەج تەواو نەبوایە، نەدەچوونەوەماڵەوە. لەنێو ژوورەکانی خۆمان گوێمان لە دەنگیان دەبوو، لە زمانی هێندێکان تێ دەگەیشـتین و لە هێی زمانی ژمارەکیشـیان حاڵی نەدەبووین. بەدرم ناردە بازاڕ، بە پارەی میسـڕی، خواردن و خۆراکی کڕی، درهەمی یەمـەنی و نـاسـڕی و ئـەرتـەقی و خوارزمی هێنـایەوە. حیسـابی خـەرجکردنی پارەکە، بێزاریـان کردم، هـەرچی پێم بوو دامـە بـەدر، ئەویش بە کەیفی خۆی سەرفی کرد، دواتر هیچ درهەم و دینارێکمان لا نەما.

من بـەیـانیـان زوو دەچوومـە حـەڕەم، تـا دوای نوێژی عیشـا نەدەگەڕامەوە، خەریکی پەرستش بووم، بە زیکر و نوێژەوە مژووڵ دەبووم، هێندە دەوەسـتام تا پێیەکانم سـڕ دەبوون، هێند دەگریام تا ئاو لە چاوەکانم دەچکا، هێندە دەسـتم بە دیواری کەعبەوە دەگرت، تاکوو قۆڵەکانم شل و شـەکەت دەبوون. هەر گاڤێکیش تیشکی خۆر بێزاری کردبـام، دەچوومـە بن دیوارێک یـان دینگـەیـەک و قورئـانم دەخوێند، بـەدریش نـاوەنـاوە نـان و ئـاوی بۆ دەهێنـام. وەختێکیش فەریزەی حەج دەستی پێ کرد، ئەرک و واجباتەکانم ئەدا کردن. هەر لـەگـەڵ کۆتـاییهـاتنی ئـەرکـەکـانی حـەج، بـازڕەکـان هێوربوونـەوە، حـاجییـەکـان بۆ مـاڵ و وڵاتی خۆیـان گـەڕانـەوە، پـاڵـەپـەسـتۆ و حەشـامەتی حەج نەما، دنیا بوو بە ئاشـی ئاو لێبڕاو. ئەوەی چەند سـاڵە بوو نیازم بوو بیکەم، کردم. ئەو دوو وشـترەی بە سـەفەر هیلاکم کردبوون، بە نرخێکی باش بە حاجیانم فرۆشـتنەوە، پاشـان

وشـــترێکم بۆ بەدر بەکرێ گرت و لەگەڵ قافڵەیەکی مەغریبی ناردم بۆ بیجایە، تاکوو مەریەم و زەینەبم بۆ بێنێتە مەککە. بەڕێم کرد و پێم گوت:

- لە بیجایە بەندەیەکی بەهێز و وڵاخێک بکڕە، مەریەم و زەینەب بخە نێو کەژاوەیەک و بیانهێنە، بەڵام تکایە خۆتان لە ئاوی دەریا دوور بگرن، چونکە من خەمی کچە بچکۆلانەکەمە.

# ٤٩

"خۆشەویستی ئەگەر گشتگیر نەبێت، بێ بەرهەم دەبێت"
ئیبن عەرەبی

بەدر ڕۆیشت و منیش بە دوای خانوویەکی کرێدا گەڕام و دۆزیمەوە. خانووەکە زۆر لە حەرەم دوور نەبوو، بەڵام حەوشـــە و باخچەی نەبوو، هەر دەرگەم کردباوە، خۆم لەســـەر ڕێگە دەدیتەوە. کاتێک لەســـەر جێگەکەم پاڵ دەکەوتم، گوێم لە تەقە و تەپەی پێی ڕێبواران دەبوو. چوومە ناو کۆڕی دەرس و دەوری حەنبەلییەکان، پێشـتر لە ئەندەلوس شـــتی وام نەدیبوو. ئێواران لەگەڵ زۆر لە ســـۆفییەکان دادەنیشتم، بە دەیانیان سەر بەوان بوون. لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و شـــام و یەمەنەوە هاتبوون. بەشـــێکیان مورید بوون، هێندێکیان نیوەمورید بوون. لە ســەروســەکوتی هێندێکیشـیان دڵنیابووم، کە نە زانســـت و مەعریفەیان پێیە، نە کەســـی نوورانی و عیریفانین. بەشـــێکیان خۆیان لێم نزیک خســـتەوە، بەشـــێکیشـــیان لێم دوورکەوتنەوە.

چەند هەفتەیەک بەم حاڵە مامەوە، ڕۆژێک لەنێو کۆڕی فەقێیانم کەســـێکم بینی، نێوچاوانی لە پانیدا وەک کتێبێکی کراوە وابوو. بە ڕیشی سپییەوە، دەتگوت قەندیلە دانراوە. بە بزەی بەردەوامی، دەڵێی

گزەنکی بەرەبەیان بوو. لە ناخەوە هەستم بە سام و هەیبەتی کرد، بەڵام هیچ قسەیەکم لەگەڵدا نەکرد.
وەک کەسێکی نزیک و ناسیاو باوەشم پێدا کرد، نەشمدەزانی کێیە. خوایە دەبێ ئەمە مێخی من نەبێت؟ دەی خوایە بیکە بە مێخی من، خوایە! نووری تۆ، لە ڕوخساری ئەو پیاوەدا دەبینم، میهرەبانیی تۆ، بە تەویلییەوە دەدرەوشێتەوە، بەرەکەتی تۆ، لە بزە و خەندەی دەفامرێتەوە، لووتفی تۆ، لە چاوەکانی بڵێسە دەدات. خوایە بۆم بکە بە مێخێک، دڵمی پێ چەسپا و سینەشمی پێ ئاوالا بکە، لە ڕێگەی ئەو پیاوەوە، بەڵێنی خۆت دەگەڵ من بەجێ بێنە. لە کۆتاییدا گوتی:
- دێی بۆ لام، یان من بێم بۆ لات؟
- من دێمە خزمەتت قوربان!
- دە کەوایە بەیانی لە مەقامی ئیبراهیم بە دیدەنی یەک دەگەین.
بەیانی لە مەقامی ئیبراهیم بە دیداری زاهیر ئەسفەهانی شادبووم. یەک ساڵی ڕەبەق لە دەرسی ئەو دانیشتم، یەک شەو و ڕۆژیشم بە زایە نەدا. هەموو ئەوەی دەیزانی فێری کردم، هەموو ئەوەی دەیشمزانی لەگەڵیدا ئەزموونم کرد. هەر بەیانییەک، کە دەچوومە لای، دەستی دەخستە سەر سینەم و نزای پارێزبەندیی لەسەر دەخوێندم. دەستمان بە خوێندنی وانەکەمان کرد. شەوان، کە دەمویست مۆڵەتی لێ وەربگرم و دەرچم، دەستی دەخستەوە سەر سینەم و نزای پارێزبەندیی لەسەر دەخوێندمەوە. بە دڵ و هەستی پڕ بەرەکەت و خۆشنوودییەوە، بەرەو ماڵ دەبوومەوە. ئەو نزای پارێزبەندی کردە نەریت و قەت لەبیری نەدەچوو. تەنانەت جارێک بەبێ ئاگاداریی وی چوومەوە ماڵەوە، هات بە توندی لە دەرگەی دا، کە کردمەوە، دەبینم ئەوە، نزاکەی لەسەر خوێندم و ڕۆیشت. زاهیر وەک مێخێک ڕەفتاری لەگەڵ دەکردم، بەڵام مەقامی من لەگەڵ ئەو، ئەو هیوایەی پوکاندمەوە. شتێک هەبوو نەمدەزانی چییە، نەشمدەتوانی لێکی بدەمەوە... بەڵام لەوە دەچوو ئەو دوو مێخەی

ناو باخەڵم توانسـتی بۆنکردنی دوو مێخەکەی دیکەیان پێدا بم! سەیرە! ئەو ماستە موویەکی تێدایە، بۆیە وا سەوداسەر بووم. هەر دەڵێی نیوەی لە مرۆڤ و نیوەکەی دیشی فریشتە بوو. نوور، نیوەی دڵی وی ڕووناک کردبووەوە، نیوەی دیکەیشـی بە خوێن و گۆشـت داپۆشـرابوو. عاریفە و عاریف نییە، دەتوانێ و ناتوانێت، دەکرێ کەرامەت لەسەر دەستی ڕوو بدات، دەشێ ڕوویش نەدات. هێندێک جار ڕاسـت دەپێکێ و هێندێک جاریش سـەرچیخ دەچێت، بەڵام ڕاستییەکەی پایە و مەقامی ئەو لە مەککە زۆر باڵایە. حاکمی مەککە ڕێزی دەگرێت و بوێریی ئەوەی نییە لە ئیمامەتی مەقامی ئیبراهیمی لای بدات. گاڤێک حاجیانی فارس لە مانگی ڕەجەب و زیل حیججە دێن، بەرەکەت لە جلەکانی وەردەگرن، دەوسـەکانی[10] بە پیرۆز دەگرن، لە مزگەوت خەرمانەی لە دەور دەکەن. بەدرێژایی شـەو، لەپێش قاپیەی دەرگەکەی، هەڵدەکورمێن. کاتێک مەوسـیمی ئەوان دێت، شێخ بە زمانی فارسی دەدوێت و وانە دەڵێتەوە.

لەو ساڵەی، کە ئەو شێخە منی خستە ژێر سایەی خۆی، هەر لەو ساڵەی کە ئەو شـێخە منی خسـتە ژێر سـایەی خۆی، مەریەمی هاوژینم، لەنێو کەژاوەیەکی قەشەنگی مەغریبی و، زەینەبی کچیشم لەنێو تابووتێکی دارینی داخراودا، گەیشتن. سەرەتا بەدرم بینی، زۆر کز و لاواز بووبوو، دەتگوت بەدرێژایی ڕێگەکە، هیچی نەخواردووە، پیری زیاتر لە ڕووی دەرکەوتبوو، تەنانەت دەموچاوی ڕەشـی، لەگەڵ قژی سـپیدا، کەوتبوونە ململانێ. لە وڵاخ خۆی هەڵدایە خوارەوە، منیش بەرەو لای چووم، وەک منداڵێکی بچووک دەسـتی بە گریان کرد. هەواڵی مەرگی زەینەب بۆ من کتوپڕ نەبوو، دوو ڕۆژ پێشتر خوا ئەوەی بۆ کەشف کردم. کفن و کەلوپەلی شۆردنم ئامادە کردبوو، چاوەنۆڕی گەیشـتنی ئەوانم دەکرد. تابووتەکەمان بەرەو

---

[10]-جێپێیەکانی.

گۆڕستانی (مەعەلات) برد و شۆردمان. دوای نوێژی نیوەڕۆ نوێژی مردوومان لەسەر کرد. پاشان بە دەستەکانی خۆم ناشتم، لەگەڵ چەند ئەسرینێکی گەرم خستمە نێو گۆڕە بچووکەکەی. من دەزانم ئەو وەک گەلایەکی بچووکی یاسەمین، بەسەر ڕووباری خەم و پەژارەی جاویدانی باوکیدا سەر دەکات.

زاهیر هات دڵنەوایی و پرسەم لێ بکات، منیش بوێری ئەوەم کرد پێی بڵێم: بەقەد قەبارەی خۆشەویستیم بۆ زەینەب، دڵم کونێکی گەورەی تێ بووە. هەر لەو ڕۆژەی لەدایک بوو، جێم هێشت، ئەو ڕۆژگارەی ئەو هەراش بوو، جێم هێشت، ئەو ڕۆژەی مەرگ پێچایەوە، لای نەبووم. ئەرێ پێم بڵێ: ئەمن چ باوکێکم؟ بزەیەکی کرد و منی لەباوەش گرت. شەپۆلێکی میهرەبانی دایگرتم، زەحمەتە هیچ دایک و باوکێک هەستیان بەم خۆشییە کردبێت، ئەوسا گوتی:

- ئەبووزەینەب، پێوانەی خوا زۆر دەبێت و لە کەمیی نادات. ئەگەر خودا تای تارزوویەک سووک بکات، تایەکەی تری قورس و سەنگین دەکات. ئەرێ تۆ ئەمەت ناوێت؟

- ئەی چۆن نامەوێت؟

- دەی گوێ لە کەلامی خودا بگرە...

وەک نەریتی هەمیشەی قورئانخوێندنەکەی، چاوەکانی نوقاندن و منیش وەک ئەو، چاوەکانم لێک نان، دەستی بە خوێندنەوەی ئایەتی :"لکی لاتأسوا علی ما فاتکم ولاتفرحوا بما اتاکم" کرد.

دوای نەختێک دڵدانەوە، زاهیر هەستا و گوتی:

- مۆڵەت بۆ (فەخری نیسا)ـی خوشکم وەربگرە، بابێت سەرەخۆشی لە ئوم زەینەب بکات.

- ئەگەر پێت خۆش بێت مەریەم دەنێرمە لای ئەو، با ئەو ئەزیەت نەکێشێت.

- نا ئەو بەرەبەری عەسر دێت.

- ئێمە دانیشتبووین، فەخری نیسا هات و سڵاوی لێ کردین. پێشتر گوێم لە دەرســــەکانی گرتبوو، کە لە ماڵەوە دەیگوتنەوە، خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێ دەکرد، وەختێکیش پیربوو وازی لە دەرســـگوتنەوە هێنا، بەڵام ڕاسـتییەکەی، یەکەمجار بوو ڕەنگ و ڕووی ببینم. ئەو، بە چەند ســاڵێک لە زاهیر گەورەتربوو، بەڵام وەک دایکی تەماشــای دەکرد و ڕێزی لێ دەگرت. لەناوەڕاســـتی ژوورەکە وەســـتا و بە کنەکنەوە گوتی:

- کامتان ئیبن عەرەبین؟

هەستام و ڕووی قسەی لە من کرد و گوتی:

- ڕۆڵە! خودا پاداشتت فرە بکات و سینەت گوشاد بکات.

- خودا خێرت بنووسێت پووری.

پاشان چووە ژووری ژنان و سەرەخۆشی لە مەریەم کرد. دانیشتم، هەموو لایەک بێدەنگ بوون، مەگەر ئحم ئحم و دەنگی تەسبیحات بە سرتەسرت هاتبا، دەنا مەجلیس کشومات بوو. پرسە کۆتایی هات، من و مـەریـەمیش دەرگەی خەمانمان بەســـەر خۆماندا داخســـت. ویســـتم لەگەڵی درێژبم، هەســـتم کرد زۆر لەگەڵم گۆڕاوە. کێشـــی لەشـــی، زۆر زیادی کردبوو، هەر دەڵێی نە ســـەفەری کردووە و نە منداڵیشـــی مردووە. جێگەی ڕاخســـت، جێی خۆی لە هی من جیا کردەوە. لـەبن دیوار پـاڵکـەوت و پشـــتی تێ کردم. لـەبـارەی خزموکەســـانی بیجایە پرســـیارم لێ کرد، وەک غەریبەیەک وەڵامی دامەوە. لە تەندروســـتیم پرســـی، وەڵامی نەدامەوە، گوێم لە گریانی بوو. بڕیارم دا تا هێور نە بێتەوە، وازی لێ نەهێنم. من خەوتم، بەڵام پێم وا نییە ئەو خەوتبێت. بەیانی ڕۆژی دواتر، خواردنی بۆ هێنام، لە ئادگاریەوە دیار بوو، قســـەگەلێکی زۆر پێ بوو، وا دیارە شـــەو ئامادەکاریی بۆ کردبوو، لە ئاخری هاتە گۆ:

- دەمەوێت بگەڕێمەوە بیجایە.

چاوەکانم هەڵبڕین و تەماشـام کرد، ئەویش بەرەو شوێنێکی دوور نیگای کرد، پێم گوت:

- تۆ ئێســـتا لە باشـــترین شـــوێنی زەوی ســـەنگراویتەوە، کەچی دەتەوێت بچیتەوە بیجایە؟

بێدەنگ بوو، هیچ وەڵامی نەدامەوە. لێوەکانی کشـــتکردن و خۆی لە تەماشاکردنی ڕوخساری من دوور گرت، پێم گوت:

- گوێبگرە مـەریـەم، پێکـەوە تـاڵاوی مـەرگـەی زەینـەبمـان نۆش کرد، پێت وانەبێت هەر تۆ ســـکت ســـووتاوە. ڕوو لە خوا بکە و لەبەری بکڕووزێوە، وابەسـتەی دیواری کابە بە، خەم دەڕوات و سێبووریی دڵت دێت.

- ئـەبووزەینـەب بـاشـــترە لێم بگـەڕێیت بڕۆم، هیچ پرســـیـارێک لەبارەمەوە مەکە. ئەگەر خوا هیچی بۆ کەشـف نەکردوویت، چاکترە هەر نەیزانیت.

ئەســـرین تنۆک تنۆک بەســـەر ڕوویدا دەهاتنە خوارەوە. لە دەورم هەستا و ڕۆیشت، گوێم لە دەنگی گریانی بوو. سەرم لەو ژنە سوور مـابوو، دەمزانی بۆ دیـداری من چـەنـدە تـامـەزرۆ وعـەودالـە، بـەڵام کۆســـتکەوتن و ســـکســـووتان، دیداری منیان لەبیر بردبووەوە. نانم خوارد، هـەر بیرم لـەوە دەکردەوە ئـاخۆ چیی بکـەم بـاشـــە، وەلێ، چەندی کردم هیچ وەرامێکم دەســـت نەکەوت. چاوەکانم نووقاندن، هیچ کەشـف و کەرامەتێکم بۆ نەهات. چووم لە ســـووچی ژوورەوە دەگریا، گوتم:

- جارێ بمێنـەوە تـا حـەج دەکـەیت، پاشـــان ئەگەر پێت خۆش بوو بگەڕێوە.

## ٥٠

**"خۆشەویستی نهێنییەکی خواکردە"**

**ئیبن عەرەبی**

مانگی ڕەمەزان هات، خەڵکی مەککە بە تەپڵ و بەزموڕەزم پێشوازییان لێ کرد. حەسیرەکانی مزگەوتی حەرام نوێ کرانەوە، هەر ئیمامە و سووچێکی مزگەوتی گرت و نوێژی تەراویحیان تێدا کرد. مزگەوت پڕ لە مۆم و مەشخەڵ بوو، تەنانەت بەشێک لە گۆڕەپانەکانی، وەک ڕۆژی ڕووناک، دەدرەوشانەوە. بەسەر هەموو منارەیەک چرایەک دانرابوو، دوای فتارکردنەوە دادەگیرسان و تا ئیمساککردن نەدەکوژێنرانەوە. کاتی وانەگوتنەوەی منیش گۆڕانی بەسەردا هات و کەوتە دوای نوێژی بەیانی، فەقێکانم وردەوردە زۆر بوون، تا ژمارەیان گەیشتە سەت کەس. زاهیریش لەنێو فەقێکان دادەنیشت و زانستی خۆراوای لەمن وەردەگرت، ئەمنیش دوای عەسران دەچووم زانیاری خۆرهەڵاتم لێ وەردەگرت. ئەگەر مەسەلەیەکی لێ عاسێ بووبایە، دەچوو لە فەخری نیسای خوشکی دەپرسی و بەیانی وەڵامەکەی بۆ دەهێنایەوە. فیکر و خەیاڵم کەوتە سەر ئەو ژنە، داوام لە زاهیر کرد، ڕێگە بدات وانەی لەکن بخوێنم.

- ئاخر ئەو پیربووە و وانە ناڵێتەوە.

- دەچم بەتەنیا لەگەڵی دادەنیشم.

- باشه بەیانی مۆڵەتت بۆ وەردەگرم.
دواتر مۆڵەتی بۆ وەرگرتم. بەرەبەری ئێواران پاش ئەوەی کاروباری ماڵەوەی تەواو دەکرد، دەچووومە ماڵیان، لەبەردەرگە دای دەنیشاندم، زانســـتێکی بەســـوود و بێ گەرێوگۆڵ و شــیرینی پێ دەگوتمەوە. ڕاستیت دەوێت، ئەو تامەی لە زانستی ئەوم گرت، لە زانستی هیچ پیاوێک وەرم نەگرتبوو. لەگەڵ ئەودا، کتێب دوای کتێب و ژیننامە دوای ژیننامەم دەخوێندەوە. هەرکە لە باســـێک دەبووینەوە، بە باســێکی دیکەوە ســەرقاڵ دەبووین. هەرگیز لە قســەکانی مەلوول نەدەبووم، ئەگەر زانیبام بە شــتێکەوە خەریکە، بۆ ئەوەی زنجیرەی قســـەکانی نەپچڕێنێت، خێرا دەچووم کارەکەم بۆ جێبەجێ دەکرد. ئەگەر کەسێک هاتبایە ژوورەوە، دەیدیت من خەریکی حەوشە ماڵینم و ئەویش قسە دەکات، من خەریکی جلشۆرینم ئەویش دەدوێت، من خەریکی ئاگرکردنەوەم، ئەویش وانەم بۆ شەرح دەکات، من خەریکی ئالیکدانی ئاژەڵانم، ئەویش زانســـتم بۆ هەڵدەڕێژێت، وەختێکیش خۆرئاوا دەبوو، لە خزمەتی مەرەخەس دەبووم.
هەموو ئەو ڕۆژانەی لە خزمەت ئەو بەســـەرم بردن، بۆ زەخیرەی عەقڵم بوون، تەنێ ڕۆژێک نەبێت، خوا وای کرد بۆ بەرژەوەندیی دڵم بێت. ئەمن لەبەردەرگەی دانیشـــتبووم، کچێک خۆی دایە لاوە و ویستی بێتە ژوورەوە، قەت قەت چاوی وا جوانم نەدیتبوون، گوتی:
- سلاو پووری.
فەخیری نیسا پێی گوت فەرموو "وەرە ژووری"، هاوکات دڵی منیش پێی گوت: "وەرە ژووری"، لەیەک کاتدا هاتە ژوورەکەی فەخری نیسا و ژوورەوەی دڵی من. بەڵێ، ئەوە نیزامی کچە چاو جوانەکەی شێخ زاهیر بوو، کتێبی بۆ پوور و باوکی دەخوێندنەوە، ئەمن هێندێک لەو کتێبانەم خوێندبوونەوە و هێندێکیشـــم نەخوێندبوونەوە، بەڵام ڕاســـتییەکەی هەمدیس کەڵکەڵەی خوێندنەوەیان کەوتەوە خەیاڵم. هەموو جارێک دوای من، لای پووری دەرســـی دەخوێند. لە کاتی

دەرچوونم، گوێم لە قســـەی پووری بوو دەیگوت "کچم ناوی خوا بێنە و دەسـت پێ بکە." گوێم قولاخ کردن، بە ڕواڵەتیش خەریک بوو پێچەی سـەرم لوول بکەمەوە، بە ئەنقەسـت خۆم دەخافلاند، تا گوێ لە دەنگە پڕ سۆز و شیرینەکەی بگرم، کە وەک تنۆکە بارانێک ڕژایە سەر دڵم. گوتم:

- خاتوو فەخری نیسا، ئەو کچە چیت بۆ دەخوێنێتەوە؟

بەرلەوەی وەڵام بداتەوە، گوتم:

- حەزم لێیە منیش هەر لەبەردەرگە، لەو خوێندنەوەیەدا بەشدار بم.

- خوا یاربێت بەیانی وا دەکەین.

بوو بە دەرســـی عـەقڵ و دڵ. بە منارەی بینایی و بەســـیرەت، بە شوعلەی جەستە و ڕووح. ئەمن پرسیارم دەکرد و ئەویش داوای لە نیزام دەکرد وەرام بداتەوە، نیزامیش پرسیاری دەکرد، فەخری نیسا داوای لـە من دەکرد وەڵام بـدەمـەوە. بـەدرێژایی وانـەخوێنـدن و کتێبخوێندنەوە، نە من بە ڕاســـتەوخۆ قســـەم لەگەڵ ئەو کرد و نە ئەویش قســـەی دەگەڵ من کرد، تەنێ لە ڕێگەی پوورێوە قســـەمان دەکرد. لەوپەڕی ئەندەلوســـەوە بۆ مەککە هاتم و کلیلی ڕووحی منی دۆزییەوە. ها ئەوەتە ئەو کچە لە دەرگەی دڵی منی دا، هەر دەڵێی قـەت کـەس لێی نەداوە. نیزام لە ســـینەمدا چرایەکی پڕشـــنگداری داگیرسـاند، لەژێر ڕووناکی ئەو چرایەدا چەند گۆشـە و سـووچێکی دڵی خۆم بینین، پێشـــتر قـەت نـەمبینی بوون. قوژبنی چۆلوهۆڵ، ژووری داخراو، چـەندان ژێرزەمین، هـەســـتی ناســـک لـەنێویاندا بەســـەریەکەوە کەڵەکە بووبوون، نەکرابوو بۆ ژیانی من دەریانخەن. بەردەوام، لە هەمو ڕۆژ و شـەو و چرکەیەکدا، خەیاڵی هێور و ئارام دەکردمەوە. وەختێک دەمنووسـی ڕووی جوانی لەنێو هەموو پیتێکدا دەردەکـەوت. وای لـە چـاوەکـانی، دەڵێی پیتی (حـا)ن، کـە بـابـای خۆشنووس نزیکەی دانەڕۆژێک پێوەی خەریک دەبێت. ئای لە لووتی جوانی، کە لە ڕێکی و ڕاســـتیدا وەک پیتی (دال) وایە، کە ســـەرواو

سەردێڕی پێ تەواو دەبێت. وای لە لێوەکانی، ڕێک لە ویقاری پیتی (ئا) دەچن، کە بێدەنگیش دەبێت و دەخەنێت شێوەی پیتی (یا) دەکەن! ئەی جوانیی لاجانگی؟ دەڵێی هەمزەیە لە دەستی ئەلفەکەی ڕای کردووە! ئەی بۆ دەموچاوی نالێن، دەڵێی کتێبێکی نوورانییە فریشتەکان نووسیویانەتەوە.

ئەی زیرەکییەکەی! ئاماژە ئاڵۆزەکانی بە پوورە زانا و بەحورمەتەکیشی کەشف نەدەبوون. کاتێک لەبارەی شتێک پرسیاری لێ دەکرد، وەڵامێکی دووورودرێژی دەدایەوە، بەسەرەتای قەسیدەیەک کۆتایی پێ دەهێنا. وەختێک دەچوومەوە سەر پاشکۆی قەسیدەکە، دەمبینی هەموو غەزەلی جوانن. کاتێک فەخری نیسا پرسیاری شتێکی لێ دەکردم، منیش وەڵامێکی درێژترم دەدایەوە، شایەتیشم بە شیعرێک دەهێنایەوە، نیزام دەیزانی باقی قەسیدەکە نامەگەلێکن لە ناخی دڵەوە بۆی دەنێرم و شێت و شەیدای بووم.

سەرەتا چەند هەفتەیەک، نیزام لەپێش دەرگە دادەنیشت، پوورێش لەدواوە و منیش لەکن کۆسپەکەی. بەدرێژایی دەرسەکە نیزامم دەبینی، پوورێش ئاگای لێ نەبوو. کچە چارۆگەی سەر دەموچاوی شل دەکردەوە، چاو و گۆنا و لێو و سینەکەی، دەڵێی گۆمی پڕ دوڕ و مرواری بوون.

ڕۆژان هاتن و ڕۆژان چوون، دوو هێندەی دەرسەکانی شێخ زاهیر، دەرسەکانی فەخری نیسام ئەزبەر کردن و تێیان گەیشتم. ئەو پیرەژنە بەستەزمانە لەگەڵ دەرس و دەورم مژووڵ بوو، جاری وا هەبوو کتێبم دووبارە بۆ دەخوێندەوە، درکی بەمە نەدەکرد و لەبیری دەکرد. چاوم لە نیزام دادەگرت و ئەویش چاوی لێ هەڵدەتاکاندمەوە. دەستمان بە کتێبێکی نوێ دەکرد، دەمانزانی هەفتەیێ دەخایەنێت، هەفتەیەک وەک مەلێکی سەرلێشێواو بە نێوچاوانی نیزامدا دەهاتم و دەچووم. هەفتەیەک وەک شاعیرێکی نوێ، لەجوانیی ئەو کچە ئەسفەهانییە ڕەسەنە ڕادەمام. هەفتەیەک لە ماچەکانی ورد

دەبوومەوە، کە وەک چرۆی شـــەکەتی خەزان لە ئاســـمان دەکەونە تەقڵەبازی و لەسـەر دەمی دەنیشنەوە. هەفتەیەک لە جووڵە و بزاوی دەســــتە ناســـکۆڵەکانی، لە چاوە ژێرپیاڵەکانی، لە لێوە گوڵینەکانی، ڕادەمـام. هـەفتـەیەک لە ئەگریجەکانیم دەڕوانی، کە دەکەوتنە ســـەر لاڕوومەتەکانی و ڕووشـانەکەی سـەر ڕووی دەشـاردەوە. منیش بە شـــاردنەوەی ئەو ڕووشــــانە، نیگەران دەبووم، هێمام بۆ دەکرد زوولفـەکـانی وەلا نێـت، ئـەویش بـە پێکـەنینـەوە وای دەکرد. کـە پێدەکەنی، ڕووشانەکەی قووڵتر دەبووەوە، لەگەڵ قسەکردنیشی، والا دەبوو. ڕووشـــانێک، لێواولێو بوو لە ژیان. منیش چەند جارێک بە بێدەنگی، ئاماژەم بۆ چەناگەم دەکرد، کە بە منداڵی بە پەلی دارچواڵە لە مورسییە بریندار بووبوو، ئێستەیش لەبن ڕیشم شراوەتەوە. نیزام ڕووی گرژ دەکرد، حەزی دەکرد ڕووشـانەکەم ببینی، منیش ڕیشـم لێک دەکردەوە تـەمـاشـــای بکات، بەڵام نـەیدەدیت. بە گیانبازی و ڕووقەیمی، خۆم نزیک دەخستەوە، تا لەودیو دەرگەوە ڕووم ببینێت، فەخری نیســـایش، دەیبینی من زیاد لە پێویســـت نزیک بوومەتەوە. نەیسـا[11]، من بە خشکەخشک و نیزامیش بە خێشـەخێش، لێک نزیک دەبووینـەوە. چـاوی دەبڕینـە پووری، لـە کـاتی بێئـاگـاییدا دەرفـەتی دەهێنا، دەسـتی درێژ دەکرد و بە ڕوویدا دەهێنام: وەها ڕادەچڵەکیم، دەتگوت منداڵم و بۆ یـەکـەمجـار لـە ئاوم هەڵدەکێشـــن. ئەو، چاوی لەســـەر پووری هەڵنەدەگرت و وردە وردەیش دەســـتی بە ڕیشـــمدا دەهێنا. چەند جار دەستەکانی ڕێگەیان هەڵە دەکرد، دەستی دەکەوتە ســـەر تـەوێڵ، لووت و ئـەبرۆم. کەڕەتێک دەســـتی لە دەمم نزیک خسـتەوە، منیش ماچم کرد، لە جووڵەم خسـت و توونـد بە دەممەوە نووسـاند، دووسێ جاری دیش ماچم کرد. سەیری دەموچاویم کرد، سـوورهەڵگەڕا، خوێنی تێدا تێزا و سـووکەلەرزێکی گرت، تووشـی

[11]-بەهەرحاڵ.

هەناسەفڕکێ بوو، پاشان بە تووندی دەستی خستە سەر لێوەکانم و کێشایەوە.
نیزام هەموو کاتەکانی داگیرکردبووم، هۆشـــی ڕفاندبووم. بەر لەوادەی خۆی دەڕۆیشتم، لە سەرەوەی ڕێگە دەوەستام، تا لەنێوان ماڵی باوکی و پووری ببینم، زۆر بە پۆشـــتە و پەرداخ و ڕێکوپێکی ڕێی دەبڕی. چارۆگەیەکی بەســـەر خۆیدا هەڵدەکیشـــا و کەمێک ڕوویشـــی دادەپۆشـــی. ئەگەر کتێب یان قاپلەمەیەک یان خواردنێکی پێ بوایە، بەری ڕووی خۆی پێ دەگرت، ئەوســـا لە ڕۆیشـــتن خاو دەبووەوە و چێژی منیش زیاتر دەبوو. وەختێکیش دەردەچوو، لە هەمان شـــوێن دەوەســـتامەوە، بەدوایدا دەچووم، دەیزانی شـــوێنی کەوتووم، تا دەگەیشـــتەوە ماڵەکەی، چاوم تێدا نز دەکردنەوە، ئینجا دەگەڕامەوە ماڵ. بە خەیاڵ جەســـتەی ئەوم دادەتاشـــی و بەدرێژایی شـــەوان بە عیشـــق و ئەوینەوە قســـەم بۆ دەکرد و دەملاواندەوە. ڕۆژێک لە بازرگانێکی عێراقی بەندەکاغەزێکم کڕی، کە لە شـــاری موســـڵەوە هێنابوونی، دەیگوت کاغەزەکان زۆر باشـــن، حوبرەکە هەڵدەمژن و بەسەریانەوە پەرش نابێت. ژاوەژاو و ناڵەی ژوورەکانی دڵم، خســـتنە ســـەر نووکی قەڵەم و بە شـــیعر بۆ نیزامم دەربڕین و ناوم نا: (ترجمان الاشواق).

# ٥١

"هەر خۆشەویستییەك هۆیەكەی زانرا، كۆتایی پێ دێت"
ئیبن عەرەبی

مەریەمی هاوژینم بێ ماچومووچ ماڵئاوایی لێ كردم، ڕووی لێ وەرگێڕام و بە تۆقە و دەست ماچكردنم، خۆی پەڕاندەوە و ڕۆیشت. لەگەڵ كاروانی حاجیانی مەغریب، كەژاوەیەكم بۆ بەكرێ گرت و بەڕێم كرد، لە جەددەش تا عیزاب سواری كەشتی دەبوو. زیاد لە خەرجی ڕێگە پارەم دایێ، هەروەها ئەو بەندەیەی بەدر لە ڕۆژی هێنانی مەریەم، لە بیجایە كڕیبووی، پێم بەخشی. هیچ وەسیەتێكم بۆ نەكرد. ئەو لە دڵم هاتەدەر، منیش بەبێ خوداحافیزی، لە دڵی ئەودا چوومە دەر. خوا وای ویست، دیارە مەككەیش هەروا خواستی لەسەر بوو. هێندێك خۆشەویستی هەن، تەنێ لە وڵاتی خۆیان نەشونما دەكەن، بچنە وڵاتانی دیكە سیس و زەرد دەبن و دەوەرێن. خۆشەویستی ئێمەیش نافوورەیەك بوو هەر لە ئەندەلوس ئاوی عیشقی پڕاند، گاهێك جێمان هێشت، وردەوردە ئاوەكەی لە كەمی دا، دواتر لە قرچەی گەرمای مەككە، بە یەكجاری چكی كرد.

ها ئەوە مەریەمە مەحبووبەكەی منە، ئەم كەژاوەیە لەبەر چاوی مندا، بەسەر پشتی وشترەوە، بەرەو خۆرئاوای دەبات! دوای چەند هەنگاوێكی كەم، وشترەكە وەستا. پێم وابوو مەریەم لە كەژاوەكەی

دادەبەزێت و پەژیوان دەبێتەوە، بەڵام وای دەرنەچوو. دوای نەختێکی تر، ملی ڕێگەیان گرتەوە و لە ئاسۆ ئاوابوون. پاشان لە خەو نەبێت، جارێکی دیکە مەریەمم نەدیتەوە. گەڕایەوە بیجایە و شازدە ساڵی دیکەی لەگەڵ خزموخوێش بەسەربرد و دواتر مرد. دوای تێپەڕینی چەند مانگێک، قاسیدێک هات و خەبەری مەرگی ئەوی بۆ هێنام، هەر چەند بەر لەوەی قاسیدەکە بگات، خودا مەرگی ئەوی لە کاتی خۆیدا بۆ کەشف کردم. ڕۆژێک لە خەودا پەراسوویێکم وەژان کەوت، زانیم ئیتر مەریەم مرد. هەستام و نوێژێکی دووردودرێژم کرد و نزای گەیشتن بە مەقامێکی پیرۆزم لە بەهەشت بۆ کرد و خەوتمەوە. ژانی پەراسووەکەم نەما، زانیم ئێستە کەوتووەتە ژێر چاودێری و لوتفی خودا، هەر ئەو خۆی دەزانێت چۆن پاداشتی ژنێکی کۆستکەوتوو دەداتەوە، چۆن دڵی ژنێکی مەحرووم، ئارام دەکاتەوە. کاتێک گەڕامەوە ماڵەوە و مەریەمی منی لێ نەبوو، ئاگر لە هەناوم بەربوو. ئاخر بەر لە چەند مانگێک هاوژین و کچێکم هەبوو، من باوک بووم، کەچی ئێستە بە تاقی تەنێ ماومەتەوە. بەبێ خەمی لەو دەرگەیە بەڕێم کرد، بەڵام کە گەڕامەوە خەم و پەژارە خۆیان لێ مەڵاس دابوو، لە چاوەڕوانیی مندا چاوەچاویان بوو. بێ خۆ ئامادەکردن، چووم تەوافم کرد، هەستم کرد لە دڵی مندا پیرێک لە گیانەڵڵادایە، منداڵێک لە ئانی لەدایکبوونیەتی. ئاویلکەدانی پیرێک و زیکە و چریکەی منداڵێکی نێو ڕەحم. لێوی گۆڕ و بێشکەی زارۆکێک. خۆرێک هەڵدێ و خۆرێکیش ئاوا دەبێت. مەریەم خۆشەویستییەکەی کۆتایی پێ دێنێت و دوور دەڕوات، نیزامیش دڵم دەبات و دەمکاتە دێوانە. ئەرێ بەڕاست لەبەینی ئەو دوو ژنەدا من کێم؟ کوان مامۆستاکانم؟ کوان دەرسەکانم، ئەی کوان دوو مێخەکانی ترم؟ من چی بکەم؟ دەبێ چۆن بم؟ لە ناخی مندا چەندان گێژەڵووک هەڵیان کردبوو، بە هیچ دانەدەمرکانەوە، نەمدەزانی بەرەو کوێ سەری خۆم هەڵگرم. گێژەڵووکەیەک لەنێو ڕووحم هەڵی کردووە،

گێژەڵووکەیەکیش لەنێو عەقڵمدا پێچ دەخوات. گێژەڵووکەی سێیەمیش ئێستە لەنێو دڵمدا هەڵدەکات. ئەرێ بەڕاست من ئێستە سۆفیم، یان عاشـــق؟ یان هەردووکیانم؟ خودایە من واز لە تەواف ناهێنم تاکوو ڕێنوێنی خێرم نەکەیت.

لێکبێنە تەواف دەکەم، حەوت جار... دە جار... سەت جار، دوو سەت جار. هەزار جار... دوو هەزار جار. تەنیا بۆ نوێژە واجبەکان وچان دەدەم، پاشان دەست پێ دەکەمەوە. شەو ڕاشکاوە و بەنیوە بووە، وا کازیوەی بەیانی هات و سـپێدە بووەوە. دووکان کرانەوە، دنیا قەڵەبالخ بوو. گەرما هات و تیشـک شـکایەوە، ئێوارە هات و خۆرئاوابوو، کاسبکاران بەرەو ماڵ بوونەوە، مزگەوت داسەکنایەوە، هیلاک و سـسـت بووم، سـەرم سـووڕا. خۆم بە دیواری کابەوە گرتەوە و پێیەکانم بەدوای خۆمەوە ڕاکێشـان. نە هیچم لەپێش خۆم دەدیت، نە لەتەک خۆم هیچم دەژنەوت. کەوتم، پێم وابێت لەسـەر شـازروانی کابە خەوم لێ کەوت، لەگەڵ بانگ هەسـتام، دوو ڕۆژ بوو لە تەوافدا بووم. نوێژم کرد و دانیشـتم و لە کابە ڕامام، ویسـتم بەردەوامی بە تەواف بدەم، پێیەکانم لە هیلاکیان تریوەتریویان بوو. هێزم دایە بەر خۆم و هەسـتامەوە، بە مەیلەو بێئاگایی، یەکدوو جار سووڕامەوە، بە دەنگێکی نزم هاوارم کرد: " ليت شعري هل دروا * اي قلب ملكوا" چەند جار ئەو شـیعرەم پاتە کردەوە، چەندان تەوافی دیکەم بەو حاڵەوە کرد. بێ پسـانەوە تەوافم دەکرد و غەفڵەتگیرانە ورێنەم دەکرد، تا کەسێک دەستێکی لە شـان دام. ترسام و ئاوڕێکم لێ دایەوە:

- نیزام ئەوە تۆیت؟

پەچەی هێنابووە سەر دەمی خۆی، چاوەکانی پێکەنیناوی بوون، لەو حاڵە شـەپرێو و شـپرزەیەی خۆم شـەرمندە و خەجاڵەت بووم. لە وشـکبوونەوەی دەمم، لە جلە شـڕوشـیتاڵەکانم، تەریق بوومەوە.

پەست و هەراسانیم بەئاشکرا پێوە دیار بوو، زمانم لاڵ بوو و لە گۆ کەوت، بەزوانی شیرینی، هاتە گۆ:

- ئەرێ پیاوەکە تۆ لێرە چی دەکەیت؟

- بۆچی؟ هەر ڕۆژێک حەز بکەم تەواف دەکەم، نابێت؟

نیزام بێدەنگ بوو، بە سەرسووڕمانەوە لێم ڕاما، ڕاستەوخۆ هەستی کرد من ئاسایی نیم. لە ماوەی دوو ڕۆژدا هەزاران جار تەوافم کردووە، بۆ نوێژکردن نەبێت لە سووڕانەوە نەکەوتووم. دەموچاوم خۆڵاوی بووە. بەپەرواوە بە دەنگێکی نزم گوتی:

- تەماشای دەوروبەری خۆت کردووە؟

بە کاوەخۆ سەرم سووڕاند، تەماشام کرد، تووشی شۆک بووم. ژنگەلێکی زۆر، بەڵێ تەنیا ژن و بەس، لە ڕاست و چەپمەوە، تەوافیان دەکرد و لە گۆڕەپانەکە نوێژیان دەکرد. ئاپۆڕەی بێهەژماری ژنان بوو، لە من زیاتر، هیچ پیاوێکیان لەناودا نەبوو. بە نیگای تووش و تووڕەیان پێکامیان. بە گنخەگنخەوە گوتم:

- خودایە ئەوە چی ڕوو دەدات؟

نیزام بە نیگەرانییەوە گوتی:

- ئەمڕۆ بیستونۆی مانگی ڕەجەبە.

- ئەمە یانی چی؟

- ڕۆژی تەوافی ژنانە! بزانە لە تۆ زیاتر، هیچ پیاوێکی دیکە لە مزگەوت هەیە؟ دەی هەتا زووە ئەو ناوە جێ بهێڵە!

زووبەزوو لەوێ ڕۆیشتم، وەک منداڵێک، کە دایکی خۆی لێ تووڕە بکات و سەرکۆنەی بکات گریام. بە خشکەخشک خۆم گەیاندە دەرگەی مزگەوت، وەک کەسێکی سەرگەردان نەمزانی بەرەو کوێ بچم. دەمویست خۆم لە لێشاوی ژنان دووربگرم، کە وەک ڕووبار هەڵدەقوڵیین، لە ژنێک هەڵەنگووتم، قاچم کەوتە سەر پێی منداڵەکەی، کە بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشا، دەستی کردە گریان. زۆر بە ڕوونی گوێم لێ بوو جنێوی پێدام، ئاوڕم لێی نەداوە. گورج ڕۆیشتم، لە

کۆتاییدا خۆم لە دەرەوەی مزگەوت بینییەوە. لەوێ چەند پیاوێکم بینین دەڕۆیشتن، سەبووریم هات و نەختێک هێوربوومەوە. تەماشام کرد لینگەخوفێکم لەپێدا نەماوە، لینگەکەی دیکەشـــم داکەند و لەبن هەنگڵم نا و گەڕامەوە ماڵەوە.

## ٥٢

**"گوڵی لاولاو بە دارمێودا هەڵدەگەڕێت و خۆی لێ دەئاڵێنێ، عیشقیش هەر بەم چەشنەیە"**
**ئیبن عەرەبی**

ڕۆژی دواتر، لای فەخری نیسا، پێک گەیشتینەوە. ئەمن هەستم بە شەرمەزاریی کرد، ئەو ڕۆژە هیچ نیگایەکم لەگەڵ نیزام نەگۆڕییەوە. بەهەرحاڵ، ئەوەندەی کرا، کتێبمان خوێندنەوە. دواتر ویستم هەستم، نیزام مەچەکی گرتم، ئاماژەی مانەوەی بۆ کردم و دەرگەی داخست. لەبەردەرگە دانیشتم، ئەو مەچەکەی ئەو گرتی، بۆنم کرد و دەستم خستە سەر. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دەبێ ئەو چ کارێکی بە من بێت و چیم پێ بڵێت.

لە کۆتاییدا نیزام دەرگەی کردەوە و بێ پەچە دەرکەوت. قژی بەسەر شانەکانیدا هاتبووە خوار. بۆ یەکەم جار، تەواوی ڕوخساریم بینی. هەر دەڵێی چاوەکانی گەورەتر و، لێوەکانی پڕتر بوونە. ڕووشانی سەر ڕوویشی، بووبوو بە هێلانەی پاسارییەکی قەت نەفڕیو.

- پوورم خەوتووە، وەرە ژوورەوە.

چوومە ژوورەوە و دەرگەم داخست. لەدیوی ژوورەوەی دەرگەکە دانیشتم. شەو هات هیچ کەسێک بە بەر دەرگەدا تێنەپەڕی. هێمای

نزیکبوونـەوەی بۆ کردم، منیش لێی نزیـک بوومـەوە. هـەر هێنـدەی گـەزێک لێک دووربووین، بۆنی بنـەوشـــە و گوڵم لێ کرد. دەمی کردەوە ددانەکانی زۆر ڕێکوڕاســت بوون، تەنیا ددانێکی لە تاقمی خوارەوە دەرپەڕیبوو، ئەویش جوان و سەرنجکێش بوو. پێی گوتم:
- ئیبن عەرەبی، پێم بڵێ چیرۆکی ژیانی تۆ چییە؟
- چیرۆکی من؟
- بەڵێ، ئەوەی لەبارەی تۆوە نایزانم بۆمی باس بکە.
بەداواکەی ئەو، حەیرانیان بووم. بە دەم بیرکردنەوە، قسەکانی ئەوم بەدەنگێکی نزم کاوێژ کردنەوە.
- هیچ کەس نازانێت، خودا سـەتری کردووە، بۆچی من ئاشــکرای بکەم؟
وەڵامی نەدامەوە. بە قووڵی لێم ڕاما، وەک ئەوەی گوێ بە وەڵامەکەم نەدات.
نەختێک بیر و زیهنی خۆم خستە گەڕ و گوتم:
- نیزام، ئـەوەی تـا ئێســتـە کـەس نـایزانێت ئەوەیە: من تۆم خۆش دەوێت.
ئـەوەم گوت و ســەرم بە خۆمدا بەردایەوە، چاوەڕوانی ورتەیەک، پرتـەیەک بووم، بـەڵام هیچی لـە دەم نـەهـاتە دەرەوە. ئـەوجارە، کە سـەرم بڵند کرد و چاوەکانم تێبڕین، بینیم بە نەرمونیانی و مهیرەوە، بزە دەکات. ئەویش چاوەکانی هەڵبڕین، شـەرمنییەک لەسـەر ڕووی دەرکـەوت، ئـەگـەر ئـەو شــەرمنییـە کـەوتبـایـە ســەر کێوێکی ســەهۆڵبەندیش، گڕی دەگرت. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دووبارە پێم گوت:
- نیزام، زۆر زۆرم خۆش دەوێیت ... خۆشـەویســتییەک، بۆ هەر کوێیـەک بچم یـاوەریم دەکـات، هـەر کـاتێک بخـەوم بێدارم دەکاتەوە. ڕۆژانە سایە و سێبەرمە، شەوانە ڕایەخ و جێی خەومە.

سووکەئاهێکی هەڵکێشا و دەستی خستە سەر دڵی. بە نەرمەبزەیەک، لێوەکانی کشــت کردن، هەر دەڵێی بۆ پێشــوازیی ماچکردن خۆیان ساز کرد. سەری بەخۆیدا بەرداوە، پەرچەمێکی کەوتە سەر ڕووی و دایپۆشی. پەرچەمەکەی هەڵدایەوە، کراسی سەر دەستی داکەلا و هەتا سەر قۆڵی دەرکەوت. لە ناخەوە هەستم بە تەزوویەکی سارد کرد، هەر دەڵێی تاڤگەیەکی بچووک لە سـینەمەوە تەکانی دەدا. تەزوومان پێدا هات و داسـەکنایەنەوە. سـاتێک بێدەنگ بووین، ئەو تەماشــای ئەرزی دەکرد، منیش سـەیری دەسـتیم دەکرد، کە خستبوویە سەر ئەژنۆکەی. پاشان دەستی بزاوت و خستییە ژێر چەناگەی، بزەیەکی کرد و ڕێک لە چاوەکانم ڕاما و گوتی:

- ئەرێ دوێنێ لە تەواف چیت دەگوت؟

- بیرم ناکەوێتەوە!

- خۆ ئیستیغفار و تەسبیحاتت نەدەکرد، بەڵکوو شیعرت دەگوت!

- یانی لە تەواف شیعرم دەگوت؟

- هۆ پیاو! لەوێ لە تەواف هەموو ژنەکان گوێیان لێ بوو، بە دەنگێکی هێندە بەرز شیعرت دەگوت، دەڵێی بانگت دەدا.

- بەڕاست؟

نیزام لە قڵقەی پێکەنینی دا، دەستی بە دەمیەوە نا و هەوڵی دا دەنگی پێکەنینەکەی کەم بکاتەوە. لایەکی بۆ ژوورەوە کردەوە، تا دڵنیا بێت پووری خەوتووە و گوێی لەو کەینوبەینە نەبووە.

منیش نەرمۆکە لەگەڵی پێکەنیم، کۆشام ئەو شیعرەم بیر بکەوێتەوە، کە گوایە لە تەواف بێ هودە گوتوومە . لە کۆتاییدا گوتی:

- دەتگوت: لیت شعري هل دروا * أي قلب ملكوا

بەڵێ، بەڵێ. ڕاست دەکەن.

- سەیرە، تۆ عاریفی چاخی خۆت بیت و ئەوەیش بڵێیت!

- بۆ ئەوە چی تێدایە؟

- تۆ پرسـیار دەکەیت ئاخۆ دەبێت ئەوان بزانن دەسـتیان بەسـەر چ دڵێکدا گرتووە. لـە کاتێکدا تۆ باش دەزانیت هەموو ژێردەسـتەیەک ناسـراوە. مەلەکییەت تەنێ بە ناسـینی مەملووک دەسـتەبەر دەبێت. کەس نییە خۆی بکاتە ماخۆی شتی نەناسراو!
- ڕاست دەکەن!
- ئەو شیعرە هیی تری بەدوا دادێت؟
- بەڵێ.
- دەی بۆم بچڕە.
- وفؤادي لو درى * أي شعب سلكوا
- سەیرە، تۆ عاریفی زەمەنی خۆت بیت و ئەوەیش بڵێیت!
- بۆ؟ ئەوە چی تێدایە؟
- تۆ ئاواتـەخوازی بزانیت ئەوان بەرەو چ نیهالێک چوون، لە کاتێکدا تۆ باش دەزانیت ئەو نیهالە شـیغاف و دڵتی لێک جیاکردووەتەوە و مـەحبووب پێیدا دێتـە ژوورەوەت، ئا ئەمەیە ڕێ لە زانینت دەگرێت. ئـەگـەر بـە نیهال ئـەشـــنا بوویت، ئەوە زانینت لە کیس دەچێت، خۆ ئـەگەر گەیشـــتبیە ڕێگەی زانین، ئەوە بێگومان بە نیهالەکە ئاشـــنا دەبیت. ئاخر چۆن بەر لەو، داوی ئەم دەکەیت؟
- ڕاست دەکەیت!
- شیعرەکە هیچی دیکەی ماوە؟
- بەڵێ.
- دەی بۆم بڵێ.
- أتراهم سلموا؟ * أم تراهم هلكوا؟
- تۆ چیت داوە لەوان؟ تۆ خۆت سەلامەتی، یان بەهیلاک چوویت؟
- ڕاست دەکەیت.
- هیچی دیکەی ماوە؟
- بەڵێ. کۆتا بەیتی ماوە.
- دەی بۆم بڵێ.

- حار أرباب الهوى * في الهوى وارتكبوا
نیزام بەحەپەساوی سەری خۆی بادا و تەماشایەکی کردم و پرسیارێکی کرد:
- سەیرە، تۆ عاریفی زەمەنی خۆت بیت و ئەوەیش بڵێیت!
- بۆ، چی تێدایە؟
- تۆ لە دوای خۆشەویستی و ئەوین، گلەیی لە حەیرانبوون و لێوبەباری دەکەیت، ئاشکرایە ئەوین هەستەکانی مرۆ سڕ دەکات، هۆش دەڕفێنێت، دوای ئەم ڕووداوانە، چی دەمێنێتەوە تاکوو پێیەوە پەریشان بیت؟
- بە خوا تۆ ڕاست دەکەیت!
دواتر دەنگی خۆی هێندە نزم کردەوە، وا هەستت دەکرد بە چپەچپ قسە دەکات. هێندە لێم نزیک بووەوە، هەستم بە ترپەی هەناسەکانی کرد، گوتی:
- پاشان تۆ ئەوە نازانێت عاشق لە مەعشووقەکەیدا فەنا دەبێت، زمانی دەبێتە زمانی ئەو و دڵی دەچێتە سەر دڵی ئەو؟
- بەڵێ دەزانم.
- چۆن دڵت حەیران دەبێت لە حاڵێکدا چووەتە سەر دڵی مەحبووبەکەی؟
- تەماشایەکم کرد و بزەی تەسلیمبوونم بۆ کرد. ئەویش بزەیەکی بۆ کردمەوە و باری ئەو دۆڕان و شکستە بچووکەی لەسەر شان سووک کردم. دەستی درێژکرد و منیش دەستم بۆی برد و دەستەکانمان بە چێژەوە تێکئاڵقان. پاشان نەمزانی بۆچی ئەبرۆکانی گرژکردن و گوتی:
- گەرەکە عەوداڵ و تامەزرۆی ئووم زەینەب بیت، تاکوو تاسە و سۆزی دەروون، هەموو ئەو شتانەت پێ بکات.
تێمڕوانی و بزەیەکم بۆ کرد، لەوەتەی ئەوم ناسیوە، قەت بزەیەکی هێندە پڕ متمانەم بۆ نەکردبوو. بۆ ماوەیەک هەردووکمان بێدەنگ

بووین. پاشـان توند دەسـتم گوشـی، هەر دەڵێی لەسـەر غیرەکەی سزام دەدا، گوتم:
- یانی پێت وایە دڵی مرۆ، دڵی خۆشـەویسـتەکەیەتی، زمانەکەیشـی، زمانەکەیەتی؟
- بەڵێ.
- ئەی چۆن پێت وا نییە، کە لەو بەیتە شـیعرانەدا هەر تۆ مەبەسـت بوویت؟
نیزام دەسـتی خۆی کێشـایەوە، شـەرمێکی کتوپڕ خۆی بەسـەردا هەڵکێشا. پەچەکەی خستەوە سەری و گوتی:
- بەرلەوەی باوکم نیگەران بێت، دەبێ بڕۆم.
- نیزام باوکت یەک سـەعاتە  خەوتووە، تاکوو بەرەبەیان وەخەبەر نایەتەوە.
- چۆن ئەمە دەزانی؟
- خودا بۆی کەشف کردم.
- ئەی پوورم؟
- چاوەکانی خەوتوون و دڵی بەئاگایە، هەسـت بەو ژوانەی ئێمە دەکات و لێشی ڕازییە.
- بەڕاست؟
- هیچ کەشفێکی هەق تەعالا نییە ڕاست نەبێت.
- هەق تەعالا هیچ شتێکی دیکەی بۆ کەشف نەکردوویت؟
- ئەو خۆی دەزانی چی کەشف دەکات نەک من.
نیزام بە چاوی ترس و شـەوقەوە تێم ڕاما، پاشـان دەسـتی منی بۆ دەمی خۆی بەرزکردەوە و بە لێوەکانی نووسـاند و بەچاوچوقانەوە وردەوردە ماچی کرد. ئەوسـا بە نیگاکانی دایگرتم، منی خسـتە ژێر لوتف و عەتف و ئەوینی خۆی. نەمزانی لەو کاتەدا چی باشـە بیکەم، لاسایی ئەوم کردەوە، دەسـتم گرت و لە دەمم نزیک کردەوە، پەنجە بە پەنجەیم ماچ کرد. پاشـان ماچێکی گەرم و گەورەم لە لەپی

دەســـــتی کرد. گوێم لـە ئاخهەڵکێشـــــانی بوو، وەک ئەوەی بیەوێت بگریت، دواتر بێدەنگ بوو. دەســـــتی خۆی کێشـــــایەوە و هەســـــتا و منیش هەســـتام. قژی خســـتەوە ژێر پەچەی و پاســـارییەکە خۆی لە هێلانەکە حەشاردا. دڵم زۆر بە خێرایی وەترپە کەوتەوە، هەر دەڵێی لەسەرە مەرگدا بووم. پاشان گوتی:

- مـادەم خوا بۆی کـەشـــــف کردوویت تـا بـەیانی بـاوکم لـە خـەو هەڵناستێت، لە ماڵی پوورم دەمێنمەوە.

- شەوت شاد گلێنەی چاوم.

نیوەی دەموچاوی خۆی لـە دەرگـەی نیوەپێوەدراو هێنـایە دەر و بە بزەوە گوتی:

- تۆیش شەوت شاد، گیانەکەم... ئەی عاریفی زەمەنی خۆت.

## ٥٣

**"هەر باتینێك ڕووكەشەكەی شایەتیت بۆ نەدات، بێهودە دەبێت"**

**ئیبن عەرەبی**

لــە گوێچكــەی دیوارەكــانی ژوورەوە، دەنگێكی زۆر بــە جۆش و خرۆش هـاتـە بـەرگوێم و وەئـاگا هـاتم. دەنگی جاڕدەری ئەمیر بوو، دەیگوت: "وەسـتایان... ئاسـنگەران... پیشـەسـازان... وەرنە كۆشـكی ئەمیر." بەرەبەرە دەنگی دوور دەكەوتەوە، تاكوو بە یەكجارەكی بڕا. لەسەر جێخەوەكەم پاڵكەوتم، هەستم بەو برینە كرد، كە حیجامەكەر بەر لە دوو شـەو، لە پشتەسەرمی دروست كردبوو. بایی ئەوەندەی خوێن لە لەشـم دەرهێنا، كە پێی وابوو ئەو سـەرئێشـەی چەند شەوە حەجمینی لێ هەڵگرتووم، نامێنێت... بەڵام دوێشـــەو، ســـەرلەنوێ ســـەرئێشـــەیەكی دی ڕووی لێ نامەوە، خەو لە چاوەكانم تۆرایەوە، تـەنێ بـەرەبـەیان كەمێك خەوم لێ كەوت. بڕێك نان و كەشـــكم لە ســـووچی ژوورەوە بەدیكرد، بەدر بۆی دانابووم، كە هەســـتام بیانخۆم. نانم خوارد و دانیشـــتم، تەماشـــای نووســـینەكەی دوێنێم كردەوە. دێڕەكانی كۆتایی بەئاشكرا تێكەڵوپێكەڵی و شپرزەییان پێوە دیاربوو، تومەز ســەرئێشــە بڕســتی لەمن بڕی بوو. لە گۆشـــەیەكی ژوورەوە، تـەمـاشـــای كـاغـەزە كەڵەكەبووەكانم كرد، گوتم ئەگەر

سەرئێشە بەرۆکم بەردات، بەر لەوەی مەککە جێ بهێڵم هەموویان پڕ دەکەمەوە.
ئەوە دوو ساڵ تێپەڕین و منیش هەر لەو شارە لەنگەرم گرتووە، نایشزانم ئاخۆ دەبێ زیاتر لەنگەر بگرم، یان نا؟ لە دوا ساتدا، خەیات جێگەی مێخی دووەمی بۆ گرتمەوە، لە سەرگەردانی و بەزایەچوون، دەربازی کردم. ئەو کاتەی، کە مێخی دووەمی تێدا مرد و خەیات جێگەی گرتەوە، زۆر بەر تەسک و تەنگ بوو، بایی ئەوەی نەکرد پێی بڵێم داخۆ مێخی سێیەم لەکوێیە. دەگونجێت لە هەر شوێنێک بێت، بۆنا؟ لەوانەیە لە هیند، یان لە چین بێت، یان دەکرێت لە ئێران یان لە ئەنازۆڵ بێت. دەلوێ لە وڵاتی ڕۆم، یان لە سودان بێت. خۆ دەکرێ لە وڵاتی ئەندەلوسی جێی گۆرینم بێت.
لە دەرگە درا، بێوەی بپرسم کێیە، هەستام و دەرگەم کردەوە، دەبینم شێخ زاهیرە، وەک نەریتی هەمیشەی بزەیەکی بۆ کردم. زۆر پێی خۆشحاڵ بووم، داوای ئیزنی کرد، فەرمووی ژوورەوەم لێ کرد:
- بێ وادە هاتم، ئاخر دەمزانی ماڵی تۆ ژن و منداڵی تێدا نییە.
پاشان بە خەندەیەکەوە قسەکەی تەواوکرد و گوتی:
- هەر وەختێک بێم، دەرگە بۆ من لەسەر پشتە، ئەی وا نییە؟
- یا شێخ! ماڵ، ماڵی خۆتە، هەمیشە فەڕ و بەرەکەتمان بۆ دێنی.
- خودا پاداشتت بداتەوە. ئەمڕۆ بەیانی هەستم کرد چەند ڕۆژێکە بۆ دەرسخوێندن نایەتە مزگەوتی حەرام. هیوادارم نەهاتنەکەت خێر بێت.
ئاماژەم بە کتێبە کراوەکە کرد، کە بەر لە هاتنە ژوورەوەی شێخ، بیرم لێ دەکردەوە. گوتم:
- یا شێخ خەریکی نووسینی کتێبێکم.
شێخ دەموچاوی گەشایەوە و بە خەندە و میهرەوە گوتی:
- بەهـ بەهـ.. بەخودا کارێکی زۆر باش دەکەیت. لەبارەی چییەوەیە؟

- هەموو ئەو هونەر و مەعریفەیەی خوا لە مەککە دەرگەی زانینی بۆ کردمەوە، دەیخەمە دووتوێی ئەم کتێبە و ناویشـــی دەنێم " الفتوحات المكية".

ئەوەم گوت و نان و پێخۆر و کەشک و شـووشـەی هەنگوینم بردنە پێش شـێخ، ئەویش تیکەنانێکی لە شـووشـەی هەنگوین هەڵهێنا و بۆ دەمی برد و کشایەوە. ئینجا دەستەکانی پێکداهێنان و بەدەم جاوینی لەتەنانەکەوە، گوتی:

- کەی لە نووسینی دەبییەوە؟

ئاخێکی درێژم هەڵکێشـــا و شـــەکوای حاڵی خۆم لای شـــێخ کرد و گوتم:

- نیـازی ئـەوەم هـەبوو بـە چـەنـد مـانگێـک تـەواوی بکـەم، بـەڵام ســــەرئێشــــەیەکی توونـد یەخەی گرتووم دای پچڕیوم. هەر کاتێک بمەوێت بنووســـم، ســــەرئێشــــە تاقەتم لێ دەبڕێت و هێز و وزەی بیرکردنەوەم لێ چک دەکات، بەناچاری دەبێ دەســـت لە نووســـین هەڵبگرم.

شـێخ چاوەکانی وێکهێنان و بەســـەر ســـیما و ئادگاریەوە، ســـۆز و میهری باوکایەتی بەدی دەکرا، گوتی:

- ڕۆڵە! خودا شیفات بدات. ئەوە لە کەیەوە؟

- لەوەتەی دەستم بەو نووسینە کردووە.

- پێشتر هیچ جار ئەو سەرئێشە توندەت گرتووە؟

- نا، قەت بەو توندییە نەمگرتووە.

شـێخ تاوێک بێدەنگ بوو، بە سـرتەسـرت نزایەکی بۆ کردم. پاشـان ئاماژەی بە پێشەسەر و بان چاوەکانم کرد و گوتی:

- ئێرەت دێشێت؟

- بـەڵێ قوربان! هێنـدێـک جاریش لاجانگەکانم وەژان دەکەون، بەڵام ژانی هەرە توند، لە پشتەچاوەکانمە.

بزەیەکی کرد و گوتی:

- منیش ئەو ئازارەم چەشتووە. کوڕی شیرینم تۆیش ئێستە تەمەنت بووەتە چل ســـاڵ و بەرەو پیری دەڕۆیت و چاوەکانت بەرەو کزی دەچن.
بە داخێکەوە سەرم بادا و خەندەیەکی قۆشماوی بەتەمەنەکەم کەوتە سەر دەم. شێخ دەستێکی لەپشت دام و پاشان بەرەو لای کتێبەکە چوو و گوتی:
- لەســـەر ئەو جۆرە کاغەزە مەنووســـە، لە بازاڕی پەڕاوســـازان کاغەزی باشـــتر هەیە. بە پیتی گەورە بنووســـە و حوبری ڕەشـــی قەترانی بەکار بێنە.
بە بەڵێ سەرم بۆ لەقاند، پاشان درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی:
- بە شـــەوان مەنووســـە، ئەگەر هەر ناچاریش بوویت، با چراکە لەپشـــتەوەت بێت، ئەگەر حەزیشـــت کرد دوو چرا داگیرســـێنیت، بە بنمیچی ژوورەوە هەڵیانواســـە، بۆ ئەوەی چاوەکانت کز و هیلاک نەبن.
- یا شێخ! خودا پاداشتت بداتەوە.
لەو کاتەدا، بەدر وەژوورکەوت، سەری شێخی ماچ کرد و چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا، بۆ وەی لە پاکوخاوێنیی ئەو ناوە دڵنیا بێتەوە. هێندێک ورتکەنان ڕاژبوو کۆی کردنەوە و وەستا و گوتی:
- با شتێکت بۆ بێنم بیخۆیت؟
شێخ بە دەستەکانی ڕەتی کردەوە و گوتی:
- دەڕۆم، هاتبووم لە حاڵی موحی بپرسم، نەمزانی ئەویش بە دەردی پێشتری ئێمە چووە، پیری وا لەپی لێ دەکوتێت.
بە حیتە پێکەنی و بەرەو دەرگە ڕۆیشـــت، بەر لەوەی خوداحافیزی بکات، لای لێ کردمەوە و شتێکی بیرکەوتەوە، گوتی:
- ئەم ساڵ، دەستەی حەجی قۆنیا، بەر لە وادەی خۆیان گەیشتوون. ئەگەر پێت خۆش بێت بەیەکەوە وانەیەکیان بۆ دادەنێین، لە بەیانی دوای عەسرەوە دەست پێ دەکەین:

- یا شێخ، بەوپەڕی ئاسوودەییەوە لە خزمەت تۆدا دەبم.
بەر لەوەی شـــێخ بڕوات، جارێکی دیکەیش جاڕدەر هاتەوە، بە دەنگێکی بەجۆش، بەڵام کەمێک ماندوو و کز، هاواری کرد:"وەستاکان... دارتاشان... ئاسنگەران.... پیشەزانان..." بە نیگایەکی پرساوییەوە تەماشای شێخ زاهیرم کرد، ئەویش گوتی:
- ئەمیر دەیەوێت شوورەیەک بۆ مەککە دروست بکات.
- شوورە بۆ مەککە؟ ئەو زاتەی لە هێرشی ئەبرەهە پاراستی، هەر ئەویش پارێزی لێ دەکا. شوورەی بۆ چییە؟
- نازانم ڕۆڵە! بەڵام وا هەســـت دەکەم بەم نزیکانە جەنگێک هەڵدەگیرسێت. تازە ئەمیری مەدینە، تەسلیمی دەستەڵاتی قەتادەی ئەمیری مەککە نابێت. هەردووکیان چاوی چڵێسیان بڕیوەتە موڵک و دەستەڵاتی ئەوی دی.

## ٥٤

**"خۆشەویستی مەرگێکی بچووکە"**

**ئیبن عەرەبی**

شـــەبەنگی نیزام بۆ ســـاتێکیش لێم جیا نابێتەوە، لە ژوورەوەو و دەرەوەی ماڵ، لە فیکر و خەیاڵم ئاڵاوە. لە کاتی تەماشاکردنی حوبر و، کتێب و، پەڕاوەکانم، خۆی لەبەرچاوم زیت دەکاتەوە. وەختێک دەچمە دەرەوە، لە ڕێگەوبان و تەواف و هەموو کاروبارەکانمدا لەپێش چاوم لا ناچێت. وەک چۆن باران لە هەوری هاوینان دێتە خوارێ، لە ئاسمانی خەیاڵی منیش بەبێ هیچ ئامادەکارییەک شـیعر بۆ نیزام دادەبارێت. گاڤێک لە ماڵەوەم، باشـترین کاغەز هەڵدەبژێرم، قەڵەمڕیشـەکەم بۆ ماوەیەکی زۆر دەخەمە نێو شـووشەی حوبرەکە، تاکوو بەتەواوی هەڵی مژێت و بەبێ پسـانەوە و هەدادان بنووسـێت. گاوێکیش لە دەرەوەی مـاڵم، پەشـــێوی دام دەگرێت، چەندجـار شـــیعرێک دەڵێمەوە، تا لەبیرم نەچێتەوە و زایە نەبێت. ئێســـتە تێنووســـێکم بۆ خۆم ڕێکخســـتووە، بۆ هەر شـــوێنێک بچم دەیبەم. هەرکاتێک بەدەم ڕێگەوە شـــیعرێکم بۆ بێت، لادەدەم، شـــووشـــەی مەرەکەب و قەڵەمەکەم دەردەهێنم و دەینووســـمەوە. ئەگەر خەڵک بپرسن ئەو دەفتەرە چییە؟ ناوێرم باسی ناوەرۆکەکەی بکەم، دەڵێم: "ئەوە کارنامەی ڕۆژانەی منە، وەختێک شـــەوانە دەچمە ســـەر

جێخەوەکەم، لێپرسینەوە لەگەڵ خۆمدا دەکەم، ئەگەر پێویستی بە لێخۆشبوون بوو، ئەوە داوای لێخۆشبوون دەکەم، ئەگەر پێویست بە سوپاس بوو، شوکرانەبژێریی دەکەم، ئەگەر تۆبەی گەرەک بوو، تۆبە دەکەم، تاکوو سەرلەبەری تێنووسەکە تەواو دەبێت، ئینجا لێی دەخەوم." ڕاستییەکەی ئەمن لەم قسەیەمدا بە هیچ شێوەیەک درۆ ناکەم، ئاخر هەرچییەک ڕۆژانە ڕوو دەدات، لە سایەی فەیزی ئەوین و خۆشەویستیی منە بۆ نیزام، ئەمن قسەی ڕۆژانەم هەمووی دەکەم بە شیعر و کۆیان دەکەمەوە، کاتێک شەو دادێت بۆ خۆم و ئەو دەیانخوێنمەوە. ئەگەر ئەوەی نووسیومە گونجاو بوو، سوپاسی خوای لەسەر دەکەم، کە ئیلهامی داومەتێ لەبارەی ئەو کچە دڵبەرە جوانە بنووسم، ئەگەر لە وەسفی ئەو شۆخەشدا کەمتەرخەمیم کردبێت و کورتم هێنابێت، یان نەمتوانی بێت بەگوێرەی پێویست بە باڵایدا هەڵبدەم، ئەوە داوا لە خودا دەکەم لە بەرهەمە خراوەکەم ببوورێت.

ئەو زانستەی فەخری نیسا لای بوو، پێی گوتمەوە. هەموو ئەو زانستەی فێری کردین، لەگەڵ نیزام ئەزبەرمان کرد، بەڵام بۆ ئەوەی دەرسەکەی هەر بەردەوام بێت، ئێمە زاکیرەی لاوازی ئەومان بە هەل قۆستەوە، ڕۆژانە سەعاتێکمان لەلا بەسەر دەبرد. هەرکە کتێبێکمان تەواو دەکرد، دەمانگوت با دەست بە کتێبێکی دیکە بکەین، ئەویش دەیگوت:

- ئەی ئەو کتێبەمان نەخوێندەوە؟

نیزامیش دەیگوت:

- بەڵێ پووری، بەڵام مەتنەکەی سەختە و لێکدانەوە و شەرحەکانیش زۆرن.

- دە کەوابوو ناوی خوای لێ بێنە کچم.

ئەمن ئیتر دەچووم لەنێو مەجلیس دادەنیشتم، چیتر لەبەر کۆسپەی دەرگە وانەم نەدەخوێند، ئەوەیش لەسەر داوای شێخ زاهیر بوو، ڕۆژێک هات و منی بینی لەبەر دەرگە دانیشتووم، گوتی:

- ئەم شوێنە شایانی تۆ نییە، بڕۆ ژوورەوە، تۆ وەلیی خوای.

پاشان لای لە نیزام کردەوە و گوتی:

- چارۆگەت بەسەر خۆتدا بێنە و تۆ لە سووچێک و ئەویش با لە سووچێک دانیشێت، ئێوە گوناهبار نابن، چونکە لە مەجلیسی زانستدان و فریشتە دەوری داون.

بەم جۆرە لە سووچێک دادەنیشتم و ئەنیشکم لەسەر بالیفێکی نەرمونۆڵ دەدایەوە، ئەمەیش دوای چەندان مانگ دانیشتن لەسەر کۆسپەی قوڕینی دەرگا و شاندان بە دیوارەکەوە. ئەوان لەتەک یەکەوە دانیشتوون، لەکن ئاگردان و کوپی ئاو. هێندێک جار فەخری نیسا سەرقاڵی کارێک دەبوو، من و نیزام پێکەوە کتێبەکەمان دەخوێندەوە و گفتوگۆمان لەبارەوە دەکرد. جاری وا هەبوو فەخری نیسا هەر لە بیریشی نەدەما بگەڕێتەوە، دەچووە سەر جێخەوەکەی و لێی دەخەوت، ئێمەیش هەموو کاتەکەمان بە قسەی خۆش و شیرین بەسەر دەبرد.

ڕەنگە وشەیەکم لێ عاسێ بێت، نەتوانم بیخوێنمەوە، نیزام لێم نزیک بکەوێتەوە و بیخوێنێتەوە، بە ماچێکی گەرمی لێو و دەمێکی تامەزرۆ، پاداشتی خۆی وەربگرێتەوە.

هەموو ڕووداو و قەوماوێکی ژیانی خۆم بۆ نیزام گێڕایەوە، ئەویش لە نووکەوە حیکایەتی ژیانی خۆی بۆ باس کردم. باسی ئەندەلوس و ڕووبار و پرد و دارودرەختەکانی وێم بۆ کرد. ئەویش حیکایەتی بەغدا و دیجلە و ڕەسافە و کەرخی بۆ گێڕامەوە. هەردووکمان بە گێڕانەوەی یادەوەری منداڵیمان کەیل و مەست بووبووین، هەریەکەو لە گۆشەیەکی دوور لەیەکەوە، باسی منداڵیی خۆمان بۆ یەکتر دەکرد. من لەوپەڕی خۆراوای موسڵمانانەوە هاتووم، ئەویش

لەوپەڕی خۆرهەڵاتەوە هاتبوو، تا لەوێ ژوان ببەستین و بکەوینە داوی ئەوین. ئەو قەسیدەیەی شەوی ڕابردوو هۆنی بوومەوە، بۆم خوێندەوە. ئەویش بە فارسی شتێکی بۆ خوێندمەوە، گوتی ئەوەیش ئەوینی منە.

داوام لێ کرد بیکاتە عەرەبی، گوتی:

- وەرگێڕان دەیپووکێنێتەوە و تامی ناهێڵێت.

- بۆچی بە عەرەبی نایهۆنیتەوە؟

- موحی، ئەوینداری بە زمانی یەکەم دەکرێت.

- بەڵام خۆ تۆ هەردوو زمانەکە بەچاکی دەزانیت.

- وەلێ بە فارسی دەتوانم قسەگەلێک بکەم لەنێوان خۆشەویستەکەم و دڵی مندا هیچ پەردەیەک نەمێنێت.

- ئەی چۆن تێی بگەم؟

- بە دڵ نەک بە گوێچەکانت.

- دەی کەواتە بۆم بخوێنەوە خۆشەویستەم، ئازیزی دڵم.

- هەستم دەکرد بە تێپەڕینی ڕۆژگار، جوانی و شۆخوشەنگیی نیزام زیاتر دەبێت. نەمدەزانی ئاخۆ دەبێ من بە عەشقی ئەو مەست بووبم، یان ئەو وا خۆی بۆمن ئارایش دەدا، بەتایبەت ئەو کاتەی فەخری نیسا چاوەکانی زیاتر کزبوون و بەحاڵ جێپێیەکانی خۆی پێ دەبینرایەوە. نیزام لەبەرچاوی مندا بوو بە دووڕیانی نوور، بە قژی ڕەشی، شەوی کردە دوو شەو، قەت ئەبرۆی هێندە کەوانی و ڕەشم لەژێر تەوێڵێکی وەها ڕووناک و ڕۆشن نەدیبوو. کاتێک پێدەکەنی، لە شەرمان دەستی بە ڕوویەوە دەنا، نەمدەزانی ئاخۆ بە بینینی پەنجە جوان و ناسکەکانی دڵخۆش بم، یان بە شرانەوەی جووتە لێوی دڵڕفێن و ددانە بریسکەدارەکانی پەریشان بم. ڕاستییەکەی، زۆرینەی وانەکانی کۆتاییمان، پێکەنین بەسەر پێکەنینەوە بوو. هەوڵمان دەدا دەنگی پێکەنینەکەمان دەرنەچێت، چونکە ئەگەر فەخری نیسا گوێی لێ بووبا، دەیگوت:

- بەچی پێدەکەنن؟
نیزامیش دەیگوت:
- پێچەکەی موحی بەربووەوە.
یان من دەمگوت:
- لە سەنەدی فەرموودەیەک هەڵەم کرد.
خۆشەویستیی نیزام وەها لە دڵم ڕەگوڕیشەی داکوتا، هەر کاتێک بیرم لە داهاتوو دەکردەوە، ئەو لەنێو داهاتوو دابوو. ئەگەر پێشتر ژیانی هاوژینیم لەگەڵ مەریەم پێک نەهێنابایە، ئێستە سوێندم دەخوارد، کە نیزام یەکەم ژنە پێی بگەم، یەکەم ژنە دەفری ئەوینی منی پڕ کرد، عەتف و سۆزی منی تێر کرد، دڵئارامی و ئۆخژنی پێ بەخشیم. لە ژیانمدا هەرگیز ژنێکی هێندە جوان و کامڵم نەدیبوو. ڕۆژێک بەدەم خوێندنەوەی ژینامەی بەشێک لە فەرموودەناسان گاڵتەی لەگەڵدا کردم، فەخری نیسایش لە ژوورەوە خەوی لێ کەوتبوو. کتێبەکەی پێوەدا و گوتی:
- موحی، ئەگەر ڕۆژێک ژینامەی منت نووسیوە، چی دەنووسی؟
کەوتمە بیرکردنەوەیەکی قووڵ، پاشان بە هێواشی پێم گوت:
- دەنووسم، نیزام گلێنە و سۆمای چاوی من بوو، کچی فەرموودەناس ئەبووشوجاع، زاهیری کوڕی ڕۆستەمی ئەسفەهانی بوو. لە دڵی موحیەدینی عەرەبی لەدایک بوو، هەر لەوێش ژیا، قەتیش لە دڵی ئەودا نامرێت. ئەو کچێکی پاکیزە بوو، بەژن زراڤ و شووشەیی بوو. زانا و خواناس بوو. ئەگەر درێژەدادڕیی کردبا، شەکەت دەبوو، ئەگەر کورتبڕیی کردبا دەستەوستان دەبوو، ئەگەر شتێکی دەربڕیبا، ڕوونی دەکردەوە.
بەم قسانەی من پێکەنی و چەناگەی خستە سەر دەستی، وەک ئەوەی چاوەڕێی زیاتر بێت. ئەمنیش تەماشای شەنگی و جوانییەکەم کرد تا قسەیەک بکەم شایانی ئەو بێت:

- ئەگەر ئارەزووی زانست بکەم دەمدوێنێ و دەیدوێنم، تەنێ زانستی من هاوتای زانستی ئەوە، تەنیا زانستی وی هاوشانی زانستی منە. بۆنا؟ خۆ ئەو کچی حەرەمەینە و پەروەردەی دەستی بەلەدولئەمینە. هەموو کتێبێکی خوێندووتەوە، لە هەموو زانستێک کارامە و شارەزا بووە. تەنێ بە خوێندنەوە سەرقاڵە، تەنیا بە مەعریفە دڵی ئاو دەخواتەوە و ئارام دەبێتەوە. ئەو خۆری پرشنگداری زانایانە، باخی وێژەوان و ئەدیبانە. خودا جوانییەکی وای پێ بەخشیوە، بە هیچ ژنێکی پێش ئەوی نەبەخشیوە. کچێک بوو بەژنی لە شیلەی گوڵان داڕژابوو. بە نیگاکانی مرۆی بە سڵەمینەوە دەخست، بە گفتولفتی شیرینی، بەردی نەرم دەکرد.

دوای ئەوەی سەرم بڵند کرد، بینیم نیزام تنۆک تنۆک ئەسرین دەڕێژێت، بزەیەکی پڕ خۆشەویستیش بەسەر ڕوویەوە بوو. دەستی درێژ کرد، منیش دەستی خۆم بردە پێش، دەستەکانمان لێک ئاڵاندن. دەستی گوشیم و لەنێو لەپی دەستم پەنجەکانی هێنان و بردن، هەر دەڵێی دەیویست برێک لە پێستم بۆ خۆی بەرێت. پاشان دەستم بۆ ڕووی برد و بەقووڵی بۆنی کرد و تا ماوەیەک هەناسەی لە سینەیدا هێشتەوە. پاشان چاوەکانی نووقاندن و ئاخێکی گەورەی هەڵکێشا. دیسان چاوی پڕ ئەشک بوونەوە و هەستا، تێگەیشتم، کە وادەی ڕۆیشتنم هات.

## ٥٥

**دەستنووسێك لە ئەماسیاوە**

**٨١١ک/١٤٠٩ز**

کابرای پاسەوان بانگی کرد:

- مەولام، سوڵتانی گەورە و خاقانی مەزن: محەمەد بایەزید بەگ.

هەموو خەڵک، بە براکانیشمەوە، ڕێکوڕاست وەستان. سەریان داهێنایەوە و پشتیان چەماندەوە، لە کاتی هاتنە ژوورەوەیدا، جگە لە ئێمە، کەس سوڵتانی نەبینی. بە پشتی ڕاست و سەری قیتمانەوە، سەیری سوڵتانمان کرد، هەر ئەمەیش شایانی نەوە و وەچەی ئەلقانی مەزن تەیموور بوو. سوڵتانی عوسمانی، لەنێوان دوو ڕیزی ڕاستوڕێک، بەرەو کورسییەکەی ڕۆیشت، کوڕە چوارساڵییەکەیشی، کە لەژێر پێچەی قوڕسی عوسمانی بەحاڵ خۆی پێ ڕاستەڕێ دەکرا، شوێن باوکی کەوتبوو. سوڵتان سەرنجی ئەو چوار کەسەی دا، کە بەردەوام تەماشای ڕیشە ڕەشەکەیان دەکرد، کە زۆر بە ڕێکوپێکی قەڵەمی کردبوو، لە دەوری ڕوویدا وەک شەو لە دەوری مانگ وا بوو. هەروە سەیری جووتەی سمێڵیان دەکرد، کە لەژێر لووتیەوە بە تیژی دەرچووبوون، تەماشای دوو ئەبرۆ ورد و چاوە بادەمیەکانیان دەکرد، کە دانەیەکیان وشک و تووڕە دەیڕوانی و

ئەوەی تریان هێمن و میهرەبان خۆی دەنواند. لە کۆتاییدا گەیشـــتە کورســـییەکەی و جلەکانی لەپشـــتەوە گرتن و دانیشـــت. ئاقی برام ویستی بە شێوەی سوڵتان دانیشێت، بەڵام کە بینی ئەوانەی لەنێو خێوەتـەکـان وەســـتـاون، پـەژیوان بووەوە. تـاوێـک بێـدەنگییـەکی هەیبەتدار باڵی خۆی بەســـەر ئەو ناوەدا کێشـــا، پاشـــان ســـوڵتان بەدەست ئاماژەی بۆ خەڵکەکە کرد و پاسەوانەکەیش هاواری کرد:

- خودا سوڵتان شکۆدار بکات.

وێجا خەڵکەکە تێکڕا دانیشـــتن و ســـەریان بەرزکردەوە، لێکدالێکدا تـەمـاشـــای ســـوڵتـانیـان دەکرد. وا دیـار بوو ســـوڵتـانیش لـە تەماشاکردنەکەیدا هیچ کەسێک ئاوێر ناکات و هەموویان بەیەک چاو ســـەیر دەکات. دواتر چاوەکانی لە ئاسـۆی مەجلیســـەکە مۆڵەق مان، دەیڕوانی و نـەیـدەبینی، بـەدەم داڵغـەوە چـاوەکانی زەق کردبوونەوە. پاســـەوانەکە لســـتی پێشـــوازی بۆ برد، کە ئەو ڕۆژە چالاکییەکان دەســـتـیـان پێ دەکرد، ســـەیری نـەکرد، تـەنێ شـــتێکی بـە گوێی پاســـەوانەکە چرپاند و تەواو. دوای چەند خولەکێک، ئاگامان لێ بوو پاسەوانەکە لەپشت سوڵتانڕا هاتە پشت من و برایەکانم، بە دەنگێکی نزم پێی گوتین:

- کامتان برا گەورەن؟

منیش بە دەنگێکی نزم وەک دەنگی ئەو، وەڵامم دایەوە:

- من، (باشی).

- دیاریتان پێیە؟

- بەڵێ.

- هەوەڵ جار تۆ بۆ حزووری ســـوڵتان بانگ دەکەم، پاشـــان دوای ئەوەی دەستیت ماچ کرد، برایەکانی خۆت ڕەپێش بدە.

پاسەوانەکە ڕۆیشت، ئالیبی برا بچووکم بە چرپەوە پێی گوتم:

- دەبێ دەستی ماچ بکەین؟ وەڵڵا من شتی وا ناکەم.

ئاق لێی هاتە وەڵام و پێی گوت:

- ئەریّ برام ئێستە کەی وەختی ئەم گێلایەتییەیە!
ئالیبیش بە پرتەپرت پێی گوت:
- ئەی ئێستە کەی وەختی ئەو سووک و ڕیسواییەیە!
لە قســـەکانی ئالیبی برام نیگەران بووم، ترســـام شـــتێک بڵێت و میزاجی ســـوڵتانمان لێ تێک بدات. ڕاســـتە ئێمە لە وڵاتی خۆمان کوڕانی ئـەلقانی مـەزن تـەیموورین، لێ ئێســـتـە لـە تـاراوگـەین و چارەنووســـمان لە دەســـتی ئەو ســـوڵتانەدایە. ئەگەر ئاودیوی ســـەمەرقەندمان بکاتەوە ئەوە شـــارۆخی براگەورەمان لە گۆڕەپانی شـــار لە سـێدارەمان دەدات. ئەگەر فەرامۆشـیشـمان بکات و گوێمان پێ نەدا، ئەوە بێکەس و ئەنوا دەســـووڕێینەوە و دڵنیانین لەوەی، کە ڕۆژێک کەسێک ساردمان بکاتەوە.
ئالیب سەری خستە بنگوێی من و بە سرتەوە گوتی:
- من بە هیچ شـــێوەیەک دەســـتی ماچ ناکەم. لەبیرت نەچێ باوکم خۆی ئەوی کردووەتە سوڵتان.
لە تووڕەییان سیکەسیکم وە ددانەکانم خست و گوتم:
- کوڕە تۆ تێناگـەیت بـاوکمان مردووە. ئەگەر کشـــوفش بکەیت و خۆت وا دەرخەیت، ئەوە بە دڵنیاییەوە لەناوت دەبات.
ئالیب ویستی شتێک بڵێت، بەڵام دەرگەوان بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:
- باشی کوڕی تەیموور لەنگ، کوڕی ئایتمشی کوڕی کلنگ.
هـەســـتام و بـەنێو ڕیزی خـەڵکدا ڕۆیشـــتم، ئاگام لێ بوو هەموو دەیانویست سەر و سیمام ببینن. ئای خودایە مەقامەکە چەند غەریب بوو! من بەرەو سوڵتانی عوسمانی دەچم، هەر تەنیا چەند هەنگاوێکی کەم ماوە بگەمە لای، کەچی هێشـتا خۆم یەکلا نەکردووەتەوە، ئاخۆ دەسـتی ماچ بکەم یان نا؟ خۆی من باشـی کوڕی تەیمووری مەزنم؟ بـەڵام ئـەوە مـانای چییە، خۆ من و براکانم ئێســـتە ئاوارەین و لای جەنابی سوڵتان پەناهەندەین، ئەو سـوڵتانەی پێشـتر باوکی لای ئێمە

ئەسیر بوو. دوا هەنگاوم نا، گەیشتمە پێش ئەو شوێنەی بۆ سوڵتان تـەرخـان کرابوو، بـالیفێکـان لـەبـەردەم دانـابوو، بـە داوی زێڕین هەڵچنرابوو، ئەو کەســـانەی دەهاتنە حزووری لەســـەر ئەو بالیفە ئەژنۆیان دەدا و دەســتیان ماچ دەکرد. منیش لەو ســاتەدا بڕیارم دا دەســتی ماچ بکەم، ئێســتە کاتی وەی نییە لووتبەرزی بنوێنم، ئاخر سیاسـەت کـشوفش و لووتبەرزی نازانێت. ئەژنۆکانم خستنە سـەر بالیفەکە، دەستم برد بۆ دەستی نەرمونۆڵی، کە بە سێ گوستیلەی گەورەی ڕەنگاوڕەنگ ڕازا بووبووەوە، لە بری ئەوەی دەستی بخاتە نێو دەستم، خستییە سەر شانم.

وەسـتام و هەسـتم بە سـووکە بێزارییەک کرد. ئەگەر ویسـتبای لە دەستماچکردن چاوپۆشیم لێ بکات، بۆچی هەتا دەسـتم بۆی نەبرد و هەوڵی ماچکردنم نەدا، دەستی خۆی وەلا نەنا؟ ڕاستییەکەی ئەوە ڕێز نەبوو، هەموو خەڵک وا تێگەیشـت سـوڵتان دوای ڕیسـواکردنم ڕێزی لێ گرتم، بۆنا؟

- مـەولام ســـوڵتان. ڕێگە بدە چەند دیارییەکت پێشـــکەیش بکەین، تەماخوازین بە قبووڵکردنیان ڕێزمان بگریت.

سوڵتان بە دەستەکانی هێمایەکی کرد و منیش وەستام و تەماشای برایـەکانم کرد، ئـەوانیش تیلەچـاوێکیـان بڕیـە بـەندەکانمان، کە لەکن دەرگە وەســـتابوون. ســـەرەتا بەندەی من ســـندووقی دیاریی منی هـەڵگرت، هـەر لـەگـەڵ ئـەوەی فـەرش ڕاخرا، بـە خێچـەخێچ خۆی گـەیـاندە لای من و ســـندووقەکەی لەبەردەم ســـوڵتان دانا. منیش کردمەوە و نەعلەیەکی کۆنم لێ هێنایە دەر و گوتم:

- ئەوە نەعلی محەمەدی سەروەرن (دروودی خوای لێ بێت).

ســـوڵتان بەســـەرســـووڕمانەوە ئەبرۆکانی هەڵدان و دروود و سـەلاوەتی لەسەر پێغەمەر (د.خ) لێ دا. لە سەر و سیمایەوە هەستی خۆ بـەکـەمزانی و گـەردەنکەچی لێ دەرکـەوت، ئـادگـار و هەســـتی لووتبـەرزی و خۆبـەزلزانیی تێکشـــکا. نـەعلی پیرۆزم لـەنێو تەختی

ســـــندووق هێنـانـه دەر و بۆ مـەقـامـی ســــولتـان بـەرزم کردنـەوە، دەستەکانی کردنەوە و لەکن یەک ڕای گرتن، منیش نەعلەکەم لەسەر دانان. تـاوێـک لێی وردبووەوە، ئینجـا ماچی کرد و نێوچاوانی خۆی پێ مەسح کرد. پاشــان خزمەتکارەکان ســندووقەکەیان لە ســولتان نزیک خستەوە و لەشوێنی خۆی دایاننەوە، پاشان چپەیەکی بە گوێی پاسەوانەکەدا کرد و ئەویش تیلەچاوێکی لە من کرد، منیش گوتم:

- مەولانا سولتان، ئێستەیش برایەکەم (جان)ی کوڕی تەیموور، دێتە حزوورت. جان بەخێرایی و گورجوگۆڵییەوە هات و لە سولتان نزیک بووەوە، ئەژنۆکانی خســتنە ســەر ســەرینەکە، ســولتانیش وەک من ڕەفتاری لەگەڵدا کرد. جان ئاماژەی بە بەندەکەی کرد سـندووقەکەی بۆ بێنێت، لە حزووری سولتاندا کردیەوە و قورئانێکی دەرهێنا.

جان بە دەنگێکی گڕ گوتی:

- ئەمە قورئانی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففانە.

ســولتان قورئانەکەی دەســت دایێ و ماچی کرد و تەوێڵی خۆی پێ مـەســـــح کرد. پاشـــــان زۆر بەتاســــــەوە لێکی کردەوە و هێندێک ســــووڕەتی لەســــەر خوێندنەوە، دوایی بەرزی کردەوە و هەمدیس ماچی کردەوە و لە شوێنی خۆی داینایەوە. هێمایەکی بۆ پاسەوانەکە کرد، بۆ ئەوەی بە هەمان شــــێوەی نەعلەکەی پێغەمبەر (د.خ) هەڵی بگرێت.

ئـاقی برام، لـە کـەڕەتی ســــێیـەم، نۆرەی گـەیشــــتێ، ئـەو لە جیاتی سندووقێک، سێ سندووقی پێبوون، زۆریش لە سندووقەکانی ئێمە گەورەتر بوون. بەندەکان بەیەکجار لەبەردەمی ســــــولتانیان دانان و کردنیانەوە، ســــیمای گەردەنکەچی و خۆبەکەمزانی لە ڕوخســــاری ســولتان، بوو بە لووتبەرزی و کیبریا، لە کاتێکدا دیتی ســندووقەکان مرواری و زەبەرجەد و یاقووتیان تێدایە.

ئاقی برام بە لاڵەلاڵەوە گوتی:

مرواری لە یەمەن هاتووە. زەبەرجەد لە مرو. یاقووتیش لە هیند.

سولتان سەری ڕەزامەندی هەژاند و بزەیەکی کرد. تەماشای برایەکەی دیکەی کردم، کە لە کۆتاییدا نۆرەی هات، وەک ئەوەی بۆ هاتنی برایەکەم بە تالووکە[12] بێت، تاکوو مەجلیس جێ بهێڵێت و بڕوات. منیش زووبەزوو هێنامە حزوور، بە چوار بەندە، سندووقێکی گەورەیان لە دوا هەڵگرتبوو، لەبەردەم سولتانیان دانا و گوتی:

- مەولام سولتان، ئەوانە کتێبەکانی شێخی گەورە، کبریتی ئەحمەر، موحیەدینی ئیبن عەرەبی ئەندەلوسیین.

---

[12]-بەپەلە.

## ٥٦

**"تۆ ئەی مرۆڤ!**
**چرا و فتیلەی، دەلاقە و شووشەی"**
**ئیبن عەرەبی**

هەرکە چاوم بە حەملەداری حاجیانی قۆنیا کەوت، بەخێرایی خۆشەویستیی ئەوم لە تەختی دڵدا چەسپا. تۆقەی لەگەڵ کردم و بە حورمەتەوە سەری خۆی ڕاهەژاند و بزەیەکی پڕ لووتفی بۆ کردم، دەستی لەنێو دەستم هێشتەوە و سەری خۆی هێنایە پێش. بە زەحمەتێکەوە سیمای خۆم گۆڕی، فەیزی خۆشەویستی خوایی هەر لە چرکەکانی سەرەتا لێکی نزیک خستینەوە. مۆڵەتی کۆکردنەوەی فیکر و ڕێکخستنی کارەکانی پێ نەدام. منیش بەگەرموگوڕیی تۆقەم لەگەڵدا کرد. لە قسەکانمدا شپرزە و شڵەژا بووم، بێ ئەوەی هەست بکەم، هەوڵم دا شێوازی ئاخاوتنە تورکمانییەکەی ئەو لەنێو زمانی عەرەبی وازی بکەم. لەنزیک خۆم دامنیشاند، دەستم لەنێو دەستی هێشتەوە، بەدر هێشووی دارخورمای لەپێش دانایێن، منیش قلە خورمایەکم داین .
جوان لە سەر و سیمای ڕامام، حەزم کرد لە زاکیرەمدا بیچەسپێنم، بەڵام لە قووڵایی دڵمدا چەسپا. تەوێڵێکی پان و سەرێکی چوارگۆشەیی هەبوو، دوو چاوی تەنگ و بچووک و، بەژن و

قامەتێکی کورتیلەی هەبوو. شـانوشـەپێلک پان و قۆڵ و باسـکێکی پاڵەوانانەی هەبوو. لاجانگەکانی بە تەواوی سـپی بووبوون، ماباقی قژی دیکەیشـی، ماشـوبرنج بووبوو. وەختێک پێکەنی، چەند هێڵێکی هاوتەریب بەسەر گۆنایەوە دەرکەوتن، کاتێکیش نێوچاوانی تێکناو و کەوتە باری بیرکردنەوە، هەمان ئەو هێڵانە دروسـت بوون. نازانم بۆچی لە خەیاڵی خۆمدا وەک درەختێکی قەدپان و کەم لکوپۆپ و گەڵا درێژم وێنا کرد. ئاشـکراشـە درەختێکی وا، بە تێپەڕبوونی وەرزەکان، هیچی بەسـەر نایەت، بە هاوین و زسـتان وەک خۆی دەمێنێتەوە. ئەو، لە شـوێنی خۆیدا دڵنیایی و متمانە و ئۆقرەگرتنی پەخش دەکرد. بەڵێ، ئەوەی من لە سـیمای ئەوم بەدی کرد، ئەمە بوو. ئیسـحاق دڵئارامی و شـادیی بە دەوروبەری خۆیدا بڵاو دەکردەوە، هەر وەک چۆن خۆر تیشکی گەرمی خۆی بە گەردووندا پەخش دەکات.

ڕۆژ دوای ڕۆژ بۆم ڕوون دەبووەوە، کە ئەو پیاوە بۆ ڕووحی شـەکەت و نیگەرانی من، چەندە هاوڕێیەکی بەکەڵکە. ڕاسـتییەکەی زۆر زۆرم خۆشـویست، لە دڵی خۆمدا لە مەقامی ئەولیایان دامنا. لە ماڵی شـێخ زاهیر میوان بووین، هەر لەوێ ڕێککەوتین لە (حەتیم) دەرسێکی دووقۆڵیی دابنێین. ئەو زانست و مەعریفە نوورانییەی، کە من لە خۆرئاوا وەرم گرتووە، بەو بڵێمەوە، ئەو زانستەی ئەویش لە باکوور فێری بووە، بە منی بداتەوە. ئەو لەنێو سەبەتەیەکی بچووکدا هێندێک کتێبی هێنان، بەڵام من هیچم پێ نەبوو. ملمان دەبەر خوێندنەوە نا. چەند سەعاتێک بەم حاڵە ماینەوە. دواتر چەند ڕۆژێک ئەو شێوازەمان دووبارە کردەوە. دواتر لە بەرانبەر یەک دانیشتین، ئەمن خیرقە سـووکەڵەکەی خۆم بۆ داکەند، ئەویش خیرقە پێسـتییە نێو لۆکە کراوەکەی، بۆ لەبەر کردم. باوەشـمان بە ڕووحی یەکتردا کرد، لە سـایەی خۆشـەویستیی خوایی، کە ئەولیاکان لە خۆرئاوا و خۆرهەلات بەیەک دەگەیەنێت، بووینە برا. پێم گوت مادەم ژن و

منداڵت لەگەڵ نینە، وەرە لە ماڵی من بمێنەوە، ئەویش ڕازی بوو. بەمەیش توانیم لە میوانداریی ماڵی نیزام بیهێنمە دەر. چۆن دەبێ لەوێ بمێنێتەوە، لە کاتێکدا نیزامی دڵبەری منیش لەوێیە؟ ئەوە کێیە گوتوویەتی ئەولیا غیرەیان نییە؟

وەرزی حەج کۆتایی هات، خەڵکی قۆنیا ئیحرامەکانیان داکەند و کڵاوە گەورەکانیان خستەوە سەریان. بە نێو مەککەدا پەرشوبڵاو بوون، شتیان دەکڕی و دەفرۆشت، ئامادەی دەرس و دەوری مەلاکان دەبوون، چەند پیشە و کارێکی سەرپێییان لە بازێڕەکاندا دەکرد. هەموو ساڵێک دەستەی حەجیانی وان خۆیان دوا دەخست، تاکوو بەقەد دوورییان، لە باکووری دوورەدەست، لە فەیز و بەرەکەتی مەککە، بەهرەوەر بن. ئەوان لەگەڵ خۆیان وەرگێڕ و خەتخۆشیان دەهێنان بۆ ئەوەی هەر کاتێک لە ئەرک و واجباتی حەج بوونەوە، خۆیان بە وەرگێڕان و نووسینەوەی کتێبگەلی فەرموودە و فیقهـ و تەفسیر بە زمانی خۆیان، خەریک بکەن. ئیسحاق مشووری هەموویانی دەخوارد، هەریەکەو ئەرکی خۆی پێ دەسپارد، گشتیان لەژێر فەرمانی ئەودا بەڕێوە دەچوون، ئەوانیش زۆر بە پەرۆش و دەروێشانە گوێڕایەڵییان دەکرد.

لە ماڵی من، باسی هێندێک وڵاتی کرد هێشتا سەردانم نەکردبوون، باسی هێندێک ڕێگەی کرد، هێشتا پێیاندا نەڕۆیشتبووم.

کە شەو دادەهات، سۆز و شەوق، دەیبردەوە ئەنازۆڵ. باسی باخێکی بچووکی بۆ کردم، کە خزمەتی کردووە. پێشتر وشک و برینگ بووە، لە نێوەڕاستدا پیرە سنەوبەرێک هەبووە، ڕۆژێک بە کنیدا تێپەڕدەبێت، خەریکبووە لێی وەقسە بێت. لاتە ئەرزەکە دەکڕێت و شوورەیەکی کورتی لە دەور دەکات، سوێند دەخوات هەموو ئەو شتانەی سنەوبەرەکە بێ سەنگ و بەها دەکەن، بیانچێنێت. بە گوڵەپەمۆ و گیامسک و زەعفەران و زرنبووک، ئەو ناوە دەڕازێنێتەوە، بنەتۆوی هەموو ئەو گوڵانەیش لە گەشتەکەی بۆ شام

و عیراق و ئەرمینیا و خوراســـان دەهێنێت... ئەوســـا، ســـەفیری سوڵتانی سەلجووقییەکان، کەیخوسەرەو بووە. پێی گوتم:
- خەڵک لەو کارەم سەریان سوورمابوو، ناهەقیشیان نەبوو، ئاخر خۆ باخەکە بەبەر ماڵەکەمەوە نەبوو، تاکوو بەم جۆرە خزمەتی بکەم و بۆی لێ ببڕێم، دیســـان خۆ بەرداریش نەبوو، تا بازرگانی و مامەڵەی پێوە بکەم! بەڵام خۆ ئەوان نەیاندەزانی ئەو باخە ماڵی ڕووحیی منە، وەلێ ئەو ماڵەی من لێی دادەنیشتم و دەخەوتم، تەنێ ماڵی جەستەم بوو. هەر کاتێک کاروباری کۆشکی سوڵتانم لە قۆنیا ڕاهی دەکرد و دەگەڕامەوە ماڵەوە و پشـــووم دەدا، ڕووحم لە چۆلەوانی دەخەوت... بەڵام ئەو باخچۆکە ســـەری منی کڕیەوە، ڕووحی لە ئامێز گرتم و گەرمی کردمەوە، ڕاســـتییەکەی ئۆقرەی پێ گرتم. گاڤێک لەنێوی دادەنیشـــتم هەموو گوڵەکانی لێم نزیک دەبوونەوە و لک و پۆپەکان بۆ بەردەمم درێژ دەبوونەوە. باســـی بۆن و بەرام و پیتاندن، ڕازی شەو، ، لەرە و ورشەی گەڵا. خرمە و کرتەی سمۆرە، تەپە و ڕەپەی نەعلی بۆ دەکردم.
- ئەی ، کە سەفەر دەکەیت، کێ چاودێری باخەکە دەکات؟
بزەیەکی کرد و لە چاوەکانم ڕاما، ئینجا بە یەقینێکەوە گوتی:
- من.
- چۆن؟
- ئەمڕۆ گەڵای وەریوی پایزم ڕامالین تا بەری تیشـــکی خۆر، لە گوڵەسورجان نەگرن، کە لەو وەرزەدا سەر دەردێنن. هەروەها دزێکم دەرکرد، دەیوسیت گوڵەگیامیسک بڕنێت و بە مام عەتتارێکی کەڕی بفرۆشـــێت. ئەو ڕۆژانەی کە بارانیش چک دەکات، دەچم لە باکوور، هەور بۆ باخەکەم دێنم.
پاڵکەوتبووم، بەڵام لەگەڵ ئەو قسانە ڕاچەنیم و دانیشتم:

- قوربان! تێگەیشـــتم چۆن گەڵا و چرۆی درەختەکانت ڕامالّی و چلۆن دزەکەت دەرکرد، لێ لەوە حالّیی نەبووم ئاخۆ چۆن هەور دێنی و دەبەیت، لەکاتێکدا ئەوە کاری خوایە و بەس.
- بەڵێ، وەک تۆ فەرمووت، ئەوە کاری خوایە، پەنابەخوا چۆن کێشمەکێشم لە کاری ئەودا دەکەم!
- ئەی چۆن ئەو کارە دەکەیت؟
- هەرچییەک بکەم، ســـوێندی پێ دەخۆم بۆم بکات، ئەویش بۆم دەکات!
- یانی بۆ هەر کارێک، کە تۆ ســـوێندت پێ خواردووە بۆت بکات، بۆی کردوویت؟
- بەڵێ، بەڵام ئەگەر نەزانم بۆم ناکات، سوێندی پێ ناخۆم.
- چۆن ئەمە دەزانی؟
چـاوەکـانی بۆ میچی ژوورەکـە بـەرزکردنـەوە، هـەر دەڵێی بـە نیگاتیژەکانی دووبەدەری کرد، ئینجا بە دەنگێکی نەرمۆکە گوتی:
- نازانم، بەڵام هەســـتی پێ دەکەم. هەســـتێک لە ڕەزامەندیی خوادا هەیە، وەســـف ناکرێت. بەرگێکی گەرمونەرم لە شـــەوێکی ســـاردا، خۆی بەســـەر دڵتدا دێنێت. کزەڕووناکییەک بەنێو دەمارەکانتدا دێ و دەچێ. فریشـتەیەک دەخزێتە نێو ڕووحت و وەک هاوڕێیەکی دێرین لە باوەشـــی دەگرێت. موحی ئەوە شـــتێک نییە بە زمان وەســـف بکرێت... بەڵێ، بەڵێ، بە هیچ شـــێوەیەک باس ناکرێت. ئەوە ڕەزای هەق تەعالایە.
بەدەم گوێ قولاخکردنەوە فرمێســـک بە چاومدا هاتنە خوارەوە، ئەویش دەوامی بە قسەکانی دا:
- بیر بکەوە، خوا تەنێ بە ڕەزای خۆی نیعمەتت بەســـەردا نارێژێت، بەڵکە وات لێ دەکات هەســـت بە ڕەزابوونەکەی بکەیت. هێندێک جار کارێکی ڕۆژانەی ئاســـاییم کردووە: خەریکی خوێندنەوەی نامەکانی کۆشک بووم، یان چووم خواردن لە بازێڕ بکڕم، یان لەگەڵ کەسێک

قســـەم کردووە، لەناکاو هەســـتم کردووە لە تاقگەیەکی نوور پەڕیومەوە، چەند خولەکێک لەژێریەوە ڕۆیشـــتووم و هاتوومەتە دەرەوە. وەک ئەوەی لەبەردەمی خۆمدا دالآنەکانی دەروون، بە پرشنگداری و پاکیی ببینم. هەر دەڵێی تازە لەدایک بووم. وا هەست دەکەم هەموو ئاوات و تەمایەکم لە دەروون هاتە دەر، بەرەو ئاسمان عرووجم کرد، پاقژ کرامەوە، بە شێوەیەکی چاکتر و پاکتر داڕژامەوە و پاشـان بۆ سـینەم گەڕێنرامەوە. براکەم ئەگەر هیواکانی مرۆڤ لە ســـینەدا مانەوە، گەنە دەبن و لەبار دەچن، ئەگەر لەنێو دەروونیش قۆناخیان داکوتا، ســـاڵ دوای ســـاڵ، نەنگی و لەنگی دایاندەلەنگێنن، بەســـەریەکەوە کەڵەکە دەبن و تۆزی خۆپەرســـتی و ئێرەیی و ناهومێدییان لێ دەنیشـێت. ڕەزای خوا، جارێکی دیکە، بە دڵێکی نوێ و هیوا و خولیای چاک و پاکەوە، خەلقت دەکاتەوە.

## ٥٧

**"هەر دڵدارێك ئیرادەی دڵبەرەكەی سەر ئیرادەی خۆی نەخات، خێر لە ئەوینەكەی نابینێ"**
**ئیبن عەرەبی**

هەستم کرد شێخ زاهیر و فەخری نیسا، پێیان خۆشە من و نیزام بۆ یەک بین. بۆیە بڕیارم دا کۆتایی بە کارەکە بێنم و بچمە خوازبێنی. جوانترین جلم پۆشی و چوومە لای ئیسحاق، لەگەڵ بەدردا خەریکی چاککردنەوەی دۆریخی دەرگە بوون.

ئیسحاق تەماشای جلە نوێیەکانی کردم، زەردەیەکی کرد و پرسی:

- بەم شکڵ و سیما جوان و ڕازاوەیەت بۆ کوێ دەچیت؟

- سەردانی شێخ زاهیر دەکەم.

بە دەمی نیوەکراوە تاوێک لە ڕوخسارم ڕاما، هەروەک ئەوەی بیەوێت بەخێرایی شتێک لە مێشکی هەڵگوشێت، بەپێکەنینەوە گوتی:

- وابزانم کاتی ڕۆیشتنی منیش لەو ماڵە نزیک بووەتەوە.

پێکەنیم، بەدر هەوڵی دا ناوەرۆکی بابەتەکەی تێبگەیێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، دەستی بە کارەکەی کردەوە.

چوومە مزگەوتی حەرام و چەند جارێک تەوافم کرد. نوێژی ئیستیخارەم کرد، نزام کرد ئەگەر خێری تێدا بێت، خودا بە نیزامم بگەیەنێ، ئەگەر شەڕیشی تێدا بێت، هەر پێکمان بگەیەنێ، بەڵام

شــــەڕەکەمان بۆ بکات بە خێر. لە ئاوی زەمزەم، مســــتاوێکم دەناو زارم کرد، بەدرێژایی ڕێگە، تا نەگەیشــــتمە ماڵی شــــێخ زاهیر و لە دەرگەم نەدا، نەم خواردەوە. دوێنێ پێم گوت بەیانی ســــەردانت دەکەم، هەڵبەت لەو کاتەی دڵنیابووم، کە نیزام لە ماڵی پووریەتی. وەک پیشــــەی هەمیشــــەی، زۆر بە دڵخۆشـــی و ڕووخۆشــــییەوە پێشوازیی لێ کردم، لەتەک خۆی دابنام و ماوەیەکی زۆر دەستمان لەنێو دەستی یەکتر نا.

لە کۆتاییدا دەرگەی قســــانم کردەوە و نیزامم داخوازی کرد، شــــێخ زاهیر هیچ پرســــیارێکی لەبارەی مەریەم و هێنانەوەی لە بیجایە بۆ مەککە، لێ نەکردم. بۆچی نیزام دەخوازی دەکەم؟ کۆمەڵێک پاســاوم بۆ هێنانەوە. زۆر سوپاس و ستایشی مەعریفە و زانست و ئاکاری بەرزیم کرد. وردورد گوێی بۆ گرتم، بزەی سەر ڕوویشی، تاکوو لە قســــەکردن بوومەوە، لە کەمی نەدا، دواتر بزەیەکی فراوان، هەموو دەموچاوی گرتەوە و گوتی:

- موحی! ئەی بۆچی هێندە دوات خست؟ئەگەر نەمزانیبایە تۆ کێیت، دەمگوت کەسێکی سادە و ساویلکەیە و لە زمانی ئاماژە و هێما تێ ناگات.

- بە خەجاڵەت و دڵخۆشــــییەوە، ســــەرم بە خۆمدا بەردایەوە و تەماشام نەکرد و گوتم:

- تەنیا لەبەر هەیبەت و سامی مەقامی تۆ داواکەم دواخست.

دەستی لەپشت دام و گوتی:

- ڕۆڵە! لە تۆ باشـــتر بۆ نیزام نابینینەوە، بەڵام زۆریشـــی لێ ناکەم، خۆی چی پێ باشە با وا بکات. سەبرێکم لێ بگرە خۆم پێی دەڵێم و گوێ لە ڕایەکەی دەگرم.

لە ماڵی شێخ زاهیر دەرچووم، لە خۆشـیان باڵم گرتبوو و بەســەر ســەری خەڵکدا دەسووڕامەوە. گەڕامەوە مزگەوتی حەڕام و حەوت جاری دیش وەک سوپاسگوزارییەک بۆ خوا، تەوافم کرد. پاشـان

چوومە بازێڕ، شیرینی و میوەیەکی زۆرم کڕی و گەڕامەوە ماڵەوە، لە خۆشییان قاچم هەردی نەدەگرت. بیرم لە فەرش و ڕایەخی ژوورەوە کردەوە. پاشان بیرم لە خانوویەکی دیکە کردەوە، خەیاڵم بۆ منداڵی نۆبەرەمان چوو، کە لەنێوانماندا دارا دارا دەکات. پاشان کەوتمە خەیاڵی ئەوەی لە کاتی خەوتن و هەستانمدا نیزامم لە باوەش گرتبێت. لە داسەکنان و نیشتەجێبوونمان، لە ڕۆیشتن و سەفەرماندا هاوژینی من بێت. من کتێب بنووسم، ئەویش بیانخوێنێتەوە و پێیاندا بچێتەوە. بەیەکەوە گفتوگۆ و مشتومڕ لەسەر ئەم باس و ئەو بابەت بکەین. لەبارەی چەند بۆچوونێک ناکۆک و ڕاجیا بین. زانست تێکەڵ بە ئەوین و خۆشەویستی بکەین، عیرفان ئاوێتەی سۆز و عیشق بکەین، ئای خودایە ئەو ژیانە چەند شیرین و خۆش دەبێت!

دوو هەفتە تێپەڕی و من هێشتا لەنێو لێڵیی ئاسۆی ئومێددا دەهاتم و دەچووم، هێشتا وەڵامم نەدرابووەوە. لە مەقامی ئیبراهیم، باوکیم دەدیت، بەڵام لەبەر دەرس و دەور، نەدەپرژایە سەر ئەوەی قسەم لەگەڵ بکات. دەچووم نیزامم لە ماڵی پووری دەبینی، بەڵام لە غەیری خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی بەردەستمان وشەیەک لە دەمی نەدەهاتە دەر. غەمزە و چاوداگرتنی جارانی نەمابوو. دوو لێکدانەوەم بۆ دۆخەکە کرد، لەلایەک گەشبین بووم، چونکە پێم وابوو ئیتر ئەو دەیەوێت وەک هاوژینی من ڕەفتار بکات و حورمەت بۆ هەیبەتی مەقامی من دادەنێت. لەلایەکی دیکەیش ڕەشبین بووم، چونکە وام بە خەیاڵدا دەهات، کە ئەو دەیەوێت خۆی لە خۆشەویستی و هاوسەرگیریی من بەدوور بگرێت.

دوای وانەخوێندن، ڕێک دەرگەی پێوە دەدایەوە، نە سڵاوی لێم دەکرد و نە ماڵاوایی. منیش بە کوڵێک خەم و پەریشانییەوە دەچوومەوە ماڵەوە. ئەرێ کەی ماقووڵە گومان لە بڕیاری نیزام

بکەم؟ ئاخر چۆن دەلوێ شـــوو بە من نەکات؟ ئەرێ ئەو هەموو متمانەیەی بەر لە داخوازیکردن بە منی هەبوو، چی بەسەر هات؟
نیوەڕۆیەک دوای دەرسخوێندن، لە نزیک دەرگە وەستام، چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی بووم. لە ڕێگەی چوونەوە ماڵەوەی، شـوێنی کەوتم، هەســتی دەکرد من بەدوایەوەم و ئاوڕی نەدەدایەوە. داخڵی کۆڵانی ئـەخیر بووم، کـە بـە مـاڵی ئـەوان دوایی دەهـات، چۆلوهۆڵ بوو، ڕووبەڕووی بوومەوە و گوتم:
- نیزام! چاوەڕوانیی من، زۆر درێژەی کێشا.
لای لێ نـەکردمـەوە، زۆر بـەهێمنی و ئـارامی وەڵامی دامـەوە، وەک ئەوەی پێشتر خۆی بۆ پرسیارەکەی من ئامادە کرد بێت:
- چی دەبێت ئەگەر درێژە بکێشێت؟
- دڵم لەنێو ســۆز و ئەویندا دەکوڵێت، ڕووحم پەرێشـــان دەبێت، نە هەدا دەدەم و نە چاوم دەچنە خەو.
- ئـەوینێـک بـە تـاســـــەوە ڕووح پـاک بکـاتـەوە، بـاشـــترە لـە هاوسەرگیرییەک ئارەزوو دامرکێنێت.
- نە خۆشـەویستی تۆ ئارەزووە دامرکێتەوە، نە خۆشەویستی منیش ئاگرە بکوژێتەوە.
- مادەم خۆشـــەویســـتیی تۆ بۆمن گەیشـتووەتە تۆقەڵان، ئیتر لەپای چی مارەم دەبڕی، لە حاڵێکدا دەزانی خۆشـــەویســـتیت بۆ من، لەوە زیاتر ناکات؟
پاشان ئاوڕی لێ دامەوە و بەتیژی لە چاوەکانم ڕاما:
- ... ئەی ئەگەر هێشـتا خۆشـەویسـتیم بۆ تۆ کامڵ نەبووبا، خۆ ئەو کاتیش نەدەبوو بە خۆشـــەویســـتییەکی نیوەچڵانە هاوژینیت لەگەڵدا بکەم.
دەنگم پچڕپچڕ بوو، خەریک بوو دەست بە گریان بکەم، گوتم:
- نیزام خۆشـــەویســـتیی تۆ، زۆر لەمن و تۆ کۆنترە. چارەنووسـێک بووە بەر لە ئێمە نووسراوە، دوای ئێمەیش هەر دەمێنێتەوە. بچووک

نەبووە تا گەورە بێت، نیوەچڵ نەبووە تا کامڵ بێت. بە تێروتەسەلی لە دڵمدا ڕسکاوە، بە خۆڕسکی بنەوبارەگەی داکوتاوە.
لەبەر دەرگەیماڵیان ڕاوەستام، ئاوڕێکی لێ دامەوە، بۆ چاوچاوانێ دڵم کەوتە لێدان. لێوە ناسک و نەرمەکانی بزاوتن، دەڵێی دەیویست شتێک بڵێت، بەڵام هیچی نەگوت. جارێکی دیش لێوەکانی پێکدادانەوە، بە دەستی چەپەی دەرگەی کردەوە و بە دەستی ڕاستەیشی قەمیسەکەی ڕاکێشام و خۆمان لە ژوورەوە بینییەوە. بۆ ماوەیەک، زەمەن لە سوورانەوە کەوت. بەهێمنی لێوەکانمان خستنە سەر یەک، بە وێنەی گەیشتنی شەو بە سەحەر، کازیوە بە سپێدە. وەک بەنێو یەکداچوونی هەورەکان، نیزام بەنێو مندا چوو، توووند لە باوەشی گرتم. دەستی بە ڕیشمدا هێنا تاکوو گەیشتە گوێچکەکانم، ئینجا خستیە نێو پەنجەکانی. دەستم لە گەردەنی وەرهێنا، دواتر کەوتە نێوان ئەگەریجە و پشتی. هەستم کرد لە لێوی ڕەشتاڵەی، کاسەی شیعر و ڕەوانبێژی، چەندان زمان، کە هەر قسەم پێیان نەکردووە، دەنۆشم. کتێبێکم لەسەر زمانی ئەو، لە باسی عیشق، جێ هێشتووە و هێشتا نەم نووسیوەتەوە. لەو جێگەیەی لێوەکانمان تەماسیان گرت، چاوێکی ئاسمانی هاتە دەر، ئاوی دلۆڤانی بەسەردا ڕشتین و تەڕی کردینەوە، ئێمەیش پتر بەنێو یەکدا چووین و بەیەکەوە لکاین، تەنانەت زیاتر لە جارێک هاوسەنگیمان لەدەست دا. پاشان بە نەرم و میهرەبانییەوە، خۆی لە باوەشم دەرهێنا و بۆ پشت دەرگە پاڵی پێوە نام و دەرگەی داخست.
بە سەرسوورمانەوە بەرەو ماڵ هاتمەوە، نەمدەزانی چی بکەم. خەمبار بم، یان دڵخۆش؟ چێژ لە ماچەکانی وەربگرم، یان حەسرەت بۆ لەدەستچوونی بخۆم؟ ئەو قسەیەی مانای چی بوو، کە دەیگوت: تاسەیەک ڕووح پاک بکاتەوە، باشترە لە هاوسەرگیرییەک، کە کەفوکوڵی ئارەزوو دامرکێنێت؟ دەبێ مەبەستی ئەوە بووبێت، کە هێشتا خۆشەویستییەکەمان کاڵ و کاڕکە و بە پایەی یەقین

نەگەیشتووە و هێشتا دەبێ درێژە بکێشێت؟ یان پێی ناخۆش بووە ببێتە ژنی دووەمم؟ یان لەو ڕۆژەی هەوڵم دا گەمەوگەپ بکەمە ڕاستی و خۆشەویستیی بکەمە ژن و مێردایەتی، لێم کەوتە بڕوبیانو و دڵڕەنجان و تێهەڵدان؟
بەشێک لە جلەکانم داکەندن و لە سووچێکی ژوورەوە وەک دەروێشی جەزبەگرتوو هەڕمام. لێوبەبار و دڵپەرێشان، وەک نەخۆش لەسەر جێگەکەم گەوزەگەوزم دەکرد. پاشان هەستام، وەک ئەوەی دووپشک چزەی لێوەهێنابم، بە نێو ژووردا ئەولاولام دەکرد. ئیسحاق هات، سەیری دەموچاوم کردم، وەک تەماشاکردنی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ ئەستێرەکان. زانی من زامدارم. بە لووتف و سۆزەوە توونـد بە سینەی خۆیەوە گوشیم و دەستی لەپشتم دا و گوتی:
- برایەکەم چیت لێ بەسەر هاتووە؟
- چاوەکانم پڕبوون لە ئەسرین، باسی خۆم و نیزامم لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە، پەردەم لەسەر هەموو نهێنییەکان هەڵدایەوە. باسی هەموو چپە و ژوان و دەستلێکدانێکم کرد. چۆن چاوم لێ داگرتووە و چۆن غەمزەبارانی کردووم. چۆن موغازەلەمان لەگەڵ یەکدا کردووە. باسی نێوان خۆم و زاهیرم بۆ کرد... تەنانەت باسی ئەو ڕووداوەیشم کرد، کە چەند سەعاتێک بەر لەر ئێستە، لەبەردەم دەرگەی ماڵی نیزام ڕووی دا. هەستی پەشێو و دڵی سووتاوی خۆم بۆ بەیان کرد. دەردەدڵی خۆم بۆ کرد، ئەویش بەهێمنی گوێی بۆ هەڵخستم. دەموچاوم لەنێو دەستەکانم شرابوونەوە، زەنگوڵ زەنگوڵ ئەشکم دەڕشت. بە توندی دەستی لەسەر شانم دانا و بەئارامی و میهرەوە گوتی:
- موحی، خوا لەو باشترت بە نسیب بکات.
- ئیسحاق ئەوە چی دەڵێیت؟ هیچ وەلامێکی یەکلاکەرەوەی نەدامەوە.

ئیســــحاق هەر بە بێدەنگیی مایەوە. لەپڕێک ڕاچڵەکیم و حالەتێکی شـێتانەم بەسـەردا هات. بەتوندی شـانم گرت و ڕامهەژاند و هاوارم کرد:

- دیارە خەتای تۆیە؟

- نا، برام.

- بەڕێوەڵلا، گوتووتە خوایە ســــوێند بێ بەتۆ دەبێ ئەو داخوازییە هەڵبوەشێنیەوە، ئەویش سوێندەکەی گیرا کردوویت.

- نا بەخوا برام کاری وام نەکردووە، چۆن کەڕاماتی خۆم لەهەمبەر سووکایەتی بە وەلییەکی خوا بە هەل دەقۆزمەوە؟

- سوێندم بۆ دەخۆیت، کە وات نەکردووە؟

- بەڵێ سوێندت بۆ دەخۆم.

بەسـەر ئەژنۆکانمدا کەوتم و وەک منداڵ دەستم بە گریان کرد. هاتە لام تا خەم و مەراقەکانم کەم بکاتەوە، بردمیە ســەر جێگەی خۆم و گوتی:

- موحی، نەختێک بخەوە، تۆ پێویستت بە پشوودانە.

- بخەوم؟ ئیسحاق بەو حاڵە ئەوە چ خەوێکی پێ دەڵێن!

ئیسحاق ڕاستەوخۆ تەماشای چاوەکانی کردم و بە دەنگێکی نەرم و هێمن گوتی:

- تۆ دەخەویت، ئاخر سوێندم بەخوا خواردووە بتخەوێنێت.

## ٥٨

**"پایەی هەر مرۆڤێك، قسەی دڵیەتی"**

**ئیبن عەرەبی**

وا چل ســاڵی تەمەنم، بە نێو دەمارەکانمدا دەڕوات، وەک قافڵەیەکی گەورە، کە ســەرەتاکەی لە مورســییە و کۆتاییەکەیشــی لەنێو ئاسـۆیەکی نادیار بێت و هیچی لەبارەوە نەزانم. ڕاسـتییەکەی نازانم لـەکوێ دوایی دێت. ئـەمڕۆ کـاروانی ژیـانی خۆم وەک دەهۆڵژەنێک وێنا کرد، کە لە نزیکمەوە دەنگی کوتەکوتی بێت و لە ئاخری بگاتە بـەرانبـەرم. لـە خـەو هـەسـتـام و هیچ بزاوێکم نـەکرد، تـەنـانـەت پێڵوەکانیشــم لێک نەکردنەوە. بەدەم بێدار بوونەوە، لە ســەلاپیتەی خـەیاڵم، کـاروانی ژیانی خۆم بەســەرکردەوە. بەڵێ کاروانی ژیانم! وڵاخەکان بەدوای یەک ڕێچکەیان بەستبوو، هاوسـاری زەمانە لێکی گرێ دابوون. لـەو کـاروانـەی منـدا، وڵاخێکی لاواز وڵاخێکی بـەتێن هەیە، وڵاخێک دەفرۆشـرێت و یەکێکیش دەکڕدرێت. خەڵک سـواری وڵاخێک بوون و وڵاخێکیشان پشتگوێ خستووە. وڵاخێک بەرەو دوا مەنزڵ دەڕوات، وڵاخێکیش سەکەت دەبێت و لەبیر دەکرێت.

کـاروانێکی پـاتـاڵکراوە، لـە پیرۆی لـەڕ و، لاواز و، کـالا و، کـەلوپـەلی هـەرزان و بێبـەهـا بترازێت، هیچی دیکـەی لێ نـەمـاوەتـەوە. خـەریکە کاروانی ژیانم توونبەتوون دەچێت و شـی دەبێتەوە، هەموو ساڵێکی

تەمەنم دەبێتە حیکایەتێکی کورتیلەی بێ سەرەتا و دوایی. بێ پەند و ئامۆژگاری، بێ حیکمەت و ئومێدەواری. ئەرێ ئیبن عەرەبی لە کوێ و لە چی ئەو هەموو تەمەنەت بە فیڕۆدا؟ ئەوە چل ساڵی تەمەنت تێپەڕاند، کەچی هێشتا شوێنپێی خۆت لە زەمین نازانی، بە ڕێی عرووجی ئاسمانت ئاشنا نیت! دوو هێندەی دیش حەسرەت دەخۆیت: حەسرەت لەسەر ڕۆیشتنی تەمەنی بابردەڵە و بێکەڵک.

لەسەر جێخەوەکەم پاڵکەوتم، عەقڵم وەک کەسی تەوافکەری تۆبەکار دەخولایەوە. دڵم وەک کاتژمێر لێی دەدا. زیکر و وێردەکانم خوێندن و چاوەکانم هەڵگوشین، کەوتمە باری بیرکردنەوە. کاروان هێشتا هەر بەڕێوەیە. گەڕیدە زۆرن، بەڵام ڕێگە هەر تەنگ و کورت دەبێتەوە. بەیانی ئەگەر زیاد لەپێویست خەڵکی گەڕیدە بە ڕێگەکەدا بڕۆن، ئەوە من دەمرم. ئەوسا کاروانی ژیانی من، لە حیکایەتێک زیاتر هیچی دیکەی لێ نافامرێتەوە. شوێنەوار و ڕێڕەوی کاروانی ژیانم، دەبێتە تۆزوتاڵی بەر با. دەڵێن ڕۆژێک کاروانێک لێرەوە ڕەت بووە. ئێژن چووەتە شارێک، خەڵک پێیەوە مژووڵ بوون، دواتر ڕۆیشتووە، خەڵکیش پەرتەیان لە دەوری کردووە. یان دەگوترێت کاروانی من ڕێگەی لێ گوم بووە، بازرگانەکانی تاوێک ئاخوئۆفیان خواردووە، دواتر بەدوای کاروانگەلی دیکەدا گەڕاون. یان لەناو خۆیان دەگێڕنەوە و دەڵێن تا شوێنی مەبەستی خۆی ڕۆیشتووە و بە ئامانجی خۆی گەیشتووە، دواتر تەمەنی کۆتایی هاتووە و ڕێگە و دەستکەوتیش، بوونەتە تۆزوتاڵ.

پاشان کاروانی ژینی من، بە هاوڕێیەکی بەدکار، بە ناوی "دڵەڕاوکێ" ئاشنا دەبێت. نە من داوای هاوەڵیم لێی کردبوو، نە ئەویش ڕووخسەتی لێ خواستبووم. وەک مەیموون بەسەر ملم هەڵدەزنێ، هەرگیز لێم جیا نابێتەوە. هەرکە لەسەر لاشانێکم دەری دەکەم، خێرا خۆی هەڵدەداتە سەر لاشانەکەی دیم. هەر کاتێکیش لەسەر هەرتک شانم فڕێی دەدەمە خوارەوە، خۆی بە قەدی دارێک دەگرێتەوە،

ماوەیەک خۆی دەگنخێنێ و دیسان باز دەداتەوە سەر شانەکانم و دەستەو ئەستۆم دەبێتەوە. ئەگەر شەوێک منی جێ هێشتبێت، ئەوە بەیانی لێ کردوومەتە ژاری مار. ئەگەر سپێدەیەک بەئاسوودەیی هەناسەم دابێت، ئەوە ئێوارەم لێ بووەتە دڕندە و هەتا بەیانی سەری لە لەشم ناوە. دنیا لەبەرچاوم تەنگ و تەسک بووە، هیچ شتێک بە قەبارە و قەوارەی خۆی نابینم. هەموو شەڕێک لەبەر چاوم گەورە و ترسناکە، هەموو کارێکی خێر، بەکتوپڕی دەبینم و لەبەرچاوم کەم و بێ بەهایە. هێندێک جار لەنێو ئارامیی شەو، ڕادەچڵەکێم و حەجمانم نامێنێت، لەبەردەم شەپۆلی بەهێزی دڵەڕاوکێ، نەخۆشکەوتووم، بەڵام نەخۆشیش نیم. کە بەیانی دەبێتەوە، ماندوو و شپرزە و هیلاکم، هەر دەڵێی بەدرێژایی شەو خەو نەچووەتە چاوەکانم. هەموو کاروبارێکی ئەو ژیانە لەبەرچاوم بچووکبووەتەوە، تاقەتی کارکردنم نەماوە، بەدرێژایی ڕۆژ، جگە لە نوێژەکانم هیچی ترم پێ ناکرێت. هەفتەیەک دێت و هەفتەیەک دەڕوات، دڵەڕاوکێی من، هەموو بێجوولەیەک دەخاتە جووڵە، هەموو جووڵەدارێکی ژیانیشم لە جووڵە دەخات. حەز دەکەم کارێک بکەم، لەو لاوە دڵەڕاوکێ دێت و سواری سەر ملم دەبێت و وازی لێ دێنم. ئێستە من جگە لە جەفاکێشی و دڵەڕاوکێ کارێکی دیم نییە. ها ئەوەتە وازم لە نووسینی کتێبی (فتوحات المكية)یش هێنا، ئاخر زانیم هەرچی دەینووسم هەمووی کۆن و دووبارەیە. لە دەرسگوتنەوەی فەقێکانیشم بێزار و بێمەیل بووم، پێم خۆشە زووبەزوو کۆتایی بە دەرسیان بێنم. لە دەرس هەڵە دەکەن، بەڵام تاقەتی ئەوەم نییە بۆیان ڕاست بکەمەوە. پرسیار دەکەن، بەکورتی وەڵامیان دەدەمەوە. لەنێو کۆڕی وانەبێژی، یان بە ڕێکەوت نەبێت شێخ زاهیر لە مزگەوتی حەرام نابینم. بە فەخری نیسایشم گوت هەموو زانست و فیقهی تۆم وەرگرت، ئیتر چیتر نایێمەوە خزمەتت. ئەویش دوعای زۆری بۆ کردم و مۆڵەتی ریوایەتکردن لە خۆیشی پێدام. نە نووسینم ما، نە

وانەخوێندن. ڕۆژانی من، وەک کوندەی بەتاڵ و وشکیان لێ هاتووە. هەر لە ماڵەوە دەردەچم و دەگەڕێمەوە. دەچم لە مزگەوت نوێژ دەکەم و دێمەوە. بە بازاڕدا دەسووڕێمەوە و کەلوپەل دەکڕم. دەچمە حەلقەی دەرس و دەور و زووبەزوو بەجێیان دێڵم. شتگەلێک دەکەم هیچ پێوەندییان پێکەوە نییە. هێندێک جار شەوان شتێک دەنووسم، کە بەیانی دەیخوێنمەوە تێی ناگەم. بەنێو کۆلانەکاندا دێم و دەچم، ناشزانم بۆ چ ئامانجێک وا دەکەم. شتێک لەو شوێنەی منی لێمە، لەگەڵ ئەو حاڵەی من، پێکەوە هەڵناکەن. بەڵام نازانم بەرەو کوێ دەڕۆم؟ هیچ جێگە و مێخێک پێ نازانم، باشترین شوێن بۆ مێخ مەککەیە، ئەو شوێنەی خەیات بۆ هاتنم دنەی دام، ئەگەرچی پێشی نەگوتم مێخی من لێرەیە یان نا؟ لێرەدا مەتەڵێک هەیە، مێخی من لە مەککەیە، کەچی لە مەککەیش نییە.

ئیسحاق لە گەرمەی خەودا خۆی بزاوت و کۆکی، دواتر وەخەبەر هات. دیتی دانیشتووم، بزەیەکی کرد و بە شێوەئاخاوتنی تورکمانی گوتی:

- قوربان! خودا سپێدەت پڕ خێروبێر بکات.

- سپێدەی تۆیش ئیسحاق. تۆم هەراسان کرد؟

هەستاوە ، نوێنەکانی دەقکردن و گوتی:

- نا مەولانا! بەڵام وا پێدەچێت تۆ خۆت بێزار بوو بیت.

- ئیسحاق لێت ناشارمەوە، پەرێشان و هەراسانم.

ئیسحاق لەگەناوێکی بۆ هێنام دەموچاوم پێ شۆرد، هەمدیس پڕی کردەوە و دەموچاوی خۆیشی شۆردن. بەدر گوێی لە دەنگەدەنگی مە بوو، هات سڵاوی کرد و ڕۆیشت خواردنمان بۆ چێ بکات. ئیسحاق لەسەر نوێنە دەقکراوەکانی دانیشت و ڕاستەوخۆ چاوی تێبڕیم و گوتی:

- موحی بۆ وا پەست و هەراسان بوویت؟

بە پرسیارەکەی دایگرتم، کڕوکپ بوو. بیرم دەکردەوە بزانم چ شتێک منی بێزار کردووە، هەر چەند هێنام و بردم، نەمزانی چییە! دەلوێ بە هۆی نیگەرانییەکی بێ پاساوەوە بناڵێنم، یان دەشێ تا ئێستە من بەرەنگاریی ئەو دڵەڕاوکێیە نەبووبمەتەوە، چەند خولەکێک بیرم کردەوە و نەمزانی چییە، دواتر سەرم بەرزکردەوە و گوتم:

- ڕێگە.

- ڕێگەی چی؟

- چوومەتە ناوی و نازانم بەرەو کوێ دەچم.

- ئەی دڵت چیت پێ دەڵێت؟

- هیچی پێ نەگوتووم.

- نا، پێت دەڵێت: خۆ خراپ بێدار نەبوویتەوە؟

- بێگومان دڵت پێت دەڵێت، بەڵام بۆت تەفسیر ناکرێت.

- ئەی کێ تەفسیری دەکات؟

- مەگەر جگە لە تۆ کەسێکی تر هەیە!

- ئەی بۆچی ئێستە تەفسیرەکەی نازانم؟

- چونکە ئێستە پەردەیەک بەسەر دڵتەوەیە. ئەگەر من دەمم بگرم و بشـــمەوێت قســـەت لەگەڵدا بکەم، هیچ تێ دەگەیت؟ دڵی تۆیش بەم شێوەیە، دەیەوێت بتدوێنێ، بەڵام پەردەیەکی بەسەرەوەیە و ناهێڵێت.

- ئەی چۆن ئەو پەردەیەی سەر دڵم لادەم؟

- موحی پێشتر دوو جار لاتداوە! لەبیرت چووە؟

بە سەرسووڕمانەوە تەماشایەکم کرد و گوتم:

- کەی؟

- بە لووتفەوە زەردەیەکی کرد، لە شـــوێنی خۆی هەســـتا و هات لەتەکم دانیشت، ئینجا دەستی خستە سەر شانم و گوتی:

- لەبەردەمی خۆمدا وەلییەک دەبینم، خوا بە دوو مێخ چەســـپا و نەلەخشاوی کردووە. تا دڵت پاک نەکەیتەوە خودا مێخت بۆ نانێرێت.

مەدهۆشی و گەردەنکەچی، ئاوێتەی یەک بوون. سەرم خستە سەر شانی و گوتم:
- ڕاست دەفەرموون. ئەی خوای دڵاوا لە بیرم ناکەیت!
ئیسحاق پێکەنی و گوتی:
- هێندێک کاری خێر، لە بێئاگاییدا دەســـتەبەر دەبن. ئەگەر جاروبار بێئاگا نەبین، نەشوەی ئاگابوون لە دەست دەدەین. بەدر خواردنی بۆ هێناین و بەیەکەوە نانێکی گەرم و ڕوتابمان خوارد، پاشان بە نۆرە کوندەیەکی پڕ شیرمان خواردەوە. ئینجا دەستنوێژمان هەڵگرت و بۆ نوێژی بـەیانی چووین. لـە نێوەڕاســـتی نوێژەکە، فیکرێکم بۆ هات، گاڤێک لە نوێژ بوومەوە، تەماشایەکی ئیسحاقم کرد و پێم گوت:
- ئیســـحاق ئێمە لەنێو مزگەوتی حەڕامین، تکایە ڕاســـتم پێ بڵێ: تۆ مێخی منی یان نا؟
- نا قوربان نا! من کێم تا ببمە مێخی پیرۆزی تۆ!
- بەڵام تەنیا مێخ، مێخ دەناسێتەوە.
- ڕاست دەکەیت، بەڵام خۆ من مێخ ناناسم، تەنیا زانیم تۆ مێخداری. وردەوردە نوێژخوێنان ڕیزەکانیان جێ هێشت، منیش چوارمەشقی لێی دانیشتم و گوتم:
- بـەر لـەوەی پێی بگـەم، مێخی دووەمم مرد، بەڵام دواتر بە دیداری مێخی شوێنگرەوە شاد بووم...
ئیسحاق بەبایەخەوە گوێی بۆ قوڵاخ کردبووم، قسەکانم تەواو کردن:
- بەڵام داخم پێی نەگوتم لە کوێ بگەمە مێخی سێیەمم.
- ئەمە نیگەران و پەرێشانی کردوویت؟
- ئەگەر شتێکی وا نیگەرانم نەکات، ئەی چ شتێک نیگەرانم بکات؟
- موحی تۆ ئەو نادۆزییەوە، ئەو تۆ دەدۆزێتەوە.
- ئەمە چۆن؟
- چونکـە جێگیرکردنی تۆ، کـاری ئـەوە. مێخـەکـەت لـە تۆ زیـاتر بەدواتەوەیە. تا دڵت بەتەواوی پاک نەکەیتەوە، ناتدۆزێتەوە.

ئیســحاق ڕێگەی من ڕۆشــن دەکاتەوە، هەر وەک چۆن چرا ڕێگەی ڕێبوارانی غەوارە ڕووناک دەکاتەوە.

## ٥٩

**"هەر شەوقێك بە ژووان دامرکێتەوە، متمانەی پێ ناکرێت"**
**ئیبن عەرەبی**

مەوسیمی حەج بەسەردا هات، من و بەدریش حەجمان کرد، لە نزاکانم تەنێ داوای پاککردنەوەی دڵ و سەفای ڕووحم دەکرد. لە کۆتاییدا ئیسحاق هەواڵی ڕۆیشتنەوەی پێدام. لە بەرانبەر دەستەی حەجی قۆنیا، تیر دەباوەشم گرت، ئینجا گەڕامەوە ماڵەوە، هەمان ئەو ئەسرینەی، کە پێشتر بۆ ماڵئاوایی شێخ کومی و ناشتنی حەسار ڕشتم، بۆ ئەویشم ڕشت. لەمەودوایش هەمان ئەو ئەسرینە بۆ هەموو کیبریتێکی سوور دەڕێژم، کە دڵی ژەنگدارم بکەنە زێڕێکی بریسکەدار. ئیسحاق نزیکەی ساڵ و نیوێک هاودەم و ئەنیسم بوو، وەک کتێبێکی کراوە، دەیخوێندمەوە. کاتێک خەمگین دەبووم، دڵنەوایی دەکردم، گاوێک بێزار و مەلوول دەبووم، دڵی دەدامەوە. بەدەم خوداحافیزی، پێشنیازی کرد لەگەڵیدا بچمە قۆنیا. بەڵێنی مەقامی باش و مێوانداریيەکی زۆر چاکی پێدام، منیش خەندەیەکم بۆ کرد و گوتم:

- ئیسحاق کێ دەزانێ لە کوێ و چۆن مێخی داهاتوو بەمن دەگات.

- داوا لە خودا دەکەم ئەو مێخەی تۆ لای ئێمە بێت، تاکوو بە نزیکبوونەوەت وابەستە بم.

قافڵەی حاجیانی قۆنیا خۆیان ڕێکخســـتەوە و لە مەککە دەرچوون. ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ، حـاجیـانی مـاڵی خوا ئـەو نـاوەیـان چۆل دەکرد، هەســـتم بە بۆشـــاییەکی ترســـناک کرد. لەگەڵ بەدر دانیشـــتین و بەبێدەنگی نانمان خوارد، لەناکاو هەســـتم کرد وەک لکی دارێکم لێ هاتووە، کە چرۆکانی وەریبن و وشک بووبێت. بەر لە چەند مانگێکی کـەم، مـەقامی من لـە مـەککـە ئاوەدان بوو. شـــێخ و هاوەڵم هەبوو، خۆشـــەویســـتی خۆم هەبوو، نیزام دڵی لە خۆشـــەویســـتییەکەی ئاخنیبووم، ئیســـحاق ڕووحی پڕ ئومێد کردبووم، شـــێخ زاهیریش عەقڵی لیوانلێوی زانسـت کردبووم. ئێسـتەیش کەوتمە سـەر سـاجی عەلی و کەسیانم بەدەستەوە نەما. نیزام بە ئازارەوە خۆی لێ دابڕیم، هیچ شـتێکی لەبارەوە نازانم. ئیسـحاقیش بەرەو شـارێکی دوور، کە هیچ لە زمانیان تێناگەم، بنەوبارگەی تێکنا و ڕۆیشت. شێخ زاهیریش مامەڵەی لەگەڵ مندا زۆر سـەیر و غەریب بووە، نە سـەردانم دەکات و نە بەخوا پەنام دەدا، تەنانەت بۆ دەرسـەکانیشـی بانگهێشتم ناکات. لەنێو دۆڵەشـیوەکانی مەککە دێم و دەچم. هەموو کوچە و، کۆڵان و، شاخوداخ و، دەشت و، دۆڵ و، بیابان و، ڕووەک و، ئاژەڵ و، ئاسمان و، ســـەرما و، گەرمای مەککە، نیزامم بیر دەخەنەوە. هەرچییەک دڵم لەبارەی ئەوین گۆی کردبا، دەمنووسـییەوە، لەنێو دەفتەرێک تۆمارم دەکرد و گلم دەداوە تـا خوا فووی پێدا کرد و بوو بـە مـەخلووقێکی نوێ، لە کاتی نیشـــتەجێبوون و گەشـــتکردن، لە دەســـتەوســـتانی و ئاگاییدا، لە ئەوین و خۆشـــەویســـتیی نیزامدا لەگەڵمدا بەشـــدار بوو. بـەتێپـەڕبوونی ڕۆژگار، من و قەســـیدەکانم بوون بە ســـوپایەکی گەورەی سۆز و ئەوین، لەو بترازێ، بۆ کەس جەفاکێشی ناکەن، بۆ ئەو نەبێت نابنە هەواداری هیچ کەسێک. هاوکات لەبەرانبەر سـوپای ســـۆزی من، قـەتـادەیش ســـوپایەکی دیکەی ســـاز و تەیار کرد. ســـوپاکەی من، بە پایان گەیشـــت و داوام لە بەدر کرد دەفتەرەکە بنووســـێتەوە و بەســـەر کتێبفرۆشـــەکاندا دابەشـــی بکات. هاوکات

ســـوپای قەتادەیش بە شـــێوەیەکی تۆکمە و تەواو، بە نیازی گەمارۆدان بەرەو مەدینە کشـا. سـوپایەک پڕە لە شـۆق و سـۆز و قەســـیدە و گڕ و ئەوین، ســـوپایەکیش پڕە لەو عەرەبانەی قەتادە کڕیونی، ئەو مورتەزەقانەی دوای فەریزەی حەج خۆیان دواخستووە، هەروەها بەشـێک لە سـەربازە ئەیووبییەکان، کە لە سـوپای مەلیک عادل دەرچوون و قەتادەیش مووچە و پلەی بەرزی پێداون. دەهۆڵی هەردوو ســـوپاکە لێدرا، کتێبی (ترجمان الأشــواق) لەنێو بازاڕی کتێبفرۆشـان وەک ئاگری نێو پووشـوپەڵاش بڵاوبووەوە. سـوپای قەتادە لە دەرەوەی مەککە کەوتە جووڵە، هێمنییەکی ئاوێتە بە بۆنی جەنگ، باڵی بەسەر مەککەدا کێشا.

بەیانییەک بێداربوومەوە، لە ژوورەوە چاو لە ئەبڵەقانە دانیشـــتم، نەمتوانی بیر و زیهنم ئامادە بکەم و فیکرەیەک بێنمە کایەوە، یان بیر لە شـــتێک بکەمەوە. بۆم دەرکەوت هەرچییەک لەو ڕۆژەدا بکەم قورس و ســـەخت دەبێت، جگە لە نوێژ و زیکرەکانم، هیچ شـــتێکی دیکە تامی نابێت. تەمای خەوێکی زۆرم بۆ خۆم خواســـت. خەوێک، بە وێنەی یاوەرانی ئەشـــکەوت، دواتر کە بێداربوومەوە خۆم لە جیهانێکی تر و زەمەنێکی دیکە بینییەوە. ئەرێ هەر بەڕاســـت من هەســـت بە غوربەت دەکەم؟ خۆ من عەوداڵی چوونەوە ئەندەلوس نیم، ڕاستییەکەی هەر بیریشی لێ ناکەمەوە. ئەرێ دەبێ خەتا لە چل ساڵەی تەمەنم نەبێت، هەناســـەی وەتەنگهێناوم و ورەی لێ داچۆڕاندووم؟ چۆن دەبێت وا بێت، خۆ پێغەمبەریش لە چل ســـاڵیدا پەیامی بۆ هات و گەیشـــتە لووتکە. یان دەبێ دڵی من، قبووڵی پاکبوونەوە نەکات؟ ئەمە چۆن دەبێت، خۆ من پێشـــتر بە دیدەنی دوو مێخ گەیشـــتووم، دووســـێ جار، شـــایەتیی هەبوونی توانســـتی دڵپاککردنەوەیان بۆ داوم. ئیبن عەرەبی ئەوە چیت بەســـەر هاتووە؟ بۆچی بەبێ هیچ حوزنێک، حەزینی؟ بیر دەکەیتەوە، کەچی لە تەوێڵی

تۆدا هیچ گرفتێک نییە؟ جەفا دەکێشـــیت، کەچی ئەوپەڕی ســـاغ و تەندروستی!
چی دەبێت ئەگەر کەمێک سـەفەر بکەم و ڕووحم ئاسـوودە و شـاد بکەم؟ بەڵام ئاخۆ ئەگەر بەبێ ئامانج و مەبەست بێت، نابێتە بەشێک لە ڕابواردن؟ ئەی ئەگەر ســـەفەرەکەم دڵی چڵکن کردم و لە خۆم و مێخەکەمی دوورخستمەوە؟ ئەی ئەگەر بەو حاڵە لە مەککە بمێنمەوە چی دەبێت؟ ئەی ئەگەر خۆشـەویستنی نیزامم لێ خەست و تیر بوو و فیراقی ڕەشـی لەبەر بریم؟ ئەی ئەگەر کەشـفم ڕووی لە کەمی دا و کـەڕامـاتم نـەمـا؟ هـەر فیکرەیـەک دەهـاتـە مێشـــکم، فیکرەیـەکی پێچـەوانـەی ئـەویشـــم لـە قیت دەبووەوە، لـە حـاڵێکدا لـەســـەر جێخـەوەکـەم پـاڵکـەوتبووم، لـەبن لێفـەکـەم هـەڵکورمـابووم. لـە دڵی خۆمدا گوتم: ئـەگـەر بـانگی بـەدرم کرد و وەڵامی دامەوە، ئەوە یانی گەشـــت دەکەین، خۆ ئەگەر وەڵامی نەدامەوە، ئەوە نیشـــانەیەکی خواییە، پێمان دەڵێت مەڕۆن. ئحمێکم کرد و قورگی خۆم ساف کرد و گازی بەدر بکەم، لە دەرگە درا... پێکەنیم، ســەیری بە پێکەنینەکەم هات:
- قوربان! بۆ پێدەکەنیت؟
وەڵامم نەدایەوە، ڕاســتییەکەی نەیشــمزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە. دانیشتم و لە ڕەنگ و سیمای پڕ پرسیاری ڕامام، دواتر پێم گوت:
- پێکەنیم، چونکە تۆ بوویتە بەشـێک لە دڵی من. بەدر تۆ بوویتە ڕاز و نیازی من.
- ڕاز و نیازی تۆ؟
- ئەرێ! نیازم وابوو بڕۆین، تۆ چی دەڵێیت؟
- بۆ کوێ؟
- تۆ خۆت بڕیار بدە.
بەدر نەختێک بیری کردەوە و گوتی:
- بۆ دیمەشق.

## ٦٠

**"هەر خۆشەویستییەك داواكاری تێدا بوو، فلسێك ناهێنێ"**
**ئیبن عەرەبی**

بڕیارمان دا دوای هەفتەیەکی تر دەگەڵ کاروانێکی شـــامیدا بڕۆین. دوای نوێژی هـەینی بۆ خواحـافیزی چوومـە مـاڵی شـــێخ زاهیر، خامۆش و لێوبەبار بوو. نێوچاوانی لۆچاوی و پێڵوە داکەوتووەکانی، شوێنی بزە و ڕووخۆشیەکانیان گرتبووەوە... پەڵەهەورێکی خەمناک، ڕووی جوانی داپۆشی بوو. بەم دیمەنەی ئەو، زۆر خەمبار بووم، تا دوا کـەس لـەوێ مـامـەوەوە. لێی نزیک کـەوتمـەوە و لای قـاچـەکانی دانیشتم و گوتم:

- شێخی من، چ خەمێک دایلەنگاندوویت؟

ئـاخێکی دووررودرێژی هـەڵکێشـــا و بێدەنـگ بوو، وامزانی وەڵامم ناداتەوە. دواتر بێ ئەوەی تەماشای من بکات، گوتی:

- ڕۆڵە! ئەجەلم نزیک بووەتەوە.

پاشان بە دەنگێکی نزم، وەک ئەوەی بیەوێت لەمن زیاتر کەس گوێی لێ نەبێت، گوتی:

- لە دوای خۆم لە چارەنووسی نیزام دەترسم، ئاخر ئەو جگە لە من، کەسی دیکەی نییە.

به داخێکەوە سەری خۆم لەقاند و هیچ وەڵامێکم نەدایەوە. ویستم بڵێم: "حەزم کرد ببمە هاوژین و هاودەمی، خزم و پەنای، بەڵام ئەو نەیویست." پێش من کەوتەوە و بەدەنگێکی گریاناوی گوتی:

- بە دڵنیایی من بەو نزیکانە سەر دەنێمەوە و دەمرم، ئەگەر تا لە ژیاندا ماوم تەسلیمی ماڵ و مێردم کردبا، ئۆخەیەکم دەکرد و هێور دەبوومەوە، بەڵام چی بکەم ئەو نایەوێت. دایکی مرد و ئەوی بە هەتیووسێوی بەسەر مندا جێ هێشت، هەر لەو کاتەوە بەڵێنم دا لە هیچ شتێک زۆری لێ نەکەم. چۆن دەشێت ئەو بە یەتیمی و بێ دایکی گەورە بێت، دواتر باوکێکی دڵڕەق و وشکیش خۆی بەسەردا زاڵ بکات؟

- ئینشاڵڵا لە ڕۆژانی داهاتوو نیزام شوو بە کەسێک دەکات شایانی خۆی بێت و لە منیش باشتر بێت.

بە ئەژنۆکانیدا کێشا و دەنگی بەرزکردەوە، دەڵێی ئەو قسەیەی من ئەویان تووڕە کرد:

- کەی؟ بۆ پێت وایە تۆ یەکەم کەسی داخوازیی ئەو دەکەیت؟ ناااا ڕۆڵە تۆ دەیەم کەسی! نازانم ئەو کچە بیر لەچی دەکاتەوە.

لەناکاو دەنگی نیزام لە ژوورەوە هات، باوکی خۆی دەدواند:

- باوکە! قورساییەک دەخەیتە سەر شانی ئەو پیاوە، کە هیچ پێوەندیی بەوە نییە...

- پێوەندیی بەوەوە هەیە... ئەی ئەو خوازبێنیی نەکردی؟

لەنێو ئەو هەڵوێستەدا، هەستم بە تەریقبوونەوە کرد. هەستام بڕۆم. ئاگام لێ بوو نیزام بە زمانی فارسی قسەی دەگەڵ باوکیدا کرد، من هیچی تێ نەگەیشتم، باوکیشی متەقێکی لێوە نەهات. سەری شێخ زاهیرم ماچ کرد، بە دەنگێکی بەرز خواحافیزیم کرد، تاکوو نیزام بزانێت من دەڕۆم. هەروەها داوایشم لە شێخ کرد بەر لە گەشتکردنم ئامۆژگاریم بکات، ئەمەیش بۆ ئەوەی نیزام بزانێت من سەفەر دەکەم و دەڕۆم. ماڵی ئەوانم جێ هێشت، لەنێو ناخی خۆیشم دا هەستم بە

ئارامبوونەوەیەکی ناوەخت کرد. دیارە نیزام بە هیچ شـــێوەیەک نایەوێت شوو بکات، هەر تەنیا منیشی ڕەت نەکردووەتەوە. بێگومان ئەو بۆیە پشـــتی لە شـــووکردن کردووە، دەیەوێت بە یەکجاری بۆ دنیای زانســـت و مەعەریفە لێ ببڕێت. بەڵام نا، ئەی بۆچی ســـەرەتا خۆشەویستیی خۆی بۆمن دەربڕی و ئومێدەواری کردم! ئای خوایە هێندێک جار تێگەیشـــتنن لە ژنان چەند ســـەخت و دژوارە، بەتایبەت لەگەڵ ژنگەلێکی ڕیزپەڕ و دەگمەنی وەک نیزام.

لـەگـەڵ کـاروانێکی شـــامی، بۆ دیمـەشـــق وەڕێ کەوتین. ئێمە لە (یـەنبوع) بووین هـەواڵی تێکشـــکانی قەتادەمان لە مەدینە بیســـت. ئەمەیش دوای ئەوەی میری مەدینە لە سنوورەکانی شـار شکستی پێ دێنێت، دواتر هێرشی بۆ دەبات و گەمارۆی مەککە دەدات، پاشان پاشەکشە دەکات. من مەیلم بۆ هیچیان نەبوو، بە جەنگ و کوشتاری ئەو دوو شـارە پیرۆزەیش زۆر خەمگین و دڵتەنگ بووم. هەر دەڵێی ئەو دوو شارە هیچ حورمەت ڕێزێکی لای وان نەبوو، کە بەم جۆرە لەســـەر تخووبەکانیان خوێنی یەک بڕێژن و، ئابلووقەی یەکتر بدەن و، خـەڵکەکە برســـی بکەن و، حاجی و زیارەتکارانیش لە ماڵی خوا بپرینگێننەوە. سوپاسی خوام کرد، کە گەشتم کرد و ئەو دیمەنەیەم بـە چـاوی خۆم نـەدیت. وێنـەی ئـەو چوار ســـاڵـەی من لـە مـەککـە بـەســـەرم برد، پاک و بێخەوش بوو. ئاشـــتەوایی و تەبایی بوو. مـەدینـەی خوا، عەقڵی منی پڕ کرد لە نوور، دڵی ســـێخناخ کردم لە عیرفـان و ســـەکینـەت. پاشـــان منی ڕەها کرد، تاکوو مەعریفە و خـەمـەکانم، هونـەر و نـاڵـەی دەروونم بە دنیـادا پـەخش بکـەم. لـە ژیـانی من نـەدەبوو مـەککـە نـەبێت، مەککە هیی منە و لە منە، هەموو ئەو شـــتانەی مرۆ لە ژیانیاندا گوزەریان دەکات، هیی ئەون. هەموو شتێک گرنگە هەبێت. هەموو ڕووداوێک گەرەکە ڕووبدات. هەرکارێک بە خەم و دڵخۆشـــی گوزەر دەکەین، یان بە ئاشـــتی و شـــەڕ بەڕێی دەکەین، یان بە خۆشەویستی و کینەداری بەسەری دەبەین... هەموو

ئەمانە پێکهاتەی هەناســـەی ئێمەن، ئەگەر بەنێویاندا تێپەڕنەبووباین، دەپووکاینەوە و دەچووینەوە قەپێلکی عەدەم.

## ٦١

**"ئازار بە نەمانی هۆکارەکەی، یان مانەوەی، دەڕوات"**
**ئیبین عەرەبی**

لە حاڵێکدا ئێمە لەگەڵ قافڵەیەکی باشـوور بەرەو غووتەی دیمەشـق دەرۆیشـتین، شـنەبا بە بۆنی خۆخ و گوێز، بەرەو لامان هات. بەرلەوەی بگەینە نێو شـار، کاروانچییەکان هەرتک وڵاخەکەیان لێ گێڕاینەوە، بەپێیان داخڵی شـار بووین. چەند کەلوپەلێکی کەممان پێ بوو، باولـەی کتێبـان و دوو بوخچـەی جلوبـەرگ. حـەمبـاڵ و خزمەتکاری خانەکان، بە دەورماندا دەگەڕان، دانەیەکمان دەستنیشان کرد، کەلوپەلەکانی خستە نێو پریاسکەیەکی گەورە و لە کۆڵی کرد و بە پشـتکووڕییەوە ڕۆیشـت. ئەمنیش وەک کەسـێکی نەخۆش، کە وردەوردە سـاغ بێتەوە، وابووم. بۆن، دەنگ و، ڕەنگی خەڵکی شـار، ئاوێتەی یەک بوون، لە دەسـتێکی میهرەبان دەچوون، کە دەسـت بە تەوێڵی شـەکەت و ماندوومدا بهێنێت و دڵی شـپرزە و هەراسـانم هێمن بکاتەوە. دەروازەی شـارمان تەی کرد، بازاڕ و، ماڵ و، باخچە و، خانەکان بە زمانی حاڵ پێیان گوتین دیمەشـق هەروەکوو جاران، باشـترین و چاکترین ئەنوای ڕێبوارە شـەکەت و هیلاکەکانە، هەروە مـەقامی ئـەو غـەوارە و غـەریبانەیە، کە یەک دوو جار تیری ئەوین دڵی ئـەنگاوتوون. حـەمبالـەکە ئێمـەی گەیاندە خانێکی بەرفراوان. لە

ژوورەکانی ڕایەخی خوری ڕاخرابوون، سـەرەتا پێم ناخۆش بوو بە پێیان وەسەریان بکەم. کەلوپەلەکانمان دانان و سۆراخی گەرماومان کرد، پرسـیارمان لە هەر کەسـێک دەکرد، بۆ شـوێنی جودا ڕێنوێنی دەکردین. لـە کۆتاییدا گەرماوێکمان دۆزییەوە، لە خۆشـــۆرین، زۆر زێدەڕۆییم کرد، وەک کەســـێک پەروای ئەوەی هەبێت نەبێتە ئەهلی دیمەشق. داوام لە سەرشۆرێک کرد قژم کورت بکاتەوە، ریشم ڕێک بخـات، نینۆکـەکـانم بقرتێنێت. لـە مێوانخـانـەی پـاشـــکۆی گـەرمـاو، چاوەڕێم کرد تاکوو جلەکانیان بۆ شـــۆردم و پێچەیان بۆ کردمەوە. شاری دیمەشق ماندووبوونی لێ تەکاندین و ئێش و ئازاری پشت و پێیەکانی نەهێشـتین، لە گەرماو هاتینە دەرەوە و ڕۆیشـتین. بەنزیک شووورەدا سووڕاینەوە، خانووی گەورە و فراوانمان بەرچاو کەوتن، هـەموویش بـاخچـە و چیمـەنیـان بـە بـەرەوە بوون. لـەنێوەڕاســـتی زۆربەشیان حەوز هەبوو، فوارەیان لەنێو دانرابوو، ئاویان لە ڕووبار بۆ دەهات و لە شــێوەی تاڤگەی چکۆڵە هەڵدەڕژان. دیوارەکانیان بە نیگاری داتاشـراوی جوان نەخشابوون. منارەی مزگەوتەکان زۆر بە ســـەلیقەیەکی جوان، ڕازێنرابوونەوە. دەرگەی مزگەوتەکان لە ژوور و دەرەوە بـە جۆرەهـا زەخرەفـە ئـارایش درابوون، کۆســـپـەی بەردەمیشـیان بە بەردی مەڕمەڕ و یەدەشـیان لە مەعدەنی سـاف و لووس دروســـت کرابوو. بـە چوونـە مزگـەوتی گـەورە، پیـاســـە کورتـەکـەمـان کۆتـایی هـات. نوێژمـان کرد و بـە دەوری حـەلقـەکـانی دەرس و دەوری نێو مزگەوت ســـووڕاینەوە. لە نزیکەوە گوێمان لە دەنگی فـەقێکـان گرت، زانیمـان چ کتێبێک دەخوێنن و چ مـەزهـەبێک پەیڕەو دەکەن. بەشـێک لە حەلقەکان هەســتان و پەرتەیان لێ کرد. بەدر لەگەڵ هێندێک لە فەقێکان قســەی کرد و بۆ چەند مزگەوتێک و گۆشــەیەک ڕێنوێنییان کرد، کە ســۆفییەکان حەلقەی دەرسـیان لێ دەبەســـت. دوای کـەمێک، فـەقێ مـەغریبییـەکـان لـە گۆشـــەیـەک کۆبوونەوە، هێندێکیان دەســتیان بەســـەر قۆڵ و کراســـم دادەهێنا و

داوایان کرد لە دیمەشـــق وانەیەک بڵێمەوە. لەگەڵ زەردەی ئێوارە، شـــەکەتی دایگرتین، کە گەڕاینـەوە، مـاخۆی خـانـەکـە، جێگـەی بۆ ڕاخســـتبووین و لێفەی لۆکەی بەســـەردا کێشـــابوون. ســـەرینی ئاوریشمی لەسەر دانابوون.

بەدر دەستی بە سەرینەکاندا هێنا و بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

- قەت قەت سەرم نەخستووەتە سەر سەرینی وەها نەرمونۆڵ!

- بەدر وابزانم دیمەشق تۆم لێ دەشێوێنێت.

دوای چـەنـد ڕۆژێک، بەیانییەک قاســـیدی قازی هات و لەکن دەرگا وەستا، منیش چوومە لای، گوتی:

- ئەرێ تۆ ئیبن عەرەبی؟

- بەڵێ.

- قـازی قوزات: ئیبن زەکی، داوای مۆڵـەتتـان لێ دەکـات و دەیـەوێت دوای عەسر سەردانتان بکات.

- بەخێر بێت.

گەڕامەوە لای بەدر، پێم ســـەیر بوو ئیبن زەکی بە هاتن و شـــوێنی مەی زانی بوو. بەدر گوتی:

- ئەوە فەقێکانی مزگەوتی گەورە پێیان گوتووە.

- ئەوان من دەناسن؟

- چۆن ناتناســن؟ کتێبی (ترجمان الأشـواق) لە بازاڕی کتێبفرۆشـان لەبەری گیراوەتەوە و کەوتووەتە دەستی خەڵک.

لـە وادەی خۆیـدا هـات، هـاوتـەمـەنم بوو، زمـانێکی پاراو و ڕەوانی هەبوو. لە ئەسپەکەی دابەزی، هەرکە منی بینی یەکسەر سەری ماچ کردم، دواتر بۆ ماڵی خۆی بردنیەوە. بانگی منداڵە بچووکەکانی کرد، بـە ڕێز هـاتن و بەخێرهاتنیان کردم، کچۆڵەیەکی بچووکی هەبوو، لە تـەمـەنی زەینـەبی کچی جوانـەمـەرگمـدا بوو. وەختێک بیرم لـەوە کردەوە، تەمەنم چل ســـاڵە و منداڵیشـــم نییە، تەزوو بە دڵمدا هات. کچۆڵەکەم هەڵگرت و توووند لە باوەشم گرت، دەستم بە قژی نەرمی

سـوورباویدا هێنا، لە شـەرمان و لە ترسـان، هیچی نەگوت. بە پەشـۆکاوی لە باوکی دەڕوانی. پاشـان بەخێرایی هەسـتا و لە خانووەکەدا خۆی ون کرد، ئەو خانووە ئیشـبیلیای بیرخسـتمەوە. حەوشـەیەکی فراوانی هەبوو، فوارە و کورسـی دارینی بریسکەداری لێ دانرابوون، درەختی بچووک بچووکی لێ ڕوابوون، ڕاسـتییەکەی وەک ئەندامەکانی خێزانیان لێ هاتبوو.
قازی بەدەم نزیکخستنەوەی قاپی نانخواردن، پرسی:
- بە زانسـت و عیرفانی خۆت، دەتەوێت چ حوجرەیەک نوورباران بکەیت؟
- جارێ تا بەسەریاندا نەگەڕێم، بڕیار نادەم.
- پێم وایـە حوجرەی (تـەقوییـە) هـەم فراوانـە و هـەمیش نزیکـە. لـە وەقفەکەی خانووێکت بۆ دەگرین و مووچەیەکیشت بۆ دەبڕینەوە.
- بـەیانی سـەردانی دەکـەم. ئـەگـەر ئەوێم هەڵبژارد ئەوە لە خانەقا دەمێنمـەوە، نـامـەوێت خـانووم بۆ بگریـت، چونکـە نـازانم کـەی لێرە دەڕۆین. مووچەکەیشم هەر هێندە دەوێت پێی بژیم.
حوجرەی (تـەقوییـە) گونجـاوترین شـوێن بوو. ڕووبـەرەکـەی زۆرگەورە بوو، ژووری زۆر فراوانی تێدا بوون، بۆ ڕۆژانی سارد و سـەرما زۆر گونجاو بوو. بە ژمـارەیـەکی زۆری فەقێیان دەور و تـەدریس دەسـتی پێ کرد، ئـارەزووی وانـەبێژیم پـەیدا بووەوە و دەسـتم بـە نووسـین کردەوە. وردەوردە دەروونم هێوربووەوە، باوەشی دیمەشق، وەک هیی فاس بوو، کە بۆ یەکەمجار لێی مامەوە. فـاس و دیمـەشـق لـە دەروازەکـانیـانـەوە بـەرگی غوربـەت لـە مرۆ دادەکنن، هەرکەسـێک بچێتە نێویان دەبێتە نیشـتمانی. چەند ڕۆژێکم بە دڵئارامی و خۆشـنوودی بەسـەربرد، من زۆر ئاتاجم بەو ڕۆژانە بوو. ڕۆژ دوای ڕۆژ خۆر هـەڵـدەهـات و منیش بـە ئومێـد و بەختیارییەوە ژیانم بەسـەر دەبرد. لە خانەقا دەسـتەهاوەڵێکی زۆر باشم لێ پەیدابوون، لە دەوریاندا هەستم بە دڵنیایی دەکرد. شەومان

بە بێداری و، زیکر و، تەهلیل بەڕێ دەکرد. بەیانیانیش سـەرقاڵی دەرس و دەور دەبووین. کتێبەکانم لە حوجرەیەکەوە بۆ حوجرەیەکی دی بردن، پشـتاوپشـتم بە خیرقەکان کرد. تێکڕای خانەقا کەوتە نێو فەیزی خۆشـەویسـتیی ئیلاهی، ڕووح تێیدا نقووم بوو، بە ئاواتی خۆی گەیشت و تێر بوو، هیچی دیکەی نەخواست.

## ٦٢

**"تۆ لە هەمووشتێك دڵنیا دەبیت، بە مەرجێك هەموو شتێك**
**لەتۆ دڵنیا بێت"**
**ئیبن عەرەبی**

بەم جۆرە ســاڵێکمان بەخێرایی قەتاند. کاروانی حاجیانی شـامیش لە مـەککە گـەڕایـەوە دیمەشـــق. کەســـێک لەنێو کارواندا بەتەنیا جیا دەبێتـەوە و لـە خانەقا و حوجرەکانی فەقێیان بەدوای مندا دەگەڕێت. لـەکۆتـاییدا بە پرســـین و ســـۆراخکردن منی دۆزییەوە، نامەیەکی پێچراوی لەنێوان دوو کاغەزی سپی پێدام، کە کردمەوە، نامەی شێخ زاهیر بوو:

" بزانە! بەر لە ســـەرکۆنەکردنت، دەتبوورم. پێش ئەوەی گازاندەت لێ بکەم، دەتبەخشـم... بەڵام گەرەکە بزانیت دوای ڕۆیشتنی تۆ، ئێمە چیمـان لێ قەوما، ئەو دەســـتەچیلەی لەدوای خۆت جێت هێشـــت، ئاگری گرت و زیان و زەحمەتێکی زۆرمان بەرکەوت. قســـەی زار و بنزاری خەڵکی مەککە تەنێ هەر لەبارەی "ترجمان الأشواق"ە. خەڵک لەنێو خۆیان قسەیەک دەکەن، ئەگەر گوێ بکەم، پێم ناخۆشە، ئەگەر بیژنـەوم، بـاوەڕ نـاکـەم. لەبەر ئەو کتێبە، خەڵک تانە لە من دەدەن و گەمە بە نیزامی کچم دەکەن. چیتر مەککە بە کەڵکی ئێمە نایەت. پاش ئەو غەزەل و لاواندنەوەیە، ئێرە سـوودی بۆ مە نەماوە، دەبێ ســەر

هەڵبگرین، بۆ جێیەک بچین کەس ئازارمان نەدات و جگە لە خوای تاقانە کەس نەمانناسێت. ڕۆڵە! پێم وانییە تۆی هێندە زیتەڵ و هۆشیار، لە جێکەوت و شوێنەواری ئەم نووسینەت بێئاگا بووبیت، نەخاسمە کاتێک ناوی نیزام بە ئاشکرا و ڕوونیی دێنێت. وێڕای ئەمانە، گوتووتە بەر لە دەرچوونم نووسخەیەکم لە بازێڕی کتێبفرۆشان جێ هێشت. لە خودا تەماخوازم لەو کارەت ببووریێت و ئێمەیش لەو بەڵایە چەپاڵە بدات."
نامەکەم پێچایەوە و نائاگایانە دەستم بە سینەمدا هێنا. پێم وابوو دەستم لە سینەم ناگەڕێتەوە تاکوو بەو چارەنووسە نەفرەتاوییە، خەڵتانی خوێن نەبێت، کە پێشتر قەت بیرم لێی نەکردبووەوە، یان بەو ئاگرە دەوروبەری نەسووتێت، کە نازانم کێ هەڵی گیرساندووە. بەدر لە ڕووی زەردم ورد دەبێتەوە و، هەست دەکا لێوەلەرزەم لێیە، پرسیار دەکات و وەڵام نادەمەوە، قسە دەکات و گوێم لێی نییە. بەبەرچاومەوە هێما دەکات و هیچ نابینم. لە کۆتاییدا فەقێکان بەڕێ دەکات و کۆتایی وانەگوتنەوەکە ڕادەگەیەنێت. قیتی کردمەوە و بەرەو ژوورەکەمان چووینەوە، سەرگەردان و مەدهۆش بووبووم، قوڕگم وشک وشک بووبوو. ژانەسکم گرتبوو، ئازاکانم دەلەرزین و چاوەکانم ڕۆچووبوون. لەسەر جێگەی خۆم داینیشاندم، نەعلەی لەپێ داکەندم و پێچەی لەسەر لادام. بە لێفە داپۆشیم، دەستی درێژ کرد و توووند مەچەکی گرتم. ماوەیەک دنیا بێ هەست و خوست بوو.

- قوربان! ئەو نامەیە چی تێدا بوو؟
- فەرمووو بیخوێنەوە.

بەدر دوو جار خوێندیەوە، تێکی هەڵپێچا و بە توووندی بە دیواری دادا و هاواری کرد:
- دەک نەفرەتی خوا و هەمووو فریشتەکانیان لێ بێت! خوا غەزەب و توورەیی خۆیان بەسەردا بڕێژێت. من لەبن لێفە هەڵدەلەرزیم،

بەدریش هەر بۆڵەبۆڵی بوو. لەکۆتاییدا کەوتە سەر ئەژنۆکانی و لێم نزیک بووەوە، بە دەنگێکی نەرم و هێمن، گوتی:
- قوربان! گوێیان پێ مەدە، ئەو لەو باسە حاڵیی نابن!
- نا، بەدر من لەو کتێبەدا نیزامم لاواندووەتەوە و پێمدا هەڵداوە!
- سوێند بە خوا هەموو ئەو شیعرانەی تۆ هۆنیوتنەوە، پاقژ و پاکیزەن.
- نا بەدر، خەڵک لە کوچەوکۆلانان تانە و تەشەر لە نیزام دەدەن و گەمەی پێ دەکەن.
- خەڵک گەوج و نەفامن، ئەوەی دەیخوێننەوە تێی ناگەن، ئەوەی کاوێژی پێ دەکەن، نازانن مانای چییە.
- لەبەر باری شەرمەزاری لە مەککە هەڵدێن، هۆکارکەیش منم بەدرگیان...
- ئەی تۆ ناڵێیت خوا بەرهۆ و هۆکاری هەموو شتێکە؟
ئەسرینێک لە چاوم هاتە خوار، بەدر بەخێرایی بە پەنجە ستوور و وشکەکانی سڕییەوە، وەک ئەوەی بیەوێت دەرگەی گریانم لێ دابخات.
سەری لەبن گوێم نا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:
- قوربان! خۆت سەرکۆنە مەکە. تۆ یەکەم کەس نیت شیعرت نووسیوە، دوا کەسیش نابیت. تکایە گەورەم تکایە! هەموو فامیدەیەک دەزانێ چیت نووسیوە و چیت گەرەکە. تەنێ گەمژە و هیچ لەباردانەبوان سەرزەنشتت دەکەن. ئاشکراشە ئەوان بۆ تاکە ڕۆژێکیش دەست لە لۆمەکردنت هەڵناگرن، کەواتە بۆ ئێستە هێندە خەمیان لێ هەڵدەگریت و بەتەنگ ئەو بابەتەوەیت.
- بەدر تکایە لەتەکەمدا بمێنەوە، دەستت بخە ناو دەستم.

# ٦٣

## دەستنووسێك لە ئەستەنبۆڵەوە
١٠٢٦ك/ ١٦١٧ز

دەبێ بەر لەوەی سـولّتان لە دیوانەکەی بە پێیان بگاتە کتێبخانە، بە زووترین کات بە سـواری ولاخ لە ماڵەوە بچمە سـەرا. ڕاسـتییەکەی ئـەوە مەحاڵە، بەڵام مەحاڵبوون لە نەریتی سـولّتانە عاقڵەکاندا بە پاساو دانانرێت، بۆ سولّتانە شێت و هارەکانیشیان هەر مەپرسە! لە ڕێگە خۆم لە بەرکەوتن و پێکداپڕانی ڕێبوارانی شەقامە جەنجاڵەکانی ئەسـتنەبۆڵ بەدوور دەگرم. بەسـەر ولاخەکەمەوە هەڵبەز و دابەز دەکەم، توووند دەستم بە قاووقی سەرمەوە گرتووە با نەیبات. دەشێ ئەوە کۆتا جار بێت لە ماڵەوە بچمە سـەرا. چارەنووسـی منیش لە هیی هاوەڵانم نزیکە. ئەوە دوو مانگە جڵەوی دەستەڵاتی وەرگرتووە، هەر فەرمانبەرێک هەڵەیەکی لێ ڕوو‌بدا، ئەو بە سووکایەتی شەخسی و دەسـتەڵاتەکەی لە قەڵەمی دەدا. هەر بۆیە سـزاکان زۆر توووند کراون و زۆر شێتانە بەڕێوە دەچن. فەرمانبەرانی سەرا، وەک گەڵای خەزان دەوەرن و لەبەردەم ڕەشەبادا بە هەوادا دەچن. زادەئەفەندی بەرپرسی خوانی سولّتانی، زللـەیەکی باشی خوارد، چونکە من زۆر کـەم حـەزم لـە شـۆرباوە. یوونس ئەفەندی بەرپرسـی ئێمزایەلی سـولّتان، کارەکەی لەکیس چوو، چونکە ئەو ئیمزایەی بۆ سـولّتانی

داهێنابوو، فەخامەت و ئەتەکێتی لە ئیمزای سوڵتان ئەحمەد (خوا لێی ڕازی بێت) کەمتر بوو. هاوڕێم ئۆغلۆ ئەفەندی، چەندە لە پەرۆشـــیی تۆدام، سـیودووسـاڵ خزمەتکردنی سەرا بە هاناتەوە نەهات، زۆر بە سووک و ئاسـانی ئاغاکان تۆیان لەوێ وەدەر نا، نەک لەبەر ئەوەی گوایە لە کارەکەت درێخیت کردووە، نا، تۆ ئەســـڵەن مانای درێخیی نازانیت، بەڵکە لەبەر ئەوەی سوڵتان بیری کەوتەوە، کە تۆ لە خوانی شـاهانەی فتارکردنەوە، ئەوت جیا کردووەتەوە. باشــە ئەو ســوڵتانە چۆن پێی وایە ئۆغلۆ سەلاحیەتی ئەوەی هەیە لە زیندان دەری بێنێت و لەســەر خوانی ئەو ســوڵتانە دابنیشــێنێت، کە پێشــتر حەپســی کردووە؟

ئەگەر لە چەند خولەکێکی کەم نەگەمە ســـەرا، ئەوە بێگومان دەچمە نێو لســتی ئەو کەســانەی وەک گەڵای خەزان وەرین و تەفروتوونا بوون. ڕاســتییەکەی ئەگەر پێش سـوڵتانیش بگەم، هێشــتا مانای وا نییە من ســەلامەتم و هیچ ترسـێکم لەســەر نییە. نازانم هاتنی ئەو، چ ســـــوودێکی بۆ کتێبخـانـە دەبێت. ئـەمن گرەو دەکـەم ئـەو نـاتوانێت ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، بەبێ هەڵە بخوێنێتەوە. گرەو دەکەم نازانێت ناوی خۆی و باپیرە(ئەرتەغرول)ـــی گەورە، بنووسێت. ئەی کەواتە چی دەوێت؟ دەیەوێت وەک سوڵتان ئەحمەد کاتێکی زۆر لە کتێبخانە بەســەر ببات؟ بەڵام سـوڵتان ئەحمەدی شـاعیر و زانا لەکوێ و ئەو خێچ و شـــەتە لەکوێ؟ ئەو تا ئێســـتا ناتوانێت بە ڕێکوڕاســـتیی بە ڕێگەدا بڕوات، لـەنـاکـاو دەســـــتـەکـانی بۆ ئـەملاولا دەردەپـەڕن و هەترەشی خەڵک دەبات.

لـە کۆتـاییدا گـەیشـــتم. بێ ئـەوەی چاوەڕوانیی قاپچی بکەم دەرگە بکاتەوە، خۆم لە درزە بەرتەسـکەکە سـمی و چوومە ژوورەوە. بە لۆقـەلۆق خۆم گـەیـانـدە کتێبخـانـە، کـە چوومە ژووەوە زۆر هێمن و ئارام بوو، فەرمانبەران وەک هەمیشـــە ســـەرقاڵی کارەکانی خۆیان بوون. سـوپاسـی خوام کرد، کە هێشـتا سـوڵتان نەگەیشـتووە. ئەگەر

هاوڕێکانم لە دیوانەکانی خۆیان سـولّتان بغافلێنن، ئەوە کۆلێک مەمنوونیان دەبم. چووم دالآنەکانی کتێبخانەم بەسەر کردەوە، تاکوو دڵنیابم هیچ شـتێک نییە سـەرودڵی سـولّتان بگرێت، خۆشـبەختانە هەموو چتەکان لەشـوێنی خۆیان بوون. کتێبە تورکی و، عەرەبی و، فارسییەکان لە بەشی خۆرئاوا دانرابوون. کتێبی یۆنانی و، رۆمی و، ئەرمەنی و، عیبرانی و، سـریانیش، لەبەشـی خۆرهەلآت دانرابوون. بەشـی سـپاردە پیرۆزەکانیش لە ڕێڕەوی کتێبخانەکە، بە پاسـەوان تەنرابوو. هەموو شتەکان بە گوێرەی پێویست بوون.
لەسـەر کورسـی دانیشـتم و بەقووڵی هەناسـەم دەدا و هەڵدەمژی. ئارەقەم لەنێوچاوانم سڕی و قاووقی سـەرم قایم کرد و بە توونـدی پێچەکەم لە دەوری لەف کرد. بە هەڵەشـەیی پەنجەی دەسـتەکانم تەقاندن، هەر دەڵێی خۆم بۆ شـەڕ تەیار دەکرد. دوایی ژاوەژاوێک هاتە بەر گوێم، لە پەنجەرەوە تەماشـام کرد، ئاپۆڕەی خەڵکی نزیک دەبێتەوە، زانیم زۆری پێناچێت دێنە ئێرە. بانگی فەرمانبەرەکانم کرد، ئەوانیش یەک بەدوای یەک وەلآمیان دامەوە، زانیم هەموویان لە جێگەی خۆیانن. بۆ ئەوەی تاوێک هێوربیمەوە، هەناسەی قووڵقووڵم هەڵکێشـان. فەرمانبەرێکی تەشـریفی، لە دەرگە هێمایەکی بۆ کردم، ئەمەیش یانی سـولّتان دێتە ژوورەوە. چەند چرکەیەک لە شـوێنی خۆم وەسـتام، دەڵێی هەزار سـاڵ بوو، دواتر بە ڕوخسـاری لەڕ و لاوازی هاتە ژوورەوە، ئاغا و پاسـەوانەکانیشـی بەدواوە بوون. چووم دەستم ماچ کرد، پەنجەی باریک و نینۆکی درێژبوون، هەستم کرد وشـک و سـارد بوون. بەنێو دالآنەکانی کتێبخانەدا ڕۆیشـت، سـەدری ئەعزەم و دەفتەردار و شـاویشی پاشایشی بەدواوە بوون. دوای تەنیا سێ خولەک، دەرچوو!
لەسـەر کورسـییەکەم دانیشـتمەوە، هەوای تێکەڵ بە گوڵاوی پەشتەماڵەکەی ئەوم هەڵمژی. لەسەر ئەو زێدەڕۆییەی لە وێناکردنی کاردانەوەی ئەودا وێنام کرد، کەمێک سـەرکۆنەی خۆم کرد.

ئەگەرچی چاوەکانی بەردەوام هەڵدەسووڕاند و لەسەر هیچ لەنگەریان نەدەگرت، بەڵام ڕاستییەکەی زۆر هێمن و بێدەنگ دیاربوو. لە میانەی ئەو هاتنە کورتەی بۆ نێو کتێبخانە، قسەیەک لەدەمی نەهاتە دەر، سەدری ئەعزەم لەمەڕ هەندێک شت قسەی لەگەڵ کرد، هیچ پێوەندیی بەبابەتی کتێبخانەکەوە نەبوو، سوڵتانیش نە ئاوڕی دایەوە و نە کەسیش دەیزانی ئایا هەر بەڕاستی گوێی لێ گرتووە، یان لەنێو خەیاڵ و ئەندێشەکانی نقووم بووە. نە بە نەخێر نە بە بەڵێ، هیچ هێمایەکی بۆ نەدەکرد. نە چرتەی دەکرد نە سرتە، دەتگوت پەیکەرێکەو بەسەر پێیانەوە ڕێ دەکات. تەواوی ڕۆژەکەم لەکارە ئاساییەکانی خۆم بەسەربرد. پۆلێنکردنی کتێبی نوێ، چاککردنی دەستنووسە پەڕپووتەکان و نووسینەوەیان. ڕێکخستنی کاتی وەرگێڕەکان و هاتنی ئەولیاکان بۆ سووچی سپاردەپیرۆزەکان. کاتەکە زۆر بەخێرایی تێدەپەڕی، وەختی ڕۆیشتنی منیش هات.
مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی (قدس الله سره) لە قۆنیایە.
تەواو بۆ کاروباری کتێبخانە لێ برام، بەدرێژایی ئەو چەند ڕۆژەی دوایی، لەوێ دەخەوتم. لەپێناو کارەکەم هەموو سەرا و دەرایەکی دەرەوەم بڕی.
لەکۆتاییدا هیچ کتێبێک لە کتێبخانە نەما، چۆلوهۆڵ لە چاوەڕوانیی کەلوپەلی نوێ دابوو. لە چۆلیان دەنگی دەدایەوە: با لە پەنجەرەکانەوە پارچەکاغەز و داوی فڕێدراوی ژوورەوەی دەلەراندنەوە. لەو شوێنەی نۆ ساڵی کاملم لێ بەسەربرد، جێگەی هەموو کتێبێکم لێ دەزانی، ئێستەیش وای لێهات، بەخۆم نەبوو، لێکدا لێکدا ئەسرینم داباراندن. دەرگەم پێوەدا، دوای مانەوەی شەش ڕۆژ، بۆ کەڕەتی یەکەم، ئەوێم جێ هێشت.
کە هاتمە دەرەوە، لەهۆڵی ژنان هەواڵەکانی سەرا، چاوەڕێیان دەکردم:
- (بیرم) پاشا چی دەڵێیت؟

- سەیرە. نەتبیستووە؟ تۆ لەکوێ بوویت؟
- ئێستە واز لەمن بێنە. ئەو هەواڵە ڕاستە یان نا؟
- عوســـمانەفەندی هەواڵەکە لەنێو کوچە و کۆڵان بڵاوبووەتەوە: شێخی ئیسلام زەکەریازادە فەتوای لە کارلادانی سولْتان مستەفای داوە.
- ئەی ئێستە کێ سولْتانمانە؟

## ٦٤

**"سەفەری بابای دڵپەشێو و سەرگەردان، بێ ئارمانجە"**

**ئیبن عەرەبی**

بەدر دەستەکاغەزێکی لەبەردەم دانام و سیرمەی لێ داپچڕاند. ئەو پێنج قامیشەی دوێنێ بۆی هێنابووم، بە ڕێکوڕاستی خستنمە سەریەک. هەموویانم پێوانە کرد، تا بزانم کامیان بۆ نووسینی مەتن و کامیشیان بۆ پەراوێزنووسین دەشێت. هەموویانم لەنێو شووشەی مەرەکەب هەڵکێشان، لەسەر کاغەزێکی کۆن تاقیم کردنەوە. سێ دانەم بژاردە کردن و دوو دانەکەی تریشم لای بەدر دانان و داوام لێ کرد سازیان بکات.

- کتێبی (فتوحات المکیة) تەواو دەکەیت؟

- نا، کتێبێکی نوێم لەبەر دەستە.

- گەورەم! خودا دەرویەکی خێرت لێ بکاتەوە. لەبارەی چییە؟

- (ترجمان الأشواق).

- چی؟

- بەدر دەمەوێت (ترجمان الأشواق) ڕاڤە بکەم، چونکە خەڵک پێیان وایە هەموو ئەو کتێبەم بۆ لاواندنەوە و پێداهەڵدانی نیزام داناوە. نازانن هەموو ڕەمز و ئامازەی ئیلاهی و تەنزیلاتی ڕۆحانیی و موناسەباتی هەق تەعالان.

- پێت وایە ئەمە ئاگرەکە دادەمرکێنێتەوە، یان خۆشتری دەکات؟
- ئۆباڵی ئەستۆم پاک دەکاتەوە و مەبەستیشم ڕوون دەکاتەوە.
- گەورەم! خوا هاوکاریت بکات. ناوی چی لێ دەنێیت؟
- ناوی دەنێم: (ذخائر الاعلاق فی شرح ترجمان الاشواق).
بە نۆ ڕۆژ لە نووسـینی ئەو کتێبە بوومەوە، تا تەواو نەبووم لە ژوورەکەم دەرنەچووم. وازم لە وانەگوتنەوە هێنا و دەسـتم بە نووسـین کرد. وەختێک لە نووسـینی بوومەوە، بەدرم ڕاسـپارد کۆمەڵە کتێبساز و خۆشنووسێک، بەکرێ بگرێت، بە خەتی مەککی و، مەغریبی و، میسـری و، شـامی، بینووسـنەوە. کاغەزی باش و حوبری بەهاداری بۆ دابین کردن، داواشم کرد هەریەکەو پێنج کتێبی لەبەر بنووسـێتەوە. دوای تەواوبوونیان بەدر کتێبەکانی لە دوو تێر ئاخنین و بە هێسـترەکەی بۆ دەرچەی کاروانسـەرای بردن. چەند فەقێیەکی خۆیشـی دەسـتنیشـان کرد، کە نووسـخە بۆ هەریەک لە شـارەکانی مەککە و، حەلەب و، بەغدا و، قاهیرە ببەن. ئەو فەقێیەی ڕەوانەی ئەسـکەندەرییە کرا، بۆ فاس و قورتوبەیش دوو دانەی پێدا ڕەوان کران. بۆ هەموو نووسـخەکانیش مۆڵەتی لەبەرنووسـینەوەم بەخۆڕایی دابوو بە هەر کەسـێک، کە بیەوێت بە هەر زمان و هەر خەتێک، بڵاوی بکاتەوە.
هێشـتایش نازانم ئاخۆ ئەمە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانم یان نا؟ بەڵام ڕاسـتییەکەی تاکوو ئەو بڕیارەم نەدا، وەک پشـیلەیەکی کوێر، بەردەوام هەڵدەلەرزیم، لە هیچ شـوێنێک ئۆقرەم نە دەگرت. ئێسـتە ئەو کتێبەم بۆ هەموو وڵاتاندا پەخش بووە، وەلێ نازانم داخۆ دانەیەکی گەیشـتووەتە دەسـتی شـێخ زاهیر یان خاتوو نیزام؟ نازانم بەرەو کوێ ڕۆیشـتوون. گاهێک چاوەکانم دەخەمە سـەر یەک و دەمەوێت بخەوم، شـێخی گەورە و کچەکەیم دێنە بەرچاو، کە چۆن لە دۆخێکی خراپدا مەککەیان جێ هێشـتووە و بەدوای ئەنوا و پەناگەیەکدا دەگەڕێن، کە کەس ئازاریان پێ نەگەیەنێت. تا ئێسـتەیش

ڕای نیزام دەزانم، ئەو پێشـتر هێندێک قەسـیدەی لە دەمی من گوێ لێ بووە و دەشـیزانی من لـە دووتوێی کتێبێک کۆیان دەکەمەوە و هیچ ڕەخنەیەکیشـی نەبوو. بەڵام بۆ شـێخ زاهیر زۆر بەپەرۆشـم، ڕێزی گرتم، ڕیسـوام کرد، چاکەی دەگەڵدا کردم، بە خراپە پاداشـتم دایەوە. ماڵی خۆی و خوشـکەکەی بەسـەرمدا واڵا کرد، چووم بە بەژن و باڵای کچەکەیمدا هەڵدا و لەنێو خەڵکدا ئابڕووم برد.

دنیام لێ وەتەنگهات و بڕیارمدا بڕۆم. جگە لە سـەفەر، هیچ شـتێک نییە ئـەو هـەموو خـەموپـەژارە و ئازارەم کەم بکاتەوە. نەمزانی ئەو بڕیارە سـەرپێییە و بێسـەروبەرەم، سـێ سـاڵ سـەرگەردان و پەشـۆکاوم دەکات! لەگەڵ بەدر بێ هیچ مەبەسـت و ئامانجێک، لە هەردی خوادا دەخولاینەوە. لە دیمەشـق بۆ حەلەب، لەوێشـەوە بۆ (حـەمـا) و موسـڵ و ئەلرەها و ماردین، دواتر دیسـان گەڕاینەوە دیمەشـق، پاشـان جارێکی دیکەش ئەوێمان جێ هێشـتەوە. لە هەر شارێک دەماینەوە، هەفتەکانی سەرەتام دەکردە پێوەر، ئەگەر دەستی هەداران و ئارامبەخشـییان بۆ درێژ کردباین و دڵم ئۆخژنی گرتبا و ترسـم ڕەوی بایەوە، ئەوە چەند مانگێک لەوێ دەماینەوە، ئەگەریش ترس و تۆقینیان بەسـەر دڵمان هەڵڕشـتبا، زووبەزوو، بەرلەوەی ماندووی و شەکەتیی سەفەرمان بڕوات، دەڕۆیشتین.

بۆ هـەر دەڤـەرێـک چووبـام، دەچوومـە لای ئـەولیـاکـانیـان، ئـەگـەر نەیانناسـیبام، خۆم پێ دەناسـاندن، مەعریفە و عیرفانمان لەیەکتر وەردەگرت. هەر کاتێک یەکێکیان زۆر نیگای تێ بڕیبام، دڵم دەجۆشا، دەمگوت بەشـکم ئەوە مێخی من بێت، بەڵام دەریش نەدەچوو. بە خەمباریی من نیگەران دەبوون، نەشـیاندەزانی چ باسـە. ئەولیاکان خەمی یەکتر لەنێوان خۆیان دابەش دەکەن، دڵبەدڵی پێ دەکەن، وەک چۆن ئاو لەنێوان ڕووبار و ناعووردا دەورانی پێ دەکرێت، ئەوانیش وەها خەمەکانیان بۆ یەک دەنێرن.

ئەو نیگەرانییەی پێشتر دیمەشق لە دڵی توورڕدام، ئێستە سەرلەنوێ هێرشی کردەوە سەرم. بەدر لە هەمووشتێک دەستباری بۆ گرتووم و بووەتە بەشێک لە من. وەختێک ئازارێکم هەبووبێت، ئەویشی لەگەڵی بەش کردووم و بۆڵەبۆڵ و گلەی نەکردووە. ئەگەر دڵخۆشیش بووبم، بەبێ ئەوەی هۆیەکەی بزانێت، لەگەڵم دڵخۆش بووە. هەر کتێبێک بنووسم ئەو زۆر بەخێرایی تاوتوێی دەکات، نووسینەکانی من بۆ تێگەیشتنی ئەو، وەک نمەبارانی ئاسمانن بۆ سەر توێژاڵی زەوی... لە ڕستە و وشەی سەخت و داخراو، ئاگادارم دەکاتەوە، منیش چۆنی بوێت ئەوها شەرحیان دەکەم. کاتێکیش لە نووسینی کتێبێک دەبمەوە، زۆر بەئاسپایی و هێمنی لێم وەردەگرێت، هەر دەڵێی مەلۆتکەی تازەبوو لە دەستی مامان وەردەگرێت. زووبەزوو دەچێتە بازێری کتێبفرۆش و پەڕاوسازان و سێ دانەی لەبەر دەنووسێتەوە. دانەیەک بۆ من و، دانەیەکی بۆ خۆی و، دانەکەی تریش لای پەڕاوساز دادەنێت بۆ ئەوەی هەر کەسێک بیەوێت، لەبەری بنووسێتەوە. خوا لەنێوان من و ئەودا قەزاوەتێکی سەیری بەجێ هێناوە. بە خۆشەویستیی من لە خوا نزیک دەبێتەوە، منیش بە خۆشەویستیی ئەو، فەڕ و خۆشی وەردەگرم. بەڵێ، بەدری حەبەشی قوربە و نیعمەتی منە. لەو هەموو گەشت و گەڕانەمدا، گازاندەیەکی نەکرد، ویڕای پیر و کەنەفتبوونی، ڕۆژێک لەڕۆژان بێزار و هەراسان نەبوو.

ڕۆژانی مانەوەمان لە هیچ شارێک هەژمار نەکردوون، پێم وانییە بەدریش ئەمەی بۆ لوابێت. بەس تەنیا بە مانگەکانی ڕەمەزان شارەکانمان بیر دەکەوتەوە. لە حەلەب ڕەمەزانێک بەڕۆژوو بووین. ڕەمەزانی دواتر لەنێوان قودس و خەلیل بووین. ڕەمەزانی سێیەم، لە شاری مووسڵ بووین. هەتا بۆمان کرابێت لە خانەقای سۆفیاندا ماوینەتەوە، وەک لە میفارقین و مووسڵ وامان کرد، ئەگەرنا لە وەقفی مزگەوتەکان دەماینەوە، کە بۆ فەقێ و مەلاکان تەرخان

کرابوو، وەک لە حیمس و حەما. هەندێک جاریش هەواڵی گەیشــتنی مە دەگەیشــتە میر و مشــوورخۆرانی شــارەکە، ئەوانەی ئەولیایان خۆشــــویســــتبان دەهاتن خانوویەکیان بۆ چۆل دەکردین و بڕێک پارەشیان بۆ خەرجی دەداینێ، هەر وەک لە حەلەب و ماردین وایان کرد.

لەگەڵ بەدردا سێ بازنەمان لە شارەکانی شام و عێراق بڕین. هەتا خوا ڕووحم دەکێشــــێ یان مێخی خۆم دەبینمەوە، لە ســــووڕان و گەڕان ناوەستم، ڕاستییەکەی کەڕەتێک لە حەلەب خوا ئاماژەیەکی پێ دام. بۆ مزگەوت دەچووم، دیتم کۆمەڵە خەڵکێک دەرگە دادەخەن. ویستم بچمە ژوورەوە، بە سینەی خۆیان پاڵیان پێوەنام و وەلایان نام، هیچ قســــەیەکیشــــیان لەگەڵدا نەکردم. پێم گوتن بۆ وا دەکەن؟ وەڵامیان نەدامەوە، لە شــوێنی خۆیان وەســتان و هەموو خەڵک بە کەیفی خۆیان دەچوونە ژوورەوە، تەنێ ڕێگری لەمن کرا. دانیشــتم، سەیرمکردن و سەیریان کردمەوە، ئەو ڕۆژەم بیرکەوتەوە، کە چۆن ئیبن ڕوشــــد لە مەراکیش ڕووی لە خەلیفەی موەحیدەکان کرد و حاڵی خۆی لە ئەلیســانە بۆ گێڕانەوە، کە چۆن خەڵکی ڕەشــۆک لە چوونە مزگەوت ڕێگرییان لێ کردووە و ئازاریان داوە. هەترەشــــم چوو. لە دڵی خۆمدا گوتم دەبێ ئەوەیش چارەنووسی من نەبێت؟

بەرەو ماڵبوومەوە، بەدر بەو خێرا گەڕانەوەم سەری سووڕما. حاڵ و حیکایەتی خۆم بۆ گێڕایەوە، داوام لێ کرد بچێتە مزگەوت و هۆی ئەمەم بۆ ڕوون بکاتەوە. دوای ســــەعاتێک بە ڕوویەکی گرژ و مۆن گەڕایەوە، بە ڕاست و چەپدا جنێوی دەپڕژاند:

- ها بەدر چی بوو؟

- گەورەم (ترجمان الاشواق) دەزانێت!

- چۆنچۆنی؟

- دەڵێن ئیبن عەرەبی خراپترین شێخە، چونکێ بە شانوباڵی کچانی شۆخوشەنگدا هەڵدەڵێ.

- لاحول ولاقوة الا بالله!
- بەیانی دەچینە کن والی و شکایەتیان لێ دەکەین.
- نا، بەیانی برۆ بۆ بازاڕ، بڕێک تێشوو بۆ ڕۆیشتنمان دەست بخە.
- لەبەر ئەو گەوجانە دەڕۆیت؟
- نا بەدر! بەڵام ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ڕۆیشتن.
- گەورەم ئەو جارە بەرەو کوێ؟
- زۆر وەڕەزی حەریری و خەیاتم کردووە، دەڕۆینەوە قاهیرە.

## ٦٥

**"واز له کاکەی نەفام بێنن، هەق بە دژایەتی تێ دەگات"**
**ئیبن عەرەبی**

لـە حـەلـەب ڕۆیشـــتم، چونکە پێم وابوو لەوە گەورەترم لەگەڵ ئەو گەوجە خەیاڵپلاوانەدا پێدا بچم و دەمەقرێ بکەم. ئەمن ڕۆیشـــتم و ئـەوانیش لـە چاوەڕوانیی مندا چـاوەچـاویـان بوو. پێم وابوو لـەگـەڵ خـەیـات و حـەریری لـە خـەناقای قەنادیل کاتێکی خۆشـــی ڕۆحانی بەســـەر دەبەین، پێکەوە پەیکی فەڕی ئیلاهی و مەعریفەی تەعالا و ئەسراری قودسی دەنۆشین، کەچی لەگەڵ کەسێکی بێ شمشێر و ئـاڵا کـەوتمـە جـەنگ. لـە ئـەزهـەر فـەقێکانم داوایـان لێ کردم وانـە بڵێمەوە، لەوێ ڕووداوێکی ڕاســـتەقینە ڕووی دا. هەفتە دوای هەفتە فـەقێ لـە مـەجلیســـی وانـەبێژیـەکـەم زیـادیـان دەکرد، تـەنـانـەت ئەو گۆشـــەیەی لێی دانیشـــتبووین، لە خۆی نەگرتین، بۆ گۆشـــەیەکی فراوانترمان گواســـتەوە، جارێکی دیش لەبەر لێشـــاوی فەقێیان بۆ ســـووچێکی دیکەمان گواســـتەوە، لەکۆتاییدا چووینە ژێر ســـێبەری مینبەرەکە، کە گەورەترین حەلقەی دەرسوتنەوەی تێدا دەبەسترا.
لەو ڕۆژەی خوا کاری خۆی کرد، من لەنێو کۆڕی فەقێیاندا دەرســـم دەگوتەوە، کەسێک لەســـەرەوەی ڕیزەکان بە پێچەیەکی شـلـوشـۆڕ و

پەشتەماڵێکی شڕوشیتاڵ و سەبەتەیەکی خورماوە خۆی هەڵبڕی و وەقسە هات:
- ها ئەندەلوسی! تۆ پێت وایە خوا شتگەلێک بۆ تۆ کەشف دەکات و لە ئێمەی دەشـــارێتەوە، لە کاتێکدا ئێمەیش وەک تۆ نوێژ دەکەین و ڕۆژوو دەگرین!
فەقێ هەموو بەیەکەوە ڕوویان تێ کرد، زۆری پێنەچوو ڕوویان بەرەو لایەکی دیکە وەرگێڕا، لەوێ پیاوێکی دیکەی ڕەنگئەســـمەر وەستابوو، بە شێوەئاخاوتنی نۆبی، گوتی:
- دیارە لەم هەموو ئومەتی ئیســـلامە، هەر تەنیا تۆ میراتگری پێغەمبەریت؟ خۆ تۆ نە قورەیشی و نە ئەهلی بەیتی؟
بێدەنگی باڵی خۆی بەسەر ئەو ناوەدا کێشا، پاشان بوو بە گاڵەگاڵ. پیاوی یەکەم وەدەنگهاتەوە، ســـەبەتە خورماکەی دانا و بە پەنجەی دۆشاومژە ئاماژەی پێ کردم:
- ئەو قسەیەی، کە دەڵێت: "ئەولیا لە ئەنبیاکان باشترن" کەی ئەمە ڕاستە؟
فەقێکان ڕوویان بۆ من وەرســـووڕاند و کەوتنە واتەوات و دەنگەدەنگ. وا دیاربوو ئەو دوو پیاوە پێشـــتر لەســـەر قســـەکانیان ڕێککەوتبن، ئەگەرچی ئێســـتە دوور لە یەکتریش دانیشـــتوون. بەدر تەماشایەکی منی کرد، وەک ئەوەی بیەوێت دنەم بدات قسە بکەم و ئەو هەڵە تێگەیشـــتنە بۆ خەڵک ڕوون بکەمەوە. هەســـتم بە سەرسووڕکەیەکی کەم کرد.
کۆکیم، نەختێک دنیا بێدەنگ بوو، دەســـتم بڵند کرد و پیاوە سەبەتە بەدەستەکەم بانگ کرد، فەقێکان ڕێگەیان بۆ کردەوە و هاتە پێشەوە، هێمای دانیشـــتنم لە دەســـتەڕاست بۆ کرد. پاشـــان ئاماژەم بە پیاوە ئەسمەرەکە کرد، لەشوێنی خۆی دانیشت، وەک بڵێی حەزی بەهاتنە پێشەوە نەکرد.

بەرلەوەی هیچ قســـەیەک بکەم، لەناکاو گەنجێکی ئەبرۆتێکهەڵقژاو، بەتەنکە ڕیشـــێکەوە لەبەردەممان قیت بووەوە، پشـــتی تێ کردم و ڕووی قسانی کردە ئامادەبوان و گوتی:

- برایانم، لە قاهیرە خوا فەڕ و بەرەکەتی بەســـەردا باراندووین، ئەو شـــارەی کردووەتە قەڵای زانایان و ڕووگەی عاریفان و فازیڵان. لەوەتەی خوا ئێرەی بە نووری پرشـــنگداری ئیســـلام ڕۆشـــن کردووەتەوە، هەر مەزهەبێکی ڕاســـت و دروســـتی خوایی پەیدا بووبێت، شێخ و دەمڕاستێکی هەبووە...

پاشـــان بە تیلەچاوێک لایەکی لێ کردمەوە و پەنجەی شـــادەنوێژی ڕاوەشاند و گوتی:

- بەڵام خوا بە دۆڕاوترین و خەســـارەتمەندترین کەســـیش تاقی کردووینەوە. دەزانن کێن؟ قورئـان وەڵامتان دەداتەوە:"الذين ضـــل سعيهم في الحياة الدنيا وهم يحسبون أنهم يحسنون صنعا."

بەشێک لە فەقێکانم لەنێو خۆیاندا دەستیان بە سرتەسرت کرد، دژی ئەو ڕیســـواکردنەی من وەســـتانەوە، ئەویش دەنگی بەســـەر دەنگی ئەواندا بەرزکردەوە و هاواری کرد:

- خۆرهەڵات، بە هەردوو حەرەمی شـــەریفیەوە، کوان هاوەڵان و زانایان و ئەهلی بەیت، کە ئێســـتە گۆڕە پیرۆزەکانیان ڕازاونەتەوە، شتی وایان گوتووە؟ لە خۆرئاوایش کوان فاتیمییەکان ئەوانەی جنێو بە هاوەڵان دەدەن و بانگەشـەی هاتنی مەهدی لەنێو خۆیاندا دەکەن، شتی وایان باس کردووە؟

- هێندێک فەقێ بە توندی دژیان وەستانەوە، دواتر چەند کەسێک بەبێ هۆ دەســـتیان بە تەکبیرلێدان کرد. ســـەیرێکی ئامادەبوانم کرد، چاوم بەچەند دەموچاوێک کەوت، قەت نەمبینی بوون. زانیم ئەوەی ڕوودەدا کارێکی نەخشـەبۆکێشراوە و پێشـتر دایانڕشـتووە. بەدر دنەی دەدام، گۆتەگۆت و ژاوەژاویش زیاتر بوو.

یەكێك لەپشتەوە گوتی:
- ئەوە نابێتە ڕێسا. زانا و زەندیق لە هەموو سووچێكی گۆی ئەم زەویدا هەن.
- ڕاستە. بەر لەوەی مەغریبییەكان بێن، منداڵ و نەوەكانی مە هیچ عەیبێكیان نەبوو.
بەدر چیتر خۆی پێ نەگیرا، جڵەوی هەڵوێستەكەی گرتە دەست و هەستا و هاواری بەسەردا كردن:
- خەڵكینە فەرموون وەڵامی خۆتان لە شێخ وەربگرنەوە، تكایە گوێ بگرن...
لەگەڵ بانگەوازەكەی بەدر چەند فەقێیەك هەستان و هەمان شتیان گوت. بەشێك لەنێو مەجلیسدا گەڕان و هەموویان بێدەنگ كردن، زۆر بەخێرایی بێدەنگی باڵی خۆی بەسەر ئەو ناوەدا كێشا. هەموو لایەك: ئەوانەی دەمناسین و نامناسین ڕوویان تێ كردم.
بە دەنگێكی نزم گوتم:
- ئەو برایەم كە لێرە دانیشتووە بە ئەندەلوسی بانگی كردم، ڕاستە ئەندەلوس شوێنی لەدایكبوون و سەرهەڵدانی منە، بەڵام وەك هەموو لایەك دەزانن من ئیبن عەرەبی حاتەمی تائیم. ئەو برادەرەی لەم لایش دانیشتووە، دەزانی تیرەی (تائی) لەبەری خۆرهەڵاتن.
ئاماژەم بە گەنجەكە كرد، ئەویش ڕووی گرژ كرد و نەیویست چاومان بكەوێتە سەریەك. لەقسەكانم بەردەوام بووم و گوتم:
- خەڵكینە! ئەی ئەهلی خێر، ئەمن تەنێ بەندەیەكی خوام، داوای ئەوە ناكەم لە سەرووی بەندەكان بم. بەڵام تەماخوازم هەموو خەڵكی جیهان وەك یەك لە بەرزترین پلەدا بن، لە پایەكانی مەعریفە و كەماڵ هیچ بەرتەنگییەك نییە...
- كابرای خاوەن سەبەتە خورماكە، قسەی پێ بڕیم و گوتی:
- بەڵام تۆ دەڵێیت من كۆتا ئەولیا و دوایین میراتگری پێغەمبەرانم! ئەی ئەوە مانای خۆبەزلگرتن نییە بەسەر بەندەكانەوە؟

دەستم لەسەر دەستی دانا و بە لوتفەوە وەڵامم دایەوە:
- ئەمە بەخششی خوایە و نامەوێت نکوولی لێ بکەم. ئەمەی پێ داوم تا لە بەرژەوەندی خەڵکیدا ڕەنج بکێشم.
پیاوەکە ئەبرۆی تێکنان و لەتووڕەییان لچێکی بەرداوە، منیش ڕووم لە خەڵکەکە کرد و گوتم:
- کێ دەزانێ مووسا چۆن بوو بە پێغەمبەر؟
گەنجێک لەڕیزی یەکەم وەڵامی دامەوە:
- هەر لەو کاتەوەی لە کێوی توور ئاگری بەدی کرد.
- خودا پاداشتت بداتەوە. دواتر چی بە ئەهلەکەی گوت؟
- گوتی ئێوە لێرە بن من ئاگرێک بەدی دەکەم، دەچم بەشکم دەستەچیلەیەکی لێ بهێنم.
- بڕوانن ئەو لەپێناو بەرژەوەندیی ئەهلەکەی کۆشا، بە پێغەمبەرایەتی گەڕایەوە. ئەی لەبارەی خدری زیندە چی؟ کێ باسی ئەوم بۆ دەکات؟
مەجلیس خامۆش بوو، کەس وەڵامی نەداوە، لایەکم لە بەدر کردەوە، پێشتر ئەوەم فێر کردبوو، هەر زوو لە ئاماژەکەم تێگەیشت و گوتی:
- چوو ئاو بۆ ئەهلەکەی پەیدا بکات، لە ڕێگە بەسەر ئاوی حەیات هەڵبوو، لێی خواردەوە و خوایش بە نەمری هێشتیەوە.
- ئافەرین! برایان منیش لە حەلەبەوە بۆ لای ئێوە هاتووم، لەبارەی مەلیک زاهیر غازی قسەیەکم هەیە. شایەتی ئەوە دەدەم لەیەک دانیشتندا سەتوهەژدە کاری خەڵکم خستە بەردەست، هیی هەر هەموویانی ڕاهی کرد.
بەمە ویستم ڕێڕەوی مشتومڕی نێو مەجلیس بگۆڕم، بەڵام نەمتوانی و شکستم هێنا، گەنجە ئەبرۆ تێکەڵەکە جارێکی دیکە قیت بووەوە، ئەو کەڕەتە ڕووی قسانی لەمن کرد و گوتی:
- کابرای ئیماندار! ئەوان مووسا و خدربوون، پێغەمبەر و هاودەمی فریشتان بوون، تۆیش فەقیهێکی مالیکی ئەندەلوسی، هاودەمی

سەلاتینەکانی، ڕێز و قەدری تۆ، بە ڕێز و قەدری ئەوانەوەیە. لە خوا بترسە!

پاشـان کەسـێک لە ناوەڕاسـتی مەجلیس هەسـتا، پێشـتر قسـەی نەکردبوون، گەنجە ئەبرۆ تێکەڵەکەی بە چمکی کراسەکەی ڕاکێشا و پێی گوت:

- ئـەو، شـــتێکی خراپتری لـەوەی دەیڵێن داهێنـاوە، دەڵێت: "خوا و مەخلووقەکانی یەک شتن." گەنجەکەیش گوێی بۆ گرت و دەستەکانی بـەرزکردنەوە، وەک ئەوەی گەنجینەی دۆزیبێتەوە، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- خۆ گوێتان لێ بوو؟ هەق تەعالا لەسـەروو ئەو وەسفانەیە. خوای موتەعال لەسەر عەرشی مەزن لەکوێ و ئێمەی بێنەوا و بەستەزمان لەکوێ؟ چۆن یەک شتن؟

- دواتر دەنگی خۆی نەختێک نزم کردەوە و قسـەی لەگەڵ فەقێکانی مەجلیس کرد:

- خۆشـەویسـتانم بەرلەوەی دینتان تێکبدات و لەبارتان ببات، لەکن ئەو پیاوە بڕۆن. ئەگەر دەتانەوێت زانســـتێکی بەکەڵک فێربن، دەبێ بچنـە حوجرەکان، نـەک خانـەقا و تـەکیان. ڕۆزی و حەوانگەتان بۆ دابین دەبێت و زانستێکی بەسوودیش وەدەست دەهێنن. دەی بڕۆن... بەشـێک لە فەقێکان هەسـتان و بە قورسـی پێیان هەڵگرت، ئەوانی دیش چاویان تێبڕین. کابرا، سـەبەتەکەی هەڵگرتەوە و بەتووڕەیی تێم ڕاما و ڕۆیشت.

## ٦٦

**"لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، هیچ هاوڕێیەکیان بەدەستەوە نەهێشتم"**
**ئیبن عەرەبی**

دوو ڕۆژ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕین و وەک جاران بەبێ هیچ ژاوەژاو و دەنگەدەنگێک دەرسەکەمان دەست پێ کردەوە. ڕۆژی سێیەم لە خانەقا بەرەو مزگەوت دەڕۆیشتم، چەند پۆلیسێک لەکن قاپییەکەی مزگەوت خۆیان لێ مات دابووم. لێیان نزیکبوومەوە، داوایان کرد لەگەڵیان بڕۆم، نەشیان گوت بۆ کوێ؟ پێم گوتن خەریکە وانەکەم دەست پێ دەکات، گوێیان بە قسەکەم نەدا، تووند گرتمیان، یەکێک شانی ڕاکێشام و یەکێکیش پاڵی بە پشتمەوە نا، خلیسکام و خەریک بوو بەر ببمەوە. بەدر لە پەرۆشیی من گڕی گرتبوو، بەدوای ئێمە غاری دەدا و دەیگوت: "ئەوە شێخی گەورەیە... ئەوە کیبریتی سووورە،" بەڵام حەریری زۆر بەهێمنی و ئەدەبەوە، هەوڵی دەدا قسە لەگەڵ پۆلیسەکان بکات و هۆکاری گرتنی منیان پێ ڕوون بکاتەوە، پرسیاری دەکرد ئاخۆ ئەوەی دەیکەن لێی دڵنیان، بەڵام کەسیان وەڵامێکی وای نەدەدایەوە، کە دڵمان ئاو بخواتەوە. لەکۆتاییدا منیان بردە نێو ژوورێکی تەسک و تەنگی زیندانی قاهیرە. شەش بەندیی تریش لە ژوورەکەدا بوون، یەکێکیان دەچووە کن یەکبەیەکی بەندییەکان و لە هەمووشتێک پرسیاری لێ دەکردن. بە

حیکایەت و ســـەربردەی ئەوانی دی، ســـێبووری دڵی تەنگی خۆی دەدایـەوە. هـەرکە چوومـە ژوورەوە و دانیشـــتم، بـەرەو لام هـات، سەرینێکی چڵکنی دامێ بیخەمە ژێر خۆم. وێجا لەتەک من دانیشت و لە جلوبەرگی خاوێن و پێچەگەورەکەی سەرم ڕاما و گوتی:

- بەخوای تۆ ئەهلی زیندان نیت. خەڵکی کوێیت؟

- ئەی ئەوە نییە ئێستە بوومەتە ئەهلی زیندان، جیاوازی چییە؟

- شـــێوەی ئاخاوتنیشـــت بە هیی خەڵکی میســـر ناچێت، لە کوێ هاتوویت؟

- ئەندەلوس.

بـەندییـەکی دیکـە، کـە بـە ورده بـەرد یـاریی دەکرد، بـەناوهێنـانی ئەندەلوس ورووژا و بە دەنگێکی بە جۆشەوە گوتی:

- یاخوا بەخێر بێیت پسمام.

لام لێ کردەوە و ســەری خۆی بەرز نەکردەوە، وازی لە یارییەکەی نەهێنا، پرسیارم لێ کرد:

- تۆیش لە ئەندەلوس هاتوویت؟

- لە میۆرەقە هاتووم.

- چۆن بوو هاتییە قاهیرە؟

زیندانیی یەکەم لەبری ئەو، پێکەنی و وەڵامی دایەوە:

- لە چنگ شمشێری موەحیدەکان هەڵاتووە!

زیندانیی دووەم وردە بەردێکی تێگرت و لە شانی دا.

- واز لەو قسانە بێدەنگ دەبیت، یان شمشێرت لێ ڕاکێشم؟

دوو زیندانیی دیش لەم لاوە، لە قڵقەی پێکەنیان دا. منیش لە شەرمی قسەکەی سەرم بەخۆمدا بەردایەوە و بێدەنگ بووم.

پاشان لێی پرسیم:

- خەڵکی چ شارێکی ئەندەلوسی؟

- ئیشـبیلیا، بەڵام چەندان سـاڵە جێم هێشـتاوە، پرسـیاری ئەوێم لێ مەکە.

- نەچوومەتە ئەو شـــارە، پێشـــتر لەنێو کەشـــتییەکی بازرگانی، کە هاموشۆی (بلنسه) دەکرد، کارم کردووە.
- ئەی موەحیدەکان بۆ ڕاویان نایت؟
- ئـەوان هـەموو (میورەقـە)کانیان بە گومان دەســـگیر دەکرد، پێیان وابوو شوێنکەوتەی بەنی غانیەن.
- ئەمە ڕاست نییە. من لە کاتی جەنگی موەحیدەکان و بەنی غانیە لە مەراکیش بووم، لەگەڵ دەســـتەیەک لە خەڵکی میورەقە دانیشـــتم، چونکە چەکیان هەڵنەگرتبوو، لە ئەمن و ئاسایشێکی تەواو دابوون و هیچ گرفتێکیان نەبوو.
پیاوەکە بە گاڵتەوە پێکەنی و گوتی:
- بەڵام من هەڵم گرتبوو! هەر کەسێک پێوەندیی بە بەنی غانیە کردبا، هەموو ڕۆژێک دە درهەم و مانگانەیش تەغارە ئاردێکی دەدرایێ.
پاشـــان گەڕایەوە شـــوێنی خۆی و بە وردەبەردەکان مژووڵ بوو، وەک بڵێی حەزی نەکرد چیتر درێژە بە قسەکردن بدات.
زیندانیی یەکەم هەلەکەی قۆستەوە و بەندییەکانی بەمن ناساند:
- ئەوە خەڵکی شـاری (سـەعید)ە. ئەم دووانە هیی شـاری (قاهیرە)ن. ئەمەی ئەولایش، یۆنانییە و نازانێت بە عەرەبی قســـە بکات. کابرای شـــاری (ســـەعید)، بەخێرهاتنی کردم. هەردوو قاهیرییەکەیش بەبێ هیچ ورتەیەک، تەماشایان کردم. زیندانیی یەکەم لێی پرسیم:
- بۆچی کەوتیە زیندان؟
- نازانم!
لە قاقای پێکەنینی دا، دەڵێی زۆر لەمێژ بوو پێنەکەنی بوو، گوتی:
- تۆ نەزانیت، ئەی کێ دەزانێت؟
- خوا دەزانێت. پێم وایە زمانیان لێ داوم.
- کێ زمانی لێ داویت؟
- ئەوانەی نازانن چی دەڵێم و لە نووسینەکانم تێناگەن.
- دەستی لە شانم دا و گوتی:

- مەترسە. قازیی ئەو زیندانە، زۆر نەرم و میهرەبان و دڵپاکە.
بەر لەوەی لەبەر دەســـتی ئەو قازییە دڵپاک و چاکە ئامادەبم، چەند ڕۆژێک لە زیندان مامەوە. ڕێگەیان نەدەدا کەس بێتە لام، قەڵەم و کاغەزیشم لانەبوو. کەوتمە نێو چەندان حزووری غەیبی. هەر کاتێک شەوان دنیا تاریک دەبوو، دڵم دەناردە حزووری ئەو کەسەی حەزی بە دیداری دڵم دەکرد، زیندوو و مردوویش جیاوازییان نەبوو. هەموو ئەو مامۆستایانەی حەزم بە دیدەنیان دەکرد، پێیان گەیشتم. سوهرەوەردی، لە بەغدا. جەنابی کومی، لە سلا. جەنابی سبتی، لە مەراکیش. شێخ غەوس، لە تلسمان... تەنانەت لە خانەقا لەگەڵ بەدر و خەیاتیش دیدارم بەســـت. لە زیندان، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بە دڵ و جەستە ژووانم گرت. بە دیداری هەموو ئەو شێخانەم گەیشتم، کە لە ماوەی ژیانمدا مردوون، هەروەها هەموو ئەوانەیش، کە بەر لەدایکبوونم وەفاتیان فەرمووبوو. گوێم بۆ هەڵخســـتن، گفتوگۆم لەگەڵدا کردن، لێیان فێربووم. بەو چەند ڕۆژە کەمەی لە زیندانی قاهیرە مامەوە، خۆرهەڵات و خۆرئاوام تەی کرد، بە حزووری دەیان شێخ و مامۆستا گەیشتم، دەیان کتێبم خوێندنەوە، چوومە ئاسمان و هاتمەوە زەمین.
لە کۆتاییدا لەبەردەم حەزرەتی قازی ئامادەبووم، حاڵم گۆڕانی بەســـەردا هاتبوو، جلەکانم پیس بووبوون، دەســـت و دەموچاوم لە خۆڵ وەرچووبوون. پاسەوانەکان منیان بردە بەردەمی قازی، گاوێک بێدەنگ بوو، ئینجا سەری خۆی بەرزکردەوە و گوتی:
- وانەکەت چی بوو؟
- کتێبێک بوو بە ناوی (روح القدس فی محاسبة النفس).
- خەڵک بۆ لێت وەهەڵلا کەوتوون؟
- قوربان! خەڵک هەر وان. خۆیان بە شـــتێکەوە خەریک دەکەن، کە هیچی لێ تێناگەن.
- خەڵکت پێ هەڵەیە و خۆت پێ ڕاستە؟

- خۆ هەموو خەڵک گلەییان لێم نییە، بەڵکە بەشێکیان...
- ئەوە ڕاستە گوتووتە: "خوا و مەخلووقەکانی یەک شتن؟"
- مەگەر تەنێ ئەهلی مولحید شتی وا بڵێت!
- ئەی لەبارەی ئەوەی: "خودا لەنێو خەلقی خۆیدا دەتوێتەوە"
- ئەوەی وا بڵێت عەقڵی خلیسکی بردووە.
- چەند پەڕاوێکی لێکۆڵینەوەم لەژێر دەستە، بە باتیڵ و زەندیق تۆمەتبار کراویت. تۆ نکوڵی لەو قسانە دەکەیت؟
- زەینی خۆت لەسەر ڕووکەشیان لابەرە و لە ناوەخنیان وردبەوە، ئەوسا دەزانی مانایان چییە.
- ئاخر ئێمەی قازی تەنها حوکم بە ڕووکەش دەکەین.
- ئەمە قسەی عەوامە نەک قازی.
- ئەدەب بنوێنە، دەنا داوا دەکەم ئێستە پەلکێشی زیندات بکەنەوە.
- زیندانم زۆر پێ خۆشترە لەوەی ئێوە دەتانەوێت.
- بڕۆ بۆ زیندان تا ئەو کاتەی لە دۆسیەکەت ورد دەبمەوە، ئینجا حوکمت لەسەر دەدەم.
- خوا خۆی حوکم دەکات، من و تۆ و هەموو شتێک مەخلووقی ئەوین و مەحکوومی ژێر فەرمانی وین.

## ٦٧

**"گوێ بە شتێك مەدە، کە لە ڕیشەکەی حاڵی نابیت"**
**ئیبن عەرەبی**

بە خەمناکی و لێوبەباری گەڕامەوە زیندان. پێم وابوو تازە دادگاییکردنم درێژە دەکێشێت تا ئەو کاتەی بەرگریی لەخۆم دەکەم و ناحەز و نەیارەکەم دەبینم... بەڵام وا دیارە قازی هیچ ڕایەکی نییە، ناحەز و نەیارەکەیشم بێ شکڵ و ڕووە. هەروا بێتەوە، چارەنووسی منیش هیچ دڵنیاییەکی تێدا نییە. بەندییەکان چەندان پرسیاریان لێ کردم، هیچ وەڵامێکم نەدانەوە. یەک لەو بەندییانەی خەڵکی قاهیرە بوو، بۆ دادگایی دەرچوو و نەگەڕایەوە، ئێمە نەمانزانی ئاخۆ ئازاد کرا، یان لە سێدارە درا. ئەو ئەگەرچی پێوەندیی لەگەڵمان لاواز بوو، بەڵام تەمومژاویبوونی چارەنووسەکەی، هەموومانی نیگەران و خەمناک کرد. ئەمشەو حزووری غەیبیم لەگەڵ ئیبن ڕوشد بەست، هەستی خۆم بۆ بەیان کرد، بەڵام لەنێو تەمدا ون بوو. لە دەرگەی غەوس ئەبوومودینم دا، بەڵام دەرگەی لێ نەکردمەوە. لە مەنزڵگەی سەماوی بە دوای جەنابی کومیدا گەڕام و دۆزیمەوە، وەلێ نوێژی دەکرد، پاشان هێمایەکی بۆ دەمی کرد و گوتی:
(ماودعک ربک وما قلی).

چەند ڕۆژێکی پێچوو، بانگهێشــتی دادگە کرامەوە. لە ژووری زیندان بەرەو دادگە چووم، لە نیازی خۆم پێم وابوو بۆ بەرگریکردن لەخۆم و پووچاندنـەوەی تۆمـەتـەکان بۆ قـازی، کـاتێکی زۆرم دەوێت. بەو نیـازە چوومــە بــەردەمی قــازی، پیـاوێکی پیرم لــەلا بــەدی کرد، دەموچاوی لەلام غەریب نەبوو، بەڵام نەشــمدەزانی کێیە؟ ماوەیەکی زۆر تێیوە ڕامام، بەڵام سـوودی نەبوو. قازی قسـەی لەگەڵ دەکردم و منیش تەرکیزم لەســەر ســیما و ئەدگارەکانی ئەو پیاوە بوو، بیرم ئاڵۆزبوو، بە قازیم گوت:

- ئەوەیە نەیارەکەمە؟

قازی بە گاڵتەوە بزەیەکی کرد و گوتی:

- ئەوە نەیارت نییە، شەفیعتە.

لەو شـەفیعە نەناسـراوە سـەرم سـووڕما. ڕاسـتەوخۆ پرسـیم کێیە؟

قازی گوتی:

- ئەبووحەسەن برۆ لەتەک تۆمەتبار بوەستە.

ئەبووحەســـەن خۆی بەســـەر دارعەســـاکەی دادا و بەخێرایی چەند هەنگاوێکی ناو و هات لەتەک من وەسـتا و تەماشــای نەکردم. قازی ئەبووحەسەنی دواند:

- تۆ بەو ڕێز و حورمەتەی لای مەلیکت هەیە، هەروە بەو تەزکییە و پشـــتگیرییەی لای زانـایـانـت هـەیـە، بەڵێن دەدەیت، کە چیتر ئیبن عەرەبی هەســـتی خەڵک بریندار نەکات و لە قەســـدی فیقهــــــــ و شەریعەت و مەزهەبی ئەهلی سوننە دەرنەچێت؟

- بەڵێ بەڵێن دەدەم.

بێدەنگ بووم، گوێشـــم لە ئەبووحەســـەن بوو لەبارەی ڕەفتاری من بەڵێنی خۆی دا، وەک ئەوەی من لەوێ نەبم. هێشتا نەمدەزانی کێیە؟ بەڵام لە ســەروســیما و ئادگارەکانی هەســتم بە ئولفەت کرد، دڵم بە دیدەنی ئاسوودە و خۆش بوو. قازی درێژەی بە قسەکانی دا:

- بەڵێن دەدەیت، کە ئیبن عەرەبی لەمڕۆ بەدواوە هیچ وانەیەک لە مزگەوتی ئەزهەر ناڵێتەوە. ئەو مزگەوتەی دەستکردی فاتیمییەکان و پاشماوەی ئیسماعیلییەکانە لە قاهیرە. بەڵێن دەدەیت؟
- بەڵێ، بەڵێن دەدەم.
- بەڵێن دەدیت ئەگەر ئیبن عەرەبی بە پێچەوانەی ئەو ڕێنمایانە جووڵایەوە، لە میسر دەربکرێت، یان زیندانی بکرێت؟
- ئەوەی ناوێت. هەرکە ئازادکرا خۆی میسر جێ دەهێڵێت.
بەسەر سوورمانەوە تەماشام کرد، ئەو سەیری منی نەکرد، لە ڕووی قازی ڕامابوو، بەردەوام بزەیەکی هێمنی بەسەر ڕوخسارەوە بوو.
لەکۆتاییدا قازی بەدەنگێکی گەورە گوتی:
- بەخێر و سەلامەتی بڕوات.
پاشان لای بۆ کاتیبی دەستەڕاستی کردەوە و گوتی:
- بەتکای ئەبووحەسەنی بیجایی و مەرجەکانی دادگا و حوکمدان، ئیبن عەرەبی ئازاد دەکرێت.
هۆڵی دادگەم جێ هێشت و بێ هیچ پاسەوانێک لە خانەی داد چوومە دەرەوە. ئەبووحەسەنیش بەسەر دارعەساکەیەوە لەپێشم دەڕۆیشت، نەمزانی ئەو لەگەڵ ئەو هەنگاوە گورجوگۆڵانە چی داوە لە دارعەسا! لە قاچەکانی وردبوومەوە، حەپەسام، خۆم دڵنیاکردەوە ئاخۆ ئەوە خەون و خەیاڵە یان ڕاستییە؟ ئاخر ئەو وا دەرنەدەکەوت بڕوات. وەک بەڕەیەکی تەنکی هەوایی وابوو، کە لە زەوی بەرزی کردبێتەوە، ئەویش پێیەکانی بجووڵێنێت بۆ ئەوەی وا دیاربێت دەڕوات. دواتر لە دەرەوەی خانەی داد بەیەکەوە وەستاین. بۆ یەکەم جار تەماشایەکی کردم.
ڕووی من، بوو بە دەریای پڕ پرسیاری شەپۆلاوی. هەر دوو دەستی لەسەر دارعەساکەی وەرینان و ماوەیەکی درێژ بەبێ دەنگی

تەماشای کردم، نەرمە بزەیەکیش بەسەر ڕوویەوە بوو، پرسیارم لێ کرد:

- چۆن هێندە بە ئاسانی شەفاعەتی تۆیان قبووڵ کرد؟

- لەکن مەلیک عادل تکا و ڕەجام بۆ کردوویت.

- مەلیک چۆن منی هەڵسەنگاند.

- ئەو تۆ ناناسێت. هەندێک خەڵک شکایەتیان لێ کردوویت، گوایە تۆ بیدعەچی و زەندیقی، ئەویش فەرمانی زیندانیکردنی بۆ دەرکردووی.

- ئەی چۆن وات لێ کرد ئازادم بکات؟

دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

- گوتم سۆفییە، لە خەڵوەکەیدا شتێکی بە خەیاڵدا هاتووە، خەڵکیش لە دەوری بوون. ئیتر ڕاستەوخۆ فەرمانی ئازادبوونتی دەرکرد.

بێدەنگ بووم، نەمزانی ئاخۆ لێی بپرسم تۆ کێیت؟ نا، ئەوە نابێت، ئاخر نەناسینی من بۆ ئەو، دەبێتە جۆرێک لە سووکایەتی. یان سوپاسی بکەم و بەڕێی بکەم؟ ڕێڕەوەی قسەکردنم بەو سپارد، ئەویش هەر زوو هاتە گۆ و گوتی:

- ڕۆڵە بڕۆ بۆ بەغدا.

- بۆ بەغدا؟

- مێخی سێیەمی تۆ لەوێ چاوەڕێت دەکات.

- مێخی من؟ چۆن مێخی من دەناسیت؟

- زۆرباش دەیناسم.

- تۆ کێیت؟

لە قرتەی پێکەنینی دا، بەر لەوەی وەڵامم بداتەوە، ماوەیەک لێم ڕاما:

- ڕۆڵە! من مێخی دووەمی تۆم.

- مێخی دووەم؟ ئەوە چی دەڵێیت! خەیات مێخی دووەمی منە!

- دوای مردنم، جێگەمی گرتەوە. دەبوو یەک لەو دوانەمان لە زیندان دەرت بێنین و بەرەو مێخی سێیەم ڕێنوێنیت بکەین. لەبەر ئەوەی

خەیات شـــەپرە لێی داوە و لەســـەر جێگە کەوتووە، ناچار من بەو ئەرکە هەستام.
پاشـــان ویســـتی بڕوات، وەک ئەوەی نە بای دیبێ و نە باران و نەزانێت من چۆن حەیران و پەشۆکاوم، گوتی:
- ڕێگەم بدە بڕۆم.
- بۆ کوێ؟
- بۆ گۆڕەکەم...
لە ســـەرەوەی بەرە هەواییەکە، چەند هەنگاوێکی هەڵگرتن و بۆ کەڕەتی دوایی ڕووی تێ کردم و ئاماژەی بە سینەی دا و گوتی:
- ڕۆڵە! ئەوە لەبیر مەکە: "ئێرە پاک بکەوە و شوێنی بکەوە."

# ٦٨

**"خۆشحاڵی بۆ ئێوە دڵپەشێوان!"**

**ئیبن عەرەبی**

بە حەیرانی و پەشۆکاوی بەرەو خانەقا چووم، هەر دەڵێی تازە جادوویەکی گەورەم لێ پووچەڵ کرابووەوە. بیرم لە هەموو ڕووداوەکان کردەوە، پاشان دەستم بە گریان کرد. لەسەر چەقی ڕێگە دانیشتم، پاشان خۆم دایە سووچێک کە خەڵک بەسەریەوە نەدەهات، ئەوسا بە کوڵ گریام. ئەو ترسەی لە مانەوەی چەند ساڵێک لە کونجی زیندان و ڕزانەوە تێیدا لە سینەمدا کەڵەکەبووبوو، هەموویم هەڵڕشت. ئاخر بەهۆی زیندانەوە، چەندان ساڵ لە مێخی سێیەمی خۆم دوور دەکەوتمەوە و دادەبڕام، خەریک بوو لە بێئومێدی و حەسرەتان شەق ببەم، هەق تەعالا ئەو پیاوەی لە گۆڕ هێنایە دەر و منی لە زیندان دەرهێنا. دەبێ چ چاکەیەک لەوە گەورەتر بێت، کە خوا بەسەر بەندەی خۆیدا هەڵبڕێژێت؟
گەیشتمەوە لای هاوەڵەکانم و چوومە ژوورەوە، بەدیار خوانی نانخواردنەوە دانیشتبوون، باوەشیان پێدا کردم و گریان. بە ئەسرینی گەرمیان شان و سینەیان تەڕ کردم، بەدر لەگەڵ گەنجێکی دیکە کە نەمناسی، زۆر بە گەرموگوڕی جێگەیان بۆ چێ کردم. تۆزوتاڵیان لە جلەکانم تەکاند و پەنجەرەکانیان بۆ هەواگۆڕکێ

خستنه سەر پشت. ئەوەی خۆیان دەیانخوارد، له بەردەمی منیشیان دانا. لەگەڵ وان جەرجیر، پەنیری بزن و نانمانم خوارد. ویســـــتم به گەمەوگەپی ئەوان باری قورسی سـەر دەروونم سووک بکەم، بەڵام هیچم به هیچ نەکرد. چاوەکانی خەیات بەردەوام لەنێو ئەسـرینگەلی حەزیندا، نغرۆ بووبوون، هاوکات بەدریش باسـی ماوەی دیارنەمانی منی دەکرد، هەواڵی خانەقا و مزگەوتی پێ ڕاگەیاندم.

ئێمە لەو قسـه و باسانەدا بووین، حەریری وەژوور کەوت، به دیتنی من شــــاگەشـــــکه بوو. بەرلەوەی له ئامێزم بگرێت، کڕنووشـــــی ســــوپاســــگوزاری بۆ خوا برد. لـه ڕەنگوڕووم ڕامـا، وەک بڵێی دەیویســـت بەر لەوەی قســـەی بۆ بکەم، له مەســـەلەکه حاڵی بێت. پێچەکەی له ســـــەر هێنامه خوار، قاچەکانی ڕاکێشـــام و پشـــووم وەرگرت. باسـی هەموو شەوەکانی زیندان و حزووره غەیبییەکانم بۆ کرد، که لەوێ بەسـەرم بردبوون. خۆ نابێت باسـی شـەفیعەکەیشـم بکـەم، چونکـه لـەوێ چـەند کـەســـێک هـەن، نـاکرێ نهێنی و ڕازی مێخەکانیان بۆ کەشف بکرێت.

دوای چەندان سـەعات قسـه و گفتوگۆ، شـەو بەسـەر داهات، بەدر چوو جلی خەوتنی بۆ هێناین، دوو دەسته جلی بۆمن دانان.

ئەو گەنجەی نەمزانی کێیە، ئەو ناوەی جێ هێشت، بەدر گوتی:

- لەو ڕۆژەی تۆیان خسـته زیندان هات و لەگەڵ ئێمه مایەوە، چرکه به چرکه به دواتدا دەگەڕێت:

- پێشتر دیدەنیمان کردووە؟

- چەند جارێک له دەرسـی تۆ بینیومە، بەڵام له سووچێک دادەنیشت و هیچ پرسیارێکی نەدەکرد.

- ناوی چییە؟

- سودکین.

- لەســـەر جێخـەوەکـەم پاڵکەوتم. دوای ئەوەی خرامه ئەو ژووره تەنگ و تەسکەی زیندان، ئەوه یەکەم جاره به ئیسڕاحەت ڕادەکشێم،

ئاخر لەویٚ لەبەر هاوەڵانم ئەوەم بۆ نەدەلوا. لەبەر ئازار و ئێشـــی ئێسقانەکانم ئاهو ناڵەناڵم نەدەکرد. بەدر بەم حاڵەی من زۆر نیگەران بوو، بـەبێ ئـەوەی داوای لێ بکـەم، هـات قـاچ و پێیـەکـانی شـــێلام. خـەیات لـەســـەر جێگـەکـەی دەنگی بـەرز کردەوە و بـەدەنگێکی کز گوتی:

- برا کەی دەڕۆیت؟

حەریری فزووڵیانە سەری بڵند کرد و بەدریش دەستی لە قاچشێلانم هـەڵگرت و چـاوەڕێی وەڵامی منی کرد. ئـەمن حـەزم دەکرد دواتر بەتەنیا هەواڵەکە بە خەیات بڵێم، نەبادا بە فیراقی من، ئازار بکێشێت، بـەڵام وا دیاربوو ئەوەی لە زانســـتی غەیبی زانی بێت. کەمێک لێی نزیک بوومەوە و دەستم خستە نێو دەستی و گوتم:

- سبەی، یان دووسبەی.

- بە خێر و سەلامەتی براکەم.

هیچی تری نـەگوت. چـاوەکـانی لێک نـان و خـەوی لێ کـەوتـەوە. چوومـەوە ســـەر جێخـەوەکـەم، بـەدر و حـەریری بـە تـامـەزرۆیی چاوەڕێی هەواڵی سەفەری من بوون، بە چپەوە پێم گوتن:

- ئیتر میسر جێگەی من نەما، دەچمە بەغدا.

تومەز بەدر پێشـــتر بە گرتنی من تاســـابوو، لەڕ و لاواز بووبوو، ڕەنگی لـەبـەر پـەڕیبوو، بـە بڕیـاری ڕۆیشـــتنی من، دڵخۆش بوو. حەریریش نەختێک بێدەنگ بوو، دواتر بە گاڵتەوە گوتی:

- جارێکی دیکە مـەگـەڕێوە. ئـازاری مـاڵئـاوایی، لە بەرگەی فیراقت بەســـوێترە! ڕۆژی دواتر، بەیانییەکەی دەرچوو بۆ ئەوەی تێشـــوو بکڕێت و سۆراخی قافڵە و قافڵەچیان بکات. سودکین هاتە ژوورەوە و ئـەو نـاوەی خاوێن کردەوە، خواردنی لە قاپی بچووک بچووک، بە شێوەی دابەشکردنی خانەقا بۆ هێناین. لەگەڵ حەریری باسـی ڕێگە و قافڵەکەلمان کرد، گەنجەکەیش گوێی لەو قســـانەی ئێمە بوو، هات لە دەورمان دەستەوئەژنۆ دانیشت. بە چاوێکی خەمناکەوە گوتی:

- گەورەم دەڕۆیت؟
- بەڵێ ڕۆڵە! سبەی یان دووسبەی.
بەســـەر دەموچاویەوە ترس و بێئومێدییەک بەدی دەکرا، دەســـتم لەشـانی دا و توووند بە سـینەمەوە گوشـی. ڕاسـتییەکەی ئەمن لە گەشـــت و گەڕیدەییم دا، فرچکم بە خەم و ئەســـەفی موریدانەوە گرتبوو. فیراقی لەم شـێوەیە و زۆر تاڵتریشـم چەشـتبوو، بە نموونە کاتێک لە ئیشـــبیلیا، فاس و، مەراکیش و، بیجایە، ماڵئاواییم لە شێخەکانم کرد، یان لە هەر شوێنێکی دیکە، کە بە ڕێکەوت شێخێکم ناسیوە و خواحافیزیم لێ کردووە.
خۆم داهێنایەوە و ماوەیەکی زۆر خەیاتم لە باوەش گرت و ئەسرینەکانمان تێکەڵ بە یەک بوون. پاشان حەریریشم لە باوەش گرت، وەها دەستی لەپشتم توووند کرد، دەڵێی دەیویست بمخاتە نێو سینەی خۆی. لە دەرگە هاتمە دەرەوە، دیتم سودکین لەبەر قاپیەکە وەسـتاوە و نەعلەکانی منیشـی بەدەسـتەوە گرتووە. داهاتەوە نەعلەکانی دەپێ کردم و کەلوپەلەکانیشـی تاکوو کاروانسـەرا بۆ هەڵگرتم، لەوێ بەدر چاوەڕێی دەکردین.
لە ڕێگە سـودکینم بەشـپرزە هاتە بەرچاو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. بۆ ئەوەی هێندێک ئازاری کەم بکەمەوە، پرسیاری خزموخوێشم لێی کرد. زانیم باوکی هەر لەو کاتەی سـەلاحەدینی ئەیووبی خانەقا بۆ سۆفیان لە قاهیرە دروست دەکات، لە خانەقایەک نیشتەجێ دەبێت. بە تەسـەووفێکی پڕ لە جەمال و کەماڵەوە کۆچیدوایی کردووە. نزام بۆ کرد. کەمێک بێدەنگ بووین، لە کۆتایی دەربەندەکە کاروانسەرامان لێ دەرکەوت. سودکین گوتی:
- گەورەم... من موریدم و داواکاریم هەیە، تۆیش بنەوبارگەت تێکناوە و دەڕۆیت.
- چیت دەوێت؟
دەمەوێت ببمە هاودەمی تۆ، خزمەتی تۆ و زانستەکەت بکەم.

- کەس لە کەسوکارەکەت نەماون؟
- کێ بێمنێ؟ ئەو ڕۆژەی نوورەدین زەنگی مرد، من و باوکم بەندەی ئازادکراوی وی بووین.
- ئەی باوکت ماوە؟
- نەخێر مردووە.
- لە ســیمای ئومێدەواری ڕامام... بارودۆخی پیربوونی بەدریشـــم لەبەر چاو بوو. بێگومان ئێستە بێت یان دوایی، ئاتاجمان بە گەنجێکی بە شــانوشــەوکەت دەبێت، کە لە ڕێگە هاریکاریمان بکات. دەســتم خستە سەر شانی سودکین و بە بزەیەکەوە پێم گوت:
- ئەگەر حەز دەکەیت لەگەڵمان وەرە.
- دەترســم ئەرکبارتان بکەم و ببمە بارقورســی بەســەر شــانتانەوە، چونکە نە پارەم پێیە و نە وڵاخ.
- کوڕی خۆم! زەمین، زەمینی خودایە، مـەقام فراوانە و خودانماڵیش بەخشــندە و دڵاوایە. کاتێک لە دوورەوە بەدرمان بینی هەوســـاری دوو وڵاخی بەدەســتەوەیە، ســودکین بەغار چوو و مژدەکەی پێ دا. بەدر تەماشــــایەکی کردم و چاوەڕێی ڕێنوێنیی من بوو، منیش پێم گوت:
- وڵاخێکی دیش بەکرێ بگرە.

## ٦٩

**"خەم، ئەگەر بەردەوام هاوەڵ و هاودەمی مرۆڤ نەبوو، بەکەڵک نایەت"**
**ئیبن عەرەبی**

کەمن ئەو شـــارانەی لە کاتی بڕینی تخووبەکانیاندا، لە چاوەڕوانیی گەیشـــتنتدا چاوەچاویان بێت و هەر لە ســـەرەتای هەنگاوەکانتدا، هەست بە میهر و، خۆشنوودی و لاواندنەوە بکەیت.
لەگەڵ ســەدان کەســی نێو قافڵەکە، بەغدا بەم چەشــنە پێشــوازی لێ کردم، هەستم کرد وەک شارە بەخشندە و غەریبدۆستەکان، بەتەنیا بـەخێرهـاتنی کردم. هـەر لـەو کـاتـەی چوومـە نـاوی، نیشـــانـەی سەرسووڕمان و مەدهۆشبوون بەسەر ڕوومەوە نیشتن، ڕێک وەک ئەو مرۆڤەی کەسێک باوەشی پێدا دەکات و نایناسێت. وەک کەسێک خۆشــی بوێیت و بە دیدارت نەگەیشــتبێت... نەیدیبیت و پێتدا هەڵبدا. ئەم ســـەرســـامبوونەیش زەمەنێکی دوورودرێژ بمێنێتەوە، تا ئەو کاتەی ئەو شـارە وانە سـەرەتاییەکانی خۆت پێ دەدات: چۆن دەبێت بەســـەر کەناراوەکانی دیجلە پیاســـە بکەیت، کەچی دڵت لەپشـــت پەراســـووەکانتەوە بمێنێتەوە، ئاوی ڕووبارەکە هاژە و هۆڕەی تێدا نـەکـات؟ چۆن دەکرێ بـە ڕەســـافـەدا ڕەتبیـت و یـەکبـەیـەکی دارخورماکان حیکایەتێکی تازەت بۆ نەگێڕنەوە، بەجۆرێک پێویســـت بـەوە نـەکات ڕۆژی دواتر پاتـەی بکـاتەوە؟ ئاخر چۆن دەلوێ بەنێو

بازاڕەکانی کەرخدا بڕۆییت و قسـەی عەتتار و کوتاڵفرۆش و زێڕنگەرەکانی، لەبەر ڕوونبێژی و ڕەوانبێژی و شیرینی، بە درێژایی ڕۆژ، لە گوێچکەتدا نەزرینگێنەوە؟ ئەری پێم بڵێ لەکوێی دیکە زوهدێکی تەواوت دەستگیربووە تاکوو هەموو شەوێک دەرگەی ماڵت بە ڕووی بەغدا دابخەیت و بخەویت؟

بە شاری بەغدا زۆر دڵخۆش بووم، ئەمە لای سودکین و بەدریش شاراوە نەبوو. شتێک لە لوتفی ئەو شارەدا لەنێوان پەنهانی و ئاشکرادا، هاتوچووی بوو. پێویستم بە کاتێکی زۆرە بۆ ئەوەی گوێ قوڵاخ بکەم، ئاخۆ دەبێ بەغدا چی بە گوێی عاریفێکدا بچرپێنێت! ڕاستییەکەی ئەمن ڕێک ئاتاجی ئەمەم. پەرتوبڵاو و و هەڵوەشابووم، بەغدا کەرت و لەتەکانی خڕکردمەوە و ڕێکی خستمەوە. غەوارە بووم، داڵدەی دام. دڵنیابووم کۆتاییەکەی وەک وڵات و شارەکانی دیکەی ئەندەلوس و مەغریب و مەککە و شام و میسر نابێت. ئاخر موەحیدەکان پێیان گوتم تۆ مافی دەرسگوتنەوەت نییە، ئەیووبییەکان خستمیانە کونجی زیندان، حەلەبییەکان قۆشمەیان بە دیوانەکەم کرد. مەککە لە هەڕەتی عیشقمدا دەرگەی بەسەر دڵمدا داخست. خوا ویستی ڕێبوارەکەی تاقیی بکاتەوە، تا ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە، عاریفەکەی ئەزموون بکات، تاکوو چێژ لە ئیمانەکەی ببینێت. پەروەرێن لەنێوان پەنجەکانی خۆیدا هەڵگێڕ و وەرگێڕی زەمان و مەکانم پێ دەکات، تا قەدری خۆم بزانم. ناوەناوە لوتفی شاراوەی خۆی و نیعمەتە زۆرەکانی بەسەرمدا دەڕێژێت، وەک ئەو لوتفەی کە ئەو ساڵ لە هاتنە بەغدا، پێی عەتا کردم. لێرە، نە خەم دام دەگرێت و نە سینەم تەنگ و تەسک دەبێت. لە هەموو سووچێکی ئەو شارەدا حوجرەیەک هەیە، پێشوازی لە هەموو زانستێک دەکات و هەموو مەزهەبێک قبووڵ دەکات. لە هەموو شەقامێکدا خانوویەک هەیە جۆری بینا و جوانییەکەی دەتتاسێنێ. هەر باخچەیەک دەگریت، درەختی وای تێدایە پێشتر لە هیچ شوێنێک نەمبینیوە. بەروبوومی

وایان هەیە قەت تامم نەکردووە. لە هەموو شـــەقامێکدا ئاوگێڕەکان دەبینی، گۆزەڵەی جوان و زەنگداریان پێیە، زەنگێکی خۆشـــکەڵە لێ دەدەن و ئاوێکی ســـارد و ســـەهۆڵاوی دەگێڕن. هەموو گەڕەکێک بازاڕی تایبەت بەخۆی هەیە، شـــتی وای لێ دەفرۆشـــرێت، لە هیچ بازاڕێکی دی دەست ناکەوێت.
چەند هەفتەیەکی ســـەرەتام لە بەغدا بەســـەربرد، تێ دەگەڕام و هیچ دەرس و دەورێکم نەبوو. لە ماڵەوە دەردەچووم و بە دەوری شاردا دەســـووڕامەوە، تەنێ دەمەویســـت دێڕە شـــاراوەکانی ژێرپێی خەڵک بخوێنمەوە، هەروە حەزم دەکرد وشـەگەلی خوا فام بکەم، کە مێژوو لەم شـــارەدا چاخ لە دوای چاخ بەســـەریەکەوە کەڵەکەی کردوون. ئاخر هێندێک جار، ئەوەندەی قاچ بەدەم ڕۆیشـــتنەوە شـــت دەخوێنێتەوە، چاو لەنێو پەڕی کتێباندا ئەوەندەی پێ ناخوێنرێتەوە. ڕاستییەکەی بەغدا هەموو ڕۆژێک گەشتێکی نوێم پێ دەکات. کاتێک دەچمە نێو (درب الزعفران)، باشترین چێتی فارس و، چاکترین شتی عەرەب و، لەبارترین چشتی تورک و، ڕۆم و، هیند و، کەرەج دەبینم، هەموویشـــیان لە بەغدا دروســـت دەکرێن. وەختێک لە بیمارســـتان نزیک دەبمەوە، چەندان دەرمانخانە لە دەورێگە دانراون، بە ئامێری ئاوتکێن و بودقە مژوولن، گیایەک دەخەنە نێو شلەیەک و دەیگرنەوە، ئاوێتەیەکی وشـــک، تێکەڵ بە مەرهەمێک دەکەن... بەڵێ ئەوان بۆ چێکردنی دەرمان، خەریکی دڵۆپاندن و ئاوێتەکاری و ســـووتاندن بوون. هەموو دەرمانەکانی خۆیان لەنێو شووشەی بچووک بچووک کردبوون، بەســـەر دەرگەکانیانەوە ڕیزیان کردبوون. بازاڕی کوتاڵفرۆشانیش ئەو ناوەیان بە قوماشی ئاوریشم و کەتان و لۆکە داپۆشـــیبوو. لە دەوری ئەویش، بازاڕی هەلاج و زێڕنگەر و تەشـــیرێســـان هەبوو. بۆ چوونە بازاڕی کتێبفرۆش و پەڕاوســـازان، ڕۆژێک بەشـــم ناکات. ئەوەی بەر لە چوونە ژوورەوە نەزانێت چی

دەویت، سەری لێ دەشێویت، ئاخر کەڕەتی یەکەم، ڕێک ئەوە بەسەر خۆم هات.
ڕەنگە کتوپڕ تووشـــی ڕێکەوتێکی جوان بیت. جارێک من لای کتێبفرۆشێک، کە کتێبی ئەندەلوسی دەفرشتن، بەسەر نامیلکەیەک هەڵبووم بە ناوی (دروێنەی بەهشـــتییە). هەڵمگرت و پەڕاوەکانم هەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد، ناوی هیچ نووسەرێکی بەسەرەوە نەبوو. دووجار بە دەنگێکی بەرز پرسیارم لە کتێبفرۆشە پیرەکە کرد، ئاخۆ بۆ هیچ ناوێکی بەسەرەوە نییە، بەڵام ئەو سەری خۆی بادا و وەڵامی نەدامەوە. دواتر تەماشایەکی کرد، هەر دەڵێی یەکەمجار بوو ئەوەی بەرچاو بکەویت. بەهەرحاڵ، ئەو نرخەی داوای کرد، دامێ و چووم لە بەردەرگەی دووکانەکەی دانیشتم. یەکبەیەک لاپەڕەکانیم هەڵدایەوە، وەک کەسێک لاپەڕەکانی ڕۆژگاری ژیانی خۆی هەڵبداتەوە و بیست ساڵ بەرەو دواوە بگەڕێتەوە.
ها ئەوەتە باسی (شانکارا) و فیساگۆرس و ڤینۆس و ئیخوان سەفا، دەستەی سەرخۆشان لە باخەکەی فرێدریک لە دووتوێی نامیلکەیەکدا کۆیان کردووەتەوە. ئەرێ دەبێ ئەوە کتێبی ئەو نەبێت؟ ئەی قابیلە هیی کێ بێت؟ نامیلکەکەم خستە نێو سەلەکەم، سەرنجێکی خۆمدا زانیم هەر لەو کاتەی ئەو کتێبەم هەڵگرتووە، لە بزە نەکەوتووم. من لە کاتێکدا لەنێوەڕاستی بازاڕی کتێبفرۆشانی بەغدا وەستابووم، با هەڵی کرد و هەموو کوچە و کۆڵانەکانی ئیشبیلیای گرتەوە، بۆنی پرتەقاڵی لە دەروازەکانەوە بۆ هێنام. هەبێ و نەبێ ئەوە سڵاوی فرێدریکە بۆ منی دەنێرێت، ئەمن لێرە و ئەویش هەر خوا دەزانێت لە کوێیە. من ئێستە نازانم ئەو زیندووە یان مردووە؟ هەر لە ئیشبیلیا ماوەتەوە، یان بۆ مەفتەنە دوورەکەی خۆی سەری هەڵگرتووە؟
بەنێو بازاڕی پەڕاوفرۆش و کتێبفرۆشەکاندا دەسووڕامەوە. ڕاستییەکەی ئەمن هاتبووم کاغەز بۆ کتێبەکەم بکڕم، بەڵام هێشتا

خوا بۆ ئەو شـــوێنە ڕێنوێنی نەکردووم. لە (بابولشـــەرقی) ڕیزە دووکانێک هەیە، بە کۆمەڵ کاغەزیان لەســـەریەک داناوە، لەســـەر تەختەدارێک نرخی کاغەزەکانیان نووسیوە. لەپشت وانیش مەنجەڵی پڕ لە نەشا و قینەب بۆ دروستکردنی کاغەز و ئامێری پەستێنەری لۆکە و کەتان و پەڕاوی شامی، دانراون. دواتر بڕندە و مشتومالّدەرە شـــارەزا و لێهاتووەکانیش چەندان جۆری ئاتاج و کەلوپەلیان لێ دروست دەکەن. پارچەی گەورە، بۆ موکاتەبە و گرێبەست. پارچەی ستوور، بۆ قورئان و سیحاح. هیی لووس و ڕەونەقداریش بۆ نامە و پەیماننامە. کاغەزی تەنکیش بۆ لەتیفە و پوختکردنەوەی کتێبانە. دوابەدوای ئەوانیش بازاڕی خۆشـــنووســـانی کتێب دەهات، هەموو کەلوپەلێکی نووسینیان دەفرۆشت، کەڵکەڵەی ئەوەم هاتە سەر، کە واز لە حوبری کۆن بێنم و ئابونووسی بێگەرد بکڕم. بۆ تاقیکردنەوە، جۆری هەموو پەڕاوەکانم کڕی. دواتر حوبرێکی نەفتیشـــم بۆ نووســـینی ئازاد کڕی. هەروەها دانەیەکی تر، کە گیراوەی مازووی شـــام بوو، بۆ پەڕی تەنک و هیی ســـێیەمم بۆ دەفتەری نێو باخەڵ کڕی. غەڕەیەکی عێراقیشـــم بۆ ناونیشـــانی کتێب و بەرگکردنیان کڕی.

## ٧٠

**"ڕێزگرتن لە مەخلووقەکانی خوا، ڕێزگرتنە لە خوا"**
**ئیبن عەرەبی**

ســاڵی یەکەمم لە بەغدا بەســەر لێواری فیتنەوە بەســەربرد. لە هەر شــوێنێکی ئەو شــارە جێگرتی دەبووم جوانی و هەوا و ئارەزووی نوێ، بۆ لایەکی دی کەمەندکێشــیان دەکردم. چوار خانووم گۆڕین، نەک لەبەر ئەوەی لە کۆڵانەکانی پێشــوو وەڕەز دەبووم، بەڵکە تەماعگیری کۆڵانەکانی دواتر دەبووم. دواجار لەنزیک مزگەوتی (بابولتاق) نیشــتەجێ بووم، لەو مزگەوتەدا درێژترین وانەم تێدا دەگوتەوە و زۆرترین فەقێم لێ خڕدەبوونەوە. گۆڕەپانی مزگەوتەکە فراوان بوو، لە پشتەوەی ڕیزە خانوویەک لەسەر کەناری ڕووبارەکە دروست کرابوون، لەبەردەمیان چەند بەلەمێکی کرێ هەبوون، خەڵک پێیان دەپەڕینەوە یان لەنێو ڕووبارەکە خۆشــی و کەیفیان پێ دەکردن. ماســیفرۆشــان ماســی زیندوویان دەهێنان و بەســەر شــیشــەوە دەیانبرژاندن، خەڵکیش بە کولێرەی گچکە دەیانخواردن. بەدرێژایی شــوورەی مزگەوت بەدیوی درەوە، کورســی دانرابوون، هەموو ڕۆژانی شــەممانیش قورئانخوێن بەنۆرە لەسەری دادەنیشتن و بە دەنگی بە جۆش و خرۆشیان ڕێبوارانیان ڕادەگرت و کەسانی بەپێوەیان بە ئەژنۆدا دەخســت، خەڵک بۆ بۆنە و ماتەم و ئاهەنگی

خەتەنەکردنی منداڵەکانیان بانگیان دەکردن و پارەیان دەدانێ.
خانوویەکم لە نزیک مزگەوتی بابولتاق بەکرێ گرت. هیچ گۆشەیەکی وەقفم دەستنەکەوت تا من و هاوەڵەکانم تێیدا نیشتەجێ بین. من لە ژوورێک دەخەوتم و سوودکین و بەدریش لە ژوورێکی دیکە. خانووەکە حەوشەیەکی هەبوو بەسەر ڕووبارێکدا دەیڕوانی، کە خواردنمان لێ چێ دەکرد و جلەکانمان لێ هەڵدەخستن. بەیانییەک دەچوومە مزگەوت، پۆلێک سۆنەی جوانم بەرچاو کەوتن، جریوە و قریوەیان تێکەڵ بە دەنگی چەرخی ناعوورەکانی ئاو بووبوو، کە باخچە و چەمەکانیان پێ ئاو دەدران. شەونخوونیم دەکرد بۆ ئەوەی مەتڵەعێکی نوێی ئیلاهی ببینم، خەریک بوو بە دڵ تامم دەکرد، ئاخر ئاسمان ساف و بێگەرد بوو و ئەستێرەیش دەبریسکانەوە، هەر دەڵێی هەموو شتێک بۆ دابەزینی نوور و عیرفانیاتی بەغدا بۆ سەر دڵێ وەلییەکی ئەندەلوسی، ساز و لەباربوو.
شەوان خەریکی نووسین بووم، ڕۆژانەیش تەدریسم دەکرد. دەنگوباسی من لەنێو هەموو مزگەوتەکانی بەغدا کە پڕبوون لە شێخ و مەلا و هەموو مەزهەب و تەریقەتێکیان فێری خەڵک دەکرد، بڵاوبووەوە. تەنێ ئەو کەسانە دەگەیشتنە من، کە تەریقەتەکەم لە دڵیان چەکەرەی کردبوو، ئارەزوویان بوو هەر لەمن زانست وەربگرن. کاتێک دەستەبەتاڵ دەبووم دەچوومە (خانەی حیکمەت)، هەموو شتێکی گرانبەها و سەنگینم دەست دەکەوت، کتێبی عەرەبی و فارسی و، یۆنانی و، سریانی و هیندی، بە ڕێکوپێکی پۆلێن کرابوون. ئەگەر زمانی کتێبەکەم نەزانیبا، دەمبردە بەشی وەرگێڕان، پاش چەند مانگێک کتێبەکەم بە زمانی خۆم وەردەگرتەوە، مەگەر خۆم حەزم کردبا پاداشتێک بدەمە وەرگێڕەکان، دەنا بێبەرانبەر بۆیان دەکردم.
لەوەتەی هاتووینە بەغدا، سوودکین لە خزمەتکردنی من و بەدر درێغی نەکردووە. کاتێک سودکین بووە هاوەڵی ڕێگە و سەفەرمان،

هیچ تێشـــوو و پارەوپوولێکی پێ نەبوو، ئێســـتە خەجاڵەتباری ئەو وەختەیە، مەگەر بە کارکردن و خزمەتکردن، دەنا هیچ شـــتێک ئەو شـــەرمەزارییەی ناڕەوێنێتەوە. ئەو هەموو ڕۆژێک بەبێ پســـانەوە شیوی بۆ لێدەناین، تەنانەت ڕۆژێک پێم گوت واز لەو کارە بێنە با لە فـەزیلـەتی برســـیبوون بێبەش نـەبین. گاهێک کونێکی لـە جلـەکانم دەبینی، یان نەعلەکەمی بە دڕاوی دەدیت، خێرا دەســتوبرد شـــەوانە پنوی دەکردن، تاکوو بەیانی بە باشترین شێوە بیانپۆشم. هەرکە پێم بۆ ئیســـــڕاحەت درێژ دەکرد، دەهات بۆی دەشـــێلام. کە دەچوومە گەرماو، لە دەرگە دەوەســـتا، شـــانە و ئاوی دەســـتنوێژی بۆ دێنام. ئـەگـەر نینۆکم هـاتبـان دەهـات بۆی دەکردم و ڕێکی دەکردن. وێڕای ئـەمانـەیش، عـەودالْ و تـامەزرۆی زانســـــت و زانیاری بوو. دەهاتە مـەجلیســـــی وانـەگوتنـەوە و کتێبی دەخوێندنـەوە و مـەتنی ئـەزبـەر دەکردن، سـەرباری ئەمانەیش، کار و خزمەتکردنیشی بە ملەوە بوو. بەدر وابەستەی بوو، مەگین چۆن، دەنا لە یەکتر جوێ نەدەبوونەوە. ڕۆژێک نامەیەکم لە خوشـکەکەم (ئوم ســـەعد) بەدەســـت گەیشـــت، حـاجییـەکی عێراقی، لـە حـاجییـەکی مـەغریبی وەرگرتبوو. بـەدەم خوێندنـەوەی، ئـەســـــرین بـە چاوەکانمدا هـاتـە خوارەوە، بە خـەتی مەغریبی نووسـرابوو، چەند سـاڵێک دەبوو دەســخەتی لەم شـێوەم نـەخوێندبووەوە. گـەیشـــتمـە ئـەو جێگـەیەی کوڕە کۆچکردووەکەی دەلاوێنێتـەوە، یەکبەخۆم گریام، لە حاڵێکدا ئەو منداڵەم نەدیوە، بەڵام وا هـەســـــتم کرد ئـەو لـەیـەک کاتدا کوڕەکەی دەلاوێنێتەوە و منیش لۆمـەباران دەکات. نـامـەکـەم ســـــووچێک دانا، حوبرەکەی وشـــک بووبووەوە، پێ دەچوو چەند مانگێکی خایاندبێ، تا گەیوەتە دەســـتی من. هەســـــتام و ڕۆیشـــــتم، نەمزانی بۆ کوێ دەچم. داخڵی (دەربی سلێمان) بووم، کە بە ماڵە قازی و، بازرگان و، خودانکۆشک، دەورە درابوو. لە کۆتا وێســـــتگەی ڕووبارەکە دانیشـــــتم، بە ڕەنگێک هیچ ماڵێکم لێ دیارنەبوو. نەختێک گریام، دواتر هەستام و ئەو ناوەم جێ

هێشت، گەیشتمە گوندێک، خانووە قوڕینەکانی بەسەریەکدا ویران و خشـــتوور بووبوون، هـەر دەڵێی دوای مـەرگی خـاوەنـەکـانیـان، خانووەکانیش تـەپکبووبوون و هیچ کـەس شـــینی بۆ نـەگێڕابوون! شـوورەی شـارم بڕی و لە دەوروبەری ڕێم کرد. گەیشـتمە کۆزی ئاژەڵەگەڕەکان، کە لە دەرەوەی مەرزەکانی شـار، بەند کرابوون. بۆ لایان چووم و لێیان نزیک بوومەوە. لە چاوی خەمگین و داچۆڕاوی وشـــترەکان ڕامام، لەدەســـت ئازارەکانیان ســـکاڵایان دەکرد و نـەشـــیـانـدەتوانی لــە خۆیـانی لابـدەن. گیراوەی قـاریـان بۆ چارەســەرکردنی گەڕبوونی پێسـتیان بەکارهێنابوو، تێکەڵ بەخوێنی کێم دەرکردوویـان بووبوو. دەســــتم بۆ درێژکردن، بـەکـاوەخۆ هاتنەپێش و بە ناهومێدی بۆنیان کرد. لە شــوورەکە کونێکم دیتەوە، پێیدا چوومـە ژوورەوە، هێندێک لـە ئاژەڵەکان ڕەوینەوە، لەلایەکەی تری کۆزەکە لێک خڕبوونەوە. دانیشـــتم، ماوەیەکی زۆر بەبێدەنگی لەگەڵ ئاژەڵەکان نیگامان گۆڕییەوە، تا لەکۆتاییدا هەستم بە شەکەتی کرد، پێچەم هێنایە خوار و لەبن سەرم ناو و لێی خەوتم.

## ٧١

**"کەسێك هەوا و ئارەزووی خۆی نەخاتە ژێرپێ، بە ڕەزامەندیی خوا ناگات"**

**ئیبن عەرەبی**

بەیانی بووەوە، بەزیهن و سـەلیقەیەکی خۆشـەوە لە خەو ڕابووم. ئاژەڵەکان لە شوێنی خۆیان جوڵابوون، سەرباری نەخۆشییەکەیان، گوردێکیان هاتبووە بەر، هەر دەڵێی کازیوەی بەیان، بە شـێوەیەکی کاتی، دەستی چاکبوونەوەی بۆ درێژکردبوون. پێچەم خستەوە سەر و هەستام، دەرگەی کۆزم کردەوە و بەهێمنی بەرەو شار بوومەوە، هەسـتم دەکرد باری ڕووحم سـووک بووە و پشـێویی نێو دڵم هێوربووەتەوە. بە خەیاڵ دێڕەکانی ئەو نامەیەم ڕێکدەخسـتن، کە دەبوو بۆ وەڵامی خوشـکەکەم بیاننووسـم. بەهەرحاڵ، نوێژی عەسری هەمان ڕۆژ، نامەکەم نووسی. چەند هەفتەیەک ئەو نامەیەم لا مایەوە، دواتر تەسـلیمی کەسـێکم کرد بەرەو میسـر دەچوو، نەشمدەزانی چەندی پێ دەچێت. لەوانەیە دوای ساڵێک، ڕەنگە ساڵێک کەمتر، لەوانەیە هەر نەشـگات. دەسـتم بە دەرس و دەوری خۆم کردەوە، وەکوو جاران بەرەو ماڵ بوومەوە و سەرم بەسەر کتێباندا گرتەوە. حاڵەتی سـەرسـوڕمان و مەسـتبوونم نەما. باری دڵم ئاسـایی بووەوە، جوانی و بەرهەوەسـتی بەغدا، لەبەرچاوانم

کاڵبوویەوە. ئیتر چوونە بازاڕ و، دەوروووبار و، نێو بێســـتانم نەما. گەڕامەوە سەر هەمان ئەو کارەی، کە بەدرێژایی تەمەنم، خووم پێوە گرتووە. هەموو ڕۆژێک لە ماڵەوە دەچمە مزگەوت، بە هەمان ڕێگەیشدا دەگەڕێمەوە. شەوان لە ژوورەکەم دوو قەندیل پێ دەکەم، هەرچی لە کاتی وانەگوتنەوە لە پرسیاری فەقێکان بە خەیاڵمدا دێت، دەینووسـمەوە. ئەوەی بەکراوەیش نووسـیومە وازی لێ دێنم، خودا بەرەکەتی تێ دەخات: وشەیەک دەبێتە دوو وشە، دێڕێک دەبێتە دوو دێڕ، ناتوانم جارێکی دیکە بگەڕێمەوە ســـەری و ڕەخنە لە هیچی بگرم. ئەوەی ئاســـمان دایباریێنێ و بە چاکی بزانێت، زەوی ناتوانێت ڕەتی بکاتەوە. ئەوە چەند مانگێکە هەست بەتەنیایی دەکەم. دڵەڕاوکێ بەنێو دەمارەکانمدا دێ و دەچێ و گژوگیای دڕکاویشـــی لە دڵمدا چاندووە. کاتێک دەرگەی ژوورەکەم دادەخەم، تەما بۆ کەســـێک دەخوازم تەنیاییم بڕەوێنێتەوە و دڵنەواییم بکات. هەڵبەت بەدر و ســـودکین لە ژوورەکەی دیکە دەخەون، هێندێک جار گوێم لە قســەکانیانە. ئەوەی پێشـتر بەدر لە منەوە فێربووە، ئێسـتە فێری سودکینی دەکات، سودکینیش هەرچییەک لەبارەی منەوە، بە خەیاڵیدا دێت، بە بەدری دەڵێت. منێک، کە ئێسـتە بەدر و سـودکین زانسـت و مەعریفەم دەسـتاودەست دەکەن و بە یەکتری دەڵێنەوە، ئێستە لەنێو ژوورەکەم هەڵکورماوم و دۆشـداماوم، نە خەوم لێ دەکەوێت و نە دەشـزانم چی بنووسـم. بێخەوی، بێتاقەت و بێزارم دەکات، دەچمە ژوورەکەی وان، تا ڕاشـکانی شـەو، خەریکی زیکر و قسـەکردن دەبین. خۆم وا دەردەخەم کە خەوم دێت، بێنم بە پرخەپرخی بەدر دێت، کە هەتا بە ساڵدا دەچێت، بە پرخەپرختر دەبێت. شـەوێک بەر لە خەوتن، سـەرنجی باسـکەکانی خۆم دا، لە لاوازی و بێگۆشـتیدا وەک دوو لکی درەختێکی وشـکیان لێ هاتبوو. تێبینی ئەوەم کرد سـەرم کەچەڵ بووە، پێسـت لەژێر گەرووم خڕبووەتەوە، ژمارە پەنجا، بەخێرایی لێم نزیک دەبێتەوە. ڕۆژێک لەوان ڕۆژان، لە

مزگەوت خەریکی وانەگوتنەوە بووم، دەنگەدەنگێکی زۆر پەیدابوو، فەقێ بەرەو دەرەوە خۆیان هەڵکوتا، زانیم ئێستە هیچم پێ دەگەڵ ناکرێن، ناچار دەرسم ڕاگرت و هەموو هاتینە دەرەوە. دەهۆڵ دەکوترا و فاکوفیک لێ دەدرا، گەلی منداڵان لێرە و لەوێ، جرتوفرتیان بوو، خەڵکێکی زۆر لەبەردەم دووکانەکانیان ڕیزیان بەستبوو. گوێدرێژێک تێپەڕ بوو، پیاوێک بە قوڵفاوقوون[١٣] سواری بووبوو. گوێدرێژەکە دوو زنجیری لەپێ کرابوون، سەری هەریەک لەو زنجیرانە لە دەستی سەربازێکی خەلیفەدا بوو. بە بینینی ئەو دیمەنە دەستم بە (لاحول و ولاقوة) و (أعوذ باللە) کرد. ئەمن چوومەوە ناو مزگەوت و فەقێکانیشم تەماشای (سەنجەر)یان دەکرد، کە پێشتر لە (خوزستان) والی خەلیفە بوو، کەچی ئێستە لە پەلوپۆیان خستەوە و لەپێش چاوی خەڵک ڕیسوای دەکەن. دوای تێپەڕبوونی سەنجەر فەقێکانم هاتنەوە و لە شوێنی خۆیان دانیشتنەوە. بڕیارم دا ئەو دیمەنەی فەقێ بینییان بە هەل بقۆزمەوە و باسی مەکری خودایان بۆ بکەم، کە مرۆڤ با هەر چەند لە ئیمان و، چاکەخوازی و، زانست و، عیرفانیش لە لووتکەدا بێت، ناکرێ قەت لەخۆی دڵنیا بێت.

دواتر (سەنجەر) زیندانی کرا و هیچ دەنگوباسێکی نەما، بەڵام وێنەی ئەو، لە مێشکی من نەسڕایەوە، بەردەوام وا هەستم دەکرد لە شەقامەکانی بەغدا، دەسووڕێنرێتەوە. کاتێک دەچمە نێو جێخەوەکەم، دڵم وەک دڵی ئەسپی مەیدانی پێشبڕکێ و ڕمبازی، دەکەوێتە تەپەتەپ. هێشتا ئەزموونی زیندانیم لە قاهیرە دەمخاتە نێو وەهم و کابووسێکی ناخۆش و خەوی شەوانەم لێ دەکاتە قوزەڵقورت. سوورەتی یووسف دەخوێنم بەو ئومێدەی ئازار و ناڕەحەتیی بیرکەوتنەوەی زیندانم لەسەر سووک بێت، کەچی بەو حاڵەیش بە

---

[١٣]-بەپێچەوانە.

ترسـەوە دەخـەوم. ئـەریّ ئەوە من چ وەلییەکم، هەموو شـەویک دلّەڕاوکیّ دەست لە ئەستۆم وەردیّنیّ، نە ئیمان فریام دەکەویّت و نە سەکینەت بە هانامەوە دیّت؟ ئەگەر فەقیّکانم بزانن من لە چ دلّەڕاوکیّ و نیگـەرانییـەکدا ژیـان بـەسـەر دەبـەم، لە دەورم پەرتوبلاّو دەبن، ئـەمنیش بـە ویّنەی بەهلوولەکان، بەنیّو کوچە و گەڕەکەکانی بەغدادا دەسـوورِیّمەوە. نازانم کەی بوو لە شـاریّکی نویّدا نیشـتـەجیّ بووم، ئەریّ هانا ببەمە بەر میر و سـەرانی ئەو شـارە بۆ ئەوەی ئەگەر لەگەلّ خەلّک تیّکگیرام، پشـتیان پیّ ببەسـتم و دەسـتبارم بۆ بگرن؟ یان ڕوو لە خەلّکی ڕەشـۆکی مزگەوت و خانەقاکان بکەم بۆ ئەوەی ئەگەر سـولّتانەکان لیّم دەرِق ڕاچوون بە هانامەوە بیّن؟ ئیمانەکەم داوام لیّ دەکات تەنیا پشـت بە خوا ببەسـتم، بەلاّم کارەکە هیّندەیش ئاسان نییە، تەنانەت بۆ ئەولیاکانیش سەخت و دژوارە. وەختیّک خوا نیعمەتی خۆیم بەسـەردا دەرِیّژیّت، لە مەکری دەترسـم، کاتیّکیش تـاقیم دەکاتـەوە، لـە توورِەبوونی پەروام هەیە. خوایە ئەمە چ حالّیّکە تیّی کەوتووم! هیّندیّک جار خەون بەوە دەبینم خۆم گۆشەگیر بکەم، نـە کـەس بمبینیّت، نە کەس ببینم. جاروبار خەیالّی ئەوە دەکەم پەلە لـە بلاّوبوونـەوەی عیرفان و زانسـتەکەم بکەم، پیّش ئەوەی پیری پـەکم بخـات و کـەلّکی هیچم پیّوە نـەمیّنیّت. بریـارم دا لـە مـالّـەوە خەریکی نووسـین بم، بۆ نویّژ نەبیّت، بۆ هیچ شـتیّکی دیکە نەچمە مزگەوت... کاتیّک نیوەڕۆ دادیّت ئەو ترسـنۆکی و بیّورەییەی خۆم سـەرکۆنـە دەکـەم، لـەبارەی مورید و فـەقیّکانم خـەجالّەتبار دەبم، دەترسـم زانسـتی حەپسـکراوی سـینەم لەنیّو گۆڕدا سـزام بدات، هەربۆیە لەژیّر ئازاری ویژداندا دەڕۆمە لایان.

## ٧٢

**"خورپەی چاوەڕوانکراو، بۆ پشتپێبەستن ناشێت"**
**ئیبن عەرەبی**

بەو حاڵە شپرزەوە، کە بەسەرمەوە هەڵکشان و داکشانی دەکرد، ساڵی سێیەمم لە بەغدا بەسەر برد. ڕۆژێک تووشی شۆکێکی گەورە بووم، قەت شتی وام بە خەیاڵدا نەدەهات. پاکی بۆ ئەو خوایەی دۆخەکان دەگۆڕێت و هیچ دۆخێکیش ئەو ناگۆڕن. ڕۆژێک بەدر وەژوور کەوت و دەرسی پێ بڕیم، هەرگیز شتی وام لە بەدر نەدیبوو. دامێنی جلەکانی گرتبوو، مەجلیسی فەقێیانی بڕی و بەرەو لای من هات. فەقێ ڕێگەیان بۆ چۆل کرد، بە لارەلار و خوارەخوار، کە خەریک بوو بەربێتەوە، گەیشتە مەقامی من و سەری لەبن گوێچکەم نا و بە چپەوە شتێکی پێ گوتم گیانم کەوتە لەرزە، دڵم شقارشقار بوو. لەیەک کاتدا بۆ من، هەم سەرسووڕمان و هەم کۆست بوو... لە هەموو حاڵ و بارێکدا هەر ستایشی خوا دەکەین، ئەوسا گوتی:

- لە مزگەوتی شێخ، جەنازەیەکیان هێنایە دەر.

سەیری چاوەکانیم کرد، زانیم تازە کار لەکاران ترازاوە، ڕووداوێکی هەژەندە ڕوویداوە. ڕووم لە فەقێیان وەرگێڕا و داوام لە خوا کرد

لوتف و مـەرحـەمـەتم لەگەڵم بنوێنێت. لەنێو دەنگەدەنگ و گوتەگۆتی فەقێیان بەدر توووند قۆڵی گرتم و گوتی:
- شێخ زاهیری ئەسفەهانی...
- ئەوە چیت گوت؟
- بەڵێ. جەنازەی شـــێخ زاهیری ئەســـفەهانی بوو، کەمێک بەر لە ئێستە لە مزگەوتی شێخ هێنایانە دەرەوە.
- تۆ لەوە دڵنیایت، یان ناوەکانت لێ تێکەڵ بوون؟
- بەڵێ دڵنیام، لەســـەر ڕوویم هەڵدایەوە و تەماشـــام کرد. گەورەم خودا سەبووریت بدات.
بەدر جلەکانی ڕاکێشـــام بۆ وەی بەخێرایی بڕۆم، بەڵام ســـوودی نەبوو. سودکینیش خۆی گەیاندەوە مە و بە لۆقەلۆق ڕێگەمان بڕی. پێچەکەم فڕی، بە دەســتێک دەمخســتەوە ســەرم و بە دەســتێکیش داوێنی جلەکانم گرتبوو. تک تک ئەســـرینم دەباراندن و باش بەرەو شــوێنێکی دووری دەبردن. قوربان! جەنابی شــێخ زاهیر، لە کەیەوە هـاتوویتە بەغدا؟ چەندێکە لێرە لەگەڵ مندا ژیان بەســـەر دەبەیت و منیش نەمدیوی؟ بۆچی موکاشـــەفەی خوا پشـــتی تێ کردووم؟ تا نەزانم کێ لەگەڵمدا شـارنشـینە و کێ لێرە سـەر دەنێتەوە؟ دەبێ چ گوناهێکم کردبێت تا بە ژوانی شـــێخەکانم نەگەم، هەر وەک خەڵکی عـەوام لـەگـەڵ جەنازەیان دەڕۆم، نە تەوێڵی بڵندیان ماچ دەکەم و نە جەستەی پاکیان دەشۆم؟
گەیشـتینە گۆڕسـتان، بینیم خەڵک لە دەوری دوو گۆڕ کۆبوونەتەوە. بـەرەو گۆڕی یـەکـەم چووین، هەو نەبوو، دواتر بەرەو گۆڕەکەی تر ڕۆیشتین، دیتمان خۆڵ بەسەر کفنەکەیدا دەکەن، بۆ چەند چرکەیەک بـەر لـەوەی بـە خۆڵ بشـــاردرێتەوە، کـەمێک لـە کفنـەکەیم بەرچاو کەوت. من و بەدر و ســـودکین لەتەک گۆڕەکەی، نوێژمان لەســـەر کرد، چۆن بۆ باوک و مامم گریام، وایش بۆ ئەو شـــینم گێڕا. خەڵک لـەســـەر گۆڕەکەی بڵاوەیان کرد، داوام لە هەردوو هاوەڵەکەم کرد بڕۆن، بە نیگەرانییەوە جێیان هێشـــتم. مێشـــکی خۆم هەڵگوشـــی،

هەموو ئەو فەرمووداتەی لەو ڕیوایەتم کردبوون، بەسەر گۆڕەکەیدا خوێندنمەوە. ژیننامەی فەرموودەناسان و هەرچییەک لەو فێربووبووم، هێنامەوە یادی خۆم و گوتنمەوە. هەروەها بۆچوونی زانا و مەزهەبی فەقیهەکان، کە ئەو لای پەسند بوون، فەتواکانی، هەموویم گێڕانەوە. لەوەی گوتم خودا ئیلهامبەخشی کردم، ئەوەی پێشتر بە ڕووی جوان و بزەی خۆشنوودی بۆ گێڕابوومەوە، بەسەر گۆڕە بێدەنگ و خامۆشەکەیەوە، گێڕامەوە. هەموو ئەوەی تەمام وابوو لای خوا شەفاعەتی بۆ بکەن، بۆم جێ هێشت، تاکوو خۆر هەڵنەهات، ئەویم جێ نەهێشت.

شێخ زاهیر ئەوشەو لەژێر خاکوخۆڵی بەغدا بەسەر دەبات، ئەی دەبێ خاتوو نیزام لەکوێ بێت؟ بەتەنیا چوومەوە ئەو مزگەوتەی، کە جەنازەی شێخ زاهیریان لێ بەڕێ کرد، بە هەر کەسێک گەیشتم پرسیارم لەماڵی شێخ زاهیر کرد، کەسی پێنجەم، ماڵەکەی نیشان دام. بەبێ وەستان و پشوودان ڕۆیشتم، ئاواتی دیدەنیی نیزامم دەخواست، وەها عەوداڵی دیداری بووم، بۆم وەسف ناکرێ. لەگەڵ ئەوەیشدا دەترسم بە بینینی ئەو، بکەومە لەرزە و لێوەلەرێ، بەڵام زۆر ڕوونە تامەزرۆییم بەسەر ترسمدا زاڵبووە و پرزەی لێ بڕیوە. ئێستە من لەبەر دەرگەی ماڵیان وەستاوم. دوو منداڵ لەبەردەم ماڵیاندا خەریکی یارییین، خەریکە دڵم بەربێتەوە و شەق شەق بێت. خوایە ئەوانە دەبێ کوڕی خاتوو نیزام بن؟ نیزام، هۆ خۆری درەوشاوە، لە کۆتاییدا خۆت لەپشت ئەستێرەیەکی دیکەی غەیری مندا، ون کرد؟ بە پیاوێکی دیکە ڕازی بوویت؟ باوکت زۆری لێ کردیت، یان بە خۆشیی خۆت وات کردووە؟ ئەمن لە سەرەتای ڕێگەوە وەستاوم و قاچەکانم بەئاستەم منیان پێ هەڵدەگیرێت. هەنگاوێک دەچمە پێش و هەنگاوێک دەگەڕێمەوە، لە حاڵێکدا چاوم لەسەر ئەو دوو منداڵە ئەبلەق ماون، دڵیشم تاوێک بۆ پێشەوە دنەم دەدا تا نیزام ببینم، گاوێکیش بەرەو دواوە دەمگێڕێتەوە تاکوو خۆی لە هەواڵێکی تاڵ و خەمهێن بپارێزت، کە پاشماوەی هیواکانم

تەفروتوونا دەکات. لە کۆتاییدا بڕیام دا لە دەرگە بدەم، ئەوجا هەرچی دەبێت با ببێت. بەرەو پێشـــەوە چووم، کاتێک منداڵەکان زانیان لە دەرگە دەدەم یارییەکەیان ڕاگرت، خۆم لە تەماشـــاکردنی ڕوویان بە دوورگرت، ئاخر ترسـی ئەوەم هەبوو یەکێکیان شـێوەی نیزام بکات و خەم و خەفەتم زیاتر بێت. کەڕەتی یەکەم هیچ وەڵامێک نەبوو، دیسـان لە دەرگەم دایەوە، دەسـتم دەلەرزی و هەناسـەبڕکێم گرتبوو. دواتر منداڵەکان دەرگەیان کردەوە و چوونە ژوورەوە، بۆ ئەوەی هـەواڵی لـە دەرگـەدان بـە ئـەهلی ژوورەوە ڕابگـەیـەنن، دەرگەیشـــیان بەکراوەیی هێشـــتەوە. لەپشـــت دەرگە منداڵێکی دیکە بەسـەر لەپانەوە دەرۆیشت. ئەی خوایە ئەمە چییە! دەبێ نیزام چەند منداڵی بووبێت! منداڵەکە لە بزاو کەوت و بە چاوە گەشـــەکانی تەماشای کردم. ئەو، چاوی دەمن بڕین و ئەمنیش لەو ڕامام. لیکاوی دەمی گەیشـتە سـەر ئەرز و چاوی لە من هەڵنەگرتن. زەردەیەکم بۆ کرد و گـەڕاوە دواوە. خۆم داهێنـایـەوە و لێی نزیـک بوومـەوە بـە خۆخشکێ ڕۆیشت و چووە ژوورەوە. زۆر خەفەتم بەوە خوارد. لە دۆخی ئومێدەواریدا، جاری وا هەیە جەفا لە منداڵێکەوە دێت، کە لە دڵـەوە زۆر پێی ئـاشـــنـا نیت، کەچی هـەر دەڵێی چارەنووســـی هەمیشەیی تۆی هەڵگرتووە.

بۆ جاری سـێیەم، زۆر بەتووندی لە دەرگەم دا، سـڵاوم کرد بەڵکە کەسێک گوێی لێم بێت. لە کۆتاییدا گوێم لە دوو ژن بوو لەگەڵ یەک قسـەیان دەکرد، قسـەکانیان زۆر ڕوون نەبوون، لەو سـەینوبەینەدا یـەک لـەو دوو منداڵە هات و بە هەموو هێزی خۆی، دەرگەی پێوەدا و دەنگی ژنەکانیش خەفە بوو و نەما. جاری سـێیەمیش لە دەرگەم دا، ئـەگەرچی مافی ئەوەم نەبوو. بە ســەرگەردانی و دڵپەشـێوی لە بەر دەرگە دانیشتم، نەمزانی چی بکەم. لەو ماڵە ژن و منداڵ هەن، ئـەوە هیچ گومـانێکی تێدا نییە، بەڵام ئاخۆ دەبێ نیزام لەپشـــت ئەو دیوارەوە بێت، کە من پاڵم پێ داوە؟

## ٧٣

**"دنیا تەنێ مەنزڵگەی عاشق و مەعشووقانە"**

**ئیبن عەرەبی**

نزیکەی یەک سەعات لە شوێنی خۆمدا هەڵکورمام، نە سەرم بەرز کردەوە و نە جووڵە و بزاوێکیشم کرد. پاشان خوا فەرمانی دا و دەرگە کرایەوە، پیرەژنێکی لەڕ و کورتیلە هاتە دەرەوە، ڕووی بە چارشێوێکی کۆن و کونکون داپۆشی بوو. دوای خۆی، دەرگەی داخستەوە و ڕۆیشت، منیش دوای کەوتم:

- پووری سەلاموعەلەیەک.

- تۆ کێیت؟

- ئەمن موحییەدینی ئیبن عەرەبیم.

- ئێ چیت دەوێت؟

- دەمەوێت بپرسم ئەو خانووەی تۆ لێی هاتیە دەر هیی شێخ زاهیری ڕەحمەتییە؟

پیرەژن بە حەسرەتێکەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، بەر لەوەی وەڵامم بداتەوە، تێگەیشتم خانووی ئەوە:

- بەڵێ خانووی ئەوە.

- ئەی نیزامی کچیشی لێرەیە؟

- نەخێر کوڕەکەم، دیارە نیزام دەناسی؟

- شێخ زاهیر و فەخری نیسا لە شاری مەککە مامۆستای من بوون.
- ڕۆڵە! خوا لێیان خۆش بێت.

تووشـــی هـەواڵێکی دیکـەی کتوپڕ بووم، تـا ئـەو کـاتـەی ئـەو ژنـە خـەبـەری مـەرگی پێ نـەدام، بیرم لە چارەنووســـی فەخری نیســـا نـەکردبووەوە. فرمێســـکێک لە چاوم هات، نەمزانی لە خەمی ئەوان بوو، یـان بۆ داخی حـاڵی خۆم بوو. پیرەژن دەســـتی درێژکرد و فرمێسکەکەی سڕیمەوە، بەم ڕەفتارەی سەرسامی کردم، دواتر تک تک ئەســـرین لە چاوەکانم هاتنە خوارەوە. دانیشـــتم و زۆر بەتاو دەستم بە گریان کرد:

- ڕۆڵە خوا چەپاڵەت بدا. بەسە، بەسە!

تا تێر نەگریام، هیچ شـــتێکم بە پیرەژن نەگوت، لە حاڵێکدا بەســـەر سـەرمەوە وەستابوو. لاحەولە و وەلا قوەتەی دەکرد و نزای لەسەر دەخوێندم. بۆ دواجار ئەســـرینەکانمی ســـڕین و هەســـتامەوە و بە ئومێدێکەوە تەماشام کرد و گوتم:

- خاتوو نیزام لە کوێیە؟
- ڕۆڵـە! نیزام لـەوەتـەی هـاتووەتـە بـەغـدا، لـە خـەڵوەتگـەی ژنـانی خەڵوەتکێش و زاهیدەکان دەمێنێتەوە. هەناســـەیەکی خۆشـــبەختیم هەڵکێشـــا. ئەو دەســـتەی بەهێزەوە دڵی منی دەگوشـــی، شـــل بوو. پیرەژن پێی گوتم ئەو پووری نیزامە، کاتێک زاهیر نەخۆش بوو و لە جووڵە کەوت، زاهیر هێنامیەوە لای خۆی. سـوپاسـی پوورێم کرد و ڕۆیشتم. دڵەکوتێم هێور بووەوە و هەناسـەم ئاسایی بووەوە. مادەم نیزام لە خەڵوەتگەی زاهیدانە، دیارە شـــووی نەکردووە. ڕوونە تەنیا ژنە خواناس و زاهیدەکان، ئەوانەی خۆیان نەزری خواپەرســـتی و بـەخێوکردنی هـەتیوان کردووە، لـە خـەڵوەتگـە دەمێننـەوە. ڕێگـەی (حیللە)م گرتەبەر، پرســـیارم لە خەڵوەتگەی ژنان کرد، تەنیا یەکێکم دۆزییەوە. لە بەر دەرگە وەســـتام، کاتێک فەرمانم بە دەســـتم کرد بەرز بێتەوە و لە دەرگە بدات، گوێڕایەڵیی نەکردم. دڵم تەسلیمی خوا

کرد و تەوەکولم پێ بەســت، بەشــکەم بیخاتە ســەر ئەو بارەی، کە خۆی لێی ڕازییە. لە دەرگەم دا ڕاســــتەوخۆ کرایەوە، بەڵام حەیفێ کەس دەرنەکەوت:

- سـەلاموعەلەیکم، سۆراخی نیزامی کچی شێخ زاهیری ئەسفەهانی دەکەم.

دەرگـە زیـاتر کرایـەوە، تومـەز نیزام خۆی بوو دەرگـەی دەکردەوە، هەر دەڵێی بۆ لە دەرگەدانی من، خۆی مەلاس دابوو. تەماشای ڕووم کرد، دەوری بە چارشێوێکی ڕەش داپۆشـی بوو، پێسـتی ڕووی، لە جاران سـپیتر بووبوو. ئەویش تەماشایەکی کردم، ساڵانی شەوق و، ئەوین و، ترس و، خۆشـــەویســـتییم لە ڕوودا خوێندنەوە. بۆ چەند ســــاتێک نیگاگەلێکی گـەرم و شـــۆکمـان لـەگەڵ یـەک گۆڕینەوە، خەندەیەکی بۆ کردم، منیش گوتم:

–نیزام!

- بەخێر بێیت کاکەی ڕێبوار.

- سڵاو لە تۆیش.

گاوێک بێدەنگ بووم، هەستم کرد قسەگەلێکی زۆر لەنێو خەیاڵدانمدا بۆ هاتنە دەر، پاڵپاڵێ و هەڵپەهەڵپیانە، ئەمنیش دەرگەیان لێ دادەخەم و ناتوانم هیچ بڵێم. لە کۆتاییدا ڕســتەیەکی کەمســەنگ و پووتەڵە لە دەمم هات دەر:

- تا پوورت پێی نەگوتم، نەمدەزانی فەخری نیسا مردووە.

- کەواتە پاساوت بەدەستەوەیە.

- خودا سەبووریتان بدات و لای باری تەعالا پاداشتان زۆر بکات.

- بۆ ئێمە و ئێوەیش.

من لە دەرەوە لە بەر دەرگە و نیزامیش لەدیوی ژوورەوە وەستاوە. لـەنێوان خۆشــــەویســــتیی من و نیزامـدا بـەردەوام دەرگـە و بـەر دەرگـەیـەک هەبووە و هەیە. دەرگەی ماڵی فەخری نیســـا، دەرگەی ماڵی نیزام لە مەککە... ئێســـتەیش دەرگەی خەڵوەتگەی ژنانی بەغدا.

دەرگەیلێک بۆ چوونە ژوورەوەم کرانەوە، بۆ هاتنە دەرەوەیشم بەکراوەیی مانەوە. دەرگەگەلێکی باش و خراپ، سەخی و بەخیل... بەڵام هەموو پێوەندییەکی ئێمەیان ڕاڤە کرد. خۆشەویستییەکەمان دەرگەدار بوو. کاتێک دەکرانەوە مانای وانەبوو دەچییە ژوورەوە، کە دەچوویە ژوورەوە، واتای وانەبوو لەوێ دەمێنییەوە، کاتێکیش لێیان دەهاتییە دەرەوە، مانای وا نەبوو جارێکی دی دەگەڕێیتەوە.

هەستم بەوە کرد ماوەیەکی زۆرە بەبێ قسەکردن وەستاوم، هەرچی ئازایەتی و بوێرییەک هەبوو لە خۆمدا کۆم کردەوە و گوتم:

- گوێ بگرە نیزام...

نیزام بە شەرمەوە سەری خۆی بەسەر دەرگەدا هێنا و بزەیەکی کرد و گوتی:

- بلێ موحی...

- خۆت دەزانی دڵی من چ خۆشەویستییەکی تۆی تێدایە.

بزەیەکی فراوانتری کرد و بە دەنگێکی هێمن وەک ئەوەی منداڵێکی شیرەخۆرە ژێر بکاتەوە، گوتی:

- بەڵێ، ئەوە دەزانم و لەبیریشی ناکەم.

- دەشزانم دڵی تۆ چ خۆشەویستییەکی زۆری منی تێدایە.

- بڕێکت زانیوە، خۆ ئەگەر هەمووت زانیبا، باوەڕت نەدەکرد.

کاتێک ئەوەم لە دەمی ئەو بیست، ئاوی دیجلە هەمووی کۆبووەوە و ڕژایە نێو دەمارەکانم. ڕاستەوخۆ، بەبێ ئەوەی هەست بە دەنگی بەرزم بکەم، گوتم:

- لە کاتێکدا خۆشەویستیی خۆم بۆت بەیان کرد و بەڵێنم پێداوی، بۆچی دەست بە ڕوومەوە دەنێی و لێم تەوەللا دەبیت؟

نیزام سەری خۆی لە دەرگە دوورخستەوە و قیتبوویەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پاشان بزەی دڵنیایی کەوتەوە سەر لێوە گوڵئاساکانی و گوتی:

- موحی بە چ ئەندازەیەک خۆشت دەوێم؟

- سوێند بەخوا، لە هەموو ئەو کەسانەی خۆر بەسەریان هەڵدێت و ئاوا دەبێت، خۆشترم دەوێیت.
- دەی منیش ســـوێند بە خوا، لە هەموو ئەو کەســـانە خۆشـــترم دەوێیت، کە هەیڤ بەسەریانەوە هەڵدێت و ئاوا دەبێت.
دەسـتی خۆی هێنا، خەڵکیش بە ڕێگەدا جرتوفرتیان بوو، دەسـتی بە شـانمدا هێنا. پاشـان نەختێک لە بزە کەوت و چاوی لە دەستی خۆی بڕی، کە بەرەو گەردەنم دەهات:
- ئاخر خۆشەویستەکەم ناتوانم شووت پێ بکەم.
- بۆچی؟
- چونکە من مێخی سێیەمی تۆم...
- ..........
- خۆشەویستەکەم! مێخەکان هاوسەرگیری لەگەڵ زەویدا دەکەن.
ئاوی ڕووباری دیجلە زووبەزوو لەنێو دەمارەکانم هەڵکشـــایەوە و زۆر بەخێرایی وشـکایی داهات، وەک ئەوەی لەناو دەسـمەنجەڵێکی گەورە بکوڵێت و ببێتە هەڵم. وەک بتێک وەســـتام و هیچ بزاوێکم دەبەردا نەما. بە دوو چاوی زەق و ئەبلەق، کە مژدەیەکی وەها خۆشـــیان، تێدا بوو، بە خوڵەمێش تەماشـــای ڕووی نیزامم کرد. بە لەپی دەستی ئەسرینەکانی سڕیم و پەنجەکانی لەنێو ڕیشم وەردا و گوتی:
- مێخی چوارەم و کۆتاییشـــت لە (مەلەتیە)یە و بە پیلیەوە بڕۆ، دڵت دامەزرا و نەلەخشاو دەکات.

# ٧٤

**دەستنووسێك لە دیمەشقەوە**
**١٢٩٠ک/١٨٧٣ز**

بەڵێنم دابوو لە دەروازەی (ریبات) چاوەڕێی بکەم، ئاخر بەر لە حەفتاوسێ ڕۆژ، لەوێ بەڕێم کرد. وەک ڕکاتی نوێژەکانم و دەنکۆڵەی تەسبێحەکەم، ڕۆژەکان دەژمێرم. هەوساری ولاخ و پریاسکەی پارەم دایە دەست و بەڕێم کرد. ڕاستییەکەی ئەمن لەو پتر حەوجەی ڕۆیشتن بووم، هەینێ پێم گوت:
- وای چەند بەخیلیت پێ دەبەم، کە چاوەکانی تۆ بەر لە چاوەکانی من، بە نووسینەکانی ئیبن عەرەبی ڕوون دەبنەوە.
- جەنابی ئەمیر، دوو مانگی پێ ناچێت من دەگەڕێمەوە خزمەتت.
هەر لەو ڕۆژەوە، من لەسەر کورسییەک دادەنیشم، کە هەموو (ریبات)م لێ دیارە. هەرکە پشتم وەژان دەکەوێت، دوو ڕۆژ جارێک نویندەرەکەی ژێرە خۆم بە نویندەرێکی دیکە ئاڵوگۆڕ دەکەم. هەر زوو فەقێکان مەقامم دەدۆزنەوە و لە دەورم خڕ دەبنەوە. سەرلەبەیانیان چەند فەقێیەک دێن لە ماڵەوە کتێبەکانی شێخی گەورە ئیبن عەرەبییان بۆ شەرح دەکەم. نیوەڕۆیانیش لە حوجرەی جەقمەقیە قورئان بۆ دەستەیەکی دی ڕاڤە دەکەم. سەرلەئێوارانیش لە ئەشرەفیە، کتێبی سەحیحی بوخاری دەڵێمەوە. فەقێکانی شەویش،

هەرچییەک لەگەڵ باری ڕووحییان بێتەوە دەینووســـنەوە و هەموو هـەفتـەیـەک لـەگـەڵ من دەوری دەکـەنـەوە. ســـەربـاری فـەقێکـانم کەســـانێکی دیکە دێن فەتوایان دەوێت و لەبارەی کاروباری ژیانی خۆیان قســـەم لەگەڵدا دەکەن. هێندێک کەســـی دیکەیش، کە لەگەڵ والیەکەمان (سـوبحی پاشـا) تێکگیراون دێن، دەیانەوێت شـەفاعەتیان بۆ بکەم. بەشێکی دیکەیان بۆ شیفا و بەرەکەت دێن، دەسرازی منداڵ و پەڕۆی نەخۆشـەکانیان لە جلەکانم هەڵدەسوون. جەزائیرییەکانیش هەر لەو ڕۆژەی داخڵی ناو دیمەشـق دەبن، دێنە لای من، تاکوو کار و نیشـــینگەیان بۆ ببینمەوە و وا بکەم لە باجی عوســـمانییەکان چاوپۆشـــییان لێ بکرێت. کارمەندانی شـــارەوانیش دوای نەمانی هاموشۆم بۆ دانیشگە، لێکدالێکدا دێن مۆر لە نووسراوەکانیان بدەم. مەسـیحیەکانیش کە سـێزدە سـاڵ بەر لە نووکە فیتنەیەک بەرۆکی گرتن، ماڵ و حاڵ و کۆلان و کڵێساکانیان وێران کران، کەچی هێشتا قەشەکەیان زۆر بە ڕێکوپێکی هەفتانە دەیاننێرێت گوێ لە دەرسەکەم ڕابگرن. منداڵـەکانیش گوێ بە قەڵەباڵخی و جەنجاڵی گەوران نادەن، لەنێو بەژن و قامەتی گەورەکان خشـــکە دەکەن و خۆیان دەگەیەنە من، ئاخر دەزانن ئەمن زۆر لە گەورەکان خۆشترم دەوێن، ئەگەرچی دەیـان پرســـیاری ســـواو و پواوم لێ دەکـەن، وەک: "کـاک ئەمیر عـەبدولقادر، پاریس چۆن بوو؟ کاک ئەمیر عەبدولقادر، چۆن لەگەڵ فـەرەنســـییەکـان جەنگـایت؟ بـەڕێز ئـەمیر عـەبدولقادر، وەســـفی (بابولعالی)مان بۆ بکە؟." منیش بە گێڕانەوەی حیکایەتەکان، تۆزوتاڵی شـــێســـت ســـاڵ لە زاکیرەم دەتەکێنم، دەمارە وشـــکبووەکانی دڵم دەکەمەوە. کاتێک شـــەویش دادێت، فەقێ (قمقشـــناوی) بۆ ماڵەوە هـاوەڵیم دەکات، زۆرم لێ دەکات، کە لەجیاتی ئەوەی وەک ڕێبواران لە دەورێگە دانیشـــم، بگەڕێمەوە مەجلیســـی ئاســـایی ماڵ و تەکیە و مزگەوتان، منیش پێی دەڵێم:

- ڕۆڵە! با تەنتاوی بگەڕێتەوە.

- جەنابی ئەمیر، ئەگەر ئەو گەڕایەوە، تۆ لە کوێ بیت، دێتە لات.
- کوڕی خۆم ئەمە دەزانم... پشـــتیوان بە خوا، تەنتاوی، بە خۆی کتێبەکانی شـێخی مەزن دەگەڕێتەوە. ڕۆڵە! من شـەرم لە کتێبەکان دەکەم، نەک تەنتاوی!
- پێت چۆنە کەسێک لە دەروازەی شار دابنێین؟
- بەڵێ. ئەوە فیکرەیەکی زۆر جوانە.
- دەتەوێت کێ بۆ ئەو کارە بنێرم؟
- خۆم.
ئەوسـا بە حاڵی پەرێشـانی خۆمدا کەوتم. نوێژی بەیانیانم دەکرد و دەچوومە دەروازەی (بەوابیجیە)، لەوێ قـافڵەکانی ئەنازۆڵ لـە بـاکووری شــــار دەهـاتنە ژوورەوە. لەنێو دووکـانی پینەدۆزان دادەنیشـتم، دەنگی چەکووشـەکانیان تێکەڵ بە دەرسـەکەمان دەبوو. ئەوەی منی بناسیایە، تەقە و تەپەی چەکووشەکەی ڕادەگرت، یان لە دووکانەکەی بێدەنگ دادەنیشـت، یان هەر دایدەخسـت و دەهات لە مەجلیسـەکە دادەنیشـت. هەموو ڕۆژێک یەکێک نەعلەیەکی بە دیاری بۆ دێنام، پاشـان ڕەتم کردنەوە و چیترم قبووڵ نەکردن. دواتر بۆ هەڵگرتنی کتێب، توورەگەیان بە دیاری بۆ دەهێنام، منیش بەسـەر فەقێکانمدا دابەش دەکردن.
شەوێک قمقشناوی پرسیاری لێ کردم:
- بۆچی تەنتاوی نەهاتەوە و دواکەوت؟ خۆ بە پازدە ڕۆژ لە دیمەشقەوە دەگەیە قۆنیا و بە پازدە ڕۆژیش دێیتەوە... با مانگێکیش بۆ نووسـینەوەی کتێب بێت وەک خۆیان گوتیان، دەی ئەگەر بەو حیسابە بێت، دوانزە ڕۆژ لە وادەی خۆی دواکەوتووە.
- نا قمقش نا، سێزدە ڕۆژ و نیوە.
- پێت وایە شتێکی لێ هاتووە؟
- ئەگەر شـتێکی خراپی لێ هاتبایە هەواڵەکەمان پێ دەگەیشـت. بێگومان دواکەوتنی ئەو، پێوەندیی بە نووسـینەوەی کتێبەوە هەیە.

هەر چەند ئەو شەوە بە گەشبینییەوە قسەم بۆ قمقشناوی کرد، بەڵام دوودڵی و گومان خۆیان خزاندبووە سینەم و خشتووریان[١٤] کردم، تا سێ بەشی ڕۆیشت هەر خۆم هەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد. دواتر بۆ شەونوێژ هەستامەوە و لەسەر بەرماڵەکەم لە چاوەڕوانیی نوێژی بەیانی، خەو بردمیەوە. خەونێکم بینی، دەنکە مرواری پڕ بە مشتی دەست، لە ڕێگەی سویقە و ساڵحیە غلۆردەبوونەوە و ئەو ناوەیان ڕووناک دەکردەوە. هەینێ بانگی بەیانی دا و وەخەبەر هاتم و بەپەلە ڕۆیشتم بۆ نوێژ، سوپاسی خوام کرد، کە دواجار تەنتاوی گەیشت. هەر لە نوێژ بوومەوە و دەستلەملانی یەک بووین.

- ڕۆڵە! بۆ دواکەوتیت؟ ئەی نەمگوت (فتوحات المكية) بنووسەوە و ڕێوڕێ بگەڕێوە؟

- بەڵێ ئەمیرم ڕاست دەکەن، بەڵام کتێبێکی دیکەم لەسەر گڵکۆی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی بەرچاوکەوت، نوێژی ئیستیخارەم کرد و بڕیارم دا ئەویش بنووسمەوە. دەشمزانی ئەگەر وام نەکردبا، تۆ چاوپۆشیت لێ نەدەکردم. دەستی بردە نێو توورەگەکەی ملی و کتێبەکەی دەرهێنا. گوتم:

- تەنتاوی، ئەوە بە خەتی تۆ نەنووسراوەتەوە؟

چاوەکانی بریسکانەوە و بەسەر ئەژنۆکانیەوە لەبەردەمم هەڵترووشکا و گوتی:

- بەڵێ جەنابی ئەمیر، ئەوە خەتی من نییە.

- ئەی خەتی کێیە؟

ئەگەرچی بە قسە وەڵامی نەدامەوە، بەڵام بە بزەی فراوانی، جوانتر لە قسە و دوان، وەڵامی دامەوە. لە دێڕەکانی دەستنووسەکە ڕامام تاکوو چاوم پڕ ئاوبوون و دێڕەکانم لێ ون بوون، بە دەنگێکی کز گوتم:

---

[١٤]-وێرانیان کردم.

- بەلام ... ڕۆڵە ئەمەیان چۆن دایە دەستی تۆ؟
- جەنابی ئەمیر، ئەمە ژیننامەی بۆنداری تۆیە. ئەوان ڕازی بوون لەبەری بنووســـمەوە. دوای ئەوەی دوو دانەم لەبەرنووســـینەوە، لەسەر بەرگی هەردووکیان نووسیم: "کتێبخانەی ئەمیر عەبدولقادری کوڕی حوســـێنی جەزائیری. "خادیمی گڵکۆ، ئەمەی خوێندەوە، دوو دانەی لای خۆی هێشتەوە، کە زانی بۆ تۆمە، نووسخە ئەسڵیەکەی دامێ.

هەســـتام و ڕۆیشـــتم، بێ ئەوەی کەســـێک دامنیشـــێنێتەوە و یان هاوکاریم بکات، ڕێوڕاســـت بەرەو کتێبخانەکەم چووم، تەنتاوی بە جلی ســـەفەرەوە لە دوورەوە دوام کەوت. لەنێو کتێبخانەدا بەدوای شـــوێنێکی گونجاودا دەگەڕام بۆئەوەی دەســـتنووســـە نایابەکەی شـێخی مەزنی لێ دابنێم. بەرەو ئەو ســووچە چووم کە دیارییەکانم لێ دانابوون. مەدالیای شـــەرەفی جەوقەی فەڕەنســـی و، ویســـامی هەڵۆی سپی ڕووسـی و، سـەڵیبی پاپا بیوسـی نۆیەم و، نیشـانەی شـکۆی عوسـمانی و، دوو دەمانچەی ئەمریکی و چەکێکی ئینگلیزیم، لەوێ بوون، هەموویم وەلانان. هەروە هەموو ئەو دیارییانەی لە دوای کوژانەوەی فتیلەی فیتنەکە لە کۆگەکە کەڵەکە بووبوون، هێندە زۆر بووبوون، ئەگەر خۆم لام نەدابان، خۆیان وەلادەنا و ئەو کتێبە جێگەیانی دەگرتەوە.

تەنتاوی مەکتەبەکەمی جێ هێشت، منیش لەنێوەڕاستەکەی دانیشتم، بیرم لە ســـووچ و پەنجەرە و ڕێڕەو و کلاوڕۆژنە و ئاوەڕۆکەی دەکردەوە، خەیاڵم بۆ هەر ئەگەرێک دەچوو، کە زیان بەو کتێبە بگەیەنێت. لە کۆتاییدا چاوم کەوتە ســەر ســندووقی وەســیەتنامە و کردمەوە و وەســـیەتەکەی خۆم دەرهێنا کە لە تاراوگەی فەڕەنســـا پێش لە بیست سال نووسیومە، ئێستایش وەک خۆی دەیهێڵمەوە و هیچ پیتێکی لێ ناگۆڕم. کتێبەکەم لەجێگەی ئەو دانا و وەسیەتنامەکەم کردەوە و لە پەراوێزەکەی نووســـیم: "دیمەشـــق، ســـاڵی هەزار و

دووسەتونەوەتی کۆچی پێغەمبەری ئەکەڕەم: عەبدولقادری قەڵەندەر وەسیەت دەکات لەتەک شێخی مەزن، ئاوی حەیاتی عاریفان، ئیمامی موحەقیقان، لە ساڵحییە بنێژرێت. بەشکەم بە بەرەکەتی واریسی محەمەدی (د.خ) بگات و پەردەی قوتبی ئەبەدی، بەسەر رووحی گوناهباری دابدرێت."

## ٧٥

**"موسافیری بێ تێشوو، بۆ ئیقتیداپێکردن نابێت"**

**ئیبن عەرەبی**

بەدرێژایی ســپێدە، ڕووم لە باکوورە و بۆنی ڕێگەکەم دەکەم. ســێ ســاڵ و نۆ مانگ بەر لە ئێســتە یەکەم جار ئەو ڕێگەیەم تەی کرد و چەندان بیابان و چۆڵەوانیم تێدا بڕین. نووکە وا هەســت دەکەم بەغدا پەنجەرەکانی خۆی بەســەر مندا داخســتوون، چیتر نایەوێت نە بە نیشــتەجێبوون، نە بە ســەفەر و میوانی، ڕووی تێ بکەمەوە. ئەمڕۆ ســودکین و بەدرم بۆ تێشــووی ســەفەری مەلەتییە و ســۆراخی قافڵەگەل ناردنە بازاڕ، ئێســتە بەتەنیا لەماڵەوە ماومەتەوە. بۆ یەکەمجار دوو ئارەزووی دژ بەیەک، ڕاکێشــڕاکێشــم پێ دەکەن، ئارەزوویەک دەڵێ دەبێ لێرە بمێنیتەوە، ئەوەی تریش بۆ ڕۆیشــتن دنەم دەدا. لە نزیکبوونەوەی ئەو ســەفەرە، بۆ بە مرادگەیشــتنم، ڕووحم وا پێش جەســتەم دەکەوێت، بەڵام ڕاســتییەکەی بەغدا (دارولســەلام)ــــە و هەر بەکردەیی، ســەلامەکەی ڕووی کردە نێو ڕووحم. لەو شارە تاکوو نها پێوەندیم بە هیچ سوڵتانێکەوە نەکردووە تا بە سەروکاریەوە بم، کارێکی وەهاشم تێدا نەکردووە، تا لەسەری پەژیوان ببمەوە.

بەدر بە خۆی و ئەو تێشــــوەی داوام کردبوو گەڕایەوە، بەڵام هەواڵگەلێکی وای پێ بوو قەت چاوەڕوانی شتی وام نەدەکرد. مەلیکی مووسڵ سوپایەکی زۆری کۆکردووەتەوە، وا دیارە شەڕێک لەنێوان ئەوان و (کەرەج) دەقەومێت، ئەمەیش وا دەکات ئەو ڕێگەیە نەگرینە بەر. لە چاوەکانی بەدر ڕامام، کە تا بە تەمەندا دەچوو، تەنگ و تەســکتر دەبوون، جووت ئەبرۆکەیشــی، تا دەهات چڕتر و ســپیتر دەبوون. لێم پرسی:

- ئەی قافڵەکان چی دەکەن؟

- هەموویان لە ڕێگەی حەلەب بۆ ئەنازۆڵ دەڕۆن.

دەستم ڕاتەکاندن و گوتم:

- کەواتە لەگەڵ وان دەڕۆین.

ســێ قافڵە لە یەک قافڵەدا یەکیان گرت و و وەڕێ کەوتین، ئالای عەباسییەکانیان شەکاندەوە، هەر موسافیرەو پتر لە یەک هەوساری بەدەســتەوە بوو. لە ماوەی بیســتوحەوت ڕۆژ، گەیشــتینە حەلەب، قافڵەکە دوو جار کەرت بوو و بە ڕێی دیکەدا ڕۆیشــت. ئێمە، کە خۆمان لە بەریەککەوتنی سوپای موسڵ دەپاراست، هەواڵی ئەوانمان لە قافڵەی دیکە دەبیســت، کە لە دووڕیانی ڕێگە و شــوێنی وچاندان پێیان دەگەیشــتین. خۆشــبەختانە ســوپا لە شــوێنی خۆی نەجوولا، هەموو شــتێک بە شــێوەیەکی دڵخۆشــکەرانە کۆتاییی هات. مەلیکی کەرەج ســەرخۆش دەبێت، بەتەنیا ســواری ئەســپەکەی دەبێت و دەکەوێتە ناو کەندڕێک. دارودەستەی مەلیکی موسڵ دەگەنێ و دەری دێنن، بەمەیش ســەری شــارەکەیان دەکڕنەوە و گەمارۆی ســەریان دەشکێت، ئیتر ئەو حیکایەتە کۆتایی دێت، کە ئێمەی وا لێ کرد لەبری ئەوەی بەرەو خۆراوا بچین، ڕێی بەرەو باکوورمان گرتە بەر.

ئەوکات ئێمە لە دەوروبەری شاری حەلەب بووین، هەموو لایەک بەم هەواڵە گەشــایەوە و دڵخۆش بوو، بەڵام ئەمن هەر چەند هێنا و بردم، نەمتوانی زیهنی خۆم لەم پێشــهاتە نوێیە بەتاڵ بکەمەوە. بۆچی خوا

خواســـتی وا بوو پێش باکوور، ڕوو لـه خۆراوا بکـەم؟ خوایـەگیـان قەدەری تۆ، هیی گەمە و گاڵتەپێکردن نییە، لە هەموو ژیانی منیشـــدا جێگەیەک بۆ پشـتگوێخسـتن و ئیشـاراتی ئاسـمان نییە. بەم هۆیەوە شـــەش شـــەوی هەوەڵ لە حەلەب شـــەونخوونیم کێشـــا. جەژنی قوربانیش بەسـەردا هات، نەمدەزانی لە چ لایەکەوە خەو، سـەرێک لە چاوە ئێشـگرەکانم دەداتەوە. لە کۆتاییدا کاروباری خۆم دایە دەسـتی خوا. ئەو چۆنی بوێت منیش هەر وام دەوێت، من وەلیی ئەوم، چۆن حەز بکات، هەر وا ئاڕاســـتەم دەکات، بۆ ئەو ڕێگەیەی دەیەوێت ڕێنوێنیم دەکات. سودکین و بەدرم لە خەوێکی قووڵ وەخەبەر هێنان، کاتێک هەستان، تەماشامکردن و پێم گوتن:

- تا ماوەیەک لە حەلەب دەمێنینەوە.

بەدر وەک نەریتی هەمیشـەی لەخەوهەسـتانی، قەیرێک دەسـتەکانی هەڵگوشین و بە سەر و سەلیقەیەکی ئاڵۆز و تێکچوو، کە چەند ساڵ بوو وای لێ هاتبوو، گوتی:

- قوربان! بۆچی بەیانی پێت نەگوتین؟

ســـودکین چاوەڕێی وەلامی منی دەکرد، منیش بە دەنگێکی کز و شەرمنانە گوتم:

- تا خەوم لێ بکەوێت!

گەڕامەوە سەر جێخەوەکەم و کەوتمە خەوێکی قووڵ، بەدر چەند جار دەستی بە شان و ڕوومدا هێنا تا بۆ نوێژی بەیانی هەستم، لە حاڵێکدا پێشـتر بە سـرتە و چپەیەک هەڵدەسـتام. خەونێکم بینی، تەندوورێک ئاگری لێ هەڵدەگیرســـا، لێی نزیکبوومەوە و وەســـتام. دەمی تەندوورەکە گەورە بوو، خۆم لەنێودا بینییەوە، بێ ئەوەی بمســـووتێنێت. سـینەم شـەق بوو، دوو کولوە بەفری بە قەد هەڵووژەیەک چوونە نێوی، زۆریان پێنەچوو بە گەرمای تەندوورەکە توانەوە. دواتر لە تەندوورەکە هاتمە دەرێ، دەسـتم لە سـینەم کوتا، دەبینم کراسەکەم بەسـەر دڵمەوە کون بووە. خەڵک لە دەورم جەم

بوون، سـەریان لە کونەکە سـووڕمابوو، هێندێک هێمایان بۆ دەکرد و بەشـێکیش پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێ دەکرد، بەپەلە بەرەو ماڵ بوومەوە تاکوو بیگۆڕم. کاتێک لەبەر خۆم داکەناند و فڕێم دایە سـەر زەوی، لەهیکرا کراسـەکەم لە شـکڵ و شـێوەی ژنێک هەسـتایەوە و باوەشی پێدا کردم.

لە خەو هەسـتام، هەوڵمدا خەونەکەم لێک بدەمەوە، بەڵام هەرچەند کردم نەمتوانی، خوایش هیچ چتێکی بۆ کەشـف نەکردم. لێرە ژنێکی جوان و دڵێکی زایەبوو هـەیـە. ئـەرێ دەبێ خوا چی لـەو بـەنـدە قەلەندەرەی خۆی بوێت؟

بانگی سـودکینم کرد بچێت بەناو مزگەوتەکانی حەلەبدا بگەڕێت، خەونزانێک بدۆزێتەوە و خەونەکەی من لێک بداتەوە. دوای ڕۆژاوا گەڕایەوە، لام دانیشت و گوتی:

- پرسـیارم لە پێنج خەونزان کرد، دوویان گوتیان تەندوور لە ڕۆژی دوایی سزای زیناکەرانە، دەبێ ئەو کەسە تۆبە بکات و بگەڕێتەوە لای خوا. هیی سـێیەمیش گوتی: ئەو بەفرەی لە دڵی دەرچووە، نیشـانەی بەتاڵی و ساردی و دوورکەوتنەوەیەتی لە هەق. خەونزانی چوارەمیش گوتبووی: بابای خەونبین خەریکە بەڵایەکی تووش دێت و دەکەوێتە گوناهێکی گەورەوە.

- ئەی هیی پێنجەم چی گوت؟

- خەونەکەی لێک نەدایەوە، بەڵام بەکورتی گوتی: پێویسـتە خەونبین، ژن بهێنێت.

ئەو شـەوە وەک کەشـتییەک، کە دەریای تارکی شـەق دەکات، چوومەوە سـەر جێگەم و کەوتمەوە بیرکردنەوەیەکی قووڵ. لەنیوەی شـەودا، خێر و فەڕ خزانە دڵمەوە. سـودکینم هەسـتاند و بە هەڵپە و پەرواوە هات، وای زانی شتێکی خراپم بەسەر هاتووە، پێم گوت:

- خودا خەونەکەمی کەشـف کرد. مەریەم و نیزامی لە دڵ دەرهێنام، ئێسـتە دڵم بەتاڵ و عەتاڵ بووە. خودا ژنێکی دیم بۆ ڕەوان دەکات، لە

پۆشاکی من دێته دەرەوە، واتا لەسەر پەیڕەو و ڕێڕەوی من دەڕوات. باوەشم پێدا دەکات، یانی شووم پێ دەکات.

سودکین چاوە خەواڵوەکانی هەڵگوشین و بە دڵەڕاوکێوە گوتی:

- ئەمە هەمووی خێر و بێرە قوربان.

- بەڵێ خێر و بەرەکەتە، تۆیش بخەوە.

سودکین کەوتەوە خەو. منیش چووم تەشتەی ئاوم هێنا، دەستنوێژم هەڵگرت و نوێژم دابەست. لە نوێژەکەمدا نزام کرد، کە هەرچی زووە ئەو ژنەی خەونم پێوەدی بکاتە قســـــمەتم، کەلێنی دڵم پڕ بکاتەوە و ئاوەدانی بکاتەوە. تاکوو بەرەبەری بەیانی لە نوێژەکەم مامەوە، دواتر بۆ نوێژکردن چووینە مزگەوت. خۆر هەڵات، بە نیازی پەڕاوکڕین چوومە بازاڕ، بینیم بەدرێژایی ڕێگەکە خێوەت هەڵدراون، وا دیاربوو خەریکی سازدانی ئاهەنگێکی گەورە بوون. سەیربوو چونکە نە مەلیک غەزای کردووە و نە لە شوێنێک سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، ئەی ئەو ئاهەنگە بۆ چییە؟ پرسیم گوتیان مەلیک زاهیر کوڕێکی بووە.

بەو بۆنەیەوە نزیکەی یەک مانگ حەلەب ئاڵاوواڵا کرا، هەموو ڕۆژێک خوان دەڕازێنرانەوە و خەڵک بێبەرانبەر یەک بە ســــکی خۆیان دەخوارد. لە هەفتەی ســــێیەم ئاهەنگێکی گەورەی ســــونەتکردنیان بۆ کرد. دەمڕاســـــت و پیاوماقووڵان منداڵەکانی خۆیان هێنان لەگەڵ ئەمیری مەلۆتەکەدا سونەتیان کەن. بۆ خەڵکەکە ڕوون بووەوە مەلیک زاهیر بە هاتنە دنیای کوڕەکەی لەوپەڕی دڵخۆشـــــی دایە. هێشــــتا ئاهەنگەکان تەواو نەبوون، فەرمانی چەند بیناکارییەکی دا: ســـێ دەروازەی نوێ و شوورەیەک بۆ شارەکە، نوێکردنەوەی مزگەوتەکە دوای سووتانی. دوای هەموو ئەمانە هیچ شکێکم لەلا نەما: خەوبینین و ڕازانەوەی شار. دەی خوایە تۆیش ژنێکم بەنسیب بکە.

## ٧٦

**"خۆگرتنەوە لە حەڵاڵ، کارێکی ناپەسندە"**
**ئیبن عەرەبی**

دوای بەسەرچوونی چەند ڕۆژێک بەسەر خەونەکەمدا، وێنەی ئەو ژنە بە هیچ جۆرێک لە دڵ و خەیاڵم دەرنەچوو، شەیدا و دێوانەی بووم، ئەگەرچی هێشتا نە دیوەمە و نە دەشیناسم. لە کاتی کڕنووشبردندا نزام دەکرد لەو نزیک ببمەوە، بە ئومێدی ئەوەی دڵم ئۆخژن بگرێت و هۆگری بم. خودا زۆر بەخێرایی نزاکەی گیرا کردم. لە مزگەوت دەگەڕامەوە، بینیم پیاوێک لەگەڵ سودکین لە بەر دەرگەی ماڵمان دانیشتووە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی من دەکات. هەرکە منی بینی، بە پیرمەوە هات و سەری ماچ کردم، ویستم لە ڕێگەی ئادگارەکانیەوە بیناسمەوە، کە لەلام غەریب نەبوو.

- قوربان سڵاوت لێ بێت.
- بەخێر بێیت.
- خزمەتکار و خۆشەویستت یوونسی کوڕی یووسف.

لایەکم لە سودکین کردەوە و سەرکۆنەم کرد:

- بۆ دەبێ مێوانەکەمان لە بەر دەرگە دانیشێت؟

سودکین بە شەرمەوە سەری دەبەر خۆ ناوە و گوتی:

- بانگی ژوورەوەم کرد و نەهات...

یوونس قسەکەی بڕی و گوتی:
- بەڵێ بانگی کردم و نەچووم. پێم باشبوو لە پێشوازیی تۆدا بم.
دیسـان ڕووم لە سـودکین کردەوە و پەنجەم لێ هەڵدان و ئاگادارم کردەوە:
- من حاتەمی تەییم، تکایە با هیچ میوانێک لە بەر دەرگە نەمێنێتەوە!
- بەسەرچاو قوربان!
چووینە ژوورەوە، سـودکین بەسـەروکاری مێوانەکەوە بوو. یارۆی مێوان نەهاتە تەک من، سـوور بوو لەسەر ئەوەی، کە لە بەرانبەرمدا بەسەر چیچکانەوە دانیشێت. گوتی:
- قوربان! خوا بەرەکەت بخاتە زانست و کردارەکانت. پێشتر ئامادەی وانـەوتنـەوەی تۆ بووم و لـە دەریـای مـەعـاریفی تۆدا ئـاوم خواردووەتەوە.
- چ وانەیەک؟
- چەند سـاڵێک بەر لە ئێسـتە لە شـاری مەککە، بەر لەوەی ئۆغر بکەیت و دڵمان بەماڵئاوایی شەقارشەقار بکەیت.
- ڕاسـتییەکەی ڕوخسـارت غەریب نییە، بەڵام بیرم ناکەوێتەوە کێ بوویت.
- بەڵام تۆ لە دڵ و زاکیرە و ڕووحی مندا هەمیشە ئامادە بوویت.
- خوا پاداشـــتت بداتـەوە و دڵ و ڕووحت پڕ لـە بـەرەکـەت و ڕەزامەندیی خۆی بکات.
سـودکین نان و میوەی بۆ هێنـاین. کابرا لێمـان نزیک بووە و بە دانیشتنە ئاساییەکەی خۆی، کە سەری ئەژنۆکانی لە سنگی دەخشان و چەناگەی لەسـەر دادەنان. نانمان خوارد، پرسـیارم لە پیاوەکە کرد لەکوێ هاتوویت:
- لە ماردین قوربان! بەڵام هاوینان دەچمەوە حەلەب.
- بۆچی؟
- کچێکم لەوێ بە شوو داوە، مێردەکەی مرد.

- خوا لێی خۆش بێت. منداڵی هەن؟
- نەخێر.
- ئەی لە ماردین چی دەکەیت؟
- منداڵە توورکەکان فێری قورئان و زمانی عەرەبی دەکەم، کاتێکیش دێمەوە حەلەب، خەریکی لێکدانەوەی خەونان دەبم.

تەماشـــای ســـودکینم کرد، بە مەغزاوە پێکەنی. ســـەیری یوونســـم کردەوە، وا دەرکەوت چاوەڕێی ئەوەم ڕوونکردنەوەیەکم بۆ بدات. گوتی:

- بەر لە چەند ڕۆژێک سودکین هاتە لام، داوای لێ کردم خەونەکەتی بۆ لێک بدەمەوە. منیش بۆم لێک دایەوە. ئەو شـــەوە بەر لەوەی بچمەوە ماڵ، یەکێک هات داوای کرد بەپەلە خۆم بگەیەنمە ماڵی کچەکەم، منیش بەخێرایی ڕۆیشـــتم، کە چووم قاســـیدێک لە دیوانی ســـەربازی هاتبوو، هەواڵی شـــەهیدبوونی مێردی کچەکەمی بە کچەکەم دەدا.
- شەهید بووە؟ نەمزانیوە ئێمە لە حاڵەتی جەنگدا بین!
- نا قوربان لە جەنگدا نین. ئەو پیاوە لەنێو لەشـــکرێک بووە، مەلیک ئەرکی لادانی مەترسـی فەرەنگەکان لەســـەر (ئەنترســـووســـیان) پێ دەســـپێرێت، بەڵام ئەوان بۆســـەیان لێ دادەنێنەوە و هەموویان دەکوژن.
- لاحول ولاقوە الا باللە...
- ویست و تەقدیری خوایە... لە دڵی خۆمدا گوتم دەشێ ئەوە ویستی خوا بێت، کە لەو ڕۆژەی من خەونەکەم بۆ تۆ گێڕایەوە، کچەکەی منیش بێوەژن بکەوێت. من وا هەســـت دەکەم کەســـم لە تۆ شـــیاوتر دەست ناکەوێت. ئەگەر حەز بکەیت ئەوە بەبێ هیچ مارەییەک دەبێتە هاوژینی تۆ.

- یوونس خوا خێرت بنووســـێت. دوای تەواوبوونی عیددەکەی دێم ســەیری دەکەم، ئەگەر خوا دڵی من و ئەوی یەکخست، ئەوە مارەی دەکەم، بەڵام دواجار بڕیار هەر لای ئەوە و بەس.
- چۆنت دەوێت وا دەبێت.
عیددەی فاتیمە تەواو بوو، چووم مارەم کرد، هەمان ئەو کچە بوو، کە دڵم ویســـتی. چوزانم، لەوانەیە دڵی بەتاڵ و خاڵیم دوای ئەو هەموو ڕووداوانە، بە هەموو ژنێک ڕازی بێت. جەستەی شەکەت و کەلالەیشـــم پاش ئەو هەموو ســـەفەر و خەڵوەتە، بە پیل هەر نەسیبێکەوە بچێت. فاتیمە هات ڕووحی ئارام و، دەروونی ئاسوودە کردم. زووبەزوو وەک باخی یاســـەمین لە ســـینەمدا گەشـــایەوە. باوکیشی بە دڵێکی ئارام و دڵنیا لە کچەکەی، گەڕایەوە ماردین. ئیتر من هۆگری خۆشـــەویســـتیی ئەو ژنە بووم و ئەویش بە هانای پیریمەوە هات. تەنێ بۆ بەدر نیگەران بووین.
ئێوارە چوومە ژوورەکەی بەدر، بینم ناوەخت پاڵکەوتووە، کە منی بینی، بەحاڵ هەستایەوە و دانیشت، بە ئازاری پشتیەوە دەیناڵاند، بە ئاخ و ئۆفەوە گوتی:
- سودکینم ناردووە ئاو بێنێت.
- باشت کردووە.
چووم لەتەکی دانیشـــتم پێی خۆی گرت و قەیرێک بێدەنگماینەوە. پاشان گوتی:
- ئێستا بۆ نەچینە مەڵەتییە؟
- ویستی خوای لەسەر بوو بەرەو خۆراوا بچین.
- بەڵام خۆراوا فراوانە، بۆچی هەر لە حەلەب بمێنینەوە؟
- چی لەمەدایە؟
بەدر بە سەرسووڕمانەوە تەماشای منی کرد و سەری خۆی بادا و بە حەسرەتێکەوە گوتی:

- ئەی چی لە حەلەبە؟ تەنیا چەند فەقیهـــــ و مورید و واعیزێک، کە دۆستی تۆن...
- ئەم گاڵتە زۆرەی ئەو بە حەلەب، تووشـــی شـــۆکی کردم. وێڕای ئـەوەیش دەموچـاوی وشـــکهـەڵاتبوون، بـە خـۆم نـەبوو لـە فلقـەی پێکەنینم دا، ئەویش بێ ئەوەی گرنگی بە پێکەنینی من بدات، درێژەی بە قسان دا و گوتی:
- .... ئائا، نەک دەرگەی مزگەوتان، بەڵکوو دەرگەی ماڵانیشـــیان بۆ کردوویتەوە، لات دادەنیشن و زانستت لێ وەردەگرن.
- هێندە پێکەنیم سـکم هێشـا... ئادگار و ڕوخسـاری بەدر ئاگریان لێ دەباری، بـە هیچ نـەرم نـەدەبوونـەوە، تەماشـــایەکی منی کرد و بە لۆمەبارییەوە گوتی:
- دیـارە لـەبیرت چووە پێش چـەند ســـاڵێک چیان لێ کردی، بیرت نـەماوە، کە لە دەســـتی ئەوان بۆ قاهیرە ڕامان کرد؟ ئەگەر تۆیش لەبیرت کردبێت، پێم وا نییە ئەوان لەبیریان کردبێت.
وەڵامم نـەدایـەوە، لـەنێو پێکەنین شـــینومۆر بوومەوە، دەســـتم بە دەموچاومەوە نا، ڕوخســاری وشـکی بەدر هاتەوە نێو زیهنم، قسـە قۆشـــمـەکانی، لـەبـەر گوێم پاتـە بوونـەوە. بۆ یەکەمجار، لەوەتەی هاوەڵایەتیم دەکات، بە قۆشـــمەوە قســـان دەکات، وەک ئەوەی چیتر بـەرگەی شـــەتەحات و خوزەعبەلاتی من نەگرێت. تەماشـــام کرد، ڕووی هەر گرژ بوو، شــوێنەواری خەو و شــەکەتی پێوە دیار بوو. تۆزوتاڵی سـەر جلەکانی دەتەکاند و سەیرێکی منی دەکرد. پێم گوت:
- بەدر، نازانم دواجار کەی بوو، کە هێندە بە تینوتاو پێکەنیم.
بێ وەی خۆی لە تەکاندنی جلەکانی بکات، گوتی:
- بەڵام ئەوە کەی مەقامی پێکەنینە؟ لەوەی دەیڵێم، زۆر سـەرڕاسـت و ڕاســـتگۆم. پێم وانییـە مـانـەوەت لە حەلەب، لە بەرژەوەندیی تۆدا بێت.
ئەوسا سەری بۆ لای من بەرزکردەوە و گوتی:

- ئەگەر ئیشاراتی ئیلاهی بەرەو خۆراوا دنەت دەدا، ئەوە بەرەو خۆراوا دەڕۆین. بێگومان خۆراوای خوا زۆر فراوانە، بەلام لە مەکۆ و مەلیکەیلی ئەیووبییەکان دوورمان دەخاتەوە، کە تەنێ بۆچوونی عەوامانەیان هەیە و بە کاروباری سیاسەتەوە مژوولن.
بێدەنگ بووم و هیچ وەلامێکم نەدایەوە. دەستی بە شاندا هێنام، چەناگەی بەرزکردمەوە تا تەماشای بکەم، ئینجا بەشێوەی ئاگادارکردنەوە پێی گوتم:
- قوربان! تا ئێستەیش سێدارەی سوهرەوەردی لە دیمەشق ماوە. سەلاحەدین گەورە و سەرمەشق و هۆشمەندی ئەیووبییەکان، لە سێدارەی داوە. ئەی لەبارەی کوڕ و ئامۆزا گەوجەکانی چی دەلێیت؟ وا لەنێو خۆیان یەک دەکوژن، پێت وایە هێندە شەریفن دەست لە خوێنی وەلییەکی سۆفی ئەندەلووسی بپارێزن؟
- بەدر خوا دەمپارێزێت.
- بەلام ڕێگریشت لێ دەکات، کە بە دەستی خۆت، خۆت بەهیلاک بدەیت.
هەردووکمان بێدەنگ بووین، سودکین هات و دیتی بێدەنگین، خواردنی لەبەر دانایین و متەقێکی لێوە نەهات. دەستمان بە نانخواردن کرد، بەدەر لە دەنگی ملچەملچی خواردن لە کاتی جاویندا، گوێمان لە هیچ نەدەبوو. بەقوولی لە قسەکەی بەدر ڕامام، هەولم دا لە تەرازووی عەقلدا هەلیسەنگێنم و دوور لە هەر ترسێکی بێپاساو، بیری لێ بکەمەوە. دەزانم پیربووە و دلەڕاوکێ دەوریان داوە. چۆن لە ئەیووبییەکان خۆمان دووربگرین، خۆ ئەوان میسر و شام و یەمەنیان بەدەستەوەیە، لە دەستی دوژمنان بەرەو کوێ ڕابکەین، خۆ ئەوان لە هەموو جێیەکن؟
نانمان خوارد، بەدر پشتی خۆی لە سودکین کرد تا بۆی بشێلێت، پاشان دوای ئەوەی ئازاری زیاتر بوو، حیجامەی بۆ کرد. بەزەییم بە بەدری هاوەل و هاونشینمدا هاتەوە کە چەندان سالی

دووررودرێژە یاوەری منە. نە ڕۆژێک سەرپێچی کردووم و نە هیچ داخوازییەکی ڕەتکردوومەتەوە. ها ئەوەتە لە هاوەڵیی مندا پیربووە و کەچی منیش هیچ بایەخێکی وای پێ نادەم.
- بەدر گوێ بگرە.
بەدر و سودکین تەماشایان کردم. سەیری چاوەکانی بەدرم کرد و گوتم:
- هەموو ئەو خۆراوایەی، کە هێمای چوونمی بۆ دەکرێت، لەژێر حوکمی ئەیووبییەکانە...
بەدر قسەکەمی بڕی و گوتی:
- دەی مادەم دەچینە دیمەشق. لانیکەم ئیبن زەکی قازی قوزات، پارێزیت لێ دەکات.
بزەیەکم بۆ کرد. ڕاستییەکەی منیش ئەوەم دەویست، نیازم بوو پێشنیازی شتێکی وای بۆ بکەم، وەک ڕەزامەندییەک سەرم بۆ لەقاند و پێم گوت:
- بەدر ئەمە تەواوە، گوێڕایەڵت دەبم. هەر وەختێک پشتێشەکەت مۆڵەتی پێدایین، دەچینە دیمەشق.

# ٧٧

**"هەر ئیرادەیەك كاریگەری دروست نەكات، بۆ پشتپێبەستن ناشێت"**
**ئیبن عەرەبی**

فاتیمەم ناردەوە ماردین، بۆ لای باوكی، خۆشمان بەرەو دیمەشق وەڕێ كەوتین، بەڵام هەرچەند كۆشاین و هەوڵمان دا، نەگەیشتین. زۆرن ئەو موسافیرانەی ڕێ دەبڕن و ناگەن. سوبحانەڵڵا! خوا لە بەغدا بە نیازی مەلەتیە هێنامیە دەر، كەچی لە حەلەب نیشتەجێی كردم. لە حەلەب بە مەبەستی دیمەشق بەڕێی كردم، كەچی لە (بیقاع) لەنگەری پێ گرتم. دوای یەكدوو ڕۆژ گەیشتینە (مەحرووسە)ی دیمەشق، وڵاخەكەم بەرەو خۆراوا ملی نا. هەرچەند لغاوەكەیم توونند كرد، هەر جەنەی گرت، لە كۆتاییدا لغاوەكەی كرۆشت و قرتاندی. دابەزیم بۆ ئەوەی ڕایكێشم، بەڵام فایدەی نەبوو، ئەو ڕایكێشام و خستمی. سودكین و بەدر لە وڵاخەكانیان دابەزین و ویستیان دەستەمۆ و ڕامی بكەن، بەڵام بێهوودە بوو، بە دەنگێكی بەرز فرمەفرمی دەكرد و لە حیلەحیلی دەدا. گوتمان لەوەیە برسی بێت، یان شەكەت بووبێت. كامان بۆ برد، دەمی بۆ نەبرد. لە دارێک بەستمانەوە بۆ ئەوەی نەختێک بحەسێتەوە، ئێمەیش لە نزیكیەوە دانیشتین.

بەدر بە سودكینی گوت:

- خۆزیا ئەو هێسترە ڕۆمییەت نەکڕیبایە. ڕاستە بەتێن و خۆشڕەوە، بەڵام چەمووش و لاسارە.
منیش بەرگریم لە سودکین کرد و گوتم:
- چۆن هێستری بەربار و گوێڕایەڵ، لە هیی چەمووش و لاسار جیا بکاتەوە؟
- ئاخر هەموو هێسترەکانی ڕۆم، چەمووشن. ئەگەر هێسترێکی میسری کڕیبایە، ئێستە تەواوی ڕێگەمان بڕیبوو.
منیش بە پێکەنینەوە گاڵتەم لەگەڵدا کرد:
- بەدرا چەندە وڵاتی میسرت خۆش دەوێت؟
بۆ دوور ڕووانی و وەڵامی نەدامەوە. پاشان لەپڕێکدا گوتی:
- بەدەر لەوێ زیاتر، بە هیچ نیشتمانێکی دیکە ئاشنا نیم. هەر لەوێ پێگەیشتووم و گەورەبووم.
چەند هەنگاوێک دوورکەوتمەوە، لەژێر سێبەری دارێک ڕاکشام، ویستم بخەوم. گوێم لە دەنگی پیرەمێردێک بوو، بەدەم نوێژکردنەوە، دەناورایەوە و نزای دەکرد. وەستام و هەوڵم دا گوێی بۆ هەڵخەم. بە هەردوو هاوەڵەکەم گوت:
- گوێتان لێی نییە؟
تەماشای یەکتریان کرد و وەڵامیان نەدایەوە. پاشان سودکین گوتی:
- قوربان! چی دەبیستی؟
چاوەکانم نووقاندن و بە دەوری خۆمدا سووڕامەوە. باسکەکانم بڵند کردن و هەستم بە سەر سووڕکێ کرد، بەڵام نەوەستام. لەگەڵ زیادبوونی سەرسووڕکێم، دەنگی پیرەمێردەکە ڕوون و ڕەوانتر دەبوو، لە کۆتاییدا وەک ئەوە وابوو لەتەکمەوە بێت. بە دەوری خۆمدا سووڕامەوە، وا هەستم کرد لەسەر ڕووپەلی زەوین بەرزبوومەتەوە و لە مەلەکووتی ئاسماندا دەخولێمەوە. لەنێو جەرگەی تاریکایی چاوە نووقاوەکانمدا، نوورێک هاتە ژوورەوە،

پیاوەکەیش تەحیاتی خوێند و سەلامی یەکەم و دووەمی دایەوە و پاشان ڕاستەوخۆ سەیری کردم و گوتی:
- بیرم کردوویت براکەم!
بەسەر دەستەکانی سودکیندا کەوتم، کە هەر لە سەرەتای سەرسووڕکێکەمەوە لە دەورم دەسووڕایەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی نەکا بەرببمەوە. دانیشتین، سەرم خستە سەر سینەی، هەوڵم دا چاوەکانم لەنێو تیشکی خۆردا بکەمەوە، تاوێک دەبوونەوە و گاوێکیش پێکەوە دەنووسان. بەدر دەموچاوی ئاوڕشێن کردم، پاشان دەستی بە تەوێڵمدا هێنا، ئینجا سینەی کردمەوە و دەستی تەڕی پێدا هێنا. لە کۆتاییدا هەستم کرد جەستەم گەڕایەوە سەر زەوی، کە بۆ چەند چرکەیەک جێی هێشتبوو، ڕووحیشم کە بۆ چوونە (بیقاع) هەڵەپەهەڵپی بوو، هاتەوە نێو جەستەم.
بە خولانەوە لە دەوری خۆم، هاوسەنگیم لە دەست دابوو، بەڵام باش بوو ڕێگەی خۆم دۆزییەوە و بە مەبەستی خۆم گەیشتم.
چوومە لای هێسترەکەم و نێوچاوانە پانەکەیم ماچ کرد. پەتم لە دار کردەوە و سواری بووم و بەرەو خۆراوا بەڕێ کەوتین.
بەدر و سودکین، بێ ئەوەی پرتە و سرتەیەک بکەن، شوێنم کەوتن. دوای ساعاتێک ڕۆیشتن، بەدر پرسیاری لێ کردم:
- گەورەم بەرەو کوێ دەچین؟
- بەدری کامڵ، بەرەو بیقاع دەچین.
- بۆ چ مەبەستێک؟
هێمایەکم بۆ هێسترەکەم کرد، کە بەوپەڕی گورجوگۆڵی ڕێی گرتبوو، گوتم:
- پرسیار لەمە بکە.
بەدر کشایەوە، سرتەیەکی کرد و تێی نەگەیشتم. زانیم شەکەتە و پشتئێشەکەی ناوەناوە بڕستی لێ دەبڕێت و منیش هیچ لاقرتەیەکی پێ ناکەم. ڕاستییەکەی لەوەتەی سواری هێستەرەکەم بووم، هێستر

ڕێنوێنیم دەکات، نەک من ڕێنوێنیی ئەو بکەم. بەڵێ گوێم لە دەنگێک بوو، پیرەمێردێکم بینی، بەڵام نەمزانی کێیە و چی دەوێت؟ هەر چییەک ئێستە دەیزانم ئەوەیە: من بەسواری ئەو هێسترە بۆ لای ئەو پیاوە دەڕۆم. تا نەیشمگەیەنێت، لەسەری نایمەوە خوارەوە، تەنانەت ئەگەر ڕووی هەموو زەویشم پێ تەی بکات. هێماکان بە گاڵتە ڕوو نادەن، کەشفیش بێهودە دانابەزێت.

## ٧٨

**"هەر غایببوونێکی دڵ، سوودێك بە ماخۆکەی نەگەیێنێت، سەری لە هیچەوە دەردەچێت"**
**ئیبن عەرەبی**

چەندان سەعات بەپێیان ڕۆیشتین، بەدر قراری لێ برا و بە دەنگێکی گەورە، دەستی بە ناڵەناڵ کرد. بۆ سووکبوونی پشتئێشەکەی خۆی بەسەر ئێستردا هێنا، دەستی بە گەردەنیەوە توونند کرد. لە هیکڕا هاواری کرد:

- چیتر بەرگەی ئەو بارە ناگرم!

لە هێسترەکەی دابەزی و لەسەر پشت ڕاکشا و دەستی بە هانکەهانک کرد. هەینێ هاواری کرد:

- خوایە لوتفم لەگەڵ بنوێنە، چیتر بەرگەی ئەم حاڵە ناگرم. لەگەڵ سوودکین بردمانە ژێر سێبەری دارێک و لێی پاڵکەوت. ئارەق لە تەوێڵی دەچۆڕایەوە. ئازاری پشتی، زۆر بە ڕوونی لە سیمایەوە دەرکەوتبوو.

بەزەییم پێدا هاتەوە، کە لەو تەمەنەدا ئەو پشتئێشە توندەی گرتووە. هێندێک جار سەبر لەبەر مورید دەبڕێت و خوا ئیرادەی تاقی دەکاتەوە. جاری وا هەیە مورید پیر دەبێت و پشتئێشە تاقەتی لەبەر دەبڕێت و جومگەکانی بە جۆقەجۆق دەکەون. هێندێک جار دەخوازێ

لە خانەقاکەیدا ژیانێکی هێمن و ئارامی هەبێت. حەز بە ڕێگەیەکی کورتیلەی نێوان ماڵ و مزگەوت دەکات. مەیلی بە چەند وانەیلێکی سـێنا و کەمەکتێبێک و ژوورێکی گەرمونەرم دەکات، بەڵام هەموو ئەمانە نە بەدەستی ئەون و، نە بە چنگی منن. گەرەکە سەفەر بکەین تـا وانـە و پـەنـدی پتر وەربگرین. مرۆڤی ئیمـانـدار، بـەردەوام لەســـەفەردایە. بوون، هەمووی ســـەفەرە بەنێو ســـەفەردا. ئەگەر وابەستەی بەدر نەبووبام و بەرگەی فیراقم گرتبا، لێم دەگەڕا بۆ هەر شـــوێنێک ســـەری خۆی هەڵبگرێت و بڕوات، بەڵام ڕاســـتییەکەی، ژیانێکم بۆ ئەو دەوێت، پڕ بێت لە ئەزموونی قووڵ. تەسـەووفێکم بۆ ئەو گەرەکە، شـــایان بە دڵی پاکی و، ڕووحی بێگەردی بێت. ئاخۆ دەبێ نەزانێت هەر کەســـێک ســـەفەر نەکات دەســـرەوێت، هەر کەسێکیش بسرەوێت، بەرەو عەدەم دەچێتەوە؟

- بەدر...

- بەڵێ قوربان.

- دەستت بێنە.

دەستی درێژکرد و گوشیم و پێم گوت:

- دەزانی بە کێ دەڵێن مورید؟

کۆکەیەکی کرد، هەروەک ئەوەی پرســـیارەکە بۆ ئەو کتوپڕ بێت. تاوێک لە وەڵامدانەوە دواکەوت، دەڵێی پێی وابوو پرسـیارەکەی من، سەرکۆنەکردنی ئەوی تێدایە:

- مورید، کەســـێکە فەقێی زانســـتەکەت بێت، شـــاگردی چەمک و تێگەیشتنت بێت.

- نا بەدر نا، تۆ بەم قســـەیە هەموو فەقێیەکت بە هەموو ئاســـت و جیاوازییەکانیانەوە، لە بەرەی گەلی موریدان هەژمار کرد.

- دەی قوربان کەواتە تۆ فێرم کە.

- بەدرگیان، بە کەسـێک دەگوترێت مورید، کە ئیرادەی خۆی دارِنی بێت و ملکەچی ئیرادەی هەق تەعالا بووبێت.... ئەی دەزانی موراد کێیە؟

- بەو شێخە دەگوترێت خوا زانستێکی پێداوە، فێری موریدانی وەک منی دەکات.

- نا بەدر نا، بەم قەسـەی تۆ بێت، موراد بە مامۆسـتای زارۆکان و مشوورخۆری ولاخانیش دەگوترێت!

- دەی کەوایە قوربان پێم بڵێ موراد کێیە!

- موراد کەسێکە ئیرادەی خۆی ژێرپێ بنێت.

بەدر بێدەنگ بوو. زانیم چاوەڕوانی ئەوەیە ڕوونکردنەوەیەکی بۆ بکەم، ئەمەیش وای لێ کردم دوای ئەو هەموو سـاڵە لە هاوەڵایەتی، دیسـان بنچینەکانی تەسـەووفی بۆ پاتە بکەمەوە. ئەگەرچی لەوانەیە ئەمە بە سەرکۆنەکردنێکی ناڕاستەوخۆ تێ بگات. پێم گوت:

- بەدرگیان تۆی مورید بە ئیرادەی خۆت، دەسـتبەرداری ئیرادەی خۆت دەبیت، بـەڵام من مورادێکی مـەجزووبم هیچ بژاردەیـەک بۆ دەستبەرداربوون لە ئیرادەکەم نییە....

بەدر زۆر بەجوانی گوێی بۆ گرتبووم، منیش بەردەوام بووم:

- هەر بۆیە هێندێک جار ئەو کارە لەسەر تۆ سەخت و دژوار دەبێت، چونکە تۆ لەگەڵ دەروون و ئارەزووەکانی خۆتدا لە کێشمەکێشـم و ململانێ دایـت... وەلێ من لـەوەتـەی خوا بۆ لای خۆی جـەزبی کردووم، ئەو ململانێیەم لە دەرووندا نەماوە، چونکە هەر ئەوکات ئیرادەکەم لێ دارِندرا.

- گەورەم خوا پلە و مەقامت بەرزتر بکاتەوە.

- بەڵام بیرت نەچێ ئەمە وا دەکات پاداشـتت لەلای خوا زیاتر بێت، چونکە جیهادی دەروونی تۆ، زۆر لە جیهادی دەروونی من سـەخت و نارەحەتترە.

ئەم قسانەی من کاریگەرییان زۆر لە بەدر کرد و وەگریانیان خست. دەنگی وەلەرزە کەوت و بە پۆزشەوە گوتی:
- بمبوورە. پیربووم و جەستەم قورس بووە، حەز بە حەسانەوە و ئاسوودەیی دەکەم.
- بەدر ئازیزم، هیچ لەگۆڕی نییە، وتەکەی بوستامییت بیردەکەویتەوە، کە چەند جاریک لە وانەکانمدا باسم کردووە:
- گەورەم چ وتەیەکی؟
دەستم لە شانی دا و کەمێک پێکەنیم و گوتم:
- پیرەپیاو، وات لێ هات ئەوەشت لەبیر بچیتەوە! باشە ئەی من کێم؟
- تۆ شێخ و ئوستادی منی.
- شێخ و ئوستادی من و تۆ، بوستامییە، ئەو دەڵێت: "بە گریە و ناڵەناڵ دەروونی خۆم بەرەو لای خوا برد، بەڵام وەختێک بردمە خزمەتی، لە تریقەی پێکەنینی دا."
فرمێسک بە کوڵمە گرژەکانیدا هاتنە خوارەوە، تێکەڵ بە ئارەقی لاجانگەکانی بوون، بەو حاڵەیش بزەی خەجاڵەتباری ڕووی ئەویان بەرنەدا. تێی ڕامام، ئەویش هەر بە بزەی ئەسریناوی مایەوە، خۆزگەم دەخواست بمتوانیبا هێوری بکەمەوە و باری دەروونی ئارام بکەمەوە. لە ناخەوە هەستم بە خۆشەویستییەکی زۆری ئەو کرد. باوەشم پیدا کرد و دەستم بە تەویڵیدا هێنا و گوتم:
- هێشتا ڕۆژ زۆری بەبەرەوە ماوە، لێمگەڕێ بەدر با چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە و دڵنەواییت بکەم.
- هەموو جەستەی خۆم دەکەم بە گوێ، فەرموو مامۆستا گیان.
- ڕۆژێک لە ئیشبیلیا تووشی چەڵەمەیەک هاتم. شار، خەریک بوو ڕووحی دەدا، تەنگی بە دانیشتوانی هەڵچنی بوو. باوکیشم بەردەوام ڕێگەی سەفەری لێ دەگرتم، وەک چۆن ڕێگری لە منداڵ دەکرێت، کە بەرەو ئاگر بڕوات. زۆربەی مامۆستا و شێخەکان شارەکەیان جێ هێشت و بەرەو (فاس) و (سلا) و مەراکیش چوون. بازێڕی

کتێبفرۆشـــان بەقوڕ گیرابوو، تاقەکتێبێکی بەســـوودی تێدا نەمابوو بیخوێنمەوە. دایکم نەخۆشـییەکی کوشـندەی گرت، لەبەر سـەرئێشـە توندەکەی، چاوەکانی کزبوون. لە ماڵ دەردەچووم تا سەر کەناری ڕووباری گەورە ڕاندەوەســـتام، بەو ئومێدەی دەرچەیەک بۆ دڵی تـەنگ و خـەمبارم بدۆزمـەوە. دەمدی گەنجانی ئیشـــبیلی خەریکی ڕابواردن و کاتبەســـەربردنن. قســـەی قۆڕ دەڵێن و بەدکاری دەکەن. شـــەرمیان نەمابوو، پیاوەتییان لەدەســـت دابوو. کەس نەیدەزانی لە چی دەترســـــن و بە هومێدی چییەوەن. خەم دوای خەم و تەنگانە دوای تەنگانە بەرۆکیان گرتم. قاچەکانم بەرەو ماڵی شـێخ عورەینیان بردم، کە لە هـەموو خـەم و چـەڵـەمەیەکدا پەنام بۆ ئەوێ دەبرد. لە دەرگـەی مـاڵـەکـەم دا، چوومـە ژوورەوە وەک هـەمیشـــە بینیم لـە خـەڵوەتگـەی خۆیـەتی. هـەرکـە منی بـە نێوچاوانگرژی و ڕوومۆنی بینی، گوتی: "ها ڕۆڵە چیت لێ قەوماوە؟ "منیش پێم گوت:" یا شـــێخ دنیام لێ وێکهاتووە و خەموخەفەت منیان داڵەنگاندووە." نە لەبارەی دڵتەنگیم شتێکی پرسی و، نە لەبارەی خەمەکانیشم. تەنێ یەک شتی پێ گوتم: "پشت بە خوا ببەستە." پاشان گەڕایەوە ناو خەڵوەتگەکەی، وەک ئەوەی من هـەر لـەوێ نـەبم، مـاڵـەکـەی ئـەوم جێ هێشـــت و نەمزانی بەرەو کوێ بچم، لە کۆتاییدا چوومە ماڵی شـێخ مووســـای مارتلی. کە چووم وەک پیشـــەی هەمیشـــەی، لە خەڵوەتگە خەریکی دروســـتکردنی ســـەبەتە بوو. لەتەکی دانیشـــتم و وردە وردە پەلی دارخورمام دایە دەست. پێی گوتم: "ها ئیبن عەرەبی، ئەمڕۆ چیت لێ قـەوماوە؟" گوتم: "خـەمێک توند ســـــینەی گرتووم، کەوتوومەتە ناو تەنگانەیەکی وا، هیچ دەرچەیەک بۆ دەرچوونم شک نابەم."

بێ ئەوەی دەســـــت لەکارەکەی هەڵبگرێت، گوتی:" پشـــــت بە خۆت ببەسـتە! "پەسـت بووم! هەسـتم کرد لەنێو ئەم شـێخ و ئەو شـێخدا، نوقمی پەشێوی و سەرگەردانی دەبم. پەلی ناو دەستم فڕێدا و ئیزنی ڕۆیشـتنم لێ خواست. پێی گوتم: "چیتە؟" گوتم: "قوربان! لەبەینی ئەو

دوو شێخەدا، سەرم لێشێواوە، ئەوەتە شێخ عورەینی دەڵێت: "پشت بە خوا ببەستە." تۆیش دەڵێت: "پشت بە خۆت ببەستە!" لە کاتێکدا ئێوە هەردووکتان خەڵک بۆ تاقگەی هەقیقەت ڕێنوێنی دەکەن." گوتی:" بگەڕێوە لای ئەو و قسەکەی منی پێ بڵێ." ڕێکە و ڕاست چوومەوە لای شێخ عورەینی و، ئەوەی شێخ مارتلی پێی گوتم، بۆم باس کرد. گوتی: " قسەکەی زۆر جوانە!" گوتم: یاشێخ، بەڵام لەگەڵ قسەکەی تۆ تێک ناکاتەوە!" گوتی: "ئاخر ئەو بۆ ڕێ و منیش بۆ هاوڕێ ڕێنوێنیمان کردوویت."

- ئەی سوبحانەڵڵا!

ئەوسا باسکەکانی بەدرم گرتن و گوتم:

- مادەم خوا یارمان بێت چیمان داوە لە سکاڵا و شاکەشاک؟

## ٧٩

**"خۆت لە خەڵك گۆشەگیرکە، تا ئەوان لە دەستت سەلامەت بن، تۆیش لە دەستیان سەلامەت بیت"**
**ئیبن عەرەبی**

لە کۆتاییدا، دوای دوو ڕۆژ ڕێکردن لە دەشتەکانی (بیقاع)، هێسترەکەم بە کامی دڵی خۆی گەیشت. لەکن تەپۆڵکەیەکی بچووک وەستا، لە دەوریدا دەستی بە سووڕانەوە کرد، بەڵام سووڕانەوەکەی تەواو نەکرد و گەڕایەوە. تەماشای دەورووپشتی خۆم کرد، دیتم چۆلوهۆڵە و هیچ کەسێکی لێ نییە. دەشتێکی کاکی بەکاکییە، بە چەند تەپۆڵکەیەکی نزمی کەم داروبار دەور دراوە. تەنانەت لە ئاسۆیشدا هیچ خێوەت و بینا و شوێنەوارێکی مرۆڤ نەدەبینرا. ئەوەتە بە زەوق و سەلیقەی هێسترەکەم چەند سەعاتێکە لە ڕێگەی گەشتیار و ڕێبواران لامان داوە. بەدر وازی لە ڕەخنە و گلەیی هێنابوو، بەڵام سودکین هەوڵی دا لەمەترسی ئەو شوێنە ئاگادارم بکاتەوە. ڕاستییەکەی، ئەمنیش ترسی ئەوەم هەبوو دوای ترازان لە ڕێگەی موسافیران، لە سنووری فەرەنگان بکەوینە جێیەکی وا، نەزانین کوێیە و چۆنە... بەڵام پشتم بە خوا بەست و بڕیارمدا بەگوێرەی ڕێگرتنی هێسترەکە بڕۆین. ئاخر ناهەقم نەبوو، ئەو هێسترە زۆر ڕێناس بوو. نە سەر هیچ شاخێکی خستین و نە لە هیچ

نیهاڵێکدا سـەرەولێژی کردینەوە، بەڵکە تا گەیشـتینە ئێرە، بە ڕاستەڕێییەکی خۆشدا هێنایني.
بەدر و سـودکین تەماشـایەکی منیان کرد، وەک ئەوەی چاوەڕێی بڕیارێکی من بن. ئێ چۆن دەلوێ لە جێیەکدا بمێنینەوە، کە نە ئاوی لێیە و نە تێشـوو، بەدەر لەمانەیش، هیچ شـوێنەوارێکی مرۆییشـی پێوە دیار نییە. هەرکە خۆریش ئاوابوو، جڕ و جانەوەر لە لانەکانیان دێنە دەر و ئەو سـێ سـۆفیە شـەکەت و کەلالە و بێ چەکانە، لێک دەکێشـنەوە. کەوتمە باری بیرکردنەوە، لە هێسـترەکەم هاتمە خوارەوە و ڕۆیشتم. بیرکردنەوە و تێڕامان لەو بارە، درێژەی کێشا، بەدریش لە ولاخەکەی هاتە خوارێ، ئەو پێستەبزنەی پشـتی خۆی پێ پێچابوو، فڕێیدایە خوارەوە، بۆ سووککردنی پشتێشەکەی، بەدەم سـووکە ناڵەناڵێکەوە، لەسـەری پاڵکەوت. سـودکین لە تەنیشـتی هەڵترووشـکا و سـەری خسـتە سـەر ئەژنۆی، قاچەکانی لەژێر جلەکانیدا بە دوو دار دەچوون، کە خێوەتیان بەسەردا هەڵدرابێت.
تەماشـای چاوەکانی هێسـترەکەم کرد، وەک ئەو کاتە ئاسـایی بووبوونەوە، کە لە ڕێی حەلەب بۆ دیمەشـق دەچووین. بۆ ئاسـایی نابنەوە؟ خۆ ئەوان تازە کاری خۆیان بەجێ گەیاند. ئێسـتە من دەبێت بڕیارێک بدەم و چاوەڕێی ئامـاژەیەکی دیکە بم. دەمێک بە دەوری خۆمدا خولامەوە، کەڵکی نەبوو. لە شوێنی خۆم دانیشتم، لە سـەرسـووڕکی بترازێ، هیچی دیکەم دەسـتنەکەت. نە هێمایەک، نە دەنگێک، نە تەمومژێک، لە کۆتاییدا بڕیاری خۆم دا:
- گەرەکە من و سودکین بچینە سەر ئەو تەپۆڵکە بەشکم ئاواییێکمان لێ دەربکەوێت. بەدریش با لای ولاخەکان بمێنێتەوە. سودکین هەستا و لغاوی هێسـترەکانی بە پەتێک لێک بەسـتەوە. بەدریش لەسـەر گازەرای پشـتی کەوت. بەرەو سـەر تۆپۆڵکەکە ڕێکەوتم، بەدریش کوندە ئاوێکی بەدوامەوە هەڵگرتبوو. دوای کەمێک گەیشـتینە سـەر تەپۆڵکەکە، ئامـاژەمـان بۆ بـەدر کرد، بـەس ئـەو هیچ هێمـایەکی بۆ

نەکردینەوە. ڕووی دیکەی تەپۆڵکەکە، وەک هیی لای ئێمە چۆڵ بوو، هەر دەڵێی خوا هەموانی لەوێ بە هیلاک بردووە. بایەکی سارد هەڵی کرد، هەواڵی هاتنی ئێوارەی پێداین و لە نالەباری و ناڕێکیی شوێنی مانەوەی شەویش، ئاگاداری کردینەوە. باشتر وایە بگەڕێینەوە ڕێی ڕێبواران، لە جێگەیەک بمێنینەوە خەڵک بەدەورمانەوە بێت و دڕندەیش زات نەکات پەلامارمان بدات. بۆ بەیانیش هەر خوا خۆی دەزانی چی دەکات. ئەوەم بۆ سودکین باس کرد، ئەویش سەری ڕەزامەندیی لەقاند. وردە وردە هاتینە خوارەوە، هێندەم زانی سودکین هاواری کرد:

- ئەوەتە!

به پەنجەی دۆرەدرێژە ئاماژەی دەکرد، بەڵام ڕاستییەکەی جگە لە چەند تەپۆلکەیەکی دیکەی وەک ئەو تەپۆلکەی بەسەریەوە وەستابووین، هیچی شتێکی دیکەم نەبینی. سودکین پەنجەکەی دەهەژاند، وەک ئەوەی بەمە ڕێڕەوی بینین ڕوونتر بکاتەوە و باشتر وەسفی شوێنەکە بکات:

- ئەو بەردە، ئەو لێژاییە، گەورەم! دەبینی؟

- سودکین چی دەبینی؟

- ئەمە ئەشکەوتە، یان خانووە!

- تۆ لەمە دڵنیای؟

- بەڵێ. قوربان! تۆ لێرەبە، من دەچم ئەو ناوە بەسەر دەکەمەوە و دەگەڕێمەوە.

- نا، بە یەکەوە دەچین.

لەلایەکی دیکەی تەپۆلکەکە چووینە خوارەوە، ئیتر بەدر لەبەر چاوانمان گوم بوو. دوای نەختێک ڕۆیشتن ڕوانینەکەی سودکینم بۆ ڕوون بوویەوە. تەپۆلکە شەبەقێکی تێدا بوو، نیوەی بە بەردێک گیرابوو، نیوەکەی تریشی بە گیاوگوڵ و لکوپۆپی داروبار

داپۆشـرابوو. ڕێک بەرەو وێ ڕۆیشـتین. گوێمان لە حەپەی سـەگێک بوو، سودکین گوتی:
- ئەوە بۆنی کردووین... دەبێ سەگی شوانەکان بێت.
لـەکۆتـاییدا لـەکن دەرگـەی مـاڵـەکـە وەسـتـاین، گوێمان لە ترینگەی قاپوقاچاخ و چرپەچرپی مرۆڤ بوو، لە نزیک ڕێڕەوەکە وەسـتاین و بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد:
- سەلاموعەلەیکوم...
کەسـێک بە جلێکی شـڕوشـیتاڵی سـەرقۆڵ دڕاو، بە سـەری کۆت و تـەویڵێکی لۆچاوی، بە دوو ئەبرۆی چڕ و تێکئالقاو، بە دەموچاوێکی خڕکەڵە و بازنەیی، هـاتـە دەرەوە. ڕیشـی پان و درێژی، تەواوی سـینەی داپۆشـی بوو. سـەرباری پشـتکووڕییەکەی، هێشـتا شانوشەپیلکێکی پانی هەبوو. بە دەستێک تەشتێکی بچووکی بەتاڵ و بە دەسـتەکەی دیش دارعەسـاکەی گرتبوو. لێمان نزیکبوویەوە، ویستی بماننناسێ:
- وەعەلەیکوموسەلام...
زیـاتر لێمـان نزیککـەوتـەوە و لێم ڕامـا، منیش بـەرەو لای چووم و تەماشـای سـیما و ڕوخسـاریم کرد. بۆ ماوەی چەند چرکەیەک، بێ ئەوەی قسـەیەک لە دەممان بێتە دەرەوە، سـەیری یەکترمان کرد، لەپاشا گوتم:
- ئەو کەسەی پێم وایە تۆیت، خۆتی؟
وەڵامی نەدامەوە. وەک ئەوەی شـتێکی گرنگی بینی بێت، دەستەکانی بە عەسا و تەشتەوە ڕاوەشاندن، بزەیەکی فراوانی کرد و گوتی:
- موحی!
باوەشمان بەیەکدا کرد، سودکین سەری لەو کەینوبەینە سووڕمابوو، وەک ڕووداوێکی خـەیاڵی وابوو، کە لەبەردەمیدا ڕوویدات. لێکدالێکدا ئەسـرین بەسـەر ڕووی ئەو پیاوەدا دەهاتنە خوارەوە، پاشـان بە کڕنووشـدا کەوت، دواتر دیسـان هاتەوە و بۆ ماوەیەکی زۆرتر لە

باوەشی گرتمەوە. توووند قۆڵی گرتم و بە زەردەخەنەیەکی گریاناوی لە ڕووم ڕاما. منیش بە وردی تەماشای سیمام کرد و هەوڵم دا ئەو ڕێگەیە ببینمەوە، کە زەمەن تێیدا تێپەڕیوە. پاشان دەستی منی خستە ژێر هەنگڵی خۆی و منی بردە نێو ئەشکەوتەکە، کە بەئاستەم جێی دوو کەسی تێدا دەبووەوە. لەوە نەدەچوو ئەو پیاوە سوودکینی بینیبێت، یان ئەو شتە کتوپڕە وای لێ کرد هیچ کەسێکی دی نەیەتە بەرچاو و لەبیری بچێتەوە، کە کەسێکی دیش لەوێ هەیە. ئاوڕێکم لە سوودکین دایەوە و داوام لێ کرد بڕواتەوە لای بەدر و بیهێنێت، ئەو بەڕێ کەوت و منیش لای ئەو پیاوە ڕوونیشتم، هێشتا چاوەکانی پڕ ئاوی ئەو فرمێسکانە بوون، کە لەنێو ڕووی لۆچاوی و ڕیشی پڕیدا، ڕێچکەیان بەستبوو.

- لێرە چی دەکەیت؟ بەتەنیا ژیان بەسەر دەبەیت؟

- بەتەنیا؟ نا، ئەو کاتەی لەنێو ئێوە بووم، تەنیا بووم، بەڵام ئێستە خوا لەگەڵمە.

ئەمەی گوت و بە هەڵچوونێکەوە تەماشای دەوروبەری کرد، وەک ئەوەی بەدوای شتێکی ونبوودا بگەڕێت. بڕێک چیلکە و دار لە سووچی ئەشکەوتەکە دانرابوون، هەستا و چوو بۆ لای ئاگردانێکی سێخناخ و لێوانلێو لە مشکی و خۆڵەمێش. ئاسەواری ئاگرێک، کە چەندان جار داگیرسابوو و کوژابووەوە. پاشان چووە کوخەکە و تووریکی هێنا و لەبەردەمی دانام، پاشان گەڕایەوە و بڕێک ئاردی لەنێو تەشتێک هێنا، بە جەڕەیەک ئاوی ڕووکردە نێو و دەستی بە هەویرشێلان کرد. پێم گوت:

- ئەی ئەو کاتەی لەگەڵ ئێمە بوویت، خوات لەگەڵدا نەبوو؟

- خوا لە هەموو جێگەیەکە، بەڵام ئێوە لە منتان شاردبوویەوە.

- لە کەیەوە لەو خەڵوەت و گۆشەنشینییە دایت؟

پێکەنی و بە لوتفەوە دەستی بە ڕیشیدا هێنام و گوتی:

- هەر لەو کاتەوەی، کە هەموو ڕیشت ڕەش بوو.

ڕیشی کورتیلەی خۆمم گرت و بە شەرمەوە بزەیەکم کرد و گوتم:
- کەسوکار و خزموخوێشت وا دەزانن مردوویت.
- ئەی تۆ؟
- چەند جارێک بەدەم نوێژ و نزاوە تۆم دیوە، بەڵام لە سیما و ئادگارەوە نەمناسیەوە.
- منیش تۆم بەسەر هێستریکەوە بینی، وەلێ نەمتوانی سیمات بناسمەوە.
بە بەردەستێ ئاگری کردەوە، فووی لە پووش و لکی بچووک کرد تاکوو ئاگر لە چیلکەکان بەربوو و داگیرسا.
بە بێدەنگی دانیشت و تەماشای منی نەکرد، ترس و ملکەچی خوا لە ڕووی دەدرەوشانەوە. ئینجا گوتی:
- هەستە نیشات بدەم...
لەگەڵی چوومە ئەشکەوتەکە. لەوێ دەرگەیەکی بچووکی دارین هەبوو، کە کردیەوە، ژوورێکی بەردین بوو، بەرزیەکەی بەقەد قامەتێک و، درێژییەکەی بە ئەندازەی کڕنووشبردنێک و پانییەکەی هێندەی شوێنی دانیشتنێک دەبوو. هیچ کلاوڕۆژنە و پەنجەرەیەکی بۆ هاتنەژوورەوەی تیشکی خۆر، نەبوو. بە ڕۆژی ڕووناک، نقوومی تاریکی بووین. دەرگەکە بە دیوی ژوورەوە، دۆریخێکی دیشی هەبوو. پێی گوتم:
- لێرە خەڵوەت دەکێشم.
- بەڵام خەڵوەتکێشی خوا ئەو مەرجەی ناوێت.
- بەڵام بزانە پچڕاندنی پێوەندی لەگەڵ خەڵکدا ئەوەی گەرەکە.
- نا، پچڕانی پێوەندیی خەڵکیش ئەوەی ناوێت! ئەولیاکان لە ماڵ و بازاڕ و دووکان و مزگەوتەکان خەڵوەت لەگەڵ خوا دەکەن.
بزەیەکی کرد و بەرەو ئاگردان گەڕاینەوە، گوتی:
- ئاخر ئەوان ئەولیای خوان، نەک من! من دەزانم دەروونی من تەنیا بەم جۆرە پاقژ دەبێتەوە. بۆ زانیاریشت، ئەوە نۆ ساڵە موجاهەدە و

ململانێی دەروونم دەکەم، کەچی ئەوە چەند مانگێکی کەمە توانیومە خەڵوەت بەدەست بێنم، هەموو ئەوەی پێشتر ڕیازەی دەروون بووە.

- چی لە خەڵوەتی خۆت فێربوویت، پێم بڵێ؟
بەرەو هەویرەکە گەڕایەوە، بریسکەی ئاگرەکە لە دەموچاوی دەدا، ئێوارەیش نزیک دەبووەوە:
- بەڵێ، نۆساڵ لێرە گۆشەنشینیم کرد تاکوو لە شەڕ و لۆمە و خراپەی خەڵک بەدوور بم، کەچی بە ئاواتی دڵم نەگەیشتم. ڕۆژێک بیرم لەوە کردەوە، من بۆیە لێرە خۆم گۆشەگیر کردەوە تاکوو ئەوان لە شەڕ و ئاشووبی من پارێزراو و بێ زیان بن، بەمە دڵم زۆر خۆش بوو. هەر لەو کاتەوە، وازم لە گۆشەگیری هێنا و دەستم بە خەڵوەتکێشان کرد. برام خەڵوە بەرزترین پلەی گۆشەگیرییە. خەڵوە تۆقەڵامی گۆشەگیرییە.
کە باسی خەڵوەی کرد، بەخیلیم پێ برد، بێ ئەوەی هەست بکەم، چاوەکانم پڕ گریان بوون، گوتم:
- دەی زیاتر بۆم باس بکە.
دەستی لە هەویرشێلان هەڵگرت و چوارمەشقی دانیشت و تەماشای ئاگرەکەی کرد و گوتی:
- تەواوی تەمەنم لەژێر چڕنووکی وەهمدا ژیاوم. تا لەنێو ئەو ئەشکەوتەدا خەڵوەتم لەگەڵ خوادا نەکرد وەهم نەهاتە ژێر ڕکێفم.
گاوێک خامۆش بووین، تەنێ دەنگی قرچەی ئاگر و سمی هێستران، کە بەدر و سودکین بەرەو لامان دەهاتن، دەکەوتە بەر گوێمان. زۆری پێنەچوو، هەرتک هاتن، سودکین وەختێک بینی هەویر لە دەو ئاگرە لەنێو تەشتێک دانراوە، خێرا بەرەو ئاگرەکە چوو و پەنگرەکانی گەش کردنەوە... بەڵام بەدر هاتە پێش و سڵاوی کرد. بەر لەوەی تەوقە لەگەڵ پیاوەکە بکات، بە زەقی لێی ڕاما و قسەی لە قوڕگدا گیربوون. ماوەیەک لە بزاو کەوت، تەنانەت وامنزانی لە هەناسەدان

کەوت. لەبەر زێدە سەرسامبوون خەریک بوو بگریت، ئێمەیش لە قاقای پێکەنینمان دا. دانیشت و قاچەکانی درێژکردن، بەبێدەنگی و خامۆشی، چاوی بەنێوماندا گێڕا.

## ٨٠

"خەسارەت هەر ڕوو دەدات، خەم هەر دەبێتە مێوانمان"

ئیبن عەرەبی

هێشـــتا خۆر نەگەیبووە تاقی ئاســـمانێ، نســـێ لە خوارەوەمان گوم نـەبووبوو، لـە بـەعلـەبـەک بـەســـــەر یـەکـەم مێوانخـانـەی ڕێبوارن هـەڵبووین. پاش ئـەوەی خەلیفە یەعقووبی کوڕی یووســـــف نوێژی بـەیـانی بۆ کردین و بـە چـاوی پڕ گریـان و دڵی خـەمبـارەوە، خواحـافیزی لێ کردین، لـەگـەڵ خۆرهـەڵاتن بـەڕێکـەوتین چـەنـد ســەعاتێک ڕۆیشــتین، لەو چەند نیشــانە کەمەی بە وردی بۆی باس کردین، مەندەهۆش بووین. دوای چەند ڕۆژێک ڕۆیشتن، ئەوە یەکەم مێوانخـانـە بوو ڕێکـەوتی بکـەین. هـەر لـەگـەڵ ئـەوەی بـەدر ئـەو میوانخانەیەی بینی، یەکەوڕاســـت وڵاخەکەی بەســـتەوە و بەر لەمن چووە ژوورەوە، کە پێشتر هەمیشە لەدوای منەوە بوو. لای حەوزی پێشۆرین دانیشت، دڕکوداڵی لە پێیەکانی هێنانە دەر. هەموو خۆمان شۆرد و بە زەیت جەستەمان چەور کرد. سودکین جلەکانی گلدایەوە و خستنیە نێو حەوزی جلشۆرین. پاشـان بۆ ناڵکردنی هێسترەکەی، بردمیە لای تـاقمی نـاڵبـەندان. دوای خۆراوا، لەگەڵ چەندان ڕێبواری دیکە لەســـەر خوانێکی گەورە دانیشـــتین، شـــۆرباو و نان و بڕێک گۆشتیان بۆ دانایین.

دوای ئەوەی خاوەنی مێوانخانە پێی گوتین بۆ مێوانخانەکەی تر، تا دەگەنە (محروس)ـــەی دیمەشق، نۆ تا دە ڕۆژی دیکە دەخایەنێت، بڕیارمان دا لانیکەم، دوو شەو بمێنینەوە. مێوانخانە جمەی دەهات. لە ژوورەکەی مە چوار کەسی دیش هەبوون، سەرەتا لە شێوە و هەیئەتیان وامانزانی موسـڵمانن، بەڵام کە قسـەیان کرد، دەرکەوت مەسـیحین. بە عەرەبییە شـڕ و ڕەکیکەکەیان گوتیان لە ئەنتاکیاوە بەرەو تەڕابلوس دەڕۆین. بەیانی ڕۆژی دواتر پۆشـاکی عەرەبی و کڵاوەکانیان داکەندن و ڕۆتکی تەسـکیان دەبەرکردن و قایشـی پێستییان بەسەرەوە بەست، بەسەر شاڵی پشتی یەکێکیان سەلیبێکی پان شۆڕ بووبووەوە. لەو کاتەدا خاوەنی مێوانخانەکە، کە کەسێکی گرگنی بەخۆوە بوو، هاتە ژوورەوە، بە تینی گڕی ئاگری فڕنی، دەموچاوی سـوور هەڵگەڕابوون. بەدر لەبارەی جلگۆڕی مەسیحییەکان پرسیاری لێ کرد، ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە:

- هەموو ئەوان لەترسـی کوشـتنیان بەدرێژایی ڕێگە بە جلی موسڵمانان خۆیان دەشارنەوە.

وشەی کوشتن بەدری هەراسان کرد، بە دەنگێکی گەورە پرسی:

- کێ دەیانکوژێت؟

سودکین، کە وەک ئەم ترسی لێ نیشتبوو، گوتی:

- چەتە و ڕێگر. ئەوانەی لەوان نین.

خاوەنی مێوانخانەکە دواپارچە نانی نێو سـەلەکەی لە نزیک من دانا و ئینجا سەبەتە بەتاڵەکەی هەڵگرت و بەدەم ڕۆیشتنەوە، گوتی:

- چەتە و ڕێگر لێرە نین. حەشیشخۆرەکانن، تەنیا مەسیحییەکانیش دەکەنە ئامانج.

بەدر ئاهێکی خۆشی پێدا هاتەوە و بە هێمنی دەستی بە خواردنەکە کرد. تەماشای پێیەکانیم کرد، بینیم برینەکانیان هێشتا چاک نەبوون و خوێنێکی کەمیان لێ دەچۆڕێتەوە. دەسـتم پێداهێنان ڕەق و ئاوسابوون، پێستیان وەک بەردی لێ هاتبوو. خستنمە نێو کۆشم و

به خەجاڵەتەوە ویستی لایان بەرێت، توووند گرتنم. دەستم پێداهێنان و سوورەتی یاسینم خوێند. هێوربوویەوە و بە ئارامی و هێواشی نانی خوارد. سوورەتەکەم تەواو کرد، نەختێک خوێنیم سڕییەوە، هەستم کرد هەست بەوە ناکات کە دەست بە برینەکانی دادەهێنم. قونجڕکێکم لە پاژنەی پێی دا، هەستی بە هیچ نەکرد و خۆی سڵ نەکرد. ترسام، تەمام خواست شتی وا ڕوو نەدات. بەڵام ڕووی دا. هێشتا نەگەیشتبووینە مەلەتییە، دوای پێنج هەفتان، پێی ڕاستی بوو بە پارچەگۆشتێکی ڕەش و، خوێنی تێدا نەما، لە ڕێگە بەدوای خۆیدا دەیکێشا. بەدر ڕێگەی نەدا پزیشک لێی بکاتەوە، تاکوو تەواوی قاچەکەیشی مرد. لە کۆتاییدا لەسەر ئەو پارچەدارە پاڵکەوت، کە سەرەتا ڕازی نەبوو پزیشک قاچی لە ئەژنۆوە بە چەقۆ، یان مشار ببڕێتەوە. پاشان بە ئاسنێک داخی کرد، بەدر چەند سەعاتان بێهۆش بوو، من ترسی مردنم لێی هەبوو، بیرم لەوە دەکردەوە چۆن دەکرێ بێی ئەو بژیم؟ بەڵام باش بوو وەخەبەر هاتەوە، دەستی بە وڕێنە کرد و گریا. وەک ئەوەی لە شتێک پەست و بێزار بووبێت و نەشزانێت چییە، لە کارێک توووڕە بێت و دەری نەبڕێت.

# ٨١

**" ئارامگرتن ئەگەر سكاڵای حاڵت بەرەو خوا نەبات، ڕەنج بە خەسار دەبی"**
**ئیبن عەرەبی**

بە درێژایی ڕۆژانی دوای قاچبڕانەوەی، بە سەروکاری بەدرەوە بووم و تیمارم دەکرد. بەر لەو، لە خەو هەڵدەستـام و خواردنم بۆ چێ دەکرد، پاشـان دامدەنیشـاند و بە دەممەوە دەکرد. سـودکین قیاسـی باڵای گرت و چوو لەلای دارتاشـی گەڕەک، گۆچانێکی بۆ دروسـت کرد. برینەکەی چاکبووەوە و زۆر بەباشـی دەیتوانی بە گۆچانەکەی بڕوات، بـەڵام هـەرگیز نـەگەڕایـەوە دۆخی جـارانی. ڕۆژ دوای ڕۆژ، تووڕەیی و بێزاریەکەی دەبووە خەم و خەفەت. بەردەوام شـپرزە و بیرئـاڵۆز بوو، بێدەنگ و خامۆش بوو، مەگەر من وەقسـەم هێنابا. بـەدەر لـە نوێژی هـەینی، بۆ هیچ جێگـەیـەک لـەگـەڵمان دەرنەدەچوو. ژمارەیەک دۆشـەکی لە سـووچێکی ژوورەکەی دانابوون، یەکێکیانی لەبەرپشـت دەنا، لەسـەر دانەیەکیان قاچەکەی تری درێژ دەکرد، لەسـەر هێی سـێیەمیان شـانی دەدایەوە. لە بەردەمیشـی مێزێکی بچووک دانرابوو. ڕاسـتییەکەی، هێزی قاچی لە دەسـتچووی، بۆ دەستەکانی گەڕاوە، خوری دەڕست و لیفە و قەمیسی لێ دروست دەکرد. دۆڵابی کەلوپەلی دەتاشـی و دەینەخشـاند. پاشـان بەسـەر نووسینەوەی کتێبدا، گۆشەگیر بوو. کاغەزمان بۆ دەهێنا و ئەم کتێب

و ئەو کتێبی دەنووسـیـیەوە، تاکوو دەسـتەکانی ڕەش هەڵدەگەڕان. خانوویەکمان بەکرێ گرت، دیوارەکانی بە بەرد دروسـت کرابوون، سـەری بە قرمید گیرابوو، سـتووندەیەکی دارینی درابووە بەر. لە دەرگەوە بە چەند ڕێچکەیەکی تەنگ و تەسک دەگەیشتی، تەنێ یەک کلاوڕۆژنـەی بۆ هـاتنـە ژوورەوەی تیشـکی خۆر هـەبوو. لـە کۆتاییەکەیشی حەوشەیەک هەبوو، دواتر کردمانە باخچە. دوای دوو مانگ لە گەیشتنمان، وەرزی زستان هات، بەدرم لە گەرمترین ژوور دانا، ئاگردانێکی مسـییم لەنزیک دانا، دووکەڵەکەی بۆ حەوشـەکە دەردەچوو. لە شەوە زۆر ساردەکانی زستان، دوو چین حەسیرمان، لـە ژوورەکەی ڕادەخسـت و هـەمووومـان لێی دەخـەوتین. هـەرچی پەردە و لێفێک هەبوو بەسـەر خۆماندا هەڵدەکێشـا. بەدەم ناڵەناڵی بەدر، کە بـەهۆی سـەرماوسـۆڵەوە ئازاری قاچەکەی چەند قات دەبووە، دەخەوتین.  لە یەکێک لەو شەوە ساردانەی زستان، ئیسحاق لە دەرگەی دا. بەر لەوەی سڵاو بکات بە بۆڵەبۆڵەوە گوتی:

- بە نهێنی هاتوویتە وڵاتەکەم و پێشم ناڵێیت؟

توووند لە باوەشم کرد و پێکەنیم:

- بە ڕۆژی ڕوون، لە دەروازەی  شار هاتووینەتە ژوورەوە، نەک بە شـێوەی پەنهان و شـاراوە. ڕێگە بۆ لای تۆ نەبوو، ئاخر دنیایەک وەزیر لەنێوانماندا هەبوون.

ئیسـحاق هاتە ژوورەوە و لە دەوری بەدر دانیشـتین، کە بەدری بەم حاڵە نالەبارە بینی تووشـی شۆک بوو، لەتەکیەوە دانیشت، هەوڵی دا بەسەر ئەسرینەکانیدا زاڵ بێـت و دەم بە مژدە و پێکەنین بێت، بۆ ئەوەی باری خەموخەفەتی بەدر قورستر نەکات. لێم پرسی:

- ئەحواڵت چۆنە؟

- بەردەوام موسافیرم، بە کەمی نەبێت، دارعەسای گەڕیدەیم دانانێم.

- بەرەو کوێ؟

- کەرەتێک دەچمە بەغدا بۆ لای خەلیفە، جارێک دەچمە خزمەت ئیمپراتۆری (نیقیە)، جاری وا هەیە دەچمە لای مەلیکی حەلەب. یان دەڕۆمە لای شـــاژنی (جۆرجیا)، پاشـــان بە هەگبەی پڕ لە نامە و هەواڵ دەگەڕێمەوە لای حەزرەتی ســـوڵتانمان لە قۆنیا. ئەو تاکوو دڵنیا نەبێت، کە لەگەڵ هەموویان نێوانی خۆشـــە و پێوەندیی باشـــە، ئۆقرە ناگرێت.

- ئەوە بۆ ئەو زۆر لە شەڕێک باشترە، کە نە ئاڵای تێدا بشەکێتەوە و نە هیچ کەڵکێک بە دەستەوە بدا.

ئیسحاق هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و قاچەکەی درێژکرد و گوتی:

- شەڕ حەلی نییە. ئێستە سوڵتان خەریکی کۆکردنەوەی سوپایە بۆ ئەنتاڵیە، بڕیارە خۆشی بچێت.

- تۆیش دەچیت؟

- نەخێر. من بەرەو بەغدا دەچم. ســـوڵتان داوای لە خەلیفە کردووە هێندێک شـــێرەکوڕی بۆ بنێرێت، خانەیەکیان لە قۆنیا بۆ دروســـت بکەن.

- چ کارێکی پێن؟

- ئیسحاق بە گاڵتەوە پێکەنی و گوتی:

- موحی چییە پرســـیار لەمە دەکەیت؟ دیارە نەچوویتە بازاڕەکانی مەلەتیە و جۆرەها خەڵکت نەبینیوە؟ لە ئەنازۆڵ وەها تێکەڵ و تێکئاڵقاون، ڕەچەڵەک و ڕێبازی هیچ کەسێکت بۆ ڕوون نابێتەوە.

- ئاخر کاری گەنجان بەمە چییە؟

ئیسحاق شانی خۆی ڕاتەکاند، وەک ئەوەی وەڵامەکە ئاشکرا بێت:

- خەڵک بەم هۆیەوە سەرباز لە نێو سوپای سوڵتان کۆ دەکەنەوە، موجاهیدی ئێشکگر و وڵاتپارێز بە دەنگیانەوە دەچن.

بەبزەوە سەیرێکی ئیسحاقم کرد و پێم گوت:

- دیوانی سەربازی، توانای جاڕدانی خەڵکی بۆ جیهاد و سوپا هەیە. ئەو گەنجانەیش سەرباز نین، ئەوان تاقمێکن ئیمانیان بە خوا هێناوە و خودایش ڕێنوێنیی کردوون.
- سوڵتانیش هەر لەبەر ئیمان و هیدایەتەکەیان دەیەوێت پەلکێشیان بکات.
ڕێکەوڕاست سەیری دەموچاوم کرد و گوتم:
- ئینجا پێت وایە ئیمان و هیدایەت بە خواردنەوەی ئاوێکی سوور و پۆشینی جلی ئەو گەنجانە، وەک لە بەغدا وا دەکەن، بەدی دێت؟
ئیسحاق سەری بە خۆیدا بەردایەوە و بێدەنگ بوو، پشتم بە دیوار دا و چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بووم، دوای تاوێک، گوتی:
- موحی تۆ ڕاست دەکەیت، بەڵام ئەمن قاسیدم، قاسیدیش تەنیا ڕوونکردنەوەی لەسەر شانە. ڕاستییەکەی سوڵتان دەیەوێت ئەو تەرزە گەنجانەی لە بەغدا هەن، لە قۆنیایش هەبن. بتوانن لەبری ئەوەی گەنجانی قۆنیا بێسوود لە ڕێگە و کوچەکان بسووڕێنەوە و خەڵک ئازار بدەن، بۆ جیهاد سازیان بکەن.
پاشان چاوە پڕ حەسرەتەکانی بەرزکردنەوە و گوتی:
- قسەی هەق هەر ئەوەیە من بۆم کردی. خڕکردنەوەی سوپا هێندە ئاسان نییە، با هەر چەند سوڵتان بەخشش و مووچە و دەستکەوتیشیان بۆ زیاد بکات. هەموو دوژمنەکانیشی بە وێنەی ئەو خۆیان ساز و تەیار دەکەن، لە ماوەی یەک سەعاتدا دۆخەکە ئاوەژوو دەبێتەوە، پەلامار دەبێتە ڕاکەڕاک و هەڵهاتن. خەڵک لە سوپادا تێکەڵ بوون، لە یەک فیرقەدا سەربازی عەرەب و بولگاری و ئەرمەن و ڕۆما و کەرەجی هەن، بەشێکیان لە دوو ڕیز و دوو لیوادا شەڕیان کردووە. ئینجا دەبێ کێ متمانە بە سوپایەکی وەها بکات؟
ئیسحاق چاوەڕوانی ڕوونکردنەوی منی لەبارەی قسەکەیەوە نەکرد، بەڵکە لەناکاو وەستا و پاشان گوتی:

- دەبێ من بڕۆم. لەنێو بارەکەمدا دیاری گرانبەها لە سـولْتانەوە بۆ خەلیفە نێردراون، دەبێ بەر لەوەی تاریکیی دابێت، تەسلیمی کۆشکی والییان بکەم.
ئاورێکی لە بەدر دایەوە، کە گوێی لە قسـەی ئێمە گرتبوو، بەسـەر ڕووشـی، بزەیەکی خەمناک لەنگەری گرتبوو. باوەشـی پێدا کرد و نێوچاوانی ماچ کرد، پاشـان منیشـی لە باوەش گرت و خوداحافیزی لێ کردم و گوتی:
- لە گەڕانەوەمدا، بە مەلەتیەدا دەڕۆم.
- بە خێر و خۆشی برایەکەم.
سودکین لە دەرگە بەڕێی کرد، کاتێک گەڕایەوە، پێم گوت:
- کاغەز و قەڵەمێکم بۆ بێنە.
ئەوەی داوام کرد، سودکین بۆ هێنام، چوارمەشقی دانیشتم و داوای یارمەتیم لە خوا کرد و دەسـتم بە نووسـین کرد: "بەناوی خوای بەهێز و مەتین، ئەو خوایەی کە گەنجانی بۆ ئەشکەوت نارد، زۆر لە دەماری بناگوێیان نزیکترە. پاشـان، لەو باسـەدا دەمەوێت گەنجان بناسـێنم، پلە و پایەیان بخەمە ڕوو، چینەکانیان باس بکەم و نهێنیی کەسانی جوامێر و سەردەستەکانیان بنووسمەوە."

# ٨٢

"حیکمەت ئەگەر دادوەری پێ نەکرا، نابێتە جێی هومێد"
ئیبن عەرەبی

بەیانییەک بۆم دەرکەوت، کە پێویستە ئیتر نیشتەجێ بین و چیتر بەملاولادا نەڕۆین. تازە مادەم هاوەڵەکەم بە یەک قاچ مایەوە، سەفەر و ڕۆیشتن، هێندە سێنا نییە، ئەوەتە هاوژینەکەیشم لە ماردین گەیشت. پەنجا ساڵەی تەمەنیشم وەک ژەنگ لەسەر جومگەکانم نیشتووە. دوا مێخیشم لێرە لە جێگەیەک، چاوەڕێم دەکات. بەراورد بە نووسین، سۆزی گەشتکردنم خەفە بووە. هەموو شتێک لەمەلەتییە ئاماژەی مانەوەمان بۆ دەکەن: زستانی سارد، کە وای لێ کردووم گۆشەگیر بم، بۆ نووسین و کتێبدانان لە ماڵەوە لێ ببڕێم. شەوە درێژەکانی، وام لێ دەکەن حەز بە نوێژکردن بکەم و خەڵوەت ببەستم. هەروە ئەو چەند عەرەبەی لێرە هەن، کە بەهۆی پێچەی گەورە و سیمای گەنمییان دەناسرێنەوە، هێمای مانەوەم بۆ دەکەن. فاتیمەیش دووگیانە و سکی خڕبووە، ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ نەڕۆیشتنم.
ڕاستییەکەی ئەمن فاتیمەم خۆش دەوێت، ناشزانم ئەو منی خۆش دەوێت، یان نا. لە چاوەکانیدا شتێک هەیە دەڵێت هێشتا ئالوودەی عیشقی شەهیدە جوانەمەرگەکەیەتی. ئەو گەنجێک بووە لە شلکە و

هەڕەتی لاویەتیدا بووە. مادەم لە ڕیزی ئەو ســەربازانەی مەلیکیش بووە، کە بۆ کاری تایبەتی خۆی ڕەوانی کردوون، دەبێ بەژن و قیافەیەکی ڕێک و جوانیشی هەبووبێت. کەچی ئێستە لەگەڵ کەسێکی لەڕ و کزۆڵی وەک من ژیان بەســەر دەبات، کە قژی پێشــەســەرم ڕووتاوەتەوە، لاجانگەکانم سپی بوون. لە کاتێکدا ئەو، هێشتا سی ساڵی تێنەپەڕاندووە. قژی درێژی، وەک هیی لەیلای عاشقە. وەک ژنانی مەککەیش، ڕەنگی پێســتی گەنمییە. ئەندامەکانی هێندە ورد و جوان و ڕێکوپێکن، دەڵێی لەگەڵ تەمەنی ئەودا گەورە نەبوون.

لەوە ناچێت وەڵامی پرســیاری خۆشــەویســتی، هیچ چتێک لەو دۆخەمان بگۆڕێت. هەمووشتێک زۆر ئاسایی دەڕوات، وەک ئەوەی دەســتی ژیان هێما بۆ ســینەم و ئەرزی مەلەتییەی ســەوز بکەن. فاتیمە لە باخچەی ماڵمان خیار و تەرۆزی و پاقلە و کەرەوزی چاندبوون. ئەو دارقەیسییەی چاندمان، بە ماوەی شەش ساڵ گەورە بوو، نســێی بۆ کردین و بەری دا، تەنانەت لە پێویســتیی ئێمەیش زیادی دەکرد، ســودکین دەیبردە مزگەوت و بەســەر هەژار و دێوانانیدا دەبەشیەوە.

دوای چەند مانگێک ئیســحاق بەســەرکەتوویی گەڕایەوە، تاقمێکی هەرزەکاری بۆ مەشــق و فێرکردنی منداڵان هێنابوون، هەروە دەستەیەک مامۆستایشی هاوردبوو تا لە مزگەوتەکاندا وانەیان پێ بدەنەوە. ئیســحاق هات لای من نانی خوارد و گوتی لە مەلەتییە دەمێنمەوە، چونکە ســوڵتان بەڕێوەیە و دەیەوێت غەزوی ئەرمەن بکات. دوای چەند هەفتەیەک، مەلەتییەی بچووک، بەهۆی ســوپا و دەستوپێوەندی سوڵتانەوە، کەوتە ژاوەژاو.

وەک سودکین بۆی باسکردم، سوڵتان بە سواری ئەسپێکی ڕۆمیی پشــت و پاشــۆڵ گەورە، بەنێو خەڵکدا دەســووڕێتەوە. خەڵکەکەیش تاکوو سوڵتان دەگاتەوە شوێنی حەوانەوەی لە کۆشکی والی، وەک گوزارشــکردن لە خۆشــحاڵیی خۆیان، گوڵ دەخەنە ژێر ســمی

ئەسپەکەی. ئەو بەیانییە ئیسحاق لەگەڵ سوڵتان دەرچوو، هەم دەرسی ڕۆژانە و هەمیش قسە و باسوخواسی شەوانەمان لە کیس چوو.
هێشتا زۆر بەسەر فیراقەکەماندا تێنەپەڕیبوو. هەر چوار ڕۆژێک دەبوو سوڵتان گەیشتبوو، ئیسحاق لەگەڵ ئەمیری دەوێتی سوڵتان هات، وەک جەنگاوەرێک لە مانۆڕی سەربازیدا، لەبەردەمم وەستا، نامەیەکی دەرهێنا و کردیەوە:
- گەورەم مەولانا موحیەدین، سوڵتان (عیزەدین کەیکاوس) داوای کردووە ئەمڕۆ لە مەجلیسی ئەو ئامادە بیت.
ئیسحاق بزەیەکی کرد، وەک بڵێی لە بانگهێشتەکەم حاڵییە. منیش ڕەزامەندیی خۆم بە ئەمیری دەوێت ڕاگەیاند و ڕۆیشت. تەنیا ئیسحاقم لەلا مایەوە، ڕوخسەتم خواست بچم خۆم بشۆم و جلی نوێ بپۆشم. داوام لە فاتیمە کرد جلەکانم بۆ ئامادە بکات، ئەویش قەمیس و جوبەی لە باولەی جلکان بۆ دەرهێنام و بەپەلە ڕای تەکاندن. پاشان پێچەیەکی خاوێنی بۆ هێنام، کە ڕۆژانی هەینی لەسەرم دەنا. بە جوانترین شێوە خۆم ڕازاندەوە. گوڵاو و بۆنی بنەوشەم لە خۆ دا، کە خەڵکی ئەنازۆڵ حەزیان پێ دەکرد. گەڕامەوە لای ئیسحاق، وا دیاربوو لە کاتی چوونم بۆ ژوورەکەم، تا هاتنە دەرەوەم، بزە لەسەر ڕووی نەڕۆیشتبوو.
لە ماڵ هاتینە دەرەوە، تەختیرەوان، کە یەک بەرێگە تەنگ و تەسکەکەی بەردەم ماڵمان بوو، بۆمان ئامادە کرابوو. پێکەوە سەرکەوتین، بە دوو ئەسپ ئێمەیان بە تەختیرەوان بردە کۆشکی والی. لە ڕێگە خەڵک سەری خۆیان دەهێنایە نێو تەختەکە تاکوو بزانن کێی تێدایە. کۆمەڵە منداڵێک دوامان کەوتن، تا کۆشکی والی لەدوومان نەبوونەوە. داخڵی کۆشکەکە بووین، ڕێڕەوەکانی تەسک نەبوون، دەلاقە دە دیوارەکانیدا بوون، هەوای گەرمی ئاگریان تێدا دەهاتە ژوورەوە، دیارە ئاگر لەسەر بانی کۆشکەکە هەڵدەکرا، بە

هەوای گەرمی ئەو ئاگرە، ڕێڕەو و ژوورەکانی کۆشـــکەکە گەرم دەبوونەوە. دوای کەمێک ڕۆیشـــتین، گەیشـــتینە ژوورێکی بەرین و فراوان، لەناوەڕاســـتەکەی کورســـییەک بۆ ســـوڵتان دانرابوو. خەڵک بەدەوریەوە لەســـەر دۆشـــەکی خوری و لۆکە دادەنیشـــتن. ئێمەیش لەنزیک کورسییەکە دانیشتین، گوێمان لە دەنگەدەنگی نێو ڕێڕەوەکان بوو، هەواڵی هاتنی ســـوڵتانیان دەدا. هەر لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی بە چەناگەی لووس و نەرم و ســـمێڵی چڕوپڕی، ئەوانەی لەبیر کرد، کە قسەیان لەگەڵ دەکرد، بۆ لای من هات و بە توندی دەباوەشی گرتم. ڕوومەتەکانی ماچ کردم و منیش ڕوومەتەکانیم ماچ کردنەوە. پاشان بە عەرەبییەکی ڕوون و ڕەوان بە شێوەئاخاوتنی تورکانە، گوتی:

- ســـڵاو لە دەریای هەقیقەت، شـــێخی هەموومان، ئیبن عەرەبی. مەلەتییەت بەرەکەتدار کرد، هەموو ئەنازۆڵت پڕ خێروبێر کرد.

- بەرەکەت لە خواوەیە، لێی دەپاڕێمەوە خۆت و دەســـتەڵاتت بە پیت و بەرەکەت بکات.

- پێم خۆشـــە لەلامان بمێنییەوە تا نوورڕژێنمان بکەیت و ســـوود لە زانستت وەربگرین.

- خوا تەمەنی سوڵتان درێژ بکات.

ســـوڵتان ئاوڕێکی بۆ لای ئیســـحاق دایەوە و بە تورکمانی قســـەیەکی پێ گوت، تێی نەگەیشـــتم. دوای ئەوەی لەنێو خۆیان قســـەیان کرد، ئیسحاق ڕووی لە من کرد و بە زمانی عەرەبی بە سوڵتانی گوت:

- مەولانا بێگومان ئەوە مەزنترین مێوانە پێی ناوەتە شاری مەلەتییە.

سوڵتانیش بە زمانی عەرەبی و ڕوویەکی خۆشەوە گوتی:

- بێگومان... بێگومان.

ســـوڵتان زۆر بەســـۆز دیاربوو، ناوەناوە لای لێ کردمەوە و دووپاتە و ســـێ پاتە و چەند پاتە بەخێرهاتنی کردم. کە وەختی نوێژ هات، داوای کرد بەرماڵ ڕاخەن، مکووڕ بوو لەســـەر ئەوەی پێشنوێژییان بۆ بکەم. پێشنوێژیم بۆ ئەو و ئیسحاق کرد. دوای تەواوبوونی نوێژ،

داوای خواردنی کرد، گۆشـــتی کاوڕی برژاویان هێنا و لەپێشـــیان دانایەن. تاکوو (جاشـنکیر) تامی نەکرد، سـولْتان دەسـتی بۆ نەبرد. جاشنکیر پشکێکی خستە دەم و جاوی و قوتی دا، ئینجا بۆ سووچی ژوورەکە کشـــایەوە. دواتر ســولْتان خواردی و بەدەســتی خۆی پشکەگۆشتێکی لێ کردەوە و لەبەردەمی منی دانا.

ئەوەندەی کرا خواردمان، دواتر شیرێکی ساردمان خواردەوە. پاشان خزمـەتکار خواردنـەکەی هەلْگرت و مەقەلْی هێنا، بخوورێکی زۆری بەســـەرەوە بوو، بەنێو ئێمەیاندا گێڕا، ئینجا ئاویان هێنا و دەسـتمان شۆرد. پاشان قاپلەمەیەکی پڕ بەڕوو و مەقەلْی بچووکیان بۆ هێنایەن. سـولْتان بەڕووی دەیخسـتنە سـەر مەقەلە و دەترۆقین، بە دەسـتی خۆی توێکلْی دەکردن و بـەچێژەوە دەیخواردن. ئێمـەیش وەک ئەومان دەکرد. مەلیک هەرچییەکی لەبارەی ئامادەکردنی ســوپا بە زیهندا هات، گوتی. نەخشـــەی بۆ جەنگی ئەرمەن داڕشـــت، هەروە لـەبارەی ئەو نامانەی لیۆنی دووەم، کە بۆ ئاشـــتەوایی، یەکبەدوای یەک بۆی هاتبوون. پاشـان دەسـتی لە تۆزوتالْی بەڕوان داوەشـاندن و گەرموگوڕی لە سیمایەوە دەرکەوت، ئینجا تەویلْی تێکنا و گوتی:

- گەورەم! حەزم کرد لەبارەی شتێکەوە ڕاوێژت پێ بکەم.

- لەبارەی چی؟

- تۆ خۆت دەزانی لـە ئـەنتـالْیا چی ڕووی دا. فەڕەنگەکان پەلاماریان دا و داگیریان کرد. ژمارەیەکی زۆری موسلْمانانیان کوشت.

- بەلْێ ئەوەم زانیوە.

- لەوانەیە ئەوەیش بزانی، کە ئەگەر لەبەر مەســـیحییەکانی ئەنتاکیە نەبوایە، ئەوان سـەرنەدەکەوتن، ئاخر ئەوان دەسـتباریان بۆ گرتن و هاوکارییان کردن، بەمەیش خیانەتیان لە بەلْێنەکەیان کرد.

- بەلْێ.

- پێت وا نییـە لـە دالْدەدانیـانـدا هـەلْـەم؟ تۆ دەزانی مەلەتییە و قۆنیا گاوریان زۆرە و منیش متمانەیان پێ ناکەم.

سوڵتان تاوێک بێدەنگ بوو، لە چاوەڕوانی وەڵامدا، چاوەکانی دە من بڕین، هەروەک ئەوەی باوەڕی بە قسەکانم نەبێت.
- جەنابی سوڵتان...
سـوڵتان خۆی لەسـەر دەسـتی ڕاسـت وەرگێڕا و بەسـەر دەسـتی چەپدا شانی دایەوە، زۆر بە وریایی و ئاگادارییەوە گوێی گرتبوو:
- هەواڵی (مجریت)ت پێ نەگەیشتووە؟
- چ هەواڵێک قوربان!
- چۆن هـەواڵی شـــکســتی موســـڵمانانت لەبەرانبەر فەرەنگەکان نـەزانیوە، کە لەبەرەوەی دەیانگوت: (لااله الاالله) ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشـتن؟ بزانە ئەوان لە وڵاتی مە دوورن و لە خاکێکی دیکەن، کەچی هاتن پشتی گاورانیان گرت و هەرەسیان بە موسڵمانان هێنا.
سـوڵتان مەیلانێکی کرد، وەک ئەوەی چاوەنۆڕیی ئامۆژگاری نەبێت، بە دەست ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد و گوتی:
- ئەو، دین و سەربازگەلی خۆی لە هەموو جێگەیەک سەر دەخات.
- تۆ ســـکاڵا لە گاوران دەکەیت، بەڵام هۆیەکەی خۆتی، نەک ئەوان. دیمـەن و ڕوخســـاری کوفرت لە وڵات بڵاوکردووەتەوە. ئەوەی تۆ لەگەڵ ئەوان دەیکەیت، ڕەفتاری ئیبن مەردەنیشـــم لە مورســـییە بیر دەخـاتـەوە، کـاتێـک گـاورەکـانی لـە وڵات جێگیر کرد و دین و دەستەڵاتەکەی دۆڕاند.
- ئەی گەورەم چی بکەم؟
- عومـەری کوڕی خـەتتـاب لـەگـەڵ ئـەهلی زیمـە چیی کرد، تۆیش وا بکە.
سـوڵتان بە مەندەهۆشـییەوە ئەبرۆکانی هەڵدان و سـەر و سیمای بۆ کەسێکی لۆمەکار گۆڕا، گاڵتەی بە قسەکەی من هات و گوتی:
- گەورەم! زەمانە گۆڕاوە. دەتەوێت داوا لە مەســـیحییەکان بکەم بە ســـەرشـۆڕی ســـەرانە بدەن و زونار لە پشــتیان ببەسـتن، لەکاتێکدا

لەسەر سنووری ئەواندایین و زۆربەی خەڵکی بەردەستیشمان لەسەر دینی وانن؟

- نا، زەمانە هەر زەمانی خودایە، ئێستا و ڕابردوو و داهاتوو، هەر لەژێر ڕکێفی ئەوە.

سوڵتان چاوی لەمن لادان و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- سەختە، قوربان سەختە!

- ڕاستەکەی سوڵتان، کارەکە سەختە.

دوای نوێژی مەغریب لە مەجلیسەکەی سوڵتان مەرەخەس بووم. بەر لەوەی وەسەر تەختیرەوان بکەوم دەرگەوانەکەی هات و نامەیەکی داخراوی دامێ و گوتی:

- یا شێخ ئەوە دیاریی سوڵتانە: خانوویەکی نوێیە لە گەڕەکی (قسوور).

داوای لە کارمەندێکی کۆشک کرد خانووەکەم نیشان بدات. سوپاسم کرد و کاغەزەکەم خستە بەر پشتم و نەمکردەوە. بە ئەسپەکانی تەختیرەوان وەڕێ کەوتن، ئیتر گوێم لە دەنگی سمەکانیان گرت، کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک دایاندەنان و بەرزیان دەکردنەوە.

ئەم دیارییە گەورەیەی سوڵتان نەک خۆشحاڵی نەکردم، بەڵکوو دڵیشی گوشیم.

ترسام لەوەی، بەبۆنەی ئەم دیارییەوە منەتم بەسەردا بکات و کلام بکا. ماوەیەک هەستم بە توورەیەکی زۆر کرد، ڕاستییەکەی لە قبووڵکردنی پەژیوان بوومەوە، ئێ نەشدەکرا تازە بەسەریدا بدەمەوە، چەشنی کەسێ، کە سەرەتا قایل بێت و دواتر پاشگەز بێتەوە. چاوەکانم قووچاندن و داوام لە خوا کرد بەر لەوەی بگەمەوە ماڵ، لەو ناخۆشی و چەڵەمەیە ڕزگارم بکات. چەند خولەکێکی پێنەچوو، خوا بە هانامەوە هات. کابرایەکی سواڵکەر بە لۆقەلۆق، بەرەو تەختیرەوان هات، یەک بە دەنگی خۆی هاواری کرد:

- گەورەم خێرێکم پێ بکە... منداڵەکانم برسین و منیش نەخۆشم.

مشـــوورخۆری تەختیرەوانم دەنگ دا و ئەســـپەکانی وەســـتاندن.
سواڵکەر لەمن نزیک بووەوە، چاوەکانی پڕبوون لە تەما و ئومێد.
دیســـــان بـە دەنگێکی نزمتر تکاکـەی پـاتـە کردەوە. بـە ســـۆزەوە سەری هەژاند، پەنجەکانی هەڵگوشین و سۆزی منی خرۆشاند:
- گەورەم هەژار و برسیم. خێرێکم پێ بکە، خوا خێرت پێ بکات.
- کاغەزەکەم لەبەر پشتم دەرهێنا و دامێ و پێم گوت:
- تەنیا ئەو خانووەم هەیە... ئەوەیش بۆ تۆ.

# ٨٣

**"هەقی بچووکان بدە"**

**ئیبن عەرەبی**

ســـولّتان لە مەلەتییە بەرەو (ســـینوب) ڕۆیشـــت، هەوڵی دا گوررزی یەکەم لە لیۆنی دوژمنی بســـرەوێنێت. ئیســـحاق بەر لە ڕۆیشـــتنی لەگەڵ هاوژینەکەی و محەمەدی کوڕە دوو ســـاڵانەکەی، هاتنە لام. کە هاتنە ژوورەوە، محەمەدی خستە باوەشـم، توونـد بە سـینەمەوە گوشـیم، پێکەنی و چەچە بچووکەکانی خسـتە نێو ڕیشـم و دەسـتی بەنێو چاوانمدا هێنا، هەوڵی دا پێچە لەســـەرم بێنێتە خوارەوە. من و ئیســـحاق و ســـودکین و بەدر لەنێو باخچە لەســـەر بەڕێکی بچووک دانیشـتین، هاوژینەکانیشمان لە ژوورەوە مەجلیسیان گەرم کردبوو. محەمەد لەنێوان گوڵاوی شـــیناورد دەهات و دەچوو، دەســـتی بۆ پەلکی ناسـکی یاسەمین دەبرد. قەیسییەک کەوتە خوارەوە، تەماشای کرد و گرتی و بە سینەی باوکی دادا، ئیسحاق لە قرتەی پێکەنینی دا و گوتی:

- ئامانجەکەی پێکا... شـــایانی ئەوەیە ببێتە بچووکترین جەنگاوەری سوپای سولّتان!

لەمیانی تێڕامانی ئەو منداڵە بچووکە، کەشـفی خودا نیشـانی دام چی بەسـەـــەر (مجریت)دا دێت و موســـڵمانان چۆن تووشـــی دۆڕان و

شـكسـت دێن. فەرەنگەکان پۆلێک ئەسـیر بۆ بازاڕ دەبەن و وەک کۆیلە مامەڵەی فرۆشتنیان پێ دەکەن. پاشـان (ئەلفۆنسـۆ) پەلاماری تـەواوی ئـەو قـەڵایـانـە دەدا، کـە موەحیـدەکـانی لێ هـەڵاتوون، منداڵەکانیان لەنێو چەند گالیسکەیەک گل دەداتەوە. دە تا بیست منداڵ دەخەنە نێو گالیسکەیەک و بۆ چارەنووسێکی نادیاریان دەبەن و بۆ هەتاهەتایە کەسوکاریان نابیننەوە. ئەو محەمەدەی لە باخچە گەمە و گاڵتە دەکات، نازانم بۆ وا بەخەیاڵم دادێت، کە ئەویش یەکێک دەبێ لەو منداڵانە. ڕاستییەکەی بەم خەیاڵەی خۆم پەست بووم، ڕووم لە ئیسحاق کرد و گوتم:

- چۆن دڵت دێت ئەو منداڵە لەگەڵ خۆت بۆ شەڕ بەریت؟

ئیسحاق زەردەیەکی کرد و خێرا وەڵامی دامەوە:

- پێم وانییە جەنگێکی توند و تیژ بێت... نامەکانی لیۆن، یەک لەدوای یەک داوای ئاشتەوایی لە سوڵتان دەکەن، بەڵام سوڵتان بە ئومێدی ئەوەی لیۆن پتر ملکەچ بێت، خۆی لە خەتی مەیلان داوە. گاهێک خەونەکەمان بەدی هات، یەکەوڕاست دەگەڕێینەوە قۆنیا.

- لە ڕێی گەڕانەوەتدا، بە مەلەتییەدا دێیەوە، یان سیواس؟

- بێگومان بە مەلەتییەدا.

- دەی مادەم گوێ بگرە. ئەو منداڵە با لە ماڵی من بمێنێتەوە و فاتیمە ئاگای لێ بێت. ئەگەر حەزیش دەکەیت هاوژینەکەت ببە، ئەگەرنا با لای منداڵەکەی بمێنێتەوە.

- بەڵام بیری دەکەم، بەردەوام لە سەفەردام و کاتی لەگەڵدا بەسەر دەبەم. دیسان ناشمەوێت ئەرک بخەمە سەر تۆ.

- تکایە بەزەییت پێدا بێتەوە و لە مەترسی پەنای بدە.

لە کۆتاییدا ئیسحاق ڕازی بوو. بانگی سەفیەی ژنی کرد و ئەمەی پێ گوت، ژنەکەیش ئاشکرا پێی گوت:

- ئەمنیش لەگەڵ ئەو دەمێنمەوە.

بەرلەوەی ئیسحاق وەڵام بداتەوە، گوتم:

- زۆرباشـــە لێرە بمێنەوە. منیش ژووری هاوەڵەکانمت بۆ چۆڵ دەکەم.
سودکین ڕووی تێکردم و بەشێوەی داخوازی گوتی:
- ژوورێکیش بۆ ئێمە بەکرێ بگرە، بەڵام با لەبەر بەدر ڕێڕەوەکەی تەخت و سینا بێت.
ئیســـحاق خۆی ئامادەکرد و لەکن دەرگە کوڕەکەی گرتە باوەش و یاری لەگەڵدا کرد. پرســـاری لەمن کرد داخۆ لەچیدا بە من دەچێت. پێم گوت ئەگەر حەز دەکەیت نازناوێکی لێ بنێ، گوتی نامەوێت من لێی بنێم. لە دوو چاوە قووڵەکانی منداڵەکە ڕامام، زەینەبی کچم هاتەوە بیر، کە لە تەمەنێکی بچووکدا، بە دەســتی خۆم کفن و دەفنم کرد، ئەی ئەگەر ئێســـتا مابوایە، بە بەرگی بووکینی بۆ ماڵی زاوا دەڕازێنرایەوە. ئەو خەیاڵە ئەســـرینی لە چاو داباراندم، باوەشـــم کردەوە و بانگی محەمەدم کرد، بە خەندەی ناسکیەوە هات و منیش هەڵم گرت و بە ئیسحاقم گوت:
- بە ئیزنی خوا نازناوی "سەدرەدین"ی لێ دەنێین. ڕازییت؟
- جوانترین نازناوە.
- ... ئەگەر خوا تەمەنی درێژکردم فێری ڕێباز و مەنهەجی خۆمی دەکەم. داوا لە خوا دەکەم دەرگەی مەعریفەی ئاسمان و ئەسراری قودسی بۆ بکاتەوە.
ئیسحاق ئۆقرەی بە قسەکانی من گرت. باوەشی بە من و کوڕەکەی داکرد و خوداحافیزی لە هاوژینەکەی کرد و ڕۆیشت.
دوای چەند هەفتەیەک ئەو کوڕە بووە ســـەبووریی ماڵمان و ئەو ناوەی پڕ خۆشـــی و شـــادی کرد. هەر کە منی دەبینی خەریکی نووســـینم، بە پێی لەحوبر وەرچووی دەهات وەســـەر کاغەز و پەڕاوەکانم دەکەوت و پیســـی دەکردن. ئەگەر ڕێگریم لێ کردبا لە دەورم دەسووڕایەوە، دواتر سەر پشتم دەکەوت و پێچەی لەسەر دەهێنامە خوارەوە و لەســـەری خۆی دەنا، ســـەر و دەموچاوی

دەکەوتنە ناو و دونیای نەدەدیت. دیسـان بەرزی دەکردەوە بۆ وەی جارێکی دی ڕووناکی ببینێتەوە، پاشـان دەیخسـتەوە سـەری. بە ڕووناکی و تاریکی سـەرچاوەکانی پێدەکەنی و منیش وەپێکەنین دەهێنا. سـودکین لە بازاڕ بزنێکی بە کاری بۆ هێنا، بەدرێژایی ڕۆژ، تا ماندووبوو لەو باخچە بەدوای ئەو کارەوە بوو. دەیوست بیگرێت، بەڵام لەگەڵی بەردەبووەوە. هێندێک جار دەکەوتە بەر پێی کاریلە و دەڕووشا، بە گریانەوە، هانای بۆ من دەهێنا.
فاتیمە کەوتە ژانی منداڵبوون. لە سێیەکی شەو لە زیڕە و قژەی ئەو وەئاگا هاتم. چووم سـەفیە بانگ بکەم، لەپێش دەرگەیان وەسـتام، دیاربوو سەدرەدینی کڕ دەکردەوە، کە بەهۆی گریە و هاواری فاتیمە بناری گرتبوو. سـەدرەدینم لێ وەرگرت و هەوڵمدا کڕی بکەمەوە و ترس و بیمی بڕەوێنمەوە. ئەویش گورج کەلوپەلی منداڵبوون، کە پێشـتر فاتیمە دانابوون، بردنی و چووە ژوورەکەی فاتیمە و دەرگەی داخسـت. نە من خەوتم و نە سـەدرەدین. ناوەناوە فاتیمە قیژەیەکی دەکرد، دەمگوت ئەوە دوا ژانیەتی، سەفیە لەپشت دەرگەوە دەیگوت:
- هێشتا ماویەتی قوربان!
ڕۆژ بووەوە، لەگەڵ سەدرەدین بۆ نوێژ چووین. دوای نوێژی بەیانی خەڵک لە حاڵی فاتیمەیان دەپرسی، ئاخر گوێیان لە ناڵە و قیژەی ئەو بووبوو، پێم گوتن هێشـتا ژان بەری نەداوە. چوومە ماڵ و دەرگەم پێوەدا و لە دەرگە درا، سـێ ژنی کۆڵان بۆ ڕزگارکردنی فاتیمە هاتبوون. ئەوان چوونە ژوورەوە و منیش چوومە بەر بزنەکە، بۆ سەدرەدین شیرم لێی دۆشت. هێشتا سـتڵەکەم پڕ شیر نەکردبوو، زیقەزیقی مەلۆتکە و تیلەلیلی ژنانم هاتە بەرگوێ. دانیشـم ئەوەندەی خوا حەز بکات گریام، بزن و کاریلەی بەسـتەزمانیش نەیانزانی بۆچی هێندە بە کوڵ گریام!
سەفیە منداڵەکەی بۆ هێنام و بە کەیفخۆشییەکی زۆرەوە گوتی:

- کوڕ... گەورەم ... کوڕ.
تەماشـای چاوی نووقاو و دەمی چکۆڵە و سـەری تەڕیم کرد، چەند چرکەیەک زەمین منی سووڕاندەوە. کوڕ، لە کاتێکدا من پەنجا ساڵم تێپەڕاند؟ سـوپاس و سـتایش بۆ تۆ خوای تاقانە. ئەو نیعمەتەی بە زەکەریات دا ئەوە بە منیشـت دا. منی پیر و کەنەفت و کەلەلا. مەلۆتکەکە زیقەیەکی کرد و توند بە سـینگمەوە گوشـی. لێوەکانم بردنە بناگوێی و بانگم بە گوێدا دا. وشـەکان هێندە تەڕ و خۆش بوون، دەڵێی یەکەم جاربوون بەسەر زمانمدا دێن. سەفیە پێی گوتم ئەگەر حەز دەکەیت خۆت مەلاشـووی شـیرین بکە یان بۆ لای ژنە لێزانەکەی هاوسـێمان دەبەم، منیش ڕێگەیم دا بۆ لای ژنەکەی ببات. مەلۆتکەم دایەوە دەست سـەفیە، بۆ یەکەم جار هەستم بە دەزووی فیراقی کرد. لە خۆشـییان نەمدەزانی چی بکەم، لەبەردەم ژوورەکەم وەسـتام چاوەڕێی ئەوە بووم کوڕەکەم لە باوەش بگرمەوە. دوای کەمێک سەفیە گەڕایەوە و گوتی:
- فاتیمە دەڵێ ناوی چی بکەین؟
لە دەرگەی ژووری فاتیمە نزیکبوومەوە و بانگی فاتیمەم کرد بە دەنگێکی کز وەلامی دامەوە. پێم گوت:
- فاتیمە ڕێگەم بدە ناوی لێ بنێم (عیمادەدین)، ناوی مێردی شەهیدبووت.
بۆ چەند چرکەیەک فاتیمە بێهەست بوو، دواتر دەسـتی بە شـین و گریان کرد.

## ٨٤

**دەستنووسێك لە دیمەشقەوە**
١٣٤٤ك/١٩٢٥ز

لە خەو هەستام و دانیشتم، دەستێکم لە شانی خانم دا، کە لەتەک مندا خەوتبوو:
- لوتفییە هەستە.
- ئەبووحاتەم هێشتا ماویەتی بۆ بەیانی.
- بە کەیفی خۆتبە... زۆر خەوتی.
دەستم دایە سەعاتە خڕەکەی بان مێزە لاتەریکەکە، بەرەو گەرماو چووم و پێم گوت:
- دوای چارەکێکی دیکە قەسف دەست پێ دەکات، دیارە ئەتۆ بە ڕمبەی بۆمبان لە خەو ڕادەبیت!
خۆم شۆرد و دەستنوێژم هەڵگرت. بەرماڵم لە سووچەکە ڕاخست و نوێژم دابەست، لەوەتەی لەو دۆخەدا خۆم لە چوونە مزگەوت گرتووەتەوە، لەم سووچە نوێژ دەکەم. لەنێو نوێژدا بووم، خانووەکەمان بە دەنگی یەکەم بۆمب لەرایەوە. لوتفییە لە خەو ڕاچڵەکی، وەک نەریتی هەمیشەی لە کاتی دەسپێکردنی قەسفدا، دەستی بە واوەیلا کرد، وەک ئەوەی سێ ڕۆژی پێشتر، لە سەعات

چوار ئەو قەســــفە نەکرابێت. ئەو فەڕەنســــیانە وردیلە و بەوەجن، تەنانەت لە خشتوورکردنی شارەکەی ئێمەیشدا.
لە نوێژ بوومەوە، بۆ تەواوکردنی زیکر و تەسبێحاتم، پشتم بە دیوار دا، لوتفییەش بەســــەر پەنجەرەکاندا دەگەڕا، تاکوو لە پێوەدان و گرتنیان دڵنیا بێتەوە، وەک بڵێی بۆمب ناکەونە ســــەربان و لە پەنجەرەکان دەخزێنە ژوورەوە. ئەو قەســــفە یەک پەنجەرەی بە ساغی نەهێشتبووەوە، هەمووی شەقوپەق کردن. پەنجەرەکانی ماڵی مەیش، وەک تەواوی پەنجەرەکانی خەڵک، یەک بە دوای یەک، وردوخاش بوون. هێندێک بە قوماش و بەشــــێک بە تەختەدار گرتبوونیان. هیچ بەرگرێک بۆ گرتنەوەی دەنگ لەنێوانماندا نییە، هەموومان لە قســــە و حیکایەت و مشــــتومڕ و قرەقڕ و پێکەنینی ڕۆژانەی یەکتر لەنێو کۆڵان هاوبەشــــین، وەک ئەوەی لە ژوورێکی گەورەدا بین و بێ هیچ بەربەستێک قسە لە میچ و سووچەکانی بێن و بچن. بەر لە چەند ڕۆژێک گوێم لێ بوو عەبدولحەمیدی دراوسێم کوڕەکەی بە گاڵتەوە ســــەرکۆنە دەکرد، منیش لە حیتەی پێکەنیم دا.
عەبدولحەمید، کە گوێی لە پێکەنینی من بوو پێکەنی و پێی گوتم:
- ئەبووحاتەم بەردەوام پێدەکەنی!
- ئەبووشوکر خوا دەوامی عومرتان بدات.
هەفتەیەکمان بەم جۆرە تێپەڕاند. سەرەتا لە دەنگ و قسەڕۆیشتنمان پەســت و بێزار دەبووین، دواتر بۆردومان ئەو ناوەی کردە شــوێنی پرســەیەکی گشــتی و قســەکانمان تێکەڵ بەیەک بوون. نەشماندەزانی کەی کاورای فەڕەنسی دەسبژێرمان دەکات. لە ســەعات نۆی شەو، بۆردومان دوایی دەهات.
ژنگەل دەســتیان بە تیلیلی و خۆشــی دەربڕین دەکرد. عەبدولحەمید گەلێک جار ســــەری لە پەنجەرەکە دەردەهێنا و بە دەنگێکی بەرز هاواری دەکرد: تەکبیر. ئینجا ســــەدای تەکبیر لەنێو پیاو و منداڵ و ســــەرلەبەری خەڵکی گەڕەک بەرز دەبوویەوە. عەباس شــــوبکی

هێندێک جار عوودەکەی هەڵدەگرت و گۆرانی یان سـەردوولکەیەکی بۆ دەچڕین. منداڵان بە بانگکردنی یەکتر لە ڕێگەی منارەکانەوە، چێژیان دەبینی. پیاوان بەم هۆیەوە هەواڵەکانیان دەگەڵ یەکدا ئاڵوگۆڕ دەکرد: ئەمڕۆ (سـیدی عموود)، (سـوق تەوێل)، (حەی شاغوور) و ناوچەی (سنجقدار)ـیان بۆردومان کردووە. لە ناوچە کۆسـتکەوتووەکان، گریە و ناڵەی ژنان و لاحەولە و وەلاقوەتەی پیاوان دەگاتە کەشـکەڵانی فەلەک. هەموو لایەک بە دڵدانەوە و دڵنەوایی، هاوبەشـیی خەمیانن. لوتفییە، زەیتوون و جاترەی لەپێش دانام. چارۆگەی لە مل ئاڵاند و نوێژی دابەست. نانم خوارد و خێرا جلەکانم پۆشـین و لە ماڵ دەرچووم، سـپێدە وردە وردە عەبای ڕەشی لادەدا و دەبووەوە. گەڕەکی شێخ محەدین هێشتا بە ساخی مابووەوە، تەنێ پەنجەرەکانی شـەقشـەق بووبوون. تۆپ و فڕۆکەی فەڕەنسـی، هێشـتا وەک گەڕەکەکانی دیکەی شـار، ئەوێیان وێران نەکردبوو. ئەو شـوێنانەی شـۆڕشـگێڕ و خەباتکاران خۆیان لێ پەنا دەدا، پێبەپێ بۆردومان کران و ئاگر بڵێسـەی دا. نازانم چیان لێ هات، ناشـوێرم بچمە ناویان، ئاخر دەزانم بچم، ئیتر ناگەڕێمەوە. تەنێ بە گوێلێبوونی هەواڵەکان، دەزانی چی ڕووی داوە. ئەمن تەنیا گوێم لە بۆمبەکان دەبێت، کە بەسەر گەڕەکە دوورەکاندا دەتەقنەوە، چاوم لێیە چۆن دووکەڵ بەرز دەبێتەوە، بەڵام نازانم چ مەرگەساتێک دەقەومێ. کاتێک دەچمە سەر منارەی مزگەوتی (خنکار)، لە دوورەوە دەبینم چۆن خانووەکان وێران بوون. دوو ڕۆژ بەر لە ئێسـتە بە ناچاری لە گەڕەکی شـێخ محیەدین دەرچووم، کۆنەچەکە و ژەنگاوییەکەی باوکمم دایە پیاوێکی شـۆڕشـگێڕ بە ئومێدی ئەوەی سـوودی لێ ببینێت، هێندێک شـتم دیت دڵم وەژان کەوت. گومبەزی مزگەوتی (سـنانیە) بە قازیفەیەک دووبەدەر بووبوو. کۆگاکانی (سنجقدار) بووبوونە گردێک لە خۆڵەمێش. وێڕای هەموو ئەمانە، دز و جەردەیش وەخۆکەوتوون، هەرچی بکەوێتە بەردەسـتیان لێی

ناپرینگێنەوە. هەرچەند هیچ کەسێکی ئەو گەڕەکانە ناناسم، بەڵام دڵم بۆیان شڤار بووە. هەموو ڕۆژێک پرسەی شەهیدێک بەڕێوە دەبەین، هەتا وای لێ هاتووە بێ ئەوەی پێمان بڵێن کەسێک شەهید بووە دەچینە گۆڕستان، چونکە دڵنیاین شەهیدمان هەیە. بەو دیمەنانە دڵم لە خەم و ژان و ڕەزا و خۆشنوودی پڕبووە. ئاخر مرۆ ئاتاج بە بۆردومانێکی زەوینی و ئاسمانییە شار بهارێت، تا سوپاسی خوا بکات، کە ژنەکەی نەزۆکە و منداڵی نابێت. ئەگەر لەو شارە چارەڕەش و بەدبەختە منداڵم هەبوان، دەبوو ئێستە حاڵم چۆن بوایە!

بەر لەوەی بڕۆمە کۆڵانی مزگەوت، بە ماڵی فارووق سەفدی تێپەڕیم. دیتم دەرگەیان کراوەتەوە، کۆتایی ژوورەوەیان دیاربوو، فارووق خەریکی دەرهێنانی سندووقێکی قورس بوو. چووم هاوکاریم کرد و هێنامانە دەر، دوو سندووق و چەند جانتایەکی پێستی لەتەک خۆ دانان، دەیویست بڕوات. پرسیم:

- فارووق بۆ کوێ دەچیت؟
- ئەبووحاتەم دەچمە حەما.
- شار ئابلۆقەدراوە، چۆن دەردەچیت؟

فارووق چووە ژوورەوە و تفەنگەکەی هێنا و گوتی:

- بەهۆی ئەمەوە دەردەچم.

بە داخێکەوە سەرم بادا و پێم گوت:

- فارووق تۆ پیربوویت، دیسان خاوخێزانت لەگەڵدایە و پێشتریش شەڕت نەکردووە!
- کێ گوتی من شەڕ دەکەم؟
- ئەی چی بەو چەکە دەکەیت؟
- فەرەنسییەکان چەکوچۆڵ گل دەدەنەوە، هەرکەسێک تەفنگێکیان بداتێ، ڕێی دەدەن لە شار بچێتە دەر.
- دەبڵێ وا... کەواتە بە خێر و خۆشی.

خوداحافیزیم لێ کرد و چوومە مزگەوت. تەحیەتولمەسـجیدم کرد، دواتر شـیشـەکانی نزرگەم داگرتن و تۆز و تاڵم لێ تەکاندن. چەند باش دەبوو تفەنگەکەی باوکم بەو شـۆڕشـگێڕە نەبەخشـیبا. ئەگەر بۆردومـان هـەر بـەو شـێوە بـەردەوام بێت، یان بگاتە گەڕەکی مە، ناچارم دیمەشـق جێ بهێڵم. سـتوون و ڕاگری خانووەکەمان دارن، زۆر بـەئاسـانی ئاگر دەگرن، ڕووباریشـمان لێ نزیک نییە، بەڵام پرسـیارەکە ئەوەیە: ئایا بەرەو کوێ بڕۆم؟ لەوەتەی لەدایک بووم بەدەر لە شـاری دیمەشـق، هیچ شـوێنێکی دی پێ نازانم. جگە لە خزمـەتکردنی ئـەو نزرگە پیرۆزە، هیچ کارێکی دیم نەکردووە. ئەگەر گەڕەکی ئێمە بۆردمان بکەن، ئەوە سـەقفی خانووەکە بەسـەر مندا دەکەوێت. لەکن شـێخەکەم سـەر دەنێمەوە. لوتفیە تاکوو ئێسـتەیش بیر لـە ڕاکردن نـاکاتـەوە، کـەچی من هـەرچەند پیاویشـم، بیری لێ دەکەمەوە!

بـەنـاو مزگـەوتـدا سـووڕامـەوە، زۆربـەی نوێژخوێنـەکانی بـاریـان کردبوو. سـەرنجم دا ئـەوانـەی لـەوێ مـاون لانـەواز و ئـاوارە و خـانـەخشـتوورن، شـەوان لە مزگەوت دەخەون و بەیانیش بە لایـەکدا دەچن. دەرگەکانی مزگەوتم خسـتنە سـەر پشـت و لە چاوەڕوانیی شوێنکەوتوانی حەزرەت دانیشتم، یەک لەدوا یەک هاتن، ژمـارەمـان گـەیشـتـە نۆ کـەس، لەنێویاندا وەسـتام و بـەیەکەوە وێردەکەمان خوێند:

ئەو بە هەق موحیەدینە * خادیمی شەرعی موبینە
غەوسی هەموو عاریفانە* شێخ گەورە و مەزنمانە

لەناو ئامادەبوان فیکر و خەیاڵم هەر لەسـەر فاررووق بوو. چاوەکانم دەنووقێنم و دەمەوێت بچمە قووڵایی زیکر و سروودەکە. سەرم بە ڕاسـت و چـەپدا دەهەژێنم و حەز دەکەم خەیاڵی دنیا لە مێشـکم دەرکەم و بکەومە کۆشی حزووری ئیلاهی.

بابه عبدالغني * الولي ابن الولي
بحر علم نبوي * شيخ أرباب اليقين

بەڵام هەرچەند هێنام و بردم فارووق لە ناوەڕاستی خەیاڵم دا هەڵنەستا و نەڕۆیشت. حازربوونی مرۆڤێک لە حزووری خوادا، دەبێ بە ئامانجێک بێت. فارووق دەڕوات، ئەوانەی دەشڕۆن دەبنە قاسید و سپاردەگر و پەیامنێری ئامាژەکان.

صفت النظرة طابَتِ الحضرَه * جاءتِ البشرى لأهل اللهِ
حتى قد ظنّا من ليسَ منّا * أنا جننّا بذِكرِ اللهِ
ومن لم يجد فليتواجد * قصداً يتعرَّض لفضل اللهِ

خێرا ئەو ناوەم جێ هێشت، سەلاممان لەیەک کرد و ڕووخسەتم خواست. بەرەو حوجرەی پیرۆز چووم. دوو جار کلیلم بادا و دەرگەکەم کردەوە و لەسەر خۆم داخست. تەماشایەکی کتێبە چاپکراو و دەستنووسەکانم کرد و چوار دانەم لێ هەڵگرتن. ئەو پارچە قوماشەی لە ڕۆژی جەژن بۆ بۆندارکردنی نزرگە لە میسکم هەڵکێشابوو، هێنام و هەر چوار کتێبەکەم لەنێو نان و لچکەکانیم گرێدان. لە حوجرەکە دەرچووم و دەرگەکەیم قەپات کرد. ئەوسا بەرەو ماڵی فارووق ڕۆیشتم. هەموو کەلوپەل و حاجەتەکانی دەرهێنابوون و خستبوونیە نێو گالیسکەیەکەوە، کە گوێدرێژێک ڕای دەکێشا.

- فارووق دەکرێ ئەو ئەمانەتەی منیش ببەیتە حەما؟

کتێبەکانی لەمن وەرگرتن و بە دڵسۆزییەوە گوتی:

- بێگومان ئەبووحاتەم. دەتەوێت بیگەینمە دەستی کێ؟

- هەر کەسێک فارووق چەپاڵە بدات... جا هەر کێ بێت.

## ٨٥

**"هەر خۆشەویستییەك بسڕێتەوە، جێی باوەڕ نییە"**
**ئیبن عەرەبی**

چۆن دارقەیسی، کە هەموو مەلەتییەی داگرتووە و لە سالی چوارەمیدا بەر دەگرێت، ژیانی منیش لێرە بە کەیفی خۆم بەری گرت. عیماد پاچەرە بووە و ماڵەوەی پڕ ژاوەژاو و گاڵەگاڵ کردووە. کەللەڕەق و گرینۆکە، بۆ هەمووشتێک نووزە دەکات و بنار دەگرێت. لە سالی یەکەمی، هەموو جەستەی بوو بە زیبکە و گرمژە، لە دووەم سالیدا تەمامان لێ دانا، مانگانە تاولەرز یەکدوو جار سەریان دە لەشی کزۆلی نا و چۆڕاندیانەوە... بەڵام ها ئەوەتە ئێستە تەمەنی بووە بە چوار سال، بۆ جاری یەکەم بە تێکەڵەی زمانی عەرەبی، کە لە ماڵەوە قسەی پێ دەکەین و زمانی تورکمانی، کە لە دەمی دراوسێکانمان فێر بووە، قسان دەکات. بەشێکی باخچەکەم دابڕی و ژوورێکم بۆ عیماد و سەدرەدین دروست کرد، سەدرەدین ئەوسا تەمەنی گەیشتبووە شەش سال، نیوەی قورئان و زۆر فەرموودەی ئەزبەر کردن. بەر لەمن بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا، بۆ چوونە مزگەوتێ پێش من دەکەوت، تەنانەت لە ڕۆژە سارد و سەرماوسۆڵەکانیش لەگەڵم دەهات و پێیە بچووکەکانی لە بەفر وەردەچوون. ئیسحاق دوای ئەوەی لە ئەسپەکەی گلا، بە ئاستەم

شــانی چەپی پێ دەجوولا، بڕیاری دا لە مەلەتییە بمێنێـــــتەوە. ڕاســتییەکەی شــکانی شــانی چەپەی بۆ وازهێنان لە خزمەتکردنی ســولّتان، کردە پاســاو، ئاخر بەو دواییانە ســولّتان خراپ ڕەفتاری کرد. ئیسـحاق بینی سـولّتانەکەی دەیەوێت شـەڕ لەگەڵ شـام بکات، خـەریکی ڕێکخســـتنی ســـوپایە بۆ جـەنگان لـەگـەڵ ئـەیووبییـە موســـڵمانەکان. بۆ ئەم مەبەســـتەیش کەڕەتێک هاوپەیمانی لەگەڵ ئەرمەنییەکان دەکات و جارێکیش لەگەڵ بیزەنتینییەکان. ئیتر ئیسحاق نەیویست چیتر بەشێک بێت لەو سیاسـەتە چەوتە، بۆیە بڕیاری دا واز بێنێت.

وەرزی هاوین و بەهاران، لە دەرسگوتنەوەی مندا، هەموو حەوشەی مزگەوت پڕ فەقێ دەبوو، زســـتان و پایزانیش شـــەش حوجرە، کە دەرگـەیـان بـەســـەریـەکەوە دەکرانەوە، بۆ ئەم مەبەســـتە تەرخان کرابوون. لەسـەر کورسـییەکی نزم دادەنیشـم، تەنێ بەقەدەر بستێک لە سـەری قوتابییەکانم بەرزم. لەدەسـتە ڕاسـتم ئیسـحاق و بەدر و ســودکین دادەنیشـــین، لە دەســـتە چەپیشـــم خەتخۆشـــترین فەقێ دادەنیشـــن، تاکوو هەر بیروبۆچوونێکی نوێ لە زارم هاتە دەر، خێرا بینووسنەوە. فەقێ لە هەموو لایەکەوە بەسەرمەوە دەڕژێن. دەستەی موریدانیش لە تەورێز و خوی و ئەردەبیل و مووسـڵ و ئەرزڕوم و نســـیبین و ئـەلرەهـا و حـەلب و ئـەنتـاڵیـاوە دێن و لـە خـانـەقـاکـان دەمێننەوە. بەشـێکیان زمانی عەرەبی نازانن، لە چەند ســوورەتێکی کورتیلـە بترازێت، کـە لـە نوێژەکانیاندا دەیانخوێنن، هیچی تر نازانن، کـەچی بۆ بـەرەکـەت، کـە دڵیـان پێی ڕوونـاک دەبێتـەوە، ئـامـادەی دەرسـەکەم دەبن. چەند کەسێکم بۆ ئەوانە داناوە تاکوو پێش دەرس و دوای دەرس فێری زمانی عەرەبییان بکەن. وانەکەی خۆم بەسـەر دوو کاتدا دابەش کردووە: کاتێکم بۆ هەموو فەقێکان تایبەت کردووە، بنچینەکانی تەریقەت و بنەماکانی شـەریعەت و تەفسـیری قورئانیان پێ دەدەمـەوە. کـاتێکیشـــم بۆ فـەقێ تـایبـەتـەکـان داناوە، دەرســـی

ئەسراری عەلەوی و کاروباری قودسی و ئەنواری ئیلاهی لە کەشف و حاڵ و جەزب و فەیز و شەتەحاتی تێدا دەڵێمەوە.
سەردەستەی پیاوانی مەزنی سۆفی و خاوەن کەرامەت، پەیڕەوانی تەرکەدنیا و ئەهلی بەرەکەت، هاموشۆمان دەکەن، تەنانەت کەمهۆش و هێرەکانیش، کە جەزبە لە عەقڵیاندا نەماوە، دێن ئامادەی دەرسەکەمان دەبن، ئەگەر نەمانتوانی لە ڕێی عەقڵیانەوە تێیان بگەیەنین، شتگەلی نێو دڵیان دەخوێنینەوە.
ڕۆژێک، ئەگەر لەبەر قەدەری خوایی نەبوایە وەک ڕۆژەکانی دیکە ئاسایی دەبوو، بەڵام وا دیارە قەدەرەکانی خوا لێک ناچن، وەک خۆی دەفەرموویێت: ( کل یوم هو فی شأن).
کەسێک بە توندی لە دەرگەی دا، کردمەوە بینیم پیاوێکی عەرەبی درێژ و بە قەد و قیافەیە، پێچەیەکی گەورەی لەسەر ناوە، لەژێرەوە قژی تا سەر شان هاتووە. توند و گورجوگۆڵ دیاربوو، تەوقەی لەگەڵ کردم، دەستی زبر بوو. لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا ترس و نیمچەئومێدێک بە سیمایەوە دیاربوو. ئەگەرچی ڕۆژانە هەموو مورید و ڕێبوارێک لەو دەرگەیە دەدەن و سۆراخی خانەقاکانی مەلەتییە دەکەن، یان بەدوای کارێکدا دەگەڕێن، خووم بە ڕەنگ و ڕوو و تەوقە لەگەڵ کردنیان گرتووە، بەڵام هەبێ و نەبێ ئەو پیاوە هەواڵێکی ناخۆشی هاوردووە، ئەوەی لە ڕەنگوڕووی ئەو بەدیم کرد، لە ڕەنگوڕووی هیچ موریدێکم نەدیوە.
- تۆ محەیەدینی ئیبن عەرەبی؟
- بەڵێ، خۆیەتی. کابرای مێوان ئەی تۆ کێیت؟
بە قامەتی کەڵەگەتی، کە بەسەر بەژنی مندا دەیڕوانی، توانی چاوێک بەنێو ماڵمدا بگێڕێت، وەک ئەوەی شتێکی لێ ون بووبێت. عیمادی کوڕم لە دەرگە نزیکبوویەوە، دواتر هات لەنێو قاچەکانم وەستا و لە خوارەوە لە قامەتی پیاوەکە ڕاما، کە بێشک بە کەسێکی زەبەلاح و حیتەی هاتە بەرچاو. پیاوەکەیش بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ چاوی لە

عیماد بڕی. لەبەر تەریقبوونەوە نەمویســـت پرســـیارەکەی لێ پاتە بکەمەوە. دەشـێ میوان بێ و نەیەوێت خۆی بناسـێنێت، ئەمنیش، کە حاتەمی تەییم، تا ســـێ ڕۆژ، هەقی ئەوەم نییە پێداگری لەســـەر ناسنامەی هیچ کەسێک بکەم. هەر لەبەر ئەوەیە، دوای بێدەنگبوونێکی زۆر، دەرگـەم لێی کردەوە و داوام لێ کرد بێتـە ژوورەوە... بـەڵام لەناکاو ڕاچڵەکی، وەک ئەوەی لە خەونێک وەخەبەر هاتبێت، پەنجەی شایەتمانی لە من ڕاست کرد و گوتی:

- گوێ بگرە کاکە. زانیومە تۆ کچی یوونست خواستووە.

- بەڵێ هاوژینی منە و دایکی عیمادە.

ڕەنگوڕووی زەردهەڵگەڕاو هاواری کرد:

- ستەم و تاوان و حەڕامە. ژنی منت کردووەتە ژنی خۆت!

لەو کاتەدا لەپشـــتەوەی خۆم، گوێم لە قیژەی فاتیمە بوو، هەرتک تەماشـــای ژوورەوەمان کرد، چاومان کەوتە ســـەر فاتیمە، لە دەرگە نزیک بووەوە و خۆی لە خاک و خۆڵ وەردا، وەک ژنی کوڕمردوو هاواری دەکرد. لەناکاو جلی بەری شـــەق بوو، ســـەرووی ســـینەی دەرکەوت، عیماد، کە دایکی وەها بینی دەســـتی بە گریان کرد. بەبێ خواستی خۆم، دەستم بۆ دەرگە برد تا پێوەی دەم و فاتیمە داپۆشم، بەڵام پیاوەکە توند گرتی و لێ نەگەڕا. دواتر بەســـەر ئەژنۆدا کەوت و دەستی بە ناڵەناڵ و فیغان کرد، وەک ئەوەی چەندان ساڵ گریانی لە ســـینەیدا قەتیس کردبێت. لە ناوەڕاســـتیاندا وەســـتام، فاتیمە وەک گوێرەکەی ســـەربڕاو لەلای ڕاستمەوە کەوتبوو. ئەو پیاوەیش لەلای دەستەچەپم وەک کەسێکی پشتشکاو دانیشت.

خوا بەم شـــێوەیە ئەولیاکانی خۆی تاقیی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی دڵیان بۆ خواناســـی ئەزموون بکات. منی بە دەرکەوتنەوەی مێردی ژنەکەم تـاقی کردەوە، دوای ئـەوەی هـەموو پێمـان وابوو شـــەهید بووە و نەماوە! لە مەجلیســـی خۆم دامنیشـاند، یەکبەخۆی هەڵدەلەرزی، ئاوم دایێ و دامپۆشـــی. چاوەکانی دەهشـــەتگرتی بووبوون، لەســـەر هیچ

ئۆقرەیان نەدەگرت، ڕووی زەرد هەڵگەڕابوو، دەتگوت خوێن لەنێویدا نەماوە. لە وادەی خۆی ئیسحاق لە دەرگەی دا، دوو هەفتە بوو پێکەوە خەریکی نووسینی نامەیەک بووین لەبارەی زاراوەکانی سۆفیگەری. هاتە ژوورەوە و دانیشت، پاشان مێوانەکەم پێ ناساند، بۆ چەند خولەکێک دەموچاوی وشکهەڵگەڕان، پاشان بەبێدەنگی سەری بەخۆیدا بەردایەوە.

ئاگرم کردەوە، قەیسی و شیر و ئاو و نانم بۆ دانا، نەختێکی لێ خوارد و هێور نەبووەوە. بەردەوام باسی پوچەڵبوونەوەی مارەبڕینی منی دەکرد لە فاتیمە، منیش هیچ دەمەقاڵێیەکم لەگەڵدا نەکرد. تەنێ بە یەک ئاماژە، کە خوا چی بوێت ئەوە دەکات، وەڵامم دەدایەوە. بێگومان لەو ماڵەدا هیچ شتێک بەبێ ویست و شەریعەتی خوا ڕوو نادات. دوو سەعات تێپەڕین و پیاوەکە هێشتا ترسی لە ئێمە هەبوو، دەستبەرداری ڕقەداریەکەی نەدەبوو. دوای ئەوەی بڕێک نان و ئاوی دیکەی خوارد و خواردەوە دەموچاوی هێوربوونەوە. باسی چەند شتێکی دیکەمان لەگەڵ کرد، وەک ڕێگەی نێوان ماردین و مەلەتییە. قافڵەکان، کەشوهەوا، خەڵک. ئیسحاق بۆ هێورکردنەوە و دڵنەواییکردنی ئەو پیاوە بەستەزمانە، هەموو هەوڵێکی دا. بە کردەیش توانی هێوری بکاتەوە، ئەوەی لە ڕێگە بینیبووی باسی کرد. ناوەناوە بزەیەکی دەکرد، بەڵام زۆر بەخێرایی بزەکەی خەفە دەبوو.

لە کۆتاییدا لێم پرسی تۆ لەکوێ بوویت؟

- من لە وڵاتی ڕۆم ئەسیر بووم.

- چۆن گیرایت؟

- ئێمە دوو سەت کەس بە پیادە لە حەلەب هاتینە دەر، سی کەسمان سوارچاکبووین. مەبەستمان دەرکردن و دەرپەڕاندنی فەڕەنگ بوو لە ئەنترسوس، کە وێرانیان کردبوو، بەڵام شەو هەموومان کەوتینە

کەمینێکی ســـەربازی، کە لەنێوان دوو گردۆڵکە بۆمان داندرابوو، تیرهاوێژی فەرەنگان بەسەر هەردوو گردۆلکەکە وەستابوون.
پرسیم:
- چەند کەستان قوتاربوون؟
- بیســت تا ســی کەسێک. بەر لەوەی دەســتی کۆمەک بمانگاتێ، بۆ ئەنترســـوســـیان بردین. ڕۆژی دواتر بۆ بازاڕی کۆیلانیان بردین. حاکم زووبەزوو ئێمەی بە چەکفرۆشــەکان فرۆشــت، ئەوانیش خێرا بەرەو (سقلیە)یان بردین.
ئیسحاق بە تووڕەییەوە گوتی:
- ئەمە ســـووکایەتییە، ســـەرەتا دیل بۆ فیدیە دەخرێنە ڕوو، ئینجا دەکرێنە کۆیلە.
پیاوەکە هیچ شـــتێکی لەســـەر قســـەکەی ئیســـحاق نەگوت، بە حەسرەتێکەوە سەری لەقاند، پاشان بێدەنگ بوو، ئیسحاق دنەی دا بۆ وەی چیرۆکەکەی تەواو بکات:
- لە سقلیە لەنێوان بەندەفرۆشـان دەسـتاودەسـتم پێ کرا، لە دواییدا کەوتمە دەست ڕەزەوانێک، خزمەتی دارمێوەکانی پێ کردم.
کاتێک زاکیرەی ئەمەی بیر خســتەوە، دەنگی پچڕپچڕ بوو، ئیســحاق پرســـیارێکی دی لێ کرد، وەک ئـەوەی بیـەوێت لـەباســـی ئـەو یادەوەرییانە لای بدات:
- ئەی چۆن لە دەستیان ڕات کرد؟
- ڕام نەکرد. ســێ ســاڵی ڕەبەق لە کێڵگە کارم کرد، تاکوو بازرگانە موســڵمانەکان لە ئەندەلوس هاتنە ســقلیە، بە پارەی زەکات ئێمەیان کڕیەوە و ئازادیان کردین.
ئیسحاق بە بزەیەکەوە تەماشایەکی کردم و گوتی:
- وای ئەم ئەندەلوسیانە چەندە مەزنن!
ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بووم و بیرم دەکردەوە، پاشـــان ســـەرم بەرزکردەوە و ڕاستەوخۆ پیاوەکەم دواند و گوتم:

- عیماد گوێ بگره...
پیاوەکە بە ترســێکەوە تەماشــایەکی کردم وەک بڵێی لەوەی دەیڵێم بەگومان بێت. گوتم:
- پێکەوە دەچینە کن قازی، با ئیســحاق شــایەت بێت، شــەرع بە هەر ئەنجامێک گەیشت، ئەمن پێی ڕازی دەبم.

## ٨٦

"بەخشینی دوای دەستپانکردنەوە، بە بەخشین ناشێت"
ئیبن عەرەبی

فاتیمە بەدرێژایی شـــەو هەر شـــینی گێڕا. بەهۆی گریان، چاوەکانی هەڵپەنمابوون و بووبوونە گۆمی خوێن. ڕووی وەک پارچە پێستێک لێ هـاتبوو، کـە بـاران بێ خێری کردبێت. لـە ژوورەکـەی منـداڵان خـەوت و و توند عیمـادی لـە ئامێز گرتبوو. منیش چاوەکانم میچی خانوودا گێڕا، بەشـکم ڕێگەچارەیەکم دەسـتکەوێت و لەو تەنگەژەیە قوتـارم بێ. ئـەرێ دەبێ بتوانم دەســـتبەرداری فـاتیمـە بم؟ ئـەگـەر دەســـتبەرداری بووم، زۆر بەخێرایی دەتوانم ژنێکی دیکە بە کەیفی خۆم بهێنمـەوە. ئـەگـەر حـەزیش بکـەم دەتوانم عیمـاد لای خۆم بهێڵمـەوە. دەکرێ بـە جـارێکیش دەســـت لـە ژنـان بشـــۆم و بۆ کتێبنووســین و خەڵوەتی خوایی، لێ ببڕێم. ئەگەر ئەوەیشـم نەکرد، واتا فاتیمەم لەلای خۆم هێشـــتەوە، هیچ چتێک گۆڕانی بەســـەردا نایەت. ئەو هەر گوێڕایەڵ و خزمەتکار دەمێنێتەوە و هیچ شـتێکیشـی بـە دەمـەوە دانـایـەت. وەک هـەر ژنێکی دیکـەی دنیـا دەمـدوێنێ و دەملاوێنێ و بـەســـەروکارمەوە دەبێت: کاری ئەو، هەر خواردن و سەرجێی و خزمەتکردنە.

ڕاســـتییەکەی هێندەی شـــەیدای مەعریفەی مەریەم بووم، هێندە بۆ مەعریفەی فاتیمە دڵبەتاسە و عەوداڵ نیم، ئەوەندەی ئارەزووی قسە و لوتفی نیزامی کچی زاهیرم دەکرد، هێندە حەزم بە قســـەی فاتیمە نییە. کەواتە برینی فیراقی فاتیمە، بەسـێنایی تیمار دەبێت و قەرەبوو دەبێتەوە.

من لـەو بیرکردنـەوەیـەدا بووم، فـاتیمـە وەژوور کـەوت، دیـاربوو ئەویش وەک من خەوی لێ نەکەوتبوو، یەکەوڕاســـت ڕووی تێکردم و گوتی:

- موحی من دەمەوێت لەگەڵ تۆ بمێنمەوە.

- فاتیمە! پێم وانییە لەو قسەیەتدا ڕاستگۆ بیت.

- درۆی من، زیان بە ڕاســـتگۆیم ناگەیەنێت. دەمەوێـــــت لەماڵەوە لەگەڵ کوڕەکەم بمێنمەوە.

- ئـەی وەختێک، کـە ئـەو پیاوەت دیت ئەو ناڵەناڵ و جڕبەجڕبوونی کراسەت لەچی بوو، بۆچی بەدرێژایی ڕۆژ، شینت گێڕا؟

بێدەنـگ بوو. بۆ ئـەوەی خۆی لـە تـەمـاشـــــاکردنی ڕووی من دووربگرێت، نیگـاکـانی لـە فـەزای ژوورەوە هـەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد، لەمەیشدا تاریکی کۆمەکی کرد. ڕۆیشت و گوتی:

- خۆ تۆ داوات نـەکردووە، بـەڵام لێرە پێت دەڵێم ئـەگـەر دەتـەوێت، حەز دەکەم لەگەڵ تۆدا بمێنمەوە. ئەگەر جەنابی قازیش پرســـیاری لێ کردم، بەم جۆرە وەڵامی دەدەمەوە.

بە ڕســـتەی کۆتایی، مەبەســـتی خۆی دەرخســـت. ئەو ژنە دەیەوێت خۆی تەســـلیمی من بکات و نەچێتە نێو دەمەقڕێ و شـــەڕ و هەڵڵا. بێگومان ئەو ترســـی ئەوەی هەیە کوڕەجگەرگۆشـــەکەی لێ هەڵبڕم. بـەڵام بـە خوای منیش تـاقـەتی فیراقی کوڕەکـەمم نییـە. توانـای سەفەریشم بۆ دیدەنیکردنی نییە.

ڕۆژی دواتر هەینی بوو. دوای نوێژ، ئیســـحاق قســـەی لەگەڵ قازی کرد و وادەیـەکی بۆ بـەیانی لە خانەی داد وەرگرت. ئەو ڕۆژە، جگە

لە بێدەنگییەکەی، زۆر بەئاسایی تێپەڕی. تەنانەت عیمادی کوڕم، کە هەموو ڕۆژەکانی بە هاروهاجی بەسەر دەبرد، ئەو ڕۆژە زۆر نەرم و ژیر و هێمن بوو، وەک بڵێی لە پێڵوی پەنماوی دایکیەوە هەستی بە ڕووداوێکی گەورە کردبێت، کە لە ماڵەوە دەقەومێت. هەر لەو کاتەی ئەو ڕووداوە تووشی فاتیمە هات، ئیسحاق بۆ سووککردنی باری سەرشانی فاتیمە، سەدرەدینی بردەوە، هەر لەو شەوەشەوە لەگەڵ دایک و باوکی دەژیت.

بەیانی ڕۆژی شەممە لەگەڵ فاتیمە بەرەو خانەی داد بەڕێکەوتین. ئیسحاق و ئەو پیاوەیش لەوێ بوون، هەر دەڵێی ئەو پیاوە خۆی بۆ جەنگ ساز و تەیار کردبوو، دەموچاوی تێکنابوون، غەزەبی لێ دەباری. لە دەرگەی حەساری خانەی داد چووینە ژوورەوە، لەو شوێنەی دژەکان دادەنیشن و چاوەڕێی جارڕدەری قازی دەکەن، دانیشتین. تاوێک بێدەنگ بووین. فاتیمە وەک بەرد کڕ و خامۆش بوو. پیاوەکە تەماشای دەرگەی ژوورەکەی قازی دەکرد، وەک ئەوەی ئارامی لەبەر هەڵگیرابێت. ئیسحاق ناوەناوە بابەتێکی گشتی لەگەڵ دەکردمەوە، دەیویست لە کۆستی جیابوونەوەی کوڕ و هاوژینەکەم، دڵنەواییم بکات.

لە کۆتاییدا خوا بۆی کەشف کردم چی بکەم. بە پیاوەکەم گوت:

- گوێ بگرە عیماد گیان.

لای لێ کردمەوە، لە هەمان کات فاتیمە قاچەکانی بزاوتن، دەڵێی لەگەڵ هاوژینی پێشووی لە قسەکانی من سڵەمینەوە. پێم گوت:

- ئەگەر حەزت لە فاتیمەیە و فاتیمەیش حەزی لە تۆیە، ئەوە تەڵاقی دەدەم، بەڵام بە مەرجێک.

- مەرجەکەت چییە؟

- لە مەلەتییە، لە خانوویەکی نزیکی من بمێنیتەوە، تاکوو ئەو کاتەی عیمادەدینی کوڕم بلووغی دەبێت.

تووڕەیی پیاوەکە بوو بە مەدهۆشی. لێکبێنە تەماشای من و ئیسحاق و بەردەمی خۆی دەکرد. پاشان گوتی:
- بەڵام من لێرە کەس ناناسـم. هیچ زەوی و زارێکیشـم نییە. هیچ پیشەیەکیش نازانم.
ئیسحاق بە تەڕدەستی وەڵامەکەی وەرگرتەوە و گوتی:
- ئەمە زۆر ئاسـانە. ئەگەر حەز بکەیت زۆر بەزوویی کارێکت بۆ دەبینمەوە.
منجەیەک لە فاتیمەوە هات، وەک بڵێی دەیویسـت قسـەیەک بکات. منیش گوێچکەم لێی نزیکخستەوە، پێی گوتم:
- ئەی کوڕەکەم...
- کوڕەکەت لەگەڵتدا دەمێنێتەوە.
لەو قسـانەدا بووین، بۆ لای قازی بانگ کراین، تەماشـای پیاوەکەم دەکرد و چاوەڕێی وەڵام بووم. هەستا و گوتی:
- ڕازیم.
ئاوڕێکم لە فاتیمە دایەوە و پێم گوت:
- ئەگەر تۆیش ڕازیت دەنگت بەرز بکەوە.
- منیش ڕازیم.
چووینە لای قازی و ڕێککەوتنەکەی خۆمانمان پێ ڕاگەیاند. قازی سەیرێکی کردم و بە دەنگێکی نزم گوتی:
- تۆ لە بڕیارەکەی خۆت دڵنیایت؟
- بەڵێ دڵنیام.
- دە کەواتە خوا سـەبووریت بدات و بە خێر بۆت تێ هەڵبێنێتەوە. تۆیش عیماد بە حزووری ئەو شایەتانە بەڵێن دەدەیت، کە تاکوو ئەو منداڵە بلووغی دەبێت لە مەلەتییە بمێنێتەوە. ئەگەر سـەفەرت کرد، نابێ ژن و منداڵەکەی لەگەڵ خۆت بەریت.
- بەڵێن بێت وا دەکەم.
- فاتیمە تۆیش ڕازیت؟

- بەڵێ ڕازیم.
- ئێستا لە کاتی سووڕی بێنوێژی، یان پاکی دایت؟
- لە پاکیدام.
پاشان  قازی ڕووی لە من کرد و گوتی:
- لەو پاکییەدا لەگەڵی جووت بوویت؟
- نەخێر.
- کەواتە ئەگەر حەز دەکەیت تەڵاقی بدە.
- یەک، دوو، سێ، هەر سێ تەڵاقم لە فاتیمەی کچی یوونس بکەون.
ئینجا قازی ڕووی لە فاتیمە کرد و گوتی:
- عیددەی[١٥]تۆ دوای بینینی سێ پاکبوونەوە تەواو دەبێت، ئەگەر دووگیانیش بیت، ئەوە دەبێ سکەکەت دابنێیت، ئینجا دەبنەوە ژن و مێردی یەک. خوا هەموو لایەک پارێزراو بکات. ئێستە فەرموون بڕۆن.
بەیەکەوە لە خانەی داد هاتینە دەر، ئیسحاق قسەی لەگەڵ پیاوەکە دەکرد و پێی دەگوت چاوەڕێی هەواڵ بە. پیاوەکەیش سەری خۆی لەقاند و تێگەیشت و ڕۆیشت. ئیسحاق هاتەوە لای من و گوتی:
- سوڵتان بەدوایدا ناردووم، حەز دەکەیت هاوەڵیم بکەیت و لە قونیا دڵ و دەروونت هێور بکەیتەوە؟
- زۆرباشە.

---

[١٥]-عیددە زاراوەیەکی فیقهییە، دوای تەلاقدانیان دروستە ژنان پاش سێ جار پاکبوونەوە لە سووڕی مانگانە شوو بکەنەوە...

# ٨٧

**"هەر کەسێك داوای دەستەڵات لە خەڵك بکات، خوا بە جەنجاڵی و ژاوەژاو، دڵی سیخناخ دەکات"**
**ئیبن عەرەبی**

هێشتا چەند سەعاتێک بەسەر گەیشتنماندا تێنەپەڕیبوو، قاسیدی سوڵتان هات و بانگهێشتی کۆشکی کردین. بەپەلە خۆمان شۆرد و جلی خوریی نوێمان پۆشی. ڕێگە بەردینەکان شەختەیان کردبوو، چەند جارێک ئیسحاقم لە خلیسکان ئاگادار کردەوە، بەڵام سوودی نەبوو. دووجار خلیسکم برد، خەریک بوو سەر و ئێسکانم ورد و خاش بن. ئیسحاق، کە بەدرێژایی ڕێگەکە یارمەتیی دەدام، بزەیەکی کرد و گوتی:
- وریابە! با سوڵتان نەڵێت ئەو مێوانە قوڵ و سەرشکاوە چییە هێناوتە!
چووینە ژووری سوڵتان، ماوەیەکی زۆر چاوەڕێمان کرد، چەند کارمەندێکی کۆشکیشی لێ بوو، ئیسحاق قسەی لەگەڵدا کردن، بەڵام من بێدەنگیم هەڵبژارد. چەند جار ئیسحاق چووە لای مشوورخۆری مەجلیسەکە بۆ ئەوەی لەبارەی قدوومی سوڵتان پرسیاری لێ بکات، ئەویش پێی گوت سوڵتان نەخۆشە و هیچی لەوبارەوە پێ نەگوتووە. زۆربەی خەڵکی مەجلیسەکە هەستان و ڕۆیشتن، من و ئیسحاق

مابنەوە. لە کۆتاییدا سـولتان دەرکەوت، زۆر بەهێواشـی هەنگاوی دەنا، جاشـنگیر بەوریاییەوە لە دوای دەڕۆییشـت، بۆ ئەوەی ئەگەر هـاوسـەنگی لـە دەسـت دا بیگرێت و یـارمـەتیی بدا. بـەڕوونی نەخۆشـییەکەی بەسـەرەوە دیاربوو، کۆکەیش وازی لێ نەدەهێنا. بە هانکەهانک و زەحمەتێکەوە لەسـەر کورسـی دانیشـت و هەموومان یەکبەدوای یەک، سلاومان لێ کرد.

بێدەنگی باڵی بەسـەر ئەو ناوەدا کێشـا، هەر کاتێک سولتان بیویستبا خۆی ڕێک و ڕاسـت بکاتەوە، دەسـتی بە کۆکە و سـووکەناڵەیەک دەکرد و بێدەنگییەکەی دەسـمی. ئێمەیش هەموو مات و خامۆش بووین. لە کۆتاییدا سولتان وەقسە هات و گوتی:

- ئیسحاق، کاروباری دەستەی گەنجەکان بەباشی ناڕوات.

ئیسـحاق بێدەنگ بوو، چاوەڕوانی مشـوورخۆری مەجلیسـی کرد، بۆ ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر:

- بە شـەشـسـەت گەنج چووینە شـام، تەنیا سـەت گەنجێک لەگەڵماندا گەڕانەوە.

- ئەی چییان بەسەرهات؟

- هەموویان سـاغ و سـەلامەت بوون، بەڵام هەر کەسـەو گەڕایەوە سەر کاری خۆی.

- وابزانم زۆربەیان خەڵکی ئەنازۆڵ بوون. لە سـیواس و مەلەتییە و قەیسەریە دەسبژێرم کردبوون، دەبێ بۆ کوێ بچن؟

ئەو کەڕەتە سولتان وەڵامی داوە:

- ئەو پرسیارە بۆ تۆیە: ئەوان بەرەو کوێ سەریان هەڵگرتووە؟

- مەولام من هەر ئەوەندە دەزانم.

مشوورخۆری مەجلیس گوتی:

- سیخووڕەکانمان دەڵێن ئەوان لە هەر سوپایەکدا بن، بەکرێگیراو و خۆفرۆشن.

سولتان بە خنکەخنک و دەنگێکی شەکەتەوە، گوتی:

- فێری جەنگیان دەکەین... دواتر لەگەڵمان دەجەنگن.
ئیسحاق لەوپەڕی ئیحراجبووندا بوو، وەک ئەوەی لەسەر ئەو خیانەتانە لۆمەباران کرابێت. سەری بەخۆدا بەردایەوە و هیچ وەڵامێکی سوڵتانی نەدایەوە. وا دیاربوو سوڵتانیش نەیدەویست لەسەرکۆنەکردنی بەردەوام بێت، بەڵام پێی گوت:
- نازانم بۆچی ئەوانت جێ هێشت و ڕووت لە مەلەتییە کرد. من کاروباری ئەو گەنجانەم دابووە دەستی تۆ، کەچی ئێستا تەڕاوبەڕا بوون.
بڕیارم دا قسە بکەم. ئحمێکم کرد، مشوورخۆری مەجلیس لای لێ کردمەوە و دەڵێی سوڵتانیش گوێی لە دەنگم بوو. گوتم:
- جەنابی سوڵتان ئیزن دەدەیت قسە بکەم؟
- دەی قسە بکە موحی.
- کەسێک شمشێرەکەی بە تۆ بفرۆشێت، بە کەسی دیکەیشی دەفرۆشێت. کەسێک خۆی بە خوا بفرۆشێت، دواتر خۆی بە هیچ کەس نافرۆشێت.
- موحی دەتەوێت چی بڵێیت؟
- دەمەوێت بڵێم عیزەت و شکۆ و دەستەڵاتی سوڵتان، تەنێ بە جیهادی ستەمکارانی گەندەخۆر وەدی دێت، کەسانی سەرڕاست و بەڵێن بەخوادەریش کۆمەکی دەکەن و سەری دەخەن.
- موحی هێشتا ئەوەی دەتەوێ بیڵێیت، نەتگوتووە.
- قوربان! ئەو تەقەلایەی بۆ جەنگی ئەیووبییەکانت داوە، خوا پێی ڕازی نابێت. وەک ئەوە وایە شمشێرێکت بەکرێ وەرگرتبێت، دواتر لە ڕووی برایەکەت ڕاکێشابێت. لە کاتێکدا نە شمشێر هی تۆیە و نە براکەیشت دوژمنی تۆیە. چۆن داوای سەرکەوتن دەکەیت، ئەوە چەک و ئەمە بەیداخت بێت؟

دیاربوو سولّتان بەم قسانەی من ئۆقرەی لێ بڕا و شەکەت بوو. بە ئاماژەی نەخێر سەری خۆی بادا، وەک ئەوەی هیچ ئەو قسانەی منی بە دڵ نەبووبێت، پاشان گوتی:
- موحی تۆ هیچ لەبارەی ئەو شەڕە نازانیت. ئەوان دەستپێشخەرییان کردووە.
- تۆ باشتر لەوان ڕەفتار بکە.
- ڕەفتاری باشمان نواند و سوودی نەبوو. حەلەب پێشتر بەر لە ئەیووبییەکان لەژێر ڕکێفی باپیرانمدا بووە. دوای ئەوەی خەڵکەکە لە دەستی مەلیکەکان ئازاری زۆریان پێگەیشت، هانایان بۆ من هێنا. مشوورخۆری مەجلیس قسەکانی ئێمەی بڕی، وەک ئەوەی بیەوێت تووڕەیی سولّتان دامرکێنێت و ڕێڕەوی قسەی مەجلیس بگۆڕێت:
- قوربان! ئەگەر حەز دەکەیت، دیسان دەستەی گەنجان ڕێک دەخەینەوە، دەیانخەینەوە ژێر کۆنترۆڵی دیوانی سەربازی، لە جیاتی دەستکەوتی جەنگیش، (جامکیە)یان بۆ دەبڕینەوە.
سولّتان بە مەیلانێکەوە گوتی:
- دەستکەوتی جەنگ لە جامکیە زۆر زیاتر دەبێت.
هەموو لایەک بێدەنگ بوون، سەرمان بە خۆماندا بەردایەوە و نەماندەزانی چی بڵێین. سولّتان بە ئازارێکەوە نێوچاوانی خۆی هەڵدەگلۆفی. پاشان نۆرەی کۆکینی هات. جاشنگیر ترسی هەبوو سولّتان بڕشێتەوە، بەپەلە چوو لەگەنێکی لەپێش دانا، بەڵام باشبوو نەڕشایەوە. کۆکەکەی تەواوبوو، ئاهێکی هاتەوە بەر، ئێمەیش بێدەنگ و خامۆش بووین. چەند خولەکێک تێپەڕی، دواتر سولّتان ڕووی لە ئیسحاق کرد و گوتی:
- ئیسحاق لێم نزیک بەوە.
ئیسحاق هێندە لێی نزیک بووەوە تا شانەکانیان لێک خشان. ئینجا سولّتان پێی گوت:
- دەمەوێت بچیە لای کیقباز.

- لە زیندان؟
- بەڵێ، بەڵام چەند کەسێکی دیاریکراو لەگەڵ خۆت بەرە، با کەس بە نیازت نەزانێت.
- بەسەر چاو.
- پێی بڵێ برایەکەت دەیەوێت لەدوای خۆی جڵەوی دەستەڵات بخاتە دەست. ئەگەر ڕازی بێت ئەوە بەسەر منداڵ و دارودەستە و بەندە و کۆیلەکانمەوە دەیکەمە جێنشین. ئەگەر ڕازیش نەبوو، بە ڕێگەی خۆتدا بگەڕێوە.
سوڵتان دەستی درێژ کرد، مشوورخۆری مەجلیسیش هەستا و چوو دوو نامەی پێچراوی خستنە دەست. ئینجا سوڵتان گوتی:
- ئەمە نامەی منە بۆ برایەکەم. ئەوەیش ناوی ئەمیری شارەکانە، یەکبەیەک دەچییە لایان و پێیان دەڵێیت برایەکەم لەدوای من دەستەڵات دەگرێتە دەست.
- بەسەر چاو.
پاشان سوڵتان ڕووی تێ کردم و گوتی:
- موحی ئەگەر حەز دەکەیت یاوەریی ئیسحاق بکە و یارمەتی بدە .
- ئینشائەڵڵا، بەپشتیوانیی خوا.
لەلای سوڵتان ڕۆیشتین، ئیسحاق کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵ. توووند دەستی بە هەردوو نامەکەوە گرتبوو، هیچ قسەیەکیشی نەدەکرد. گەیشتینەماڵێکی نزیکی کۆشکی سوڵتان و چووینە ژوورەوە. هەرکە چووینە ژوورەوە و لە دەوئاگردان دانیشتین، بۆ کەڕەتی یەکەم لەوەتەی لە کۆشک دەرچووین، ئیسحاق وەقسە هات.
- گوێت لێ بوو چی گوت؟ سوڵتان دەیەوێت لەدوای خۆی دەستەڵات بخاتە دەست ئەو برایەی، کە پێشتر لەگەڵ سوڵتان جەنگاوە و پلانی دژی دەستەڵاتی گێڕاوە. ئێستایش دەیەوێت لە زیندان دەری بهێنێت و لە دوای خۆی بیکاتە سوڵتان.
- خوا ئەوەی بیەوێت دەستەڵاتی دەخاتە دەست.

دیســــان ئیســــحاق کەوتەوە بیرکردنەوەیەکی قووڵ و لە پشـــکۆ گەشاوەکانی نێو ئاگردان ڕاما. لەناکاو داچڵەکی، وەک ئەوەی شتێکی بیرکەوتبێتەوە، ئینجا گوتی:

- قوربان موحی! ئەوەی ئەمڕۆ لە حزووری ســـوڵتان گوتت، زۆر ترسناک بوو.

- چی ببینم، هەر ئەوە دەڵێم.

- بەڵێ، تۆ بە شـــکســـتەکانی خۆش بوویت. ئەی نازانی چی لەو ئەمیرانە کرد، کە خیانەتیان لێ کرد؟

- چی لێ کردن؟

- سووتاندنی!

- ئەی خوایە! لە سەرکێشی و یاخیبوونی ئەو تاغووتانە، بە زاتی تۆ، خۆم پەنا دەدەم. ســوێند بە خوا ڕۆژێکی دیکە ناچمەوە مەجلیســی ئەو پیاوە.

- بەڵێ ئەوە بۆ تۆ زۆر باشترە.

## ٨٨

**"ژیانی من، لەدوای ئێوە هەر فەنابوونە"**
**ئیبن عەرەبی**

بردنەسەری سوێندەکەم زۆر قورس نەبوو. بەرلەوەی زستانی ئەو ساڵە بێت، سوڵتان وەفاتی کرد. کیقبازی برای لە زیندان هاتە دەرەوە و ڕاستەوخۆ دەستی بەسەر عەرشی دەستەڵاتدا گرت. دوای ئەوەی لەگەڵ ئیسحاق بەسەر میرنشینە سەلجووقییەکاندا گەڕاین بۆ بەیعەتبەستن لەگەڵ کیقباز، بەتەنیا گەڕامەوە مەلەتییە. کە گەڕامەوە فاتیمە عیددەی تەواو بووبوو، گەڕابوویەوە لای پیاوەکەی و لەنزیک ماڵی مندا نیشتەجێ بووبوو، جاروبار لە نوێژەکاندا پیاوەکەیم دەدیت. دوای ئەوەی فاتیمە لە ماڵ ڕۆیشت و خانووەکەم چۆل بوو، سودکین و بەدر هاتنەوە لام، دیسان بووینەوە سێکوچکەی جاران. لە شەوێکی ساردی زستاندا بزنەکەمان سەرمابردی دەبێت و لووت و لیکاوی دەبنە شەختە و ڕەق دەبێتەوە.

هەرچەند بەدر بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵمدا دەمایەوە و سودکینیش بەردەوام خزمەتی دەکردین، بەڵام ماڵەکەم زۆر کڕ و بێدەنگ بوو، بەرگەی ئەو حاڵە بۆ من ئەستەمە. شەوانە عیماد لە لەرینەوەی دارودرەخت و دەنگی هەورەتریشقە دەترسا و دەگریا، ئێستا گوێم

له گریانەکەی نییە. سەدرەدین چەندان سوورەتی قورئان و بە دەیان فەرموودەی ئەزبەرکردبوون، بەیانیان زوو دەوری دەکردنەوە، کەچی ئێستە هیچ شتێک ناژنەوم. نووکە لە ناندین دەنگی دەستاڕ و ڕەقە و زرینگەی قاپوقاچاخ و ئاونکوتانی فاتیمە نابیستم. لە شلکەی بەهار سکاڵای حاڵی خۆم لەلای ئیسحاق کرد، ئەویش دوو ئەسپی بۆ هێناین، بۆ پیاسە و دڵخۆشی چووینە سیواس. گەیشتینە شوێنی مەبەست، لە مێوانخانەکەی بازاڕ لاماندا، لە ئەنازۆڵ هیچ جێگەیەکم هێندە جەنجاڵ نەبینیبوو، لەبەر دووکان و کاڵا و کەلوپەل و خەڵک، ڕێبەڕی نەبوو. بە هەر ڕێگەوبانێکدا دەچووم، بازرگانی هەموو وڵاتێکی بەسەردا ڕژابوو: عەرەب، قفجاق، کەرەج، ئەرمەن، تورکمان.... هەر یەکەو بە زمانی خۆی قسەی دەکرد، بەدرێژایی مانەوەشیان لە شارەکە، وەرگێڕیان بۆ خۆیان دەگرت. کەلوپەلمان لە میوانخانە دانا و دوو ئەسپەکەمان تەسلیمی خاوەنەکەی کردەوە و چووینە گەرماو. جلەکانمان داکەندن و خۆمان لە ئاوی حەوزەکە نقووم کرد، دەلاکێک سەری ئیسحاقی شوشت، منیش بە ئاوی گەرم خەریکی شوشتنی ڕیشەکەم بووم. قسەیەکی ناخۆشم لە دەمی دەلاکەکە بیست، لە کاتی خۆیدا هیچ گرنگییەکم پێ نەدا. باسی پۆرگێکی گەردەنی ئیسحاقی کرد:

- لەکەیەوە لێت هاتووە؟

- نازانم. وابزانم چەند مانگێک دەبێت.

- ئازاری هەیە؟

- نەخێر.

- گەورە دەبێت، یان هەر وەک خۆیەتی؟

- سەرەتا بچووک بوو، دواتر بەم ئەندازەیە گەورەبوو، دواتر وەستا. خوا بۆی کەشف کردم، بەڵام من لێی غافڵ بووم و ئەویش لێی شاردمەوە. پۆرگەکە هاوڕێکەمی لووش کرد و دوای دوو هەفتە خستییە گۆڕەوە، منیشی بەتەنیا جێ هێشت. خوایەگیان لەم دنیایەدا

چەندان کەسم ناسین و ژیانئاواییان کرد. چەندان مرۆم خۆشویستن و لێرە باریان کرد. هاوەڵێی چەندان کەسم کرد و بۆ دنیای دی ئۆغریان کرد: خەیات، حەسار، عورەینی، سبتی، غەوس، زاهیر، ئێستا بۆ ئیسحاق دەکوڵم، هیچ کەسێکم وەک ئەو، ڕووح پاقژ و خاوێن نەناسیوە. نەرمونیان و بەخشندە، بە لێوی بەخەندەوە دەخەوێت، بە ڕووی بەبزەوە هەڵدەستێ.
ئاخری کە بە کفن ڕوخساری ئیسحاقیان داپۆشی، بۆ هەتاهەتایە لێوەکانی پێکدادان و لەبزە کەوت، خەریک بوو سینەی منیش هەناسەی لێ ببڕێت. لە مەککە، لە پیرۆزترین شوێنی دنیا، دڵم باوەشی بۆ کردەوە و بەخێرهاتنی کرد، لە مەلەتییەیش ماڵئاوایی لێ کرد. بەدرێژایی مەودای ئەو دوو شارە، بەقەد دارودرەخت و کێو و دەشت و دۆڵ، سووتانی عیشق لە سینەمدا هەیە. خوا ڕەحمت پێ بکات هاوڕێکەم، تۆ دڵسۆز و فریادڕەسی من بوویت.
والیی مەلەتییە وەک ئەوەی ئەمیرەیلی سەلجووقییەکان بێت، خێوەتگەی پرسەی بۆ ئیسحاق هەڵدا. گەدا و دەوڵەمەند و نزیک و دوور هاتن. والی خۆی بۆ دەبڕینی هاوخەمی ئامادەی پرسەکە بوو. بە قاسیدێک هەواڵی مەرگی ئیسحاقیان گەیاندە سوڵتان (کیقباز)، ئەگەرچی خەریکی ئامادەکردنی سوپا بوو بۆ غەزای (قلقیلیە)، بەڵام ئەوە وای لێ نەکرد پرسەنامەیەکی شاهانە بۆ مەرگی ئیسحاق نەنێرێت، کە مژدەی شایەتی لە زیندانەوە بۆ برد. هەر بە بۆنەی مردنی ئەویشەوە، داوای کرد جلوبەرگ و خواردن بۆ گەدا و نەداران ببرێت. لەنزیک کورسییەکەی والی بیرم لە سەدرەدینی کوڕی کردەوە، کە بەو بچووکییەی هەتیو کەوت. ئەویش لەتەک من دانیشتبوو، خەم و دەهشەت لە چاوەکانیدا ئاوێتەی یەک بووبوون. ئەو خەڵکە زۆرە لەو خێوەتە گەورەیەدا بە جلوبەرگ و زمانی جیاوازەوە دەبوونە مایەی دڵنەوایی بۆ ئەو. کاتێک بیری لەوە دەکردەوە، کە ئەو پرسە گەرموگوڕە بۆ باوکی بەڕێوەدەچێت،

تاوێک خامۆش دەبوو، پەشـــۆکاوی لە دەموچاوی دەرەویەوە، لێ ترس لە نادیار و هەستکردن بە نەمانی چەتری سـەری، خەمگینیان دەکردەوە.
گەڕامـەوە مـاڵ، فەرویەکی قوندوســـی، دوا دیاریی ئیســـحاقم لە خۆمـەوە لوول دا، ئـەو دەمـەی لـە ســیواس بووین لـە بازرگـانـە ڕووســـەکانم کڕی و بەســـەر شـانی منی دادا، بۆ ئەوەی خۆم لەو زەمهـەریرەی ئـەنـازۆڵ چـەپـاڵـە دەم. هـەموو جـارێ ئـەم دیـارییـە هاوڕێکەمی دەخستمەوە یاد. دواتر هەر کەسێک باسـی سـیواسـی کردبـا، وێنـە و شـــکڵ و شــێوەی ئـەوم دەهـاتـەوە مێشـــک، خۆشبەسەربردنی ئەو چەند مانگەم، بەسەریەکەوە دەکەتەوە خەیاڵ. ئەو کاتانەی بەسـەر مزگەوت و گۆشە و سووچ و قەڵا و تخووب و بێســتانەکان دەگەڕاین و خەڵک پێشـــوازییەکەی گەرموگوڕیان لێ دەکردین، ئـەمـەیش بـەهۆی من و تـەریقـەتـەکـەم، یان لـەبـەر قەدری ئیسحاق و ڕێزەکەیەوە بوو لە کۆشکی شانشین، یاخود بەهۆی ئەو ئاشـــنـایـەتییـە زۆرەی ئـەو بوو لـەگـەڵ بازرگانەکان، ئاخر بۆ هەر وڵاتێک بە قاسید دەچوو، خەڵک پۆل پۆل ڕوویان تێدەکرد. بەیەکەوە کتێبمان دەخوێندنەوە و لە پێشوازیی فەقێیان دەوەستاین و خیرقەی تەسـەووفمان دەپۆشـی. داوا لە خوا دەکەم کردەوەکانمان لێ قبووڵ بکـات، بۆ ڕێگـەی مـحـەبـەتـە کـامڵـەکـەی خۆی، ڕێنوێنیمـان بکـات، بۆ مەقامی سۆز و میهر و خۆشنوودیی خۆی، بەرزمان بکاتەوە.
لە پرسەی ئیسحاقدا ماتەمگێڕێک پێی گوتم: "قوربان! ئاخری خەمانت بێت." ئـای خودایـە ئـەم دەربڕینـە چـەنـدە نـاقۆڵا و هیچـە! نـە ئـاواتـە بـەدیبێت، نـە نزایـە گیرا بێت. هـەرکـاتێک یـەکێک ئـەو ڕســـتـەیـەی دەگوتەوە، خەڵک بە "دوا خەمت بێت." تێدەگەیشـــتن، بەڵام ئەمن پێم وابوو، کـە دەڵێن: "تـەمـاخوازین بـەر لـەوەی خـەمێکی دیکـە بەرۆکت بگرێت، باهۆزی مەرگ خێرا بنەوبارگەت بپێچێتەوە. "ئێمە بەبێ خەم کێین و چین؟ بێ خەم چۆن لە بوونی خۆمان دڵنیا بین؟ ئاخر ئەگەر

بێ خەم بین، وەک بزنی وێڵ، لە نیهالی غەفڵەتیدا سەرگەردان و لاڕێ دەبین. خەم، حەزی لە دڵ و دەروونی سۆفی تەرکە دنیایە، ڕقی لە جاهیلی دنیاویست و تەفرەخواردووە. لەو ڕێگەیەدا خوا خەم لەدوای خەمی پێداوم.

هەر دوای ئەوەی ئیسحاقی هاوەڵ و ئازیزم ئەسپەردەی خاک کرد، هاتمەوە ماڵ و هەڵکورمام، مێشکی خۆم هەڵگوشی هەر چ یادەوەرییێک لەنێوانماندا هەبوو هێنامەوە بیری خۆم. لە ڕوانگەی غیاب و نەمانی ئەودا، لە ژیان ڕادەمام، تاکوو قاچی دووەمی بەدریش، وەک هیی یەکەمی، ڕەشهەڵگەڕا، لە پەلوپۆ کەوت و بەتەواوی پەکی کەوت.

سودکین لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە هەڵی دەگرت. دایدەنیشاند و سەری دەشوشت، نەیدەتوانی هیچ بزاوێک بکات. ئەگەر ویستبای گوازەگوازێک بکات، لەسەر ئەنیشکەکانی دەخشا، یان لەسەر پشت و سکی هەڵگێڕ و وەرگێڕی دەکرد، تاکوو خۆی دەگەیاندە شتەکە. زۆر ئارام و دڵپاک و بەرگەگر بوو. پزیشکێکم بۆ بانگ کرد، بە هەموو لایەکدا هەڵی گێرا، دواتر بێ ئەوەی هیچ شتێکمان پێ بڵێت ڕۆیشت، وەک ئەوەی لە باری تەندروستی ئەو نائومێد بووبێت. ئیتر زانیم فیراقی من و ئەو دۆستە ئازیز و خۆشەویست و هاوەڵی سەفەری خۆرئاوا و خۆرهەڵاتیشم نزیک بووەتەوە. زۆر خواردنی بۆ چێ کردم و گەلێک سەری شوشتم، خزمەتێکی بێشۆی کردم و زۆر بەدوامەوە بوو. بێدا یاریدە و کۆمەکی کردم. زۆر شتی لەمن وەرگرت و منیش زۆر شتم لەو وەرگرت. بڕیارم دا تا خوا لایەکی لێ بە لایەک دەکات، ئەوەندە تەمەنەی ماویەتی، لەگەڵ ئەودا ژیان بەسەر ببەم. وازم لە وانەگوتنەوەی مزگەوت هێنا و سەرتاپای ڕۆژەکەم لە ژوورەکەی وی بەسەر دەبرد. من دەمنووسی و ئەویش دەینووسییەوە. هەر کاتێک لە نووسینەوە تووشی گرفتێک بوایە،

پرسیاری لێ دەکردم، منیش وەڵامم دەدایەوە، وەڵامێک کۆدی نهێنیی خۆشەویستی و قەدر و پایەداری لە سینەمدا بۆ ئەو کەشف دەکرد.
لەوان ڕۆژان بەیانییەک لە خەو هەستام، سەیرم کرد بەدر پێش من لە خەو هەســـتاوە و خەریکی نووســـینە. کاتێک چوومە لای، زەردەخەنەیەکی کرد، ئەو کتێبەی، کە خەریکبوو دەینووســـی، دایە دەستم، زۆر بە جوانی نووسرابوویەوە، بە ڕێکوپێکی بەرگ کرابوو، "الإنباه فی طریق الله"ـــی لەســەر نووسـرابوو، پێم وانەبوو، کە من پێشتر کتێبێکی وام لەژێر ئەو سەرناوە نووسی بێت.
- بەدر ئەوە چییە؟
- بە درێژایی چەندان ســـاڵ، هەموو ئەو شـــتانەی پێشـــتر لە تۆم بیســـتوون، لە دووتوێی ئەو کتێبە کۆم کردوونەتەوە، ئەوەی لەنێو ئەو کتێبەدایە لە هیچ کتێبێکی دیکەی تۆدا نییە، ترسام ئەو زانیارییانە لەبەین بچن، بۆیە لەو کتێبەدا کۆم کردنەوە.
- یانی تۆ کتێبێکت لەبارەی منەوە نووسیوە؟
بەدر پێکەنی و گوتی:
- قوربان! مەعریفەی تۆیە، بە دەستخەتی من نووسراوە.
- منیش دەیخوێنمەوە و ساغی دەکەمەوە.

# ٨٩

**"ئارامگرتنی یەکەم، لە چەڵەمەی یەکەمەوە حیسابی بۆ دەکرێت، ئارامگرتنی دووەم، بەهەند وەرناگیرێت"**
**ئیبن عەرەبی**

ڕۆژێک کاتیبێکی خانەی والی لەگەڵ سەربازێک لە دەرگەیان دا و نەهاتنە ژوورەوە. بە سیما و ڕوخسارێکی وشک و تێکهەڵاتوو لەبەردەم سودکین وەستان، سودکینیش دەیویست لە داواکەیان تێ بگات. ئەوانیش تەنێ گوتیان فەرمانیان پێ کراوە، کە هاوڕێ گولەکەتان ببەینە کۆڵانی گەڕ و گولان. هەر چەند سودکین بۆی ڕوونکردنەوە، کە لە ماڵی ئێمەدا کەس گول نییە، ئێوە بەهەڵە ناونیشانتان وەرگرتووە، بەڵام ئەوان لەسەر قسەی خۆیان موکڕ بوون و لەبەر دەرگە وەستان و دوورنەکەوتنەوە. منیش گوێم لە گفتوگۆی نێوانیان بوو، سودکین بانگی کردم، منیش پرسیم:

- کێ ئێرەی پێ نیشان دان؟
- پزیشکی بیمارستان.
- چی گوت؟
- گوتی گولێک لەو خانووەدا دەژی.

لام لە سودکین کردەوە، کە هێشتا هەر پێی وابوو هەڵەیان کردووە. ویستم بۆی ڕوون بکەمەوە و بڵێم ئەو دوانە بەڕاست و دروستی

هـاتوون، بـەڵام هـەرچـەند هێنـام و بردم توانـای قسـەکردنم نـەما. ئەسرینی گەرم و ئاگرین لە چاوەکانمەوە ڕژانە سەر کوڵمەکانم، کە سەرماوسۆڵی پاییز شەقشەقی کردبوون.

چوومـەوە ژوورەکـەم، نـامتوانی تـەمـاشـای بـەدر بکـەم، بێ هەستوخوست هەڵکورمابوو، چەند گوناهـبوو، نەیدەزانی چ باسە. لەسـەر ڕایەخە کەڵەکەبووەکانی سـووچی ژوورەکە ڕاکشـام و چاوەکانم پەنا دان و تێر گریام، نەمهێشـت هەسـت بە گریانی من بکات. بەڵێ گریام بۆ ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ بەدر بەسـەرم بردبوون، بۆ ئەو شـەوانەی لەژێر میچێک یان لەبن گومبەزی ئاسـمانی شـین، بـەیـەکەوە خـەوتبووین. ئەو ڕۆژ و شـەوانەی لەگەڵ یەک بەپێیان ڕۆیشـتن و سـواری وڵاخ بووین. بۆ ئـەو کاتـانـەی لە جێگەیەک دەمـاینەوە، بۆ ئەو سـاتانەی پێکەوە گەڕیدەئاسـا بووین. بۆ ئەو وەختانەی قووتمان هەبوو، یان ئەو ڕۆژانەی برسی و بێ نان و ئاو بووین. بۆ ئەو کاتانە دەگریام، کە لە دەوروبەری فاس و گەڕەکەکانی قـاهیرە و، دۆڵـەشـیوەکـانی مـەککـە و، کۆڵانـەکـانی حـەلـەب و، گەڕەکەکانی بـەغدا بەیەکەوە دەگەڕاین. بۆ هەموو ئەو خانوانەی لە شـاران لێیان نیشـەجێ بووین، بۆ گشـت ئەو خانەقایانەی فیکر و زیکرمـان تێدا کردوون. بۆ هـەموو ئـەو میوانخـانـانـەی وەک ڕێبوار تێیاندا ماوینەتەوە. بۆ هەموو بیابانانەی پێیاندا تێپەڕبووین و تیشکی خۆر سـەری هەڵکڕووزاندووین. بۆ هەموو ئەو کێوانەی بەنێویاندا ڕۆیشـتووین و سـەرمـا ئازاکانمانی بەسـتووە. بۆ هەموو ئەو خواردنانەی لە دەوری کۆ دەبووینەوە و کامیان خۆشتر و باشتربوو بۆ منی دادەنا. بۆ هەموو ئەو ئاوانەی خۆمان پێ فێنک دەکردنەوە و دەمانخواردنەوە، کە قەت پێش من نەیدەخواردەوە.

لـە ژوورەکـەم هـاتمـە دەرەوە، دیتم سـودکین لـە بـەر دەرگـەم دانیشتووە، نازانێت چی دەکات. جێم هێشت تاکوو بچێت ئەو هەواڵە

به بەدر بدات، منیش ئەو ناوەم جێ هێشت، ڕۆیشتم بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەڕۆم و چیم دەوێت.

شـــەو گەڕامەوە ماڵ، گەیشـــتمە ســـودکین. بە ئاماژە پێی گوتم هەواڵەکەم بە بەدر داوە. چوومە لای بەدر، خەریکی نووســـین بوو، هەروەک ئەوەی نە بای دیبێ و نە باران، دیاربوو هەق تەعالا سەکینەتی ئیماندارانی بە سەر دڵ و دەروونیدا ڕشتبوو. تەماشایەکی منی کرد و گوتی:

- هەردوو کتێبی "العظمة" و "القربة"م نووســـینەوە. تێنووس و پەڕاویش لەگەڵ خۆم دەبەمە گولخانە و کتێبی "میم" لەوێ تەواو دەکەم.

لەیەک کاتدا ڕۆندک و بزە بە ڕوومدا هاتن. بەدریش بزەیەکی بۆ کردمەوە، هەستی بە دڵتەنگیی من کرد و گوتی:

- قوربان دڵتەنگ مەبە، من تەنیا بۆ فیراقی تۆ خەمبارم.

- بەدرگیان! زۆر پێم ناخۆشە تۆ دەچیە گولخانە.

- نا قوربان! ئەوێ جێگەیەکی خۆش و دڵگیرە، مەقامی ئیماندارە ئارامگرەکانە، هەموو ڕۆژێک لە تەرازووی گوناهەکانیان کەم دەکاتەوە و لە تەرازووی خێر و چاکەیان زیاد دەکات.

- برا بەپێی توانا سەردانت دەکەم.

- مانگانە یەک جار وەرە لام، کەمتر لە یەک ســـەعاتیش بمێنەوە. ئەگەر ئەو نەخۆشییە تۆ بگرێتەوە، قەت لە خۆم خۆش نابم.

خۆم تێکرد و ســـەریم ماچ کرد، ئەویش بە شـــەرمەوە کشـــایەوە و هەوڵی سەرماچکردنی منی دا. دەستی، کە لە حوبری سوور و ڕەش هەڵهاتبوو، گرتم و ماچم کرد، ئەویش دەســـتی منی گرت و ماچی کرد. توند بە ســـینەمەوە نووســـاند، گەردەنکەچ بوو. من گریام و ئەویش بەهێمنی دەســـتی بە شـــان و پشـــتمدا هێنا، هەروەک ئەوەی منداڵێکی ونبوو کڕ بکاتەوە. لەکۆتاییدا ئەسـرینەکانم سـڕین و خۆم قیت کردەوە، تەماشـــام کرد و هەوڵم دا چاوەکانم بە ڕوخســـار و

سیمای ئەو بسپێرم، بەڵکە ئەمە کۆستی فیراقی ئەوم لەسەر سووک بکات.

تاوێک بێدەنگ بووین، بەدر خەریکی ڕێکخستنی پەڕاو و داخستنی حوبردانەکەی و سازکردنی خۆی بوو، منیش لە تێڕامان و وردبوونەوە لەو، زیاتر هیچ چتێکی دیکەم نەدەکرد، بێدەنگ و خامۆش بووبووم. ئێمە لەو حاڵەدابووین سودکین وەژوور کەوت، لە سووچێکی ژوورەکە دانیشت و نیوەی دەموچاویشی لەپشت ئەژنۆکانی پەنا دا. دواتر بەدر، کە هێشتا هەر خەریکی سەیرکردنی پەڕاو و ڕێکخستنیان بوو، هاتە قسە و گوتی:

- ئەرێ قوربان دەزانیت؟

- چی هاوەڵە ئازیزەکەم؟

- منداڵ بووم لە قاهیرە، ڕۆژێک بەرلەوەی ببمە کۆیلەی ئەبووفەتووح، پیاوێک منی کڕی و دوای دوو ڕۆژ منی بۆ بەندەفرۆشەکە بردەوە، دەزانی بۆ؟ چونکە من نەدەخەوتم، وایزانی نەخۆشم. بەندەفرۆشیش ڕێک منی ڕەگەڵ حەبەشییەکان خست، کە تازە لەگەڵ قافڵەیەکی عەرەبی گەیشتبوون. ژنێکیان لەگەڵ دابوو بەختی دەگرتەوە، بە کەسێکی گوت چارەنووسی تۆ لە بەغدا کۆتایی پێ دێت. بە یەکێکی دیکەی گوت: لە کەرک سەر دەنێیتەوە. بە کەسێکی دیکەی گوت لە دیمات دەمریت. گەدا و هەزار لێی خڕدەبوونەوە، هەر یەکەو دەیویست بزانێت باهۆز بەرەو کوێ ڕای دەپێچێت. دوای ئەوەی بەختی بۆ هەموویان گرتەوە، ئاوڕێکی لێ کردەوە و گوتی: تۆ کوڕە بچکۆلەکەم، ناتەوێت پێت بڵێم گەورەکەت چی لێ دێت؟ گوتم: "نا، بەڵام حەز دەکەم بزانم دایکم لە کوێیە؟".

ئینجا بەدر کەمێک بێدەنگ بوو، دەستەکانی لە تۆزوتاڵ داوەشاندن و چاوەکانی لە دیوار بڕین، وەک ئەوەی پەنجەرەیەکی تێ بووبێت و لێیەوە ڕابردوویەکی دوور ببینێت و بۆمان بگێڕێتەوە. پاشان بەدر گوتی:

- ژنەکە جارێک، دووجار، سێ جار بەختی بۆ گرتمەوە، هەموو کەڕەتێکیش سەری خۆی ڕادەهەژاند و سەرسوورمانیی خۆی دەردەبڕی، وەک ئەوەی جادووەکە نهێنییەکانی لێ بشارێتەوە. لەکۆتاییدا حەسرەتێکی هەڵکێشا و بە نیگایەکی پڕ لە سۆز و میهرەبانەوە تەماشایەکی کردم، هەرگیز ئەوەم لەبیرناچێتەوە... گوتی: "جگەرگۆشەکەم تۆ دایکت نییە، دەمێکە مردووە." بەچی مردووە؟" دیسان بۆ دوا کەڕەت، بەختی گرتەوە و گوتی: "بە گولبوون."

- سوبحانەڵڵا!

- قوربان وابزانم یەکدوو ساڵم ماوە تەمەنم بگاتە حەفتاساڵی. هەرکاتێک ئەو پیرەژنە بەختگرەوەم دێتەوە بیر، نیوەی یەکەمی قسەکەی، کە گوتی: "... تۆ دایکت نییە..." دەکەوێتەوە یاد، قەت بیر لە نیوەی دووەمی ناکەمەوە، چونکە مادەم دایکم نییە، پێویست ناکات بزانم چۆن مردووە. ئەمڕۆ، کە سودکین ئەم هەواڵەی پێ دام، قسەی ژنەکەم کەوتەوە بیر.

- هاوەڵە ئازیزەکەم خودا شیفات بدات. خوا هاوکارت بێت.

- قوربان من بە چوونە کۆڵانی گەڕ و گولان هیچ خەمبار نیم....

وێجا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بزەی سەر ڕووی زیاتر کرد و بە دەنگێکی پڕ ئومێدەوە گوتی:

- ... دەڕۆمەوە لای دایکم.

## ٩٠

**"بەدری حەبەشی، لەبەر تۆ حەبەشییەکانم خۆش دەوێن، هەر لە بەرخاتری ناوی تۆیش، عاشقی (بەدری مونیر)م.**
**ئیبن عەرەبی**

کۆلانی گەڕ و گولان کەوتبووە دەرەوەی مەلەتییە، ڕێک بە ئاراستەی با، تاکوو هەڵم و هەلاوی تووشبووانی ئەو نەخۆشییە بۆ دەرەوەی شار بڕوات. تەنیا ئەو ئاوەیان بەکار دەهێنا، کە لە شار دەردەچوو. دەیان خێوەتیان بۆ هەڵدابوون، خێرخوازێک مزگەوتێک و گەرماوێکی بۆ دروست کردبوون. خزمەتکارەکانیش هەر بەشێک لە گولەکان بوون، وەختێک کەسوکاری نەخۆشەکان دەهاتن پارە و پاداشتی خزمەتەکەیان لێ وەردەگرتن. بەشێک لەو کەسانەی بۆ سەردانیان دەچوون، لە دوورەوە بە دەنگێکی بەرز قسەیان لەگەڵدا دەکردن. بەشێکی دیکە دەچوونە نێو خێوەتەکەیان و جاری وا هەبوو بە شەویش لەلایان دەمانەوە. هیچ یاسایەک بۆ قەدەغەکردنی هاموشۆی خەڵک بۆ لای گولەکان نەبوو، وەک ئەو یاسا توندانەی کە لە وڵاتی مەغریب بۆ سەردانیکەرانی کۆلانی گولان دانرابوون. لێرە هەر کەسەو بە گوێرەی پلەی ئیمانەکەی بە قەزا و قەدەر ڕەفتاری دەکرد.

لەگەڵ سودکین لە نزیک مزگەوت و گەرماوەکە خێوەتێکمان بۆ بەدر هەڵدا، ڕێگەی چوونە مزگەوت و گەرماویشـــمان بۆ تەخت کرد و بەرد و دڕکمان لێ لادا، بۆ ئەوەی هەر وەختێک بیەوێت بەبێ ئازار بە ئاسـانی لەسـەریان بخشـێت و بۆیان بچێت. خزمەتکارەکانمان لەبارەی ئەو ڕێنوێنیی کرد و پارەی زیاترمان پێدان، بۆ وەی لە سەرشۆردن هاریکاری بکەن و هەموو ڕۆژێک ئاو و نانی بۆ ببەن.

بەدر جگە لە پەڕاو و قەڵەم، هیچی دیکەی داوا نەکرد، ئاخر بە نووسـینەوەی کتێب، سـەبووری دەهات. ئەو زۆر داوای لێ کردین بڕۆین و ئەو ناوە جێ بهێڵین، نەبادا ئەو نەخۆشـییە بگرینەوە، ئێمەیش لە خزمەتی مەرەخس بووین. هەرکە کۆڵانی گولانمان جێهێشـت و لە مەلەتییە نزیک کەوتینەوە، سـودکین بەکوڵ گریا، تاکوو گەیشـتینەوە ماڵەوە، تنۆک تنۆک ئەسـرینی گەرمی داباراندن.

ماڵ تەنیا بۆ من و ئەو مایەوە، ها ئەوەتە لە دەوروبەری ماڵەوەمان گڤەگڤی با دێت، پێشـتر دەنگی ژن و قیژەی منداڵ و باڕەی بزنی لێ دەهات. ئەمڕۆیش تەنیا دوو کەسی دڵ پڕ لە خەمی تێدا ماونەتەوە.

هەموو ڕۆژێک دەچمە بەر دەرگەی ماڵی سـەفیە، دەبینم سـەدرەدین لەوێ چاوەڕوانی من دەکات. پێکەوە دەچین بۆ وانەگوتنەوە، من وانە بە فەقێیان دەڵێمەوە و ئەویش لەتەکمەوە دادەنیشـێت. کاتێک فەقێکان دەڕۆن لەگەڵی دادەنیشـم و ئەوەی گوێی لێ بووە پێکەوە دەوری دەکەینەوە، ئەوەی لێی تێنەگەیشـتووە تێی دەگەینم. دوای نوێژی مەغریب بەخۆم دەیبەمەوە ماڵیان، دڵم نایەت بەتەنیا لەو کۆڵانە تاریک و نوتەکانە ڕێ بکا.

ئیسحاق ماڵ و پارەیەکی باشی بۆ جێ هێشتوون، ترسی هەژاری و بێدەرتانی ئەوانم نییە، بەڵام ترسـی ئەوەم هەیە بڕۆن. دایکی سـەدرەدین هێشـتا گەنجە، دەترسـم پیاوێک مارەی بکاتەوە و بۆ شـوێنێکی دوور بیانبات. بیرکردنەوە لەو باسـە، نان و خەوی لێ هەڵگرتبووم، هەر وەختێک سـەرنجی بلیمەتی سـەدرەدینم دەدا،

دەمدی بە گڕوتینەوە بەرەو پیلی زانســت دەچێت، خەم و پەرۆشــیم پتر دەبوو. لە نێوچاوانی پان و چاوەگەشـــەکانی ئیســـحاق بۆم دەرکەوتبوو، کە ئەگەر پابەندی ریازە و موجاهەدە بێت، خودا زەوقی عاریفان و حاڵی سۆفیانی پێ دەبەخشێت. خۆ ئەگەر بکەوێتە دەســـتی پیاوێکی دیکە، ڕەنگە هەموو ئەوانەی لەکیس بچێت، ببێتە شــتێک کە من نەمەوێت: ســەربازێک، نووســەرێک، بازرگانێک، یان هەر شـــتێکی دیکەی تر. لەبارەی وی زۆر ئیســـتیخارەم کرد، تا بەیانییەک نیەتم دامەزرا، لەناوەڕاستی دەرس، فەقێکانم جێ هێشتن، داوام لە ســـودکین کرد ئەوەی ماوە پێیان بڵێتەوە. ئەو کەڕەتە ســـەدرەدینیشـــم لەکن ئەو جێ هێشـــت. ڕێک بەرەو ماڵی ســـەفیە ڕۆیشتم، چونکە دەمزانی ئەو کاتانە تەنیایە. لە دەرگەم دا، بە زمانی تورکمانی قسەی کرد، وەڵامم نەدایەوە. بە زمانی عەرەبی قسەکەی دووبارە کردەوە:

- کێیە لە دەرگە دەدا.

- من، موحی.

خێرا دەرگەی کردەوە و گوتی:

- بەخێر بێیت قوربان. سەدرەدین سەلامەتە؟

- ســـەلامەتە و لە مزگەوتە. هاتووم داوایەکت لێ بکەم، حەزم نەکرد سەدرەدین گوێی لێ بێت:

- لە خزمەتم قوربان.

- هاتووم خوازبێنیت بکەم.

وەک چاوەڕێم دەکرد، بێدەنگ بوو، بە لوتفەوە دەرگەی لەقاند و لە پشتیەوە ڕووی خۆی شاردەوە. بە دەم ڕۆیشتنەوە پێم گوت:

- پەلە مەکە و بیری لێ بکەوە، دواتر خەبەرم بدەوە. تۆ هەمووشتێک لەبارەی منەوە دەزانیت، کوڕەکەی تۆ وەک کوڕی من وایە، حەز دەکەم پێکەوە پەروەردەی بکەین. کەی حەزت کرد وەڵامم بدەوە.

ویستم دەرچم، بانگی کردم:

- قوربان...
- بەڵێ.
- من ڕازیم.
- خاتوو سەفیە ناتەوێت بڕێک بیری لێ بکەیتەوە؟
- ئەو باسە لەمێژە براوەتەوە. من لە چاوەڕوانیی تۆدا بووم.
- بڕاوەتەوە؟ کێ بڕاندوویەتیەوە؟
- ئیسحاق.
- چۆن؟
- بەر لە مردنی ڕایسپاردم شوو بە تۆ بکەمەوە.

جێم هێشت و چوومە مزگەوت، بە قسەکانی زۆر دڵم خۆش بوو، هەستم کرد ئومێدێک گەڕایەوە و سەرلەنوێ ژیانی سەوز کردمەوە، دوای ئەوەی دووساڵ وشک و برینگ بووبوو، وەک بیستانێک ئاوی لەسەر بڕابێت و قاتی و شکەساڵی بڕستیان لەبەر بڕیبێت. دوای چەند هەفتەیەک سەفیە و سەدرەدین هاتنە ژوورەکەی من و سودکینیش جارێکی دیکە گەڕایەوە حوجرەکانی مزگەوت. ئەوجارە لەباتی بزنێک، دوو بزنمان کڕین. دوای نوێژی بەیانی، وانەیەکی تایبەتم بۆ سەدرەدین و عیمادەدین دانا. هەموو ڕۆژێک سەدرەدین وەک خۆر پرشنگی دەدا....بەڵام عیمادەدین تەنبەڵ و لاسار بوو.

بۆ جارێکی دیکە، سەنگرامەوە، خوا بۆ زنجیرەیەک میعراجی عەقڵی و مەقاماتی رۆحانی و مەراتیبی باڵا، ئیختیاری کردم. هەق تەعالا کۆمەڵێک کەشفیات و مەواجید و ئەحواڵی بۆ ناردم، بەمەیش توانیم چەندان کتێب و پەیامی جۆراوجۆر بنووسم. هەرکە پەیامێک، یان کتێبێکم دەنووسی، ڕاستەخۆ بۆ بەدرم دەبرد، ئەویش دنیایەک شاد و دڵخۆش دەبوو. لە سەردانی دواتر، کە دەچوومەوە لای، دانەیەک یان دوو دانەی لێ نووسیبوونەوە، یەکدوو پرسیاریشی لەبارەیەوە لێ دەکردم. لەبارەی بە سودکینیش دەمەوێت بڵێم لە جاران زیاتر بایەخی پێ دەدەم، بەتایبەتی وەختێک هەق تەعالا بۆی کەشف

کردم، کە ڕووحی نمای کردووە و هەڵکشـــاوە، بێگەردانە ئاوێتەی تەسـەووف بووە، ناسـکبووەتەوە، وەک هەوری سـپی، بەرز و باڵا بووە.

لـە مـەلـەتییە دۆخەکە ئارام و جێگیربوو، بەڵام لە شـــوێنەکانی دی، ئاڵۆز و شەپرێو بوو. تەتەر سەمەرقەند و بوخارای وێران کردبوون، وڵاتگەلێکی زۆریـان داگیرکردبوو، لـە دارولخـەلافەی بەغدایش نزیک بووبوونـەوە. ســـەدای ئـەو ســـوپا دڕندەیە لە هەموو گۆشـــە و سووچێکی دنیا دەنگی دابووەوە، بووبوو بە قسەی سەرەکیی خەڵک بە هەموو چین و ڕەنگ و ئایینەکانیانەوە، تەنێ ترس و چاوەڕوانی، ئەوانی لێک کۆ دەکردەوە. ڕۆژانە چیرۆکی ئـەو گـەلـە دڕندەیان بۆ یەک دەگێڕایەوە، کە نەریتیان کوشـتن و کوشـتنەوە بووە، بۆ هەر گونـدێـگ چووبـان کۆمـەڵکوژیـان دەکردن و کـەس بـە زینـدوویی نـەدەمـاوە. هـەر لـەبـەر ئـەوە بوو خەلیفە لە بەغدا هانا و هاواری بۆ ســـوڵتانی قۆنیا برد. لـە بـازاڕ گوێمـان لێ بوو کـەســـێک لـەنێو سـوارچاکان جاڕی دەدا و دەیگوت هەر کەسێک دەیەوێت بە هانای خەلیفەوە بچێت، ئەوە ئەســـپ و شـــمشـــێر و زرێی دەدرێتی و تا دەشگەڕێتەوە، جامکیەی بۆ سەرف دەکرێت. دەستەیەک سوارچاکی مەلەتییە لە دەوری ســـەڵتەنەتی ســـوڵتان خڕبوونەوە، ســـوڵتانیش بەرەو بەغدا بەڕێی کردن.

لەو سـەینوبەینەدا چەندان نامەم لە حەلەب پێگەیشتن، داوایان دەکرد بچمەوە حەلەب دەســـت بە تەدریس بکەمەوە، لە کاتێکدا هێشـــتا دە ساڵ بەسـەر دەرکردن و هەڵاتنم لەوێ بۆ قاهیرە نەچووبوو. پاکی بۆ ئەو خوایەی بارودۆخەکان دەگۆڕێت و گۆڕانیش بەســـەر خۆیدا نایـەت. مـەلیک زاهیر مرد و کوڕەکـەی، مـەلیک عـەزیز لـە تـەمـەنی منداڵی لـەژێر چاودێری و ڕاســـپاردەی ئـەتـابگ تغرول جلـەوی دەســـتەڵاتی گرتە دەســـت و هەمووشـتێک گۆڕانی بەســـەردا هات.

هەستم کرد نامەکان جۆرێک لە دڵنەواییان تێدایە، کاتێک سەردانی بەدرم کرد، بۆم خوێندەوە، پێکەنی و پرسی:

- مامۆستا کێ دۆخەکەی وەها هەڵگێڕاوەتەوە؟

- پێم وایە میسرییەکان دوای کۆچیدوایی مەلیک زاهیر، خۆیان مشووری حەلەب دەخۆن.

- ئەمە چۆن؟

- مەلیک عادل لە میسر، باپیری ئەو مەلیک عەزیزەیە، کە خەڵک لە ڕێگەی دایکییەوە بەیعەتیان پێدا. مەلیک عادل بووەتە پارێزەر و هۆی مانەوەی لەسەر عەرشی دەستەڵات، ئەگەر پاسەوانیەتی ئەو نەبوایە، ئەمیرەکانی ئەیووبی، تونبەتوونیان دەکرد.

- کەواتە زۆری پێناچێت حەلەب هەمووی دەکەوێتە ژێر دەستەڵاتی میسر.

- بەڵێ بەدر. هەر بۆیە نووکە ئەوێ پڕبووە لە خانەقا و گۆشەی سۆفینشین، وا داوام لێ دەکەن دەرسیان تێدا بڵێمەوە.

- ئینجا دەچیت؟

- نا بەدر، جارێ ناچم.

بەدر بە مەبەستێکی خەفەکراو و بزەیەکەوە تەماشایەکی کردم و گوتی:

- قوربان! پێم خۆش نییە لەبەر خاتری من بمێنیتەوە، من دەزانم تۆ چەندە وڵاتی شامت خۆش دەوێت. خوا یار بێت منیش ساخ و سەلامەت دەبم.

- بەدر، بێشک دڵم بۆ فیراقی تۆ، پارچەپارچە دەبێت، بەڵام هێشتا چەند کارێکی دیکە ماون ڕێگرن لە چوونم. هێشتا ئەمری خودام بۆ نەهاتووە.

زۆری پێنەچوو، ئەمری خودا هات، گیانی بەندەیەکی خۆی کێشا. بەدر چووە بەر دلۆڤانیی خودا، پێشتر منیش هیچ گومانێکم نەبوو لە ماوەیەکی نزیکدا وەفات دەکات. ڕەشایەتی قاچەکانی بۆ ڕانەکانی

هەڵکشـــا، بە ڕادەیەک ئەگەر بڕابانەوە، دەمرد. هەموو جەســـتەی ئاوســـابوو، قۆڵ و دەســـتی وەک کوندە ئاویان لێ هاتبوو. پاشـــان وازی لە نانخواردن هێنا. دواتر بەشـێک لە پێستی هەڵی دا و خوێنی لێ دەچۆڕایەوە. لە ڕۆژانی کۆتایی، لەسـەر پشت کەوت و بەتەواوی پەکی کەوت. لـە شـــەوێکی تاریکی بێ هەیڤ، گیانی گەڕایەوە لای خوای تاقانە. لەگەڵ ســـودکین بردمانە گۆڕســـتان، وەک کەســـی مـارانگـاز هـەڵدەلـەرزیم، نـەمتوانی بچمـە نێو گۆڕەکـەی، لـەدوورەوە چاودێریم دەکرد، هـەر خۆی گۆڕەکـەی هـەڵکـەنی و شـــاردییـەوە. کاتێک ئەسپەردەی خاکی کرد، بە هانکەهانک هاتە لام و گوتی:

- شوکر باشیت؟

گوتم ئەسرینەکانم ناوەستن:

- پێم ناڵێیت چۆن باشـم بم؟ نابینی بەدری تریفەداری من، ماڵئاوایی لە ژیان کرد. ئەمن کێم تاکوو کەسێکی وەها بنێژم.

## ٩١

**"هەقیقەت لەبەر زێدە ئاشکرایی و ڕۆشنیەکەی، خەفە بووە"**
**ئیبن عەرەبی**

ســـــەفیە ژنێکی هێمن و بێدەنگ بوو. لە باخچە خەریکی چاندنی جۆرەها گوڵ و میوەجات بوو. باخچە چڕوپڕ بوو، گەڵا و لکوپۆپی دارودرەختەکان، تێک ئالقان. بەدرێژایی ســاڵ، بۆنی خۆشــیان لێوە دەهات. ســـەفیە وەها منی خزمەت دەکرد، وەک ئەوەی لەپێناو مندا خولقابێت. هەرکە لە خەو هەڵدەستام، یان لە شـوێنێک دەگەڕامەوە، ئاوی دەســتشــۆرین و خواردن و جلوبەرگی بۆ ســاز دەکردم. لە فەزڵی ئەو، ماڵمان پڕ ڕایەخ بووبوو، لە ئەرز ڕای دەخســـتن و دیواری پێ دادەپۆشین، بەمەیش خانووەکەمان گەرم بوو، کە پێشتر وا نەبوو. تاکوو من نەخەوتبام، ئەو نەدەخەوت، ئەمەیش لەبەرئەوەی نەبادا داوای بکەم و ئامادە نەبێت. ســـەفیە قژێکی قاوەیی پڕ و دوو ئەبرۆی پان و لووتێکی باریکی هەبوو. خاڵێکی جوان و ناســـکیش بەســـەر ڕوویەوە بوو. بەژن و قیافەی لە زۆینەی ژنان بەرزتر و بەخۆوەتر بوو. هەموو ئەمانە شـــیاوی ژنێکی وەک ئەو بوون، کە هەر لە منداڵییەوە سەروکاری لەگەڵ کشتوکاڵدا هەبووە. ئیسحاق بێ ئەوەی بچێتە لای ســـوڵتانی باوک (کەیخوســـرەو) و پاســـاوی بۆ بهێنێتەوە، ڕادەکات و لە وڵاتانی شـام دەسـووڕێتەوە، لەو کاتەیشـدا

سەفیە مێردی پێ دەکات. هێشتا سەفیە نامەیەکی سوڵتانی بۆ ئیسحاق لەلای خۆی پاراستووە، کە داوای لێ دەکات بگەڕێتەوە ئەنازۆڵ و ڕەزامەندیی خۆی بۆ دەردەبڕێت، من ئەوەم نەدەزانی، بەم دواییە، لە سەفیەم بیست. سوڵتان قەسیدەیەک بە زمانی تورکمانی بۆ ئیسحاق دەنووسێت، سەفیە بۆمی خوێندەوە و بۆ زمانی عەرەبیش وەری گێڕا:

ئەی زاتی پاکی سەما،

ئەی تاجی مەجلیسی تەبایی و برایەتی

دڵم بۆت پڕ حەسرەت و خەم بووە، وەک چۆن بۆ مەلیک جەمشید خەمناک بووم

لانەواز و سەرگەردانم، تاوێک وەک پڵنگ بۆ بیابان و

گاوێک وەک حووت بۆ ناو ئاو.

هاوەڵانم لێ دابڕاون، دەی خێراکە...

کاتی هاتنەوەت هاتووە، دە وەرەوە.

لێرە سۆراخی شوێنک بکە.

لێرەوە شەرم دایگرت و نەیتوانی قەسیدەکە تەواو بکات، وەک بڵێی ترسی ورووژانی غیرەی منی لە ئیسحاق کردبێت. حەزم کرد گاڵتەی دەگەڵدا بکەم، پرسیم:

- لە دڵی تۆدا کاممان خۆشەویسترن، من یان ئەو؟

بەڵام لە گاڵتەکەم سەرکەوتوو نەبووم. کتوپڕ ئەسرین بە چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە، لە چی دەترسا، تووشی هات. منیش توند لە ئامێزم گرت و پێکەنیم و پێم گوت:

- تۆ خۆشەوسترین ژنی منی، ئەویش باشترین هاوەڵی من بوو.

- تۆیش گەورە و مەولا و مامۆستامانی.

دواتر دووگیان بوو، کوڕێکی بوو، وەک ئەوەی ڕەحمەتێک بەسەر ماڵماندا دابەزیبێت، لە کاتێدا، کە زۆر پێویستیمان پێی بوو. لەبەر

زێده دڵخۆشـی و خۆشـحاڵی بەو، ناوم نا (سـەعدەدین). هەڵمگرت و لە سـیما و ئادگارەکانی ڕامام. شـوێنەواری سـەفیەم لە نێوچاوانی پانی و ئەبرۆ پڕەکانی دیتەوە. نێوان چاوەکانیم ماچ کرد و سوپاسی خودام کرد، کە نیعمەتەکانی خۆی بەسـەردا ڕشـتم. بڕیارم دا بۆ سـوپاس و سـتایشـی خوا، لە خانەقایەکی دەرەوەی مەلەتییە بچمە خەڵوەت. کاتێک بە سـودکینم گوت بەیەکەوە دەچینە خەڵوەت زۆری پێخۆش بوو، دوای ڕۆژەڕێیەک گەیشـتینە خانەقاکە. هێسـترێکمان پێبوو، لە ڕێگە بەنۆرە سواری دەبووین. لە خانەقا چەند هەفتەیەکمان لەگەڵ چەند برایەک بە شـەونخوونی و زیکر و برسـیبوون بەسـەر برد. ڕێکەوتی چەند شـێخ و مامۆسـتایەکمان کرد، کە لە بەلْخەوە هاتبوون. هەروە چەند موریدێک لە سـەمەرقەند هاتبوون، دەسـتە دەروێشێک لە هەمەدان و موسڵەوە هاتبوون.
ئەوانە لەگەڵ ئێمەدا کاتیان بەسـەر دەبرد، لەنێویاندا خەڵکی ڕێبواریش هەبوون، بەمەدهۆشـی و هائیمی لە خانەقایەکەوە دەچوونە خانەقایەکی دیکە، تەنێ قاپی دارینیشـیان پێبوو خێر و سەدەقەیان پێ وەردەگرت.
دوو کتێبم بۆ خوێندنەوە، دواتر لەبەر جیاوازی زمانی من لەگەڵ وان و سەختیی وەرگێڕان، وازم هێنا. بە کۆمەڵ دەکەوتینە نێو زیکر و تەهلیل، سـۆفییەکی خویی دانیشـتنەکەی بەڕێوە دەبرد، نەمانزانی لەسەر چ تەریقەتێکە و سەر بە چ شێخێکە. هەرکە دەمانگوت لەکوێ هاتوویت؟ دەیگوت: "لەکن خوا." دەمانگوت بەرەو کوێ دەچیت؟ دەیگوت: "بەرەو لای خوا." کاتێک پێکەوەبووین پرسیارەکەم لێ پاتە کردەوە، بەشـکم باشـتر وەڵامم بداتەوە، کەچی بە "خوا خۆی وەدیهێنەرە، خوا خۆی تەریقەتە، خوا خۆی ئامانجە." وەڵامی دامەوە." بە قسـەکانی سـەرسـام بووم، بەردەوام هاوەڵیم دەکرد، بەڵام لەمە زیاتر هیچی دیکەی نەدەگوت. بەدرێژایی ڕۆژ لەنزیک دارقەیسییەکە، کە پاڵی بە دیواری خانەقاوە دابوو، هەڵدەکورما و قسـەی لەگەڵ

کەس نەدەکرد. ڕووی خۆی بە کڵاوێکی گەورە دادەپۆشی، ئەندامەکانیشی بە جلی بەریەوە دەشاردنەوە، دیمەنەکە وا دەردەکەوت، کە جلێکی ڕەشی گەورە، بەسەر دارێکەوە هەڵواسرابێت. بە قەدەر ئەوەی شەیدا و عەودالی قسەکانی بووم، هێندەیش لە گۆشەگیرییە زۆرەکەی بێزار دەبووم. ڕۆژێک بەو حاڵە چوومە لای و پێم گوت:

- مادەم هێندە حەزت بە گۆشەگیری و خەڵوەتە بۆچی لە خانەقا دەمێنیەوە؟

پێشەکڵاوەکەی لەسەر چاوەکانی هەڵگرت و لەنێوان پەرچەمە تۆزاوی و پەرتوبڵاوەکانی سەر ڕوو و تەوێڵی، تەماشایەکی کردم و بزەیەکی فراوانی کرد و گوتی:

- دەتەوێت بەڕاستی وەڵامت بدەمەوە؟

- بەڵێ.

- لەپێناو خواردن! ئەمە زۆر خۆش و دڵگیرە.

دوای چەند ڕۆژێک ون بوو. بەیانی هەموو لێک خڕبووینەوە، ئەو دیار نەبوو. بەدرێژایی ڕۆژیش هیچ شوێنەوارێکی ئەومان لە هیچ شوێنێک بەدی نەکرد. دواتر زانیمان، کە کەلوپەل و پریاسکەکانی هەڵگرتوون و ڕۆیشتووە. ئومێدی خێر و خۆشیمان بۆ خواست، هەموومان نزای ڕێگەی بەرەوخواچوونمان بۆ کرد. گەڕاینەوە سەر کاروبارەکانی خۆمان. وەک هەموو غەفڵەتزەدەکان پێمان وابوو ئەو کەسێکی غەریبە و غەوارە و سەیرۆکەیە. لە جیهانی دەروێشاندا دیدار و دیدەنیی ئەو تەرزە کەسانە سەیر نییە، گەلێک جار ئەو جۆرە سۆفیانە دەبینم، کە هیچ پێوەندییەکیان بە چینی سۆفیانەوە نییە، هۆگر و گۆشەنشینانی خانەقا دەبینم، هیچ پێوەندییەکیان بە ئەهلی خانەقاکانەوە نییە. بەردەوام خوا مەشق و ڕاهێنام پێ دەکات و فێرم دەکات، بەمەیش خاکەڕایی و درککردنم پتر دەبێت، ڕوونە ئەمەیش لەبەر نەزانی و کەم زانستییەکەمە.

بەخ بەخ! شـێخی گەورە و کبریتی سـوور، ئەی ئەو کەسـەی خودا شتت بۆ کەشف دەکات، لە خەودا ئەسراری عەلەویت نیشـان دەدا.
ها ئەوەتە مێخی چوارەم، بە بەردەمتدا ڕەتدەبێت و ناشزانیت!

## ٩٢

**"ئەو کەسەی کەفوکوڵی دامرکایەوە، نالوێ بە عاشق ناوی بەرین"**
**ئیبن عەرەبی**

دوای مانگێک، لەگەڵ سـودکین و چوار دەروێشـی خانەقا، کە بڕیاریان دابوو شـوێنپێم بگرن و لە مەلەتییە دەرسـم لەلا بخوێنن، گەڕاینەوە مەلەتییە. لە کاتی گەڕانەوەدا کەسـێک چاوەڕێی دەکردم، کە قەت پێشـبینیم نەدەکرد. بێ ئەوەی بەدوایدا بنێرم، عیمادی کوڕم هاتبووە ماڵەوە. سەفیە بە حەسرەتێکەوە گوتی:

- فاتیمە هێنایەوە و ڕۆیشت. گوتی مێردەکەم مکوڕە لە مەلەتییە بار بکەین و چیتر ناتوانێت لێرە بژیت.

- بۆ کوێ چوون؟

- شاری ماردین.

- چۆن منداڵەکەیان جێ دەهێڵن و دەڕۆن؟ ئەمە چ شێتییەکە!

- ئازیزم هیچ لە گۆڕێ نییە، من وەک کوڕەکەی خۆم پەروەردەی دەکەم.

ماڵمان جارێکی دیکە بە گاڵەگاڵی منداڵ و باڕەباڕی بزن، ئاوەدان بووەوە، من و سـەفیە و سـێ منداڵ و دوو بزن. کاتێک مێوانێکمان دەهات نەماندەزانی لەکوێ داینیشـێنین. ئەگەر شـەو لە لامان بمابایەوە، نەمدەزانی لەکێ بیخەوێنم. داوام لە سـودکین کرد، بە

لایەنیکەم، خانوویەکی سـێ ژووریمان بۆ بەکرێ بگرێت. چەند ڕۆژێک بۆ گرتنی خانوو لە کۆڵانەکانی مەلەتییە سـووڕایەوە، هیچ خانوویەکی دەست نەکەوت. وەلێ کەسێکی دۆزییەوە.

- قوربان! بیرتە ئەو دەروێشەی لە خانەقا سەردانی دەکردین؟

- بەڵێ، بۆ چییەتی؟

- لە بازاڕ شـوێنێکی گرتووە و لەپی دەسـت دەخوێنێتەوە، بەدەر لە قووتیش، هیچ پاداشتێکی دیکەی ناوێت.

سـەری خۆم بادا، گەڕامەوە سـەر خوێندنەوەی خۆم، سـودکین پچڕاندمی و پرسی:

- گەورەم لەبارەی خوێندنەوەی لەپی دەست چی دەڵێیت؟

- ئەمە عیرفانە، یان فیراسەیە، یانیش درۆ و دەلەسەیە.

- پێت وایە ئەم دەروێشە لە کامیانە؟

- سودکین بۆ دەپرسی؟

- حەز دەکەم بچمە لای و لەپی دەسـتم بخوێنێتەوە، بەڵام پێم باشبوو پرسوڕا بە تۆ بکەم.

- زۆرباشە، پێکەوە دەچین بزانین چ پیاوێکە. لە کوێ دادەنیشێت؟

- لەلای بەیازین کن سووچی مزگەوتەکە.

- بە ئیزنی خوا، بەیانی دەچین.

دوای نوێژی عـەسـر، سـودکین بردمیە لای دەروێشـەکـە. سەروسەکووت و شکڵ و شێوەی هەر وەک ئەو ڕۆژە وابوو، کە لە خانەقا بینیم، ئەگەرچی پتر چرچ و لاواز بووبوو. پشتی بەدیواری مزگـەوت دابوو، قـاچـەکـانی لـەبـەردەم خۆی دانـابوون، وەک دوو سـتوون وا بوون، کە جلە خورییە قوڕس و گەورەکەی ئەویان پێدا درابێت. نزیکبووینەوە قسەی لەگەڵدا بکەین، پیاوێک لەپێش ئێمە لەپی دەسـتی بۆ کردەوە. درویشـەکـە بە پەنجـەبـاریک و نینۆکـە درێژەکانیەوە، قوڕسایی و فشاری خستە سەر لەپی دەستی پیاوەکە و پێی گوت:

- تۆ نەخۆش نیت.
- بەلام لەبەر ژانی ئازاکانم خەوم لێ ناکەوێت.
- ئەوە ژانی دانانە...
- چ دانانێک، خۆ من پیاوم، ئەوە گاڵتەم پێ دەکەیت!
- خۆ تۆ دانانێت، بەڵکوو شوێنی دانانەکەیت.
- ئەوەی دادەنرێت چییە؟
- ڕووحی تۆیە.
- شەیتان، بە خوای قۆشمەم پێ دەکەیت!
پیاوەکە بە تووڕەیی ڕۆیشت و دەرویشیشی بە بزەوە جێ هێشت، هیچ پاداشـــتێکیشـــی نەدایێ. لەو کاتەدا حاڵی من وەک ئەو کاتانە وابوو، کە لەنێو کەشف و موکاشـەفەی خوایی دام. بێ ویستی خۆم لایەکم لە سودکین کردەوە و پێم گوت:
- سودکین بەتەنیا جێمان بهێڵە.
سودکین بە سەرسووڕمانەوە دوورکەوتەوە. بڕێکی دی لە دەرویش نزیکبوومەوە، تاوێک تەماشای یەکمان کرد، ئەو هێشتا هەر زەردەی دەکرد. بۆ چەند سـاتێک سـەرسـووڕکێم گرت، هەسـتم کرد لەناو حاڵەتێکی ناتەواودام، زۆر نەماوە بەتەواوی بچمە ناویەوە. وەختێک دەروێشەکە گەیشتە کۆتایی ڕێگەکە و ون بوو، بە دەرویشم گوت:
- ئـەو پیـاوە بۆ وا بـەتووڕەیی پشـــتی هـەڵکرد، نـازانێ قوڕ، تـەنێ بەگەرمایی توند و ڕەق دەبێت؟
- هەروەک خۆشەویستی، کە تەنیا بە ژان و ئازار تێر و کامڵ دەبێت.
- پێی وایـە دوای لـەدایکبوونی یـەکـەمی، جـارێکی دیکـە لـەدایـک نابێتەوە؟
- خوایش هەموو ڕۆژێک سەرلەنوێ دروستی ناکاتەوە.
- بە شەیتان ناوی بردیت؟
- وای زانی شـەیتان لە دەرەوەیەتی، لە کاتێکدا لە ژوورەوەیدا خۆی مات کردووە.

- چی لەو شەیتانەی ناوەوەمان بکەین؟
- هەتا ماوین لەناوماندا دەمێنێتەوە و دەرناکرێت، ئەو بەشێکە لە ئێمە.
- ئەی چۆن خۆمان لە شوێنەوارەکانی پاک بکەینەوە؟
- بە بێدەنگی، جەستەت پاقژ دەبێتەوە. بە زوهد، ڕووحت خاوێن دەبێتەوە.
- ئەی چۆن دڵم پاک بکەمەوە؟
- بە خۆشەویستی.
- ها! لەپێ دەستمت خوێندەوە زانیت چی لە دڵم دایە؟
- موحی، دڵی تۆ تەنیا خوای تێدایە.
پاشان دەستی خستە سەر شانم و گوتی:
- .... من مێخی چوارەمی تۆم.
باوەشم پێدا کرد و سەر و ڕیشم ماچ کرد، ئەویش دەستی لە شان دام و بە میهر و سۆزەوە، بە سینەیەوە نووساندم. جلەکانی بە ئەسرینە گەرمەکانی من تەڕبوون. کاتێک سەرم بەرزکردەوە، بە هێمنییەکی زۆر سەیر، فرمێسک لە چاوەکانی هاتنە خوار. بزەیەکیش سەر ڕووی گرتبوو، دەتگوت مەتڵەعی بەرەبەیانە.
- ئێستا چی بکەم؟
- چیت دەوێ بیکە، چۆن بوویت وابە. هەق تەعالا بە چوار مێخ دڵی تۆی دامەزراند، ئیتر قەت لاڕێ نابیت.
- بەڵام مەولانا هێشتا هەست بەو جێگیرییە ناکەم، کە تۆ دەیڵێیت.
- چونکە تۆ هێشتا سووری لەسەر ئەوەی لەناو چەقی ژیاندا بژیت، لێ من پێت دەڵێم: لێگەڕێ با ژیان لەناو تۆدا بژیت.
- هێشتایش لە زۆر شت سەر دەرناکەم و دۆش دادەمێنم.
- هەر وەختێک دۆشدامایت سەفەر بکە و بگەڕێ.
- من لە خزمەتت مەرەخەس دەبم.
- بە خێر و سەلامەتی.

دەستم ماچ کرد و دەستی ماچ کردمەوە. لەجێی سودکین وەستام، هەستم بە سەرسوورکێ کرد . سودکینیش بۆ خوێندنەوەی لەپی دەستی، چووە لای و پاش چەند خولەکێک هاتەوە. چەند هەنگاوێک ڕۆیشتین و لە تاخەکە پێچمان کردەوە. زۆر حەزم دەکرد بگەڕێمەوە، سودکینم جێهێشت و بە گورگە لۆقێ گەڕامەوە لای دەروێشەکە، بینیم هەستاوە و دەیەوێت بڕوات. بە قەدوبالآی بەرز و جەستەی کزۆڵ و رۆیشتنی سستوخاوی، وەک دارخورمایەکی گەورەی بیابان وابوو، کە جووڵە بکات. شوێنی کەوتم و بانگم کرد:

- مەولانا... مەولانا...

- بە بزەیەکی هێمن، ئاوڕێکی لێ دامەوە و گوتی:

- موحی چیت دەوێت لە خزمەت دام؟

- لەگەڵ هەر یەک لە سێ مێخەکەی دی، ماوەیەکی زۆرم بەسەر برد، زانست و عیرفانم لێ وەرگرتن و ئەوانیش شتیان لە من وەرگرت، تەنیا لە تۆ نەبێت، ئەمە چۆن دەبێت؟

- شتێکت لە من وەرگرتووە، لە هیی هەموویان باشترە.

- چییە؟

- خۆشەویستی. دڵی تۆی وەک دەریایەکی شیرین سیخناخ کردووە، هەموو مەلەوانەکانی بەهێمنی و ئارامی ژیان بەسەر دەبەن.

- بەلآم من عەودالی هاوەڵیی تۆم، شەیدا و سووتاوی دیدەنیی تۆم.

- مادەم تۆ ئیمانداریت، بۆ هەر کوێ بچی و لە هەر کوێ نیشتەجێ بیت لەگەڵت دەبم. ئایینی ئێمە، ئایینی خۆشەویستییە، ئینسانەکان بە دڵەکانیانەوە لێک گرێدراون، سەربەندی دڵی هەر یەکێکیان پچڕا، سەربەندێکی دی، لە جێگەیەکی دیکە شوێنی دەگرێتەوە.

- لێرە دەمێنیتەوە یان دەڕۆیت؟

- موحی! وەک پێشتر حەسار بۆ لای تۆ هات، منیش بۆ لای کەسێکی دیکە هاتووم. بیری حەسار ناکەیت؟

- جارێکی دی دەتبینمەوە؟

بەوپەڕی دڵخۆشی و خۆشبەختی، چاوەکانی بریسکانەوە، پاشان دەستەکانی بە سینەوە نووساندن و گوتی:

- موحی! من مێخی تۆم. هەتاهەتایە لە دڵی مندا دەمێنیتەوە.

منیش وەک ئەو دەستەکانم بە سینەوە نووساندن و پێم گوت:

- ناوت چییە؟

جوانترین و بێگەردترین بزەی دنیای کرد و گوتی:

- ئەمن شەمسم، شەمسی تەورێزی!

## ٩٣

**دەستنووسێك لە حەماوە**

١٤٠٢ك/ ١٩٨٢ز

ســـەلەبەری شـــارەکە ســـووتاوە، هیچ وەســـفێک لەمە وردتر نییە. خانووەکـان، شـــەقامـەکان، مزگـەوتەکان، گۆڕەپانەکان، بازاڕەکان، خڕیان ســـووتاون. تەنانەت دڵ و ڕووح و ســـینە و جەســـتە و هەناسەکانیش سووتاون. لە ماوەی بیستوحەوت ڕۆژدا هەمووشتێک کڵوکۆی دامرکا، شـەیتانەکان بە شـار وەربوون، دەڵێی هەزار ملیۆن ســـاڵ بوو کینـەیان لـە دڵ گرتبوو، یانی هەر لەو کاتەوەی ئیبلیس کڕنووشـی بۆ ئادەم نەبرد. شـەیتانگەلی نوێ، بە شـکڵ و ڕێکخستنی نوێ، بە ناوی جودا لە ناوی خۆیان: تیپی بەرگری، لیوای ٤٧ـــــی دەبابات. لیوای ٢١ـــــی میکانیک. فەوجی ٢١ـــــی ئاســمانی. هێزە تـایبـەتـەکان. ئـەوانـە هـەموویان لـەژێر تـارمـایی خـاکیی جۆراوجۆر ئەهریمەنن. ئەوانی دیش بە جلی مەدەنین. ئامانجی ئەوان لەو شـارە تەنێ کوشتنە، بەڵێ کوشتن و بەس.

لـە کۆتـاییدا قـەدەغـەی هـاتوچوو هـەڵگیرا، خـەڵک پۆل پۆل دەهـاتنـە دەرەوە، بۆ وەی قەبارەی کۆســـت و کارەســـاتەکانی خۆیان بزانن. چیتر شـــەقامەکان ئەوانیان نەدەناســـییەوە. کوچە و کۆڵانەکان لێیان لالووت و نەناس بوون. شـۆســـتەکان قســـەیان لەگەڵ خەڵکی پیادە

نەدەکرد. مزگەوتەکان ڕێگەیان بە نوێژخوێنان نەدەدا. باژێڕەکان مامەڵەیان لەگەڵ کڕیاران نەدەکرد. هەموو سییەک دەبوو لە ڕۆژێکدا ژمارەیەکی دیاریکراوی هەناســـە هەڵمژێت، لەو ژمارەیە نەدەبوو بترازێت. هەموو دڵێک بۆ دەربڕینی شــین و ڕۆڕۆ، ڕێگەیەکی دیاریکراوی هەبوو، نەدەلوا لە دڵێکی دیکە ڕێگەی دیکە بگوازێتەوە. بۆ ژن و پیاوی کۆستکەوتوو تەنیا دوو ئەسرین هەبوون و بەس. بۆ هەموو بێوەژنێک دوو حەسرەت هەبوو. هەموو هەتیوێک تەنێ دوو ڕاچەنینی هەبوو. بە هەدەردان گەرەک نەبوو، خەمێک نەبوو بەشـــی هەموان بکات. کەس لە دنیادا نەیدەزانی ئەوەی بەســەرمان هات بەهۆی چەوەشـــەکاریی ڕاگەیاندن بوو. هەر بۆیە نابێت سەرەخۆشی و دڵنەوایی لە دەرەوە بۆمان بێت، بەڵکە دەبێ خۆمان دڵنەوایی خۆمان بکەین، یان وەک ئەو حەفتا منارەیەی، کە لە بانگدان وەستێنرا، ئێمەیش لە ژیان بوەستین.
خەڵک لە گۆڕەکانیان هاتنە دەرەوە و بەرەو دەوروبەری شار هاتن. لاشەی زیندوو، شینی بۆ لاشەی مردوو دەگێڕا. ڕۆیشتم پوورم ببینم، بەدرێژایی ڕێگەی نێوان گەڕەکی (جەراجیمە) و گەڕەکی (شێخ عەنبەر)، نە ئەسرینێکم بینی ڕژابێت، نە ئاخێکم ژنەوت هەڵکێشرابێت. خەم و پەروا ڕووی هەموو ڕێبوارانی داپۆشـــیبوو، وەک ئەوەی نەوێرن خەم و ئازارەکانیان بە شێوەیەکی سۆزئامێز تەفسیر بکەن، نەبادا نەفرەتباران بن. ئەمە ڕێگەیەکی نوێیە بۆ پاشـــەکەوتکردن و پاســـەوانیکردنی خەم، هەڵبەت ئەمەیش لە حاڵەتێکی چەســـپاوی فیزیاییدا، تا ڕۆژێک دێت گریان ڕێگەی پێ دەدرێت، وێجا گێچەکە دەتوێتەوە و بە ئیســـراحەت بۆ خۆمان دەگرین. تاکوو نووکە کەس نازانێت ئەوە چییە ڕوو دەدات. تا ئێســـتە کەس نازانێت ڕووداوەکان کۆتاییان پێهاتووە، یان ئەمە تەنیا هودنەیە و بەس. دەنگۆیەک لەنێو خەڵک بڵاوبووەتەوە، کە ئامانج لەم ڕووداوانەدا کاولکردنی تێکڕای

شارەکەیە، گوایە چەندان جەڕافە دەوری شاریان داوە، بۆ وێرانکردن و ژێراوژوورکردنی، لە ئامادەباشیدان.
گەیشـــتمـە مـاڵی پوورم، کەوتمـە بـەرداشـــی نێوان دوو ئـەگـەر: ئەگەرەکەی شـانی ڕاستم دەیگوت هێشتا پوورت ماوە و نەمردووە، ئەگەری دەستی چەپەیشم دەیگوت مردووە. ئەگەری نەمردنی، دوو ئەگەری دیکەی هەڵدەگرت: ســـاغ و تەندروســـتە، یان نا. ئەگەری مەردنیشـی دوو ئەگەری دەهێنا ئاراوە: ئێسـتە لاشـەکەی دیارە، یان لـەنێو بـەرد و دار و پـەردووی بینـا هەپروون بەهەپروون بووە، یان لەنێو گۆڕستانێکی بە کۆمەڵ نێژراوە. شتێکی دیکەیش هەیە، ئەگەری سـاغبوونی جەسـتەی، مانای وا نییە لە ڕووی دەروونییەوە سـاغ و سـەلامەتە. ڕاسـتییەکەی ئەگەری سـەلامەتنەبوونی پوورم دەرگەی لێشـــاوێک لە ئەگەری دی دەکاتەوە. بیســـتوحەوت ڕۆژ لەماڵەوە، بەدەر لە چاندن و ڕوواندنی ئەگەر و شـیمانە لە خاکێکی وشـک و بێهومێدی و پڕ ترسدا، دەبوو چیتر بکەم؟
من چوار سـاڵی سـەرەتای تەمەنم لە باوەشـی گەرمی ئەو پوورەمدا ژیاوم، ئەوســـا دایکم لە ســـعوودیە مامۆســـتا بووە، هەر گاهێک گەڕاوەتـەوە، بـە زۆری منی لـە پوورم ســـتاندووەتەوە، منیش هیچ شـــتێک بهدەســـت خۆم نەبووە. بەو هەموو ئەگەرانە داخڵی ئەو شــەقامـە بووم، کە مـاڵی ئەوی لێیە. لە دەرگەم دا. خۆی دەرگەی کردەوە و توند لە باوەشم گرت.
ڕووی زەرد هەڵگەڕاو و خەمناکی لەنێو سینە و بەرۆکمدا شاردەوە، بـەدەنگێکی نزم و خـەفـەکراو گریـا. لێوەکـانم بـە تەوێڵییەوە لکاندن و بەبێدەنگی ماچم کرد. لەنێو باڵەخانەکە، لە حاڵەتی پێکەوەنووسـان و تێکئالقان بەرەو لای دەرگە جووڵەمان کرد و پوورم دەرگەکەی پێوە دا. لە دە خولەکی دواتر هەناسەمان دەخواردەوە و بەتەمای دانەوەی نەبووین. ئاخری دەنگ بۆ ئەو فیلمە سـینەماییە بێ دەنگە گەڕایەوە، لێی پرسیم:

- کەسی پووریێ، لە کوێ بوویت؟
- پووریێ، گەڕەکی (جەراجیمە) تۆق درابوو. هاتنە ژوورەوە و چوونە دەرەوە قەدەغەبوو.
- ئەو شەوەی ڕووداوەکەی تێدا قەوما، پێم گوتی لەلای من بخەوە، بۆ نەخەوتی؟ ئەوە یەک مانگە دڵم بۆ تۆ کزەی دێت و خەو نەچووەتە چاوەکانم.
- پووریێ، کێ دەیزانی ئەو ڕووداوانە دەقەومێن. لێم ببوورە. تەنانەت تەیمووری لەنگیش ئەوەی بەسەر (حەما) نەهێنا.
دەستی باریکی درێژ کرد تاکوو بە دەممەوە بنێت، بۆنی سابوونم کرد، ئاخر پوورم لەوەتەی پیربووە، تووشی وەسوەسەی خاوێنی بووە و بەردەوام دەستی لەنێو سابووندایە. گوتی:
- کوڕەکەم بێدەنگ بە، کوڕەکەم وسبە، دیوارەکانیش گوێیان هەیە!
- پووریێ کوا دیوار ماوە تا گوێی هەبێت.
بە پەنجەی شادەنوێژ، هێمای بۆ ئاسمان کرد و لەبەرخۆیەوە بەگنەگن نزایەکی کرد و نەمزانی چی گوت. ئێ ئاخر ترسی ئەوەی هەبوو ئەزلامەکان نزاکەی ببیستن. تاوێک لە ژوورەکەی ڕامام، هەموو شتێک وەک دوا سەردانم بەر لە ڕووداوەکان، لە جێگەی خۆیان مابوونەوە. سندووقەکانی خواردنی قتووکراو. دەفرە ئاوەکەی بەنیوە کردبوو. هەموو کەلوپەل و پێداویستییەکانی لەنێو چەند جانتایەک نابوو، خۆی بۆ ڕاکردنێکی خێرا ئامادە کردبوو. پەیکەر و کۆتەڵی عەزرا لە هەموو سووچ و قوژبنێکیماڵەوە بوون، ئەمەیش بۆ ئەوەی بە ماڵێکی مەسیحی خۆی بنوێنێت. خاچێکی زەبەلاحی لە دوو پارچەدار دروست کردبوو، لە جەرگەی ژوورە سەرەکییەکەی دابوو، بۆ ئەوەی ئەگەر سەربازەکان دەوری شوقەیان دا و هاتنە ژوورەوە فریو بخۆن. لەتەک خاچەکەیش وێنەیەکی سەرۆک حافز ئەسەدیشی بە جلی سەربازی هەڵواسیبوو، بەدەست هێمای کردبوو، بە گوڵی دەستکردیش چوارچێوەی بۆ کرابوو.

- ئەرێ پووریێ کتێبەکانی من لە کوێن؟
لە جێگەی خۆی هەستا و بەرەو سووچەکە چوو، کە بۆ دواجار جانتاکەمی تێدا شاردەوە، لەنێو جانتاکان هێنایە دەرەوە و بۆ لای من ڕای کێشا. بەر لە مانگێک پێم گوت:
- ئەم کتێبانە لە هیی کتێبخانەی مزگەوتی نووری بەهادارترن!
- گرنترین شت ئەوەیە کتێبەکانی ئیخوان یامو تێدا نەبن.
- نەخێر هیچ کتێبێکی لەو بارە تێدا نییە. هەموویان لەبارەی تەسەووفن.
- سوپا لێکیان دەردەکەن؟
- پێم وا نییە. بەڵام بێگومان چەند لیستێکی کتێبی قەدەغەکراویان لایە.
جانتاکەم کردەوە و هەموویان سەروژێر کردن، تەنیا کتێبەکانی ئیبن عەرەبیی تێدابوون. " الفتوحات" و " الفصوص" و " الرسائل". هەیان بوو دەستنووس بوو، هەیان بوو لەبەری گیرابووەوە. بەشێکیان ڕاڤەیان بۆ کرابوو، هێندێکان هەر مەتن بوون. دوای ئەوەی دڵنیابووم تەواوی کتێبەکان ماون، دڵم ئۆقرەی گرت. جانتاکەم داخست، لەسەر تەخت لێی پاڵکەوتم. چاوەکانم نوقاندن و ویستم بخەوم، بەڵام نەمتوانی. ناوەناوە دەنگی تەقوتۆقی تۆپی شێستێر دەخزێتە نێو شوقە. باڵندەکانی حەمایش لەنێوان جەنگاوەراندا دابەش بوون. ها ئەوەتە قەلەڕەش بەسەر لاشەی گیشەکراوی نێو ڕێگەوبانەکان، قیرەقیر دەکەن. نابینن کوتر لە جیاتی هەموو خەڵکی حەما، بەدرێژایی هەموو ڕووداوەکان، بە ئێستاشەوە گمەگم دەکات.
چەند هەفتەیەک دواتر، پێش ئەوەی گەمارۆ هەڵگیرێ و ڕێگە بە خەڵک بدرێت لە شار بچنە دەرەوە، بە خۆم و جانتاکەمەوە بەرەو دیمەشق ڕۆیشتم. ملوانکەی سەلیبم لە مل کرد، موسڵمانەکان لە حەما وەک بەڵگە و پاساوێک بۆ بەڕائەت و بێلایەنی، دەنێو یەکتردا دەستاودەستیان پێ دەکرد. دەیان لەو کتێبانەی خۆشەویستیم بۆ

حیزبی بەعس تۆخ دەکەنەوە، لە کتێبخانەکەم بژارم کردن و خستنمە جانتاکەمەوە، بۆ ئەوەی بەمە پەنا و پارێزی کتێبەکانی دیکەیان پێ بکەم. لە ڕێگە بیستونۆ خاڵی پشکنینی لەشکرگەم هاتنە پێش. لە هەموویان پانتۆڵیان لەپێ کردم و ڕووتیان کردمەوە، تەنیا مایەم لەبەردا دەما. هەموو کتێبەکانی نێو جانتاکەیان هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردن، هیچ لەو کتێبانەیان دەستنەکەوت، کە لە لستەکانی بەردەستیاندا بوون. دەیان بەرتیلم دانێ تاکوو بۆ پشکنین نەیانبەنە بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگیری. لە کۆتاییدا بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا چوومە دیمەشق.
لە "حەلبوون" لای کتێبفرۆشەکانی کتێبی دەستی دوو، وەستام. ئەو کتێبانەی بە مەبەستی پەنا و پارێزی لەگەڵ خۆم هێنابوونم، بێبەرانبەر لەکۆڵ خۆم کردنەوە. ئەوسا بەرەو تەکیەی سلێمانییە ڕۆیشتم. هەر لەگەڵ ئەوەی چوومە حەسارە گەورەکەی، سییەکانم پڕ هەوای سارد بوون. بۆ باڵەخانەی شەرقییە ڕۆیشتم، پێشتر قەت نەمبینیبوو، کەچی وامدەزانی هەموو ڕۆژێک هامۆشم کردووە. بە چەندان دەرگە و ڕێڕەویدا ڕۆیشتم، لە کۆتاییدا گەیشتمە لای بەڕێوەبەری ئەنتیکەخانەی جەنگی. بێ ئەوەی لەسەر کورسییەکەی هەستێت، لەنێوانی دوو چاوەی چاویلکەکەی و تەوێڵیدا تەماشایەکی کردم. یەکەوڕاست نۆ کتێبم بۆ دانان و پێم گوت:
- مادەم تۆ بەڕێوەبەری ئەنتیکەخانەیەکی تەکیەی سۆفیانی، نرخی ئەو کتێبانە لە هەموو کەسێک زیاتر دەزانی.
جانتای بەتاڵم هەڵگرت و لەلای ڕۆیشتم، ئەویش هەر خەریکی هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی کتێبەکان بوو. بانگی کردم و لام لێ نەکردەوە. بەخێرایی ئەو ناوەم جێهێشت و بەرەو کەناری (بردی) باشوور بەڕێکەوتم. بەتەنیا دانیشتم و یادگارنامە بچووکەکەم لە باخەڵ دەرهێنا و ئەو وشانەم نووسینەوە، پاشان جانتاکەم کردەوە

و ناوپۆشـی داخڵیم شـەق کرد و دەمانچە بچووکەکەم لەنێو دەرهێنا و سـەری لوولەکەیم گرت.

## ٩٤

"مرۆڤ جیهانێکی بچووکە، جیهان مرۆڤێکی گەورەیە"
ئیبن عەرەبی

ساڵێکی ڕەبەق تێبەڕی، جگە لە شوانی ئازەریەکە، کە نان و ئاوی بۆ دەهێنام هیچ کەسێکی دیکەم نەبینی. لە هەر چوار وەرزی ساڵدا خەڵوەتم لەگەڵ خوا بەست، ئەو لە هەموو ویردێکی سەر زمانم مەزن و بالاتر بوو، لە هەموو لێدانێکی دڵم نزیکتر بوو. زانیم ئەو باشترین هاوەڵە و ڕێگەیش هەر بۆ لای ئەو چوونە. ئەگەر لەبەر ئەو زانستەی سینەم نەبوایە، هەتا بۆ لای خۆی دەبردمەوە، لە حزووریدا دەمامەوە... بەڵام دیارە ئەوە ویستی من بوو، خوایش چیی بوێت هەر ئەوە دەکات.
خودا دەیەوێت مەبەستێکم پێ ڕاهی بکات، منیش هەر ئێستا دەگەڕێمەوە نێو خەڵک و مەبەستەکە دێنمە جێ.
کەلوپەلەکانم لەنیو حەسیرێک لوول دان و لە پشتم کردن و چوومەوە مەلەتییە. دەموچاوگەلێکی ئاشنا و ناسیاوم بینین، تەماشایان کردم و نەیانناسیمەوە. قژم درێژبووبوو، دەغەڵ و پووتەڵە بووبووم، سیمام ڕەش هەڵگەڕابوو. بەرەو ماڵ بوومەوە و لە دەرگەم دا. سەدرەدین بە دەنگێکی گەورە ناوی هێنام، وەک گەنجێکی هەراشبوو، دەنگی پڕ جۆش و خرۆش بووبوو، ئینجا

باوەشـــی تێکردم و ماچی کردم. عیمادەدینیش بە دوای داهات. ســـەعدەدینیش بە ترس و لەرزەوە بە دوویدا هات، نەیدەزانی ئەو پیاوەی دوو براکەیەی بەو گەرموگوڕییە باوەشـــی پێدا دەکەن و ماچی دەکەن کێیە!

چوومە ژوورەوە، ســـەفیە بەدەســـتی بە هەویری بە پیلمەوە هات، دەستی گرتم و ماچی کرد و گریا.

شـــەو منداڵەکان خەوتن و منیش لە ســـەرشـــۆر دانیشـــتم، ســـەفیە یەکبەیەکی ئەندامەکانی شۆردم. دواتر لێی پرسیم:

- گەورەم خەڵوەتەکەت چۆن بوو؟

- بەچێژترین ساتی ژیانم بوو.

- ژنیش بۆی هەیە بچێتە ئەو خەڵوەتانە؟

- بێگومان ســـەفیە، حزووری خوا جیاوازیی لەنێوان نێر و مێدا ناکات.

- بەڵام غەریبی و وەڕەزیی منداڵەکانم دەکەم.

- ئەوان گەورە دەبن، ئەوسا دەرفەتێکت بۆ دەڕەخسێت.

- دەزانی سەدرەدین هەموو قورئانی ئەزبەر کردووە؟

- چەند بەئاسانی! ئینجا کاتی ئەوەیە تێی بگات و درکی پێ بکات.

- عیمادەدین هێشـــتا لەبەری نەکردووە. نازانم چی لەگەڵ ئەو کوڕە بکەم. ســـودکین پێی نەگوتی لە مزگەوت ڕای کردووە و بە تەنێ هاتووەتەوە ماڵ؟

- با سەرکۆنەی منداڵێک نەکەین، کە دایکی ڕۆیشتووە و قەدەرێکە نەیبینیوە.

- ڕاست دەفەرموون. خۆزیا سەردانی کردبا و بینیبای.

- لە ڕێگەی گەشتەکەمان دەیبینێت.

- لە ڕێگەی گەشتەکەمان؟ بۆچی ئێمە دەڕۆین؟

- بەڵێ. بۆ دیمەشق.

- بۆچی دیمەشق؟

- چونکە ڕۆژی پەسـلان دەبێتە شـوێنی دابەزینی عیسـا. سـەفیەخاتوون تەوبەی من عیسـایانەیە، لە خوا دەخوازم مردنم لە جێگەی هاتنە خوارەوەی ئەو بێت.
- چەند لەوێ دەمێنیەوە؟
- خۆ وتم لە خوا دەخوازم لە مەنزڵگەی ئەو بمرم.
بە شەش هێستران ڕەگەڵ قافڵەیەکدا وەڕێ کەوتین، بەنێو بەهارێکی تەڕ و مەسـتدا ڕێگەمان بڕی، ڕاسـتییەکەی قەت بەهاری هێندە شـەنگم نەبینیبوو، هەر دەڵێی ئەنازۆڵ بەجوانترین و ڕازاوەترین جلوبەرگ لەنێو سـندووقی سـروشـتدا خواحافیزی لێ دەکردین. هەرکە ئەنازۆڵمان تێپەڕاند گوڵنگدارەکانی بان سـەری سـەلجووقییەکانمان لێ ونبوون و پێچەی تەنک و ناسـکی ئەهلی شاممان لێ دەرکەوت. چەند ڕۆژێک لە ماردینماینەوە، نە فاتیمەمان بۆ دۆزرایەوە، نە هاوژینەکەی. لەبارەی باوکی فاتیمە کەوتینە سـۆراخ، ئەهلی مزگەوت گوتیان چەند سـاڵێکە چووەتە حەج و بووەتە ئیمام و نەگەڕاوەتەوە. ئەوسـا بۆم دەرکەوت فاتیمە ویسـتوویەتی بەیەکجاری پێوەندی لەگەڵ ئێمەدا بپچڕێنێت. لە دوای خۆیشی هیچ نامە و نیشانەیەکی جێ نەهێشتبوو، لەمەیشدا درۆی کردبوو، کە بە سـەفیەی گوتبوو لە ماردین نیشتەجێ دەبین. حەزی کردووە بۆ هەتاهەتایە دەستبەرداری عیمادەدین بێت. ڕۆڵەی شیرینم خوا پشتیوانت بێت.
گەیشتینە دیمەشق، لە دەروازەکانەوە دەستەیەک خەڵک وەستابوون خانوویان بەکرێ دەدان، هەریەکەو بەجوانترین شێوە بە خانووەکەی خۆیدا هەڵدەگوت. خانوویەکی سـێ ژووریم لە یەکێکیان بەکرێ گرت، ڕاستییەکەی مەبەستم بوو چیتر سودکینم لێ دانەبڕێت، بەڵام قەدەری خوا شـتێکی دیکەیە، ئەو خۆی دوای چەند مانگێکی کەم لەمن جیا بوویەوە. ژنی هێنا و چووە خانووەکەی مزگەوتێ. ئێمە تاکوو خانووەکەی خۆمان دیتەوە، هەر سـێ منداڵەکەمان لە

شـــەكەتییان لە پەلوپۆ کەوتبوون. خانووەکە باخچەی نەبوو، هەر خێرا ســـەفیە چووە بـازاڕ و چـەند مـەرکـانێکی هێنـان و لـە هـەر سووچێکیدا گوڵێکی تێدا ڕوواندن. سودکینیش گەچی کڕی و هەموو کونوکەلەبەرەکانی گرتن و کۆسپەیەکیشی بۆ دەرگە دروست کرد. هەموو شـتێک شـوێنی خۆی گرت. سـێ منداڵەکەمان لە ژوورێک و من و سـەفیەیش لە ژوورێکی دیکە، سـودکینیش لە ژووری کتێب و پەڕاو و کەلوپەلی نووســـینم بوو. لە بەرهەیوانیش، کە هەر ســـێ ژوورەکەی بەیەک دەگەیاند پێشـــوازیمان لـە مێوانـان دەکرد، لە قوڕنیچکەکەیشی خواردنمان دروست دەکرد.

دوای چـەند هەفتەیەک، قازی قوزات زەکی ئیبن زەکی ســـووچێکی فراوانی لە خانەقای سـیمسـات دامێ، ڕۆژانەیش سـێ دەرهەمی بۆ بڕیمەوە، زۆر لە پێویســـتییەکانم زیاتر بوو، بەڵام دیاربوو ئەو پێی کـەم بوو. جـەنابی قـازی خۆی لـەگـەڵم هـاتـە مـەجلیســـی مـەلیکی موەعەزەم عیســـا، لەوە دەچوو خەبەری هاتنی منی بۆ دیمەشـــق بیستبێت. لە مەجلیس هەستا و بە پیلمەوە هات، لەپی دەستی خۆی ماچ کرد و بە لەپی دەستی منیەوە نووساند. ئینجا گوتی:

- شێخی هەموان بەخێربێیت. بەخێربێیت، بەخێربێیت، بەخێربێیت.

هـەموو جارێک کە دەچوومە لای، دووبارە وســـێبارە، بەخێرهاتنی مێوانەکانی دەکرد.

نـەمدەزانی ئاخۆ دەبێ بزانێت بـاوکی لـە قـاهیرە چی بـەســـەر من هێنـاوە، یـان زاکیرەی هێنـدە فراوان و بـەهێز نییـە تـا بزانێت داخوا بـاوکی کێی زیندانی کردووە و کێی زیندانی نـەکردووە. بـەهـەرحاڵ، ئەمێستا حەپسم بکات یان نا، زۆر لام گرنگ نییە و هەر گوێشی پێ نادەم. مادەم هەموو دنیا لە سینەمدایە، جیاوازیی چییە ئەگەر لە ماڵ بم، یان لـە کونجی زیندان؟ وەلێ بە هـەر بارێک بێت، من لە مەلیکی موعەزەم پێشـبینی خراپە و شـەڕ ناکەم. لە دیمەشـق مەشـرەب و مـەیلی خـەڵـک جۆربـەجۆر و ڕای جیـاواز پـانتـاییـەکی فراوانی

داگیرکردبوو. لە هەر گەڕەکێک حوجرەیەک هەبوو لە حوجرەکانی دی جیاواز بوو. هەر کاتێک مەسەلەیەکم لێ عاسێ دەبوو، زیارەتی هەر یەک لە حوجرەی ئەو مەزهەبانەم دەکرد. چوومە لای شافیعییەکان لە حوجرەی ئەتابکی، سەردانی حەنەفییەکانم کرد لە حوجرەی بەڵخ، زیارەتی مالیکییەکانم کرد لە مزگەوتی گەورە، چوومە لای حەنبەلییەکان لە حوجرەی عەمریە. وێڕای هەموو ئەمانەیش، هەفتانە دەرسێکم لە خانەقاکانی دیمەشقی گچکە هەبوو، هەروە لە شوێنی دوورەدەستیش مەجلیسی زیکرمان دادەنا.

سودکین کچێکی بێ دایکی مارەکرد، باوکی لە هەمان ئەو مزگەوتە دەمایەوە، کە نوێژمان تێدا دەکرد. ڕۆژێک لەتەک میحرابدا دەست بە گریان دەکات، دوای ئەوەی خەڵکەکە دەڕۆنە دەرەوە، سودکین دەچێتە لای و لە حاڵی دەپرسێ، ئەویش شەکوای پیربوونی لەلا دەکات و ترس و پەرۆشی کچەکەی لەدوای مەرگی بۆ باس دەکات، سودکینیش ڕاستەوخۆ داخوازی دەکات و ئەویش یەکەوڕاست ڕازی دەبێت.

من خۆم چووم لێم مارە کرد، لە پاشەکەوتی ئەو مووچەیەی ئیبن زەکی مانگانە دەیدامێ، دووسەت دەرهەمم وەک مارەیی پێدا. هەروەها سەفیەش دووسەت دەرهەمی دیکەی دایێ. چووە بازاڕ و کەلوپەلی جوانکاری و جلوبەرگی ڕازاوەی بۆ کڕی، بۆنخۆش و ئارایشی کرد. سەت دەرهەمیشم بە سەدرەدین دا، کە ئەو کات باخۆش بووبوو، چوو لە بازاڕ فەڕش و ڕایەخ و قاپوقاچاخی بۆماڵەکەی کڕی.

دوای ئاهەنگێکی گەرموگوڕ و بەسەربردنی شەوێکی خۆش لە خانەقا، سودکین بە هاوژینەکەی شاد بوو، ئێمەیش هەموو نزای خێرمان بۆ کرد. بەشێک لە دەروێشەکان سەمایان بۆ کرد و عەتر و گوڵیان پێشکەش کرد، ئەویش بە بزەوە غەمزەی بۆ دەکردن.

زۆر بەسەر چۆلبوونی ژوورەکەی سودکین لە ماڵەوەماندا نەچوو، دوای چەند هەفتەیەک لە ژیانی هاوژینی سودکین، جەنابی ئەوحەدین کرمانی لەگەڵ ئەیووبی مەقەڕی موریدی لە مەلەتییەوە هاتن. لە دەرگەیان دا و منیش بەوپەڕی دڵخۆشی بەخێرهاتنم کردن. لە دڵی خۆمدا یادی ئەو ڕۆژە جوانانەم کردەوە، کە پێشتر لەگەڵ کرمانیدا لە مەلەتییە بەسەرمان بردوون. لەبارەی شارەوە پرسیارم لێ کردن، کرمانی بەوپەڕی خاکەڕایی و سۆزی گەرمەوە:

- ئاو وشک بوو، بەروبوومم لەبەین چوو.

- بەراست؟ چی ڕووی داوە؟

- بەرەکەتی خوا پووکایەوە، خێر و بێری بڕایەوە.

- پەنا بە خوا دەگرین لە تووڕەییەکەی. پێم بڵێ چی بووە؟

- هیچ نەبووە تەنیا ئەوە نەبێت شێخی مەزنی لە کیس چووە.

نقورچکێکم لە ئەژنۆی دا و پێکەنیم، ئەویش بزەی هەر لەسەر دەموچاوی بوو، وەک ئەوەی دەیڵێت ڕاستە. پاشان گوتی:

- گەورەم من و ئەیووب دەمانەوێت لە دیمەشق یارت بین.

- بەخێر و خۆشی و سەلامەتی.

# ٩٥

**"ئەوەی بە زۆرەملێ بەدەست دێت، بە نەرمونیانیش وەدەست دێت،**
**ئەوەی بە نەرمونیانی بەدەست دێت، بە زۆرەملێ وەدەست نایەت"**
**ئیبن عەرەبی**

هەواڵی مردنی خەلیفە ناسـڕ لە بەغداوە گەیشـت. ئەهلی دیمەشـق بە سـەرسـووڕمانەوە لە مردنی خەلیفەیان دەڕوانی، وەک بڵێی دوای چلوشـەش سـاڵ مانەوەی لە عەرشـی خەلافەت، مردن بۆ وی هەق نەبێت. بەغدادییەکان، کە لە تەکییە و بازێڕەکان هاوەڵ و هاوڕێمان بوون، بە مردنی ئەو حەپەسابوون، ئاخر بەشێکیان لەوەتەی هاتوونە سـەر زەمین، بەدەر لەو، ئاشـنای هیچ خەلیفەیەکی دیکە نەبوون. ڕاسـتییەکەی ئەوان بەو هەواڵە کتوپڕە تووشـی شـۆک هاتن، وەها باسی مەرگی پیرەخەلیفەیان دەکرد، وەک بڵێی دوای وی، کارەساتێکی گەورە بەسـەر بەغدادا بێت. دوای مەرگی خەلیفە، هەریەکەو بە جۆرێک بیری لە ئایندەی وڵات دەکردەوە. پێشـتر خەڵکێکی زۆری بەغدا، کە لە ترسـی جەور و زۆر و باجوەرگرتنی خەلیفە ڕایان کردبوو و لە دیمەشـق نیشـتەجێ بووبوون، دوای مەرگی خەلیفەیش گەڕانەوە بەغدا. لە بەرانبەر ئەمەیشـدا، لە ترسـی گۆڕانی بارودۆخ و پەشـێویی شـار و نزیکبوونەوەی تەتەر لە مەرزەکان، بەشـێک لە خەڵکی بەغدا بەرەو دیمەشق کۆچیان کرد.

مەلیکی موعەزەم بە غائیبی نوێژی مردووی لەسەر خەلیفە ناسڕ کرد. پرسـەیەکی گەرموگوڕیشـی بۆ دانا، پێشـوازیی لە خەڵکێک دەکرد، کە نەیاندەزانی خەلیفە کێ بووە. منیش چوومە پرسـەکە، سـڵاوم لە خەلیفە کرد، وەک پیشەی هەمیشەی، چەند جارێک بەخێرهاتنی کردم. ڕاسـتییەکەی زمانەکەی ئەو هێندێک جار، بەبێ هیچ مەبەسـت و خواستێک، حەزی دەکرد دەستەواژەی "بەخێربێن" پاتە بکاتەوە، بەڵام بەهەرحاڵ، هێشتا ناو و نازناوی منی لەسەر زمانە. قازی قوزات لای خۆی جێگەی بۆ کردمەوە، وەک هەمیشـە لە حاڵ و باری پرسـیم. سوپاس و ستایشم کرد، پاش تاوێک بێدەنگی، لای لێ کردمەوە و بە چرپەوە پێی گوتم:

- قوربان دەمـەوێت لـەبارەی شـتێک ڕاوێژت پێ بکەم. ئەو پیاوە دەبینی، کە تازە سەلامی لە مەلیک کرد؟

زرتەزەلامێکی بێ ڕیشـم بینی، خۆی بەسـەر شـانی کوڕەکەیەوە دادابوو، بە ئاستەم جوڵەی پێ دەکرا.

- بەڵێ دەیبینم، بەڵام نایناسم.

قازی پێکەنی و گوتی:

- پێم وایە تۆ تاکەکەسی دیمەشقی نایناسی. ئەمە "هیبەتوڵڵای کوڕی ڕەواحە"ە، گەورە بازرگانی دیمەشقە.

زەردەیەکم کرد و گوتم:

- بازرگانیی ئەو، وەک بازرگانیی من نییە، بازاڕی ئەو، لە بازاڕەکەی من ناچێت.

قازی پێکەنی و گوتی:

- بێگومان. بەر لە چەند ڕۆژێک سـەردانی کردم، دەیەوێت بینایەک دروست بکات و وەقفی حوجرەیەکی مەزهەبی شافیعی بکات.

- حوجرەیەکی دیکەی شافیعی؟ تۆ لەسەر دەی حوجرەکانی دیمەشق شافیعین. تاکەی واز لەو ئیسڕافە ناهێنین؟

- ئەوە مـەزهـەبی ئـەوە. ئێمـە نـاتوانین سـەرکۆنـەی بکـەین. منیش ڕەزامەند بووم، بڕیارە حوجرەکە لەکن دەروازەی (فەرادیس) دروست

بکات. بەڵام ئەوەی دەمەوێت لەبارەیەوە پرســـوڕات پێ بکەم، "تەقییەدینی شارەزووری"یە.
- لە چ بارەیەکەوە؟
- ئیبن ڕەواحە دەوێت کاروباری ئەو حوجرەیە بخاتە دەستی ئەو.
منیش سەری خۆم بادا و گوتم:
- مادەم وەقفی ئەوە، ئازادیشـــە کێ بە بەڕێوەبەری حوجرەکە دەستنیشان دەکات.
- ئاخر دەبێ من لەســـەر بەڕێوەبەری حوجرەکان ڕازی بم. ڕای تۆ چییە؟
- جەنابی قازی، من هیچ ڕایەکەم نییە، تۆ دەزانی فەقیهـ و سۆفییەکان دانویان پێکەوە ناکوڵێت. دەترســم بە هۆی ناکۆکیی نێوانمان، ڕای من وەک بوختان وەربگیرێت. تکایە چاوپۆشــیم لێ بکە، خوا چاوپۆشــیت لێ بکات.
لەگەڵ قازی لە مزگەوتەکە نوێژمان کرد، دوای نوێژ بانگهێشـــتی ماڵەوەی کردم. وەک نەریتی هەمیشـــەی بانگی منداڵەکانی کرد، یەکبەدوای یەک هاتن و بەخێرهاتنیان کردم. تەنانەت کچە تازە پێگەیشـــتووەکانیشـــی، بە چارشـــێوێکی تەنکەوە هاتن، باوکیان پێی دەگوتن:
- سڵاو لە گەورەمان بکەن. بەرەکەت و سەماحەتی لێ وەرگرن.
کاتێک هەموو ڕۆیشـــتن، دەرفەتم بۆ ڕەخســـا بە قازی بڵێم بۆچی هاتووم. نێوچاوانی تێکنا و کەوتە نێو بیرکردنەوەیەکی قووڵ و وەک نەریتی بەردەوامی، ســـەرە پەنجەکانی دەســـتی بە لێوەکانی داهێنا. بێئەوەی لە بیرکردنەوە بکەوێت، بە چپەوە گوتی:
- قوربان! ڕاست دەکەیت.
- لەوبارەیەوە دەتوانی چی بکەیت؟
هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پاڵی دایەوە و گوتی:
- زۆر کەمتر لەوەی گومان دەبەیت. ناتوانم بڕیار بدەم ئاخۆ چی لە حوجرەکانیان دەخوێنن.

پاشان تاوێک بێدەنگ بوو. دواتر بەشەرمەوە گوتی:
- ئەگەر بزانی بەشێک لە سۆفییەکان لە خانەقاکان چی دەکەن، گلەییت لە فەقیهەکان ناکرد!
- چی دەکەن؟
- پێم خۆشـــــە قســـــەکەم وەک ڕەخنە وەرنەگریت... بەڵام بەدرێژایی شەوان سەمایە، زیکر و دەف و دەمبک و هەڵڵایە، ئەمەیش بەشێک لە فەقیهەکانی قەڵس کردووە و وای لێ کردوون تەدریسی خانەقاکان بە گرنگ وەرنەگرن.
- چیتر جەنابی قازی؟
- دیسـان قسـەی بەشـێک لە سۆفییەکان زۆر بەزەحمەت لەنێو خەڵکی ڕەشۆک وەردەگیرێت. بە نموونە دەڵێن: "فیرعەون ئیمانداربووە." ئەمە چۆن خـەڵکی عـەوام تێیدەگـەن؟ یـان چۆن لـەوە تێ دەگەن، کە ئێژن: "خودا و وجوود، یـەک شـــتن."؟ یـان چۆن لـەوە تێبگـەن، کـە دەڵێن: "خوایەتی دەچێتە نێو هەموو پەرستراوەکان، تەنانەت بتەکانیش!"
- ئەمە قسەی منە و بەس. ئەگەر هیچ گازاندەیەکت لەمن هەیە، ڕووی قسەت لەمن بکە و قسەکانت بەشێوەیەکی گشتی مەکە.
- ببوورە قوربـان، من گومانم لە زانســـــتی زۆر و بێگەردیی نییەت و نیـازەکـەت نییە... بـەڵام هێندێک جار هیچ وەڵامێکم بۆ ئەوانە پێ نییە، کە ســــکاڵات لـەبارەوە دەکـەن. ئـەگـەر بمـانـەوێت ئازاری فەقیهەکان لەســەر سـۆفییەکان لادەین، باشـتر وایە سـۆفییەکان واز لەو قسـانەی خۆیان بێنن و چیتر عەوام هەراسان و پەست نەکەن.
قســەکانی تەواوکردن و بە لوتفەوە چاوەکانی تێبڕیم، ئاخر دەیویسـت بزانێـت من چۆنچۆنی پـەرچی دەدەمــەوە. بـەنیـازی هێوربوونــەوە، کەمێک هەناســەم دا. بڕیارم دا هیچ شـتێک لەوبارەوە نەڵێم و وەڵامی نەدەمەوە.
دواتر هەستام و گوتم:
- جەنابی قازی ڕاست دەفەرموون. خوا یار بێت، بیری لێ دەکەمەوە.

## ٩٦

**"خەڵك چەندان عەقیدەیان لە خوا وەرگرت، منیش عەقیدەی هەموویانم وەرگرت"**

**ئیبن عەرەبی**

جیاواز لە هەموو جارەکانی دیکە، ســـودکین زۆر توند لە دەرگەی دا. عیمـادەدین دەرگـەی لێ کردەوە، ســـودکین تـەوێڵی مـاچ کرد و پێی گوت:

- شێخ لەکوێیە؟

دەمودەســـت بـەرەو مـاڵیـان ڕۆیشـــتین. هـەرکـە چووینە ژوورەوە، ســـودکین بە چاوی پڕ ئەســـرینەوە، مەلۆتکەکەی لە دەســـتی مامان وەرگرت و دایە دەستی من. منیش بانگم بە گوێیدا دا. پاشان سودکین گوتی:

- داوا لە خوا بکە بیخاتە سەر ڕێگەی ئێمە.

- نا سودکین نا، ڕێگەی هەقیقەت بەقەد ژمارەی ڕێبوارەکانی، لکوپۆپی لێ دەبێتەوە.

- دەی قوربان کەواتە داوا لە خوا بکە بە ئەهلی ئاســـمانی حیســـاب بکات.

- نا ســـودکین نا، خوا لەســـەر ڕووپەلی زەوین دروســـتی کردووە. بەسەریدا بەرزی ناکاتەوە و زاڵی ناکات.

- ده مادەم داوای لێ بکە هەقیقەتی نیشـــان بدات، گومان و دڕدۆنگی لەسەر پەردەی دڵ هەڵگرێت.
- نا ســـودکین نا، گەردوون هەمووی گومانە، لەم گەردوونە پانوپۆڕە هەر تەنیا بە خۆت ئاشنای و بەس.
- داوا لە خوا بکە زانستی پێ عەتا بکات.
- نا ســـودکین نا، ڕاســـتە زانســـت جەهل ڕادەماڵێت، بەڵام ناتوانێت بەختەوەری دەستەبەر بکات.
سـودکین لەم قسـانەی من سـەری سـووڕما، بەڵام کەیفخۆشـییەکەی بەسەر مەدهۆشییەکەی کەوت، مەلۆتکەی لێ وەرگرتم و گوتی:
- کەوابێت بە کەیفی خۆت نزای بۆ بکە.
- لە خوا داواکارم دڵی وەک مەککە لێ بکات، کە هەموو بەروبوومێکی بۆ دەچێت.
- ئامین. خوا لە نزا باشەکانی تۆ بێبەشمان نەکات.
- چ ناوێکت لێ نا؟
- تاهیر.
- خۆ لـەنێو خزم و کـەســـوکارت ئـەو نـاوە نـەبوو، بۆ ئـەو نـاوەت هەڵبژارد؟
- ســـــەرەتا لای بازرگانێکی قاهیرە بە ناوی تاهیر کارم دەکرد، بڕێک پارەی بە قەرز دامێ، منیش نەمتوانی بیدەمەوە، ئەویش چاوپۆشی لێ کردم.
- هەموو ناوێک بڕێک لە مانەکەی بەر دەکەوێت.
ئەمن ڕۆیشـــتم، ســـودکینیش خەریک بوو لە خۆشـــییان باڵ بگرێت. کـاتێک گـەڕامـەوە ماڵەوە، بینیم قازی لەبەر دەرگە وەســـتاوە، منیش پشـــتم هـەڵکرد و بـە ڕێگـەی خۆمـدا گـەڕامـەوە، بـەنێو تاخەکەدا ســووڕامەوە، تا لە کۆتاییدا گەیشـــتمە بازاڕ، ڕاســـتییەکەی خەریکی کاتکوشـــتن بووم، دەمویســـت قازی بڕوات. ڕۆژانی دواتر چەندان قاسیدی بۆ لا ناردم، وەڵامی هیچیانم نەدایەوە. دەزانم سەری لەو ڕەفتارەی من سووڕماوە، لێ بەڕاستی نامەوێت وەڵامی بدەمەوە، تاکوو لەبارەی ئەو پیاوەی ڕیخی چیلی لە دەرگەی خانەقا هەلسـوی،

دادگەریی نەکات. ئێ ئاخر پێشـــتر شـــکایەتم لێی کرد، کەچی هەموو ڕۆژێک وەک ئـەوەی نـە بـای دیبێ و نـە بـاران، بـە ڕێگـەی بـەردەم خانەقا دەهات و دەچوو، هیچ لێپێچینەوەیەکیشی لەگەڵ نەکراوە.
دوای چەند ڕۆژێکی دیکە، قاسـیدی مەلیکی موعەزەمی بەدوادا ناردم، زانیم قازی ئیبن زەکی لەپشـــت ئەو بانگهێشـــتەیە. لە کاتی دیاریکراو چوومە مەجلیســـی مەلیک، جگە لە دارودەســـتە و کاتیبەکانی کەســـی دیکە لـەوێ نـەبوو. گاهێک مـەلیک هـات و منی بینی وەســـــتا، لـەپی دەستی خۆی ماچ کرد و بە لەپی دەستی منیەوە نووساند، دیاربوو بە چوونی من دڵخۆش بوو. لای خۆی دانیشاندم و ڕاستەوخۆ گوتی:
- قازی قوزات گلەیی لێت هەیە.
- ئەگەر قازی دژت بێت، کێ قەزاوەت بکات!
مەلیک یەک بە دەمی خۆی پێکەنی و پێی گوتم:
- ئێســـتا لە کاری قورســـی مەلیک تێگەیشـــتی، ناچارم حوکم لەنێوان شێخی ئەکبەر و قازی قوزاتدا بکەم. ئەوە چ گێژەن و گێژاوێکە!
بزەیەکم کرد و هیچ قسەیەکم نەکرد. دیسان گوتی:
- قوربان! گوێم بۆ بگرە. تۆ سکاڵات لەو پیاوە کردووە کە پیسایی بە خانـەقادا کردووە. ســـــوێند بە خودا ئەمە کارێکی هەتا بڵێی خراپ و ناڕەوایە و ئێمە پێی ڕازیی نین.
پاشان مەلیک بە دەنگێکی نزم پێی گوتن:
- بەڵام قوربان من و قازی هیچ ســـوودێکمان لە ســـزادانی نەبینیەوە، درزەکە لەوە گەورەترە بە پنووی سزا بگیرێت.
- مەبەستت چ درزێکە؟
- تۆ دەزانی مەبەستم چییە...
- بەڵام ئەگەر خۆت باسی بکەیت گومان و دوودڵی باشـتر لادەچن و ڕوونتر دەبێتەوە.
- مەبەسـتم "فصـوص الحکم"ە، ئەو کتێبەی لەو ڕۆژانە کتێبفرۆشـەکان لەبەریان نووسییەوە و فرۆشتیان.
- چییەتی؟
- ئێستە نیشانت دەدەم چییەتی.

به دەنگێکی گەورە هاواری کرد:
- دوادار!
لە سـووچی مەجلیسـەکە پیاوێک، کە حوبر و قەڵەمی مەلیکی هەڵگرتبوو، هەستا و لەنێو مەجلیس وەستا، ناوەڕاستی مەجلیسی بەرنەدا تا مەلیک پێی نەگوت:
- بڕۆ نامەکان بێنە.
کەمێکی پێچوو، بە یەک باوەش کاغەز گەڕایەوە و لەبەر دەستی منی دانان. ئینجا مەلیک گوتی:
- گەورەم فەرموو بیانخوێنەوە و حوکمیان لەسەر بدە.
- نامە دوای نامەم کردەوە، هەموو نامەی فەقیهەکان بوو بۆ مەلیکیان ناردبوو، هەریەکەو لە دەسـتەواژەیەک یان دوان و سـییانی کتێبی "فصـوص الحکم" گلەییان هەبوو، هۆشـیارییان لەبارەی مەترسی و گومڕایی کتێبەکە خستبووە ڕوو. لە نامەی پێنجەم وەستام و سەرم بۆ لای مەلیک بەرز کردەوە، دیتم دەستی خستبووە ژێر چەناگەکەی و بەوپەڕی بایەخەوە سەیری دەکردم.
دواتر گوتی:
- گەورەم ئێستا زانیت کارەکە لەوە گەورەترە کە گەوجێک پیسایی بە دەرگەی خانەقادا بکات؟
- ئەی جەنابی مەلیک چۆن لەم باسە دەگات؟
- گەورەم خۆت دەزانی چیت نووسیوە، خوا بەقەد تۆ زانستی بە من نەداوە. من خەریکی کاروباری سـیاسـەتم. هێندە دەزانم ئەو کتێبە عەوام دەورووژێنێ و خەڵکت لێ هەڵدەستێنێ.
بێدەنگ بووم، دواتر گوتی:
- قوربان! ئێرە مەلەتییە نییە، خەڵکەکیش توورک نین.
تەماشای چاوەکانیم کرد و ڕێکەوڕاست گوتم:
- ڕاست دەکەن. حاکمەکانیشی سەلجووقی نین.
مـەلیک نـەختێک کشـایـەوە، ئـەم تـەرزە وەڵامـەی من بۆ ئـەو چاوەڕواننەکراو بوو، گوتی:

- ئەمە چییە قوربان! لە خۆم نزیکت دەخەمەوە، پرسـوڕات پێ دەکەم، کەچی بەم شێوەیە لە مەجلیسەکەمدا سووکایەتیم پێ دەکەیت؟
- گەورەم ئەوە سـوکایەتیی نییە، بەڵکە هەقیقەتی سـیاسـەتە. سـەلجووقییەکان بە خۆشـەویسـتی و قەناعەتەوە سـۆفییەکانیان داڵدە دا. هەروەها ئەیووبییەکانیش ئەوانیان لە ئازار و ئەشـکەنجەی شیعەکان پەنا دا.
ئەو کەڕەتە مەلیک بە شێوەیەکی بەرگریکارانە هاتە قسە و گوتی:
- گەورەم ئەوە گومانێکی زاڵمانەیە! هەموو مەزهەبەکان لە دیمەشـق قوتابخانەی خۆیان هەیە، هەموو شـێخەکان فەقێیان هەیە. هیچ شارێکی موسڵمانان نییە وەک ئێرە فەقێ بە ئازادیی خۆیان مەزهەب و حوجرە هەڵبژێرن. قوربان بە چاوی داد و هەقیقەت بڕوانە!
- ڕێک مەبەسـتی من ئەوەیە. هەموو مەزهەبەکان لێرە خزمەتی سیاسەت دەکەن.
هەسـتام و ویسـتم بڕۆم، مەلیک چاوی لێ زەق کردمەوە و گوێی بۆ قولاخ کردم، منیش بەر لە ڕۆیشتنم گوتم:
- مەلیکی موعەزەم، من نە بۆ خاتری تۆ لە دیمەشقم، نە بۆ ئەوەی لە سـایەی تۆدا بژیم. ئەرز و سـایەی خوا زۆر فراوان و گەورەترن... بەڵام ڕاسـتییەکەی پیربووم و مەرگ لەپم لێ دەکوتێت، بۆیە حەزم کرد لە شوێنپێی پیرۆزی عیسا سەر بنێمەوە و ئاودیوی ئەودیو بم...

## ٩٧

**"هەر جەستەیەك هیممەت بەرهەم نەهێنێ، پووچەڵە"**

**ئیبن عەرەبی**

ئەمڕۆ تەمەنم گەیشتە شێستوسێ ساڵ، ئەمەیش پەیامێکی مەزن و مەترسیدارە. کەس لە دەوروبەرم نازانن هێندە پیر بووم، ئاخر نە ریشم ئەوەندە سپی بووە و نە پشتم کووڕ بووەتەوە. هەموو بەیانییەک سەفیە جلەکانم بۆ ئامادە دەکات، هەموو ڕۆژێک سەدرەدین بۆ دەرسگوتنەوە و هاتنەوە لەگەڵمە. قسە دەکەم و کارەکانم بەجێ دێنم، خواردن دەخۆم و هەناسە دەدەم، وەک هەر مرۆڤێکی ڕووپەلی سەر ئەو زەوینە... بەڵام دەزانم ئێستای تەمەنم لە هیچ قۆناخ و ساڵەکانی دیکەی پێشتر ناچێت، نە لە شێستودوو و نە لە شێستویەک. ئەمە ئەو تەمەنەیە، کە حەتمەن دەبێت مرۆڤ بارودۆخی تێدا بگۆڕێت و گوفتار و کردارەکانی گۆڕانیان بەسەردا بێت. خۆشەویستەکەم "د. خ" دوای ئەوەی پەیامەکەی گەیاند و ڕێنوێنیی گەلەکەی کرد، لەم تەمەنەدا ژیانئاوایی کرد.

دوای شێستوسێ ساڵ، خوا یەک ساڵی دیکەیشی بە خۆشەویست نەبەخشی، کەچی ها ئەوەتە چەند ساڵێکی دیکەی بە منی قەلەندەر و هیچ دەبەخشێت. بێگومان ئەو ساڵانەی خوا بە منی عەتا کردوون و بە خۆشەویستەکەی نەداون، مانای وایە حیسابیان سەخت و

دژواره. موحی، واوەیلا بۆ تۆ ئەگەر لە کاری هیچوپووچ بەفیڕۆیان بدەیت. هەستە، کەی وەختی دانیشتن و خەوتنە! بڕۆ تەدریس بکە. ئەوەی لە دڵ و دەروونتدایە، هەڵیڕێژە. ئەوەی خوا لە زانست و سۆراخکردن و عیرفاندا بۆی کەشف کردوویت، بینووسەوە.

بەدرێژایی ڕۆژ، شەپۆلی فیکران سەر لە زیهنم نابڕێ. دنیایەک خورپە و مەواجید و تەنەزوولات دێنە ئاسمانی خەیاڵم، هێشتا لە باسی یەکەم تەواو نەبووم، باسی دووەم دەڕژێتە ناخمەوە. ڕێک وەک ئەو ڕەوەکلۆیەی، کە چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا ئاسمانی دیمەشقیان تەنی، هێشتایش لە کوچە و کۆڵان و شەقام و دار و دیواری ئەو شارە هەر ماون. کلۆکان زۆر گەورە و بەتینن، دووجار پێیان لێ دەنێی هیچیان لێ نایەت. بە دار و درەخت هەڵدەزنێن و گەڵاکان دەقرتێنن، بەسەر دیواران زاووزێ دەکەن، دەچنە نێو پێچە و جلوبەرگی پیاوان. دەڕۆنە نێو ژنان و ناو چارشێوەکانیان، ڕۆژێک ژنێک لەنێو خەڵکدا وەک مەڕی سەربڕاو هەڵپەڕ و داپەڕی دەکرد، تا کلۆی نەفڕاندن نەیتوانی ڕێ بکات، ئەمەیش دوای ئەوەی منداڵەورتکە هەموو پێی پێکەنین. هەموو گۆشە و سووچێکی دیمەشق پڕ بوو لەو کلۆیانە، تەنیا ئەو خانەقایە نەبێت، کە من دەرسی تێدا دەڵێمەوە. گەلی کلۆیان خۆیان لەوێ پاراستووە، وەک ئەوەی نەیانبینیبێت. هێندێک خەڵک دەیانگوت:" تەنانەت کلۆکانیش حەزناکەن لەو سۆفییە چڵکنانە نزیک ببنەوە. "هێندێکی دی دەیانگوت:" ئەها کلۆکانیش نایانەوێت ئازاری سۆفییەکان بدەن، کە مێوانی خوانی خودان لەسەر هەرد." بە کورتی، هەر کەسە گوێزی لە هەنبانەی خۆ دەژماردن.

تەنانەت مەلیکی موعەزەم و قازی قوزاتیش حەزیان دەکرد ئەو دیمەنە بە چاوی سەری خۆیان ببینن. ڕۆژێک خەریکی وانەگوتنەوە بووم، لەناکاو وەژوور کەوتن، هیچ پاسەوان و دارودەستەیەکیان لەگەڵدا نەبوو. قازی بە ئاماژە سڵاوی کرد و مەلیکیش بزەیەکی بۆ کردم و بە خاکەڕاییەوە لە کۆتایی مەجلیسەکە دانیشتن. بە

شـێوەیەکی ئاسـایی دەرسـەکەم تەواو کرد، هەر کاتێک تەماشـای ئەوانم دەکرد، دەمبینین بەبایەخەوە گوێیان قولاخ کردووە. وام بیردا هـات هـاتنی ئـەوان، بۆ ئـاشـتکردنـەوەی دڵی من بێت، ئـاخر لـەو دەمەقاڵێیەی دواجار لەگەڵ مەلیک کردمان، دڵم ڕەنجا.

بەهەرحاڵ، دوای ئەوەی دەرسـەکە کۆتایی هات، سـڵاوم لێکردن و سـوپاسـی هاتنیانم کرد، پاشـان بردنمە حەوشـەی خانەقا. دەروێش لەوێ خواردنیان بۆ دانابووین، نان و شیر و ترێمان خوارد.

مەلیک برێکی لێ خوارد و گوتی:

- وای خواردنەکەتان چەند خۆش و بەتامە! ئەی زوهد و تەقەشووف لەکوێن؟

ویسـتم پەرچی بدەمـەوە، بەڵام قاقای بەرزی مەلیک نەیهێشـت، دەستی لە شان دام و گوتی:

- قوربان! گاڵتەت لەگەڵ دەکەم. دیسـان سـەرکۆنەمان مەکە، لە ڕۆژانی گورین زۆر سەرکۆنەت کردووین.

قازی ئیبن زەکی هاتە گۆ و گوتی:

- من و مـەلیکی موعـەزەمم بۆ پرسـیارێک هـاتووین، لـە هـەر فەقیهێکمان پرسیوە نەیزانیوە.

زۆر بە هێمنی و هێوری وەڵامم دایەوە، هەستم کرد پرسیارەکە هیچ پەشۆکاوی نەکرد، تەنیا دەیویست بۆ هاتنی پاساوێک بدۆزێتەوە:

- فەرموو جەنابی مەلیک.

مەلیک ڕووئارایانە پێکەنی و گوتی:

- دەمەوێت لێت بپرسـم ئاخۆ ڕاسـتە بۆ تەختی خەلافەت، ئیمامی عەلی لە ئەبووبەکر شیاوتر بووە؟

قازییش بە شـێوەیەکی درێژدادڕ و بێ هودە، پرسـیارەکەی پاتە کردەوە:

- قوربان! شیعەکان پێیان وایە ئیمامی عەلی لە هەموو کەسێک زیاتر شـایانی خـەلافـەتی پـەیـامهێن (د.خ) بووە، سـوننـەیش لایان وایە

ئەبووبەکر لە گشتیان شیاوتر بووە. هەر گرۆیەی دەستگری ڕا و بۆچوونەکەی خۆیەتی.

- ئەی بۆچوونی ئەهلی تەسەووف لەوبارەوە چییە؟

هەموو لایەک بێدەنگ بوون، ڕوویان لەمن کرد و چاوەڕێی وەڵام بوون:

- جەنابی مەلیک بزانە! ئیرادەی خودا لە سەرووی هەموو ئیرادەیەکە، زانستیشی لە بان هەموو زانستێکەوەیە.

مەلیک زۆر بە خاکەڕایی و بێفیزی گوتی:

ڕاست دەکەیت. سوبحانەهووەتەعالا.

بەردەوام بووم و گوتم:

- خودا پێشتر زانیویەتی ئەبووبەکر پێش عومەر دەمرێت، عومەر پێش عوسمان دەمرێت، عوسمان بەر لە عەلی دەمرێت، هەربۆیە بەم جۆرە لە خەلافەت دایناون.

مەلیک سەری خۆی لەقاند، وادیاربوو قسەکەی منی بەگرنگ وەرگرت. دیسان دەستم بە قسە کردەوە:

- خودا ئەجەلی هەر چواریانی زانیوە، هەر بۆیە ئیرادەی خوا وابووە، کە کێ پێشتر ماوەی تەواو بێت، ئەو سەرەتا ببێتە خەلیفە.

ڕووم لە قازی کرد و دیسان درێژەم بە قسەکانم دا و گوتم:

- ئەگەر هەر یەک لەو دوو دەستەیە ڕێزیان لە ئیرادەی خودا گرتبا، تووشی ئەو گرفتە نەدەهاتن، ئەم ناکۆکییە ڕووی لێ نەدەکردن، وەها بەنێو یەک وەرنەدەبوون.

مەلیک نیشانەی بیرکردنەوە بە دەموچاویەوە دیاربوو:

- قوربان! خوا دەرووی خێرت لێ بکاتەوە.

هەموو ئەهلی مەجلیسەکە ئامینیان بۆ نزای مەلیک کرد، ئینجا هەستا و خۆی بۆ ڕۆیشتن سازدا. تا دەرگەی خانەقا لەگەڵیان چووم، مەلیک لەپی دەستی خۆی ماچ کرد و لە لەپەدەستی منی دا و لەگەڵ قازی بەنێو کلۆگەلدا ڕۆیشتن، کە لەگەڵ هەنگاوەکانیان

هەڵدەبەزینەوە و خۆیان بە جلەکانیانەوە جیڕ دەکردەوە. تاکوو لەو ناوە ئاوابوون هەر سەیرم کردن، دواتر گەڕامەوە مەجلیسەکەم، بە قووڵی بیرم لە هاتنی مەلیک و دانیشتنی لە کۆڕی وانەکەمدا کردەوە. کۆسپێک کەوتە دڵمەوە، هەبێ و نەبێت کۆشکی مەلیک شتێکیان لەبن سەردایە، قازی قوزاتیش نەخشەداڕێژەرەکەیەتی. تەماشای ڕووی فەقێکانم کرد، کە لە دەورمدا خەرمانەیان کردبوو، سەیری دەروێشەکانم کرد، کە لە سووچ و گۆشەکانی خانەقا پەرش بووبوون، بە خۆم نەبوو بیرێکی ناخۆش و بێزارکەرم بۆ هات: ئەگەر من بەهۆی ڕێز و پایەکەم لە دەست و تاقمی سیخوڕ و کینە لە دڵانی مەلیک و سوڵتانەکان چەپاڵە بدرێم، ئەی ئەو قەڵەندەرانە کێ پەنایان بدات؟
ئەو بیرە بێزارکەرە چەندان شەو و ڕۆژ وەک مار خۆی لە مێشکم ئاڵاندبوو، لە دەرس و نووسین دووری خستبوومەوە و پەکی خستبووم. بیرم لە خشتووربوونی خانەقا و لاوازبوونی بەرەی تەسەووف لە خۆرهەڵات دەکردەوە، کە بەتەواوی پشتیان بە ئەوقاف و خێروخێرات و ڕەزای سوڵتان دەبەست، لە خۆراواش دۆخەکە بە جۆرێکی دیکەیە. ماوەیەکی زۆر بیر و خەیاڵم بە سیاسەتەوە مژووڵ بوون. شەوێک نوێژم کرد و داوام لە هەق تەعالا کرد دەروی خێرم لێ بکاتەوە، هەرزوو نزام گیرابوو، سیاسەت وازی لێ هێنام. زۆری پێنەچوو زەنگی فیتنە لەنێوان مەلیکی موعەزەم لە دیمەشق و برایەکەی مەلیک کامل لە میسر، لێ درا. (ئیمپراتۆری فەرەنگی) بە مەبەستی بەیتولموقەدەس، سوپاکەی بۆ (عەکا) دابەزاند. خوارزمیش، بە نیازی بەغدا، سوپاکەی لە باکووری عێراق کۆکردەوە. مەلیکی موعەزەم خۆی لەنێو سێ سوپادا بینییەوە، نەیدەزانی کامیان پێشتر کۆتایی بە دەستەڵاتەکەی دێنن. بەمەیش ئاگای لە حوجرە و خانەقا و دووزمانیی فوقەها و تەگبیری گەوج و نەزان نەما.

یەک لە وەزیرە نزیکەکانی مەلیک مرد، منیش چووم سەرەخۆشیی لێ بکەم، نەیناسیمەوە. چاوەکانی کزبووبوون، خوێن لە ڕوخساری نەمابوو، بەم دیمەنەی ئەو، زۆر خەمبار بووم، ئەمە دواجار بوو ئەوم دەبینی.

دواتر تووشی هەوکردنی ڕیخۆڵەکان بوو و مرد، لەگەڵ تەرمەکەی چووینە ناوچەیەکی بیابانی، لەسەر وەسیەتی خۆی قەڵەندەرانە ناشتمان و هیچ قەفەز و بینا و جوانکارییەکیشمان بۆ گۆڕەکەی نەکرد.

## ٩٨

**دەستنووسێك لە بەیرووتەوە**
**١٤٣٣ك/ ٢٠١٢ز**

ئەها! لەبیرم چوو پرسیاری وێنە و شێوەیەکەی لێ بکەم. ئەمە وام لێ کردم لە جیاتی ئاوڕدانەوە بۆ ئەولا و ئەملا، کە هەر دەڵێی سەر بە ئەستۆمەوە نابوو، بەهێمنی لە قاوەخانەیەک چاوەڕێی بکەم. ئەرێ دەبێ لە ژوانی ئەو عاشقانەی لە قاوەخانەی دەریایی چاوەڕێی یەکتر دەکەن، هەمان شت ڕوونەدات، کە بۆ هاتنی خاوەننامە چاولەڕێن و لە هەموو ئەو کەسانەی ئێوارە و بەیانیان دێن، ڕادەمێنن و ورددەبنەوە، هەروەک چۆن لە فیلمەکاندا بەرچاو دەکەوێت؟ خوایە ئەوە چ عومرێکە من بەسەرم بردووە، ها ئەوەتە گەیشتمە پەنجاودوو ساڵ، کەچی هێشتا هیچ چتێک لەو حیکایەتانە نازانم! لە قوتابخانەی ژنە ڕاهیبەکان، نیوەی تەمەنم بە کاسۆلیکی بردە سەر، لە نیوەی تریش شووم کرد و بە موسڵمانی بەسەرم برد. لەنێو ئەو دوو ئایینەدا، هەلی ئەوەم لەکیس چووە، کە لە قاوەخانەیەک چاوەڕوانی هاتنی عاشقێک بکەم. بێبەش بووم لە چێژی چاوەڕوانی، لە بینینی ڕوخسار و هەڵدانەوەیان، لە هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی ئەگەرەکان، لە توورزکردنەوەی خەون و خولیاکان

لەسەر مێزێک، کە شنەبای دەریا، پەردەی سەری دەلەرێنێتەوە. خۆ من دەزانم هەموو ئەوانە ناتوانن خێزانێکی بەختیارت پێ ببەخشــن، هەموو هاورێ کچەکانم، کە ئێســتا لە بوونی مێردێکی میهرەبان و منداڵـە ســاڵحـەکـانم ئێرەییم پێ دەبـەن، ئـەو هـەقیقـەتـەیـان بۆ چەســپاندووم... بەڵام شــتێک هەیە قەت ژن لێی نابوورێت، ئەویش ئەوەیە: رۆژێک لە ڕۆژان ئاگری خۆشەویستی دڵی نەسووتێنێت، بۆ ئەوەی وەک ئەو دەســتنووســانە دەرکەوێت، کە بەهۆی کۆنیانەوە بەهادار دەردەکەون. دڵی من، پێچەوانەی ئەمەیە، هێشــتا هەر نوێیە، دەڵێی بە پلاســتیک پەردەپۆش کراوە. زۆر شــت لە دەوروبەری ڕوویان داوە، بـە چـەنـدان بـارودۆخـدا تێپـەڕیوە، کـەچی هێشــتا نـەکراوەتـەوە. بـەدەر لـەوەی کـە من ژنێکی زۆر ڕاســتگۆم، هیچ پاســاوێکی دی لەپشــت ڕەفتارە شــەختەبەندییەکەی نییە. ئاخر خۆشــەویســتی پێویســتی بە خەیاڵە. خەیاڵیش مۆزاییکێکە لە چەند درۆیـەکی بچووک، لـەمـە بترازێت هیچی تر نییـە. من بـە عـەقڵێکـەوە لەدایکبووم، ناتوانێت درۆ بەرهەم بێنێت و بەرنامەی بۆ دابنێت. هەر بۆیـە من نـە خـەیـاڵ دەکـەم و نـە خـەون دەبینم و نـە تـەمـا بۆ هیچ شــتێک دەخوازم. لە بەرانبەردا، کارم کردووە و کۆشــاوم، دواتریش پێشبینی دەکەم. ئامرازێکی بچووک لەسەر شێوە و شکڵی ژن. بەڵێ، ئەوە نزکترین لێکچوونە، کە من لەســەری دروســت کراوم، باشــترین پاســاویشــە بۆ ژیانێکی دوور لە خۆشــەویســتی. هەر ئەمەیش بوو وای کرد لـەنێو قوتـابخـانـەی کچـە ڕاهیبـەکـانـدا لـە هـەموویـان بـەختیـارتربم. هـەر شــتێک لە بەرهەیوان و داڵانەکان ڕووی دەدا، لەگەڵ ڕووحی من دەهاتەوە. ڕۆژێک لە ڕۆژان ســکاڵام لە دەســتی ئـەو ڕژێمـە توندە نـەکرد، کە لـە ڕۆژگـاری خوێندنماندا بەکار بوو، بەڵکە بەپێچەوانەوە، لەکۆتایی ئەو ساڵەی ڕژێم نەختێک هاوســەنگی لەدەست دا، کچە ڕاهیبەکان هەلی ئاسـانکارییان بۆ ڕەخسـا، ئەوسا

من دەسـتم بە گلەیی و بۆڵەبۆڵ کرد، گوتم نابێ بە هیچ شـێوەیەک ڕێگە بەمە بدرێت. کچەکان زوو دەردەچوون، گەلێک گەمە و گەپیان دەکرد. بە نموونە بەڕوویان تێک دەگرتن. بەر لەوەی بشـگەنەوە ماڵەوە، لەگەڵ یەکدوو کوڕ، تووشـی تیر و توانج و ناو و ناتۆرە دەهاتن.

گارسـۆن تەماشـای کرد کوپی قاوەکەم بەتاڵ بووە، هەڵیگرت و ڕۆیشـت. تەماشـای دەمژمێرەکەم کرد، ئاخر سـەعات پێنجی ئێوارە وادەی بەیەک گەیشـتنمان بوو. لێرە بەولا، هەقمە ئەگەر لەسـەر دواکەوتن لۆمەبارانی بکەم، ئەگەر نەشـهات، بەر نەفەرەتی بدەم... بەڵام ئاخۆ دەبێ چیی هەبێت ئەو دوا بخات؟ دوو هەزار دۆلار بۆ پەناهەندەیەکی سـووری، کە بەئاسـتەم تیکەنانێکی لە بەیرووت دەسـتگیر دەبێت، لەسـەرووی هەموو خەونەکانیەتی. پارەکە لەنێو جانتای بەردەستم دایە، هەر کاتێک هات و دەستنووسەکەی تەسلیم کردم، بێ سـێودوو، پارەکەی دەدەمێ. دەسـتنووسـەکە ژیننامەی شێخی مەزن موحییەدینی ئیبن عەرەبییە. ئەمە تێزەکەی منە، کە بەر لە هەژدە ساڵ توانیم پلەی دکتۆرای پێ وەربگرم. زۆر بەباشی ئەو بەیانییەم لەبیرە، کە لە زانکۆی سـۆربون گفتوگۆ لەسـەر تێزی دکتۆراکەم کرا. بەیانییەکەی زۆر لەوە سـارتر بوو، کە پێشـبینیم دەکرد. چوار سـەعات لەسـەر یەک لەبەرانبەر حەوت دادوەری فەڕەنسـی، لەسـەر ڕەمز و نەزعەی هیچگەرایی لە فیکری ئیبن عەرەبیدا، قسـەم کرد. بڕوانە! خوێندکارێکی کچ، چوار سـەعات لەبارەی ئیبن عەرەبی قسـان دەکات، کەچی هیچ لەبارەی خەیاڵ و خۆشەویستی لە ڕوانگەی سەردەستەی ئەوین و ئوستادی خەیاڵی تەسـەووفی ئیسـلامی، نازانێت. ئای ئەمە بۆ من چەندە جێگەی سـەرسـووڕمان و دۆشـدامانە! بەڵێ، من بەر لە هەموویان خۆم مەدهۆش کرد. دواتریش کاتێک تێزی دکتۆراکەم وەرگرت، موفاجەئە

گەورەکەی خۆم تەقاندەوە: لەبەردەم هەموویاندا ڕامگەیاند، کە من موسڵمان بووم!
ئەو کاتەیش دەبوو نامەیەکی سـەختتر لە تێزی دکتۆراکەم بۆ باوکم بنووسـم، ئەمەیش وەک پەرچدانەوەی نامەکەی باوکم، کە منی بە دەسـتبەرداربوون لە یەسـووعی ڕزگارکەر، تۆمەتبار کردبوو. لە قاوەخانەیەک وەک ئێستای چاوەڕوانیم بۆ پەناهەندە سوورییەکە، بە چەند لاپەڕەیەک نووسـیم، بەڵام ئەودەم لە پاریس بووم. باسـی ئەوەم بۆ باوکم کردبوو، کە چۆن ئیبن عەرەبی بە ڕێگەیەکی دیکە منی بە یەسـووع گەیاندەوە. ئەی ئەو بەردەوام ناڵێت یەسـووع ڕێنوێنی کردووم؟ ئەم نووسینە زۆر سەرنجی ڕاکێشام، کە دەڵێت: "چوار تەنمان هەس: تەنی ئادەم، تەنی حەوا، تەنی ڕەچەڵەکی ئادەم، تەنی عیسـا. خوا ئادەمی بەبێ دایک و باوک دروسـت کرد، حەوای تەنیا لە پیاو دروسـت کرد، ڕەچەڵەکی ئەوانی لە دایک و باوک، واتا ژن و پیاو، خستەوە. عیسایشی تەنیا لە ژن خولقاند." ئیتر هەر لەو ڕۆژەوەی ئەوەم خوێندووەتەوە، زیاتر هۆگری ئیبن عەرەبی بووم. دوای چەندان سـاڵ لەگەڵ ئەودا، ئێسـتا نازانم کامیان بۆ کامیان ڕێنوێنی کردووم، یەسـووع یان ئیبن عەرەبی؟ من بایەخ بەو پرسـیارەم نادەم، لێ دڵنیام هەردووکیان یەکێتیی ئیمانی لەنێوانیادا هەیە، ئەمەیش بۆ من زۆر گونجاو و لەبارە. من ئیمانم بە هەرتکیان هێناوە. ئێسـتا من ژنێکی موسـڵمانم و یەسـووع ڕێوانی کردووم، هەڵبەت ئەمەیش لەسـەر ڕێبازی شـێخی مەزن، ئیبن عەرەبی. لەبەر ئەوەی هیچ کەسێک ناتوانێت بەم شوناسە ئیمانییە ئاڵۆزە لە وڵاتێکی وەکوو لوبنان بژیت، بڕیارم دا لە فەڕەنسـا بمێنمەوە. شـووم بە (ریمۆند) کرد، کە یەکێک بوو لەو حەوت دادوەرەی لیژنەی گفتوگۆی تێزەکەم، کە لە موسـڵمانبوونی من تووشـی شـۆک هات. دواتر لە ماوەی نۆ سـاڵ، خوا سـێ منداڵی دایێ بە ناوی: ڕۆجیە، مانو،

ئەندریە. وەک هەوڵێک بۆ گەیشتن بە ڕێڕەوی ڕووحیی ئیبن عەرەبی، سەردانی مورسییە و، فاس و، مەراکیش و، توونس و، قاهیرە و، دیمەشق و، حەلەب و، قۆنیا و، مەلەتییەمان کرد، بەڵام هەوڵەکەمان شکستی هێنا. ڕیمۆند گوتی: دەشێ هۆکارەکە ئەوە بێت، کە من لەبەر ئەوەی کەسێکی مەسیحیم، نەمانتوانی بچینە مەککە، بەمەیش زنجیرەی سەفەرە ڕۆحییەکەمان پچڕا. بەڵێ، مەککە پێگەی هەرە بنەڕەتی ڕۆحانیەتی ئیبن عەرەبی بووە. هەر بۆیە لەو توێژینەوە هاوبەشەی لەوبارەوە نووسیمان، سەرەتا چەند ڕووپەلێکمان بەئەزموونی جوگرافیای ڕووحی شێخی مەزن پڕ کردەوە، لاپەڕەیەکی دیکەیشمان لەبارەی کیمیا و سیمیا لە فەلسەفەی بەرجەستەکراوی ئیبن عەرەبی نووسی. چەند لاپەڕەیەکیشمان دەربارەی ڕەمزیەتی گوازەگوازی ئیبن عەرەبی لەنێو مەقاماتی تەسەووف، نووسی. هەروەها چەند ڕووپەڕێکمان لەبارەی حاڵی فیمۆنۆلۆژی نووسی. بەشێکی دیکەمان لەسەر سنووربەند و بێسنووری ڕووانگەی گەردوونیی ئیبن عەرەبی نووسی. وای خوایە، نووسین لەسەر ئەو زاتە چۆن هۆش دەبووژێنێتەوە و ڕێڕەوی ئەکادیمیی ئێمە تێروتەسەل دەکات. تەنانەت ئەو شەوەی لەسەر خوانی نانخواردن گفتوگۆمان لەبارەی ئیبن عەرەبییەوە کرد، هەست و ئارەزووی ئەوین و خۆشەویستیمان پتر بوو.

لە کۆتاییدا گەیشت. پیاوێکی هەتا بڵێی کزۆڵ و لاوازبوو، ڕوومەتەکانی پێکدا قوپابوون، چاکەتێکی گینیز و پانتۆڵێکی ڕەشی پۆشیبوو. قژێکی تێکهەڵقژاو، دەنگێکی نووساو و نزم. زۆر بە ئەدەبەوە سڵاوی کرد و دانیشت. چاوەکانی من لەسەر جانتا قوماشییەکە لەنگەریان گرت، کە بەر لەوەی دانیشێت، بە لایەکی کورسییەکەی هەڵواسی. حەزم دەکرد دەستم ببەمە ناوی و ئەو

دەستنووسەی، کە لەبەر خاتری ئەو، لە پاریسەوە هاتوومە بەیرووت، دەستی بخەم. داوای قاوەیەکی کرد، دواتر دەستی درێژ کرد و دەستنووسەکەی هێنایە دەر و خستیە دەستی من.

- فەرموو ئەوەتە خاتوون.

- ئاخر چۆن بزانم ئەوە دەستنووسە ئەسڵیەکەیە؟

کابرا شانی خۆی ڕاتەکاند و پێکەنی و گوتی:

- نازانم! من خۆم نازانم ئاخۆ ئەسڵییە یان نا.

- لەکوێ دەستت کەوت؟

- لە ژوورەکەی برای ڕەحمەتیم. لەگەڵ هەموو ئاتاج و کەلوپەلە گرانبەهاکانی خستبوویە نێو باولەیەک.

- بۆ هیچ پسپۆرێکی بواری دەستنووسناست بردووە، تاکوو دڵنیا ببیەوە؟

بزەیەکی کرد و گوتی:

- خاتوون! لە دیمەشق پسپۆری دەستنووسناس لەکوێ بێنم؟ باشە ئەگەر کەسێکی وام دۆزییەوە بۆی دەرکەوت، کە دەستنووسێکی ئەسڵییە، چۆن دڵنیابم دەمداتەوە؟

- ئەی چۆن من دڵنیابم، کە تۆ دەستنووسێکی ساختەت بە من نەداوە؟

دیسان شانی خۆی ڕاتەکاندەوە و ئەبرۆکانی هەڵدان و وەڵامی نەدامەوە. من دڵنیابووم لە پاریس دەتوانم ئەو دەستنووسە ساغ بکەمەوە. هاوەڵەکانم لە بەشی دەستنووسازی، بەئاسانی تاقیکردنەوەی کاربۆنیی بۆ دەکەن. دەشتوانم داوا لە پسپۆڕی بەشی دستنووسەکان بکەم، ئەو دەستخەتە بەراوردی دەستنووسە ئەسڵییەکان بکات، کە بە دەستی شێخی مەزن نووسراون... بەڵام ڕاستییەکەی نامەوێت گێلۆکە و کاڵفام دەرکەوم، لە ئینتەرنێت باسی دەستنووسێکم خوێندووەتەوە، هەر بەم هۆیەشەوە لە پاریس

هاتوومە بۆ بەیرووت، ئێســتەیش نامەوێت بەبێ هیچ وردبوونەوە و ســۆراخێک، ڕاســتەوخۆ دوو هەزار دۆلاری بدەمێ، لە بەرانبەری ئەوەیش دەستنووسێکی ساختە وەربگرم!

- ببوورە خاتوون! هەقی خۆتە لە ڕاستیی دەسـتنووسـەکە بەگومان بیت، بەڵام زۆر بەڕاستی و ڕاشکاوی پێت دەڵێم: هیچ چتێک لەبارەی دەســتنووس نازانم. هەموو ئەو شــتانەی من لەو بارەوە دەیزانم، برایەکم ژمارەیەک دەسـتنووســی پەیدا کردبوون، کاتێکی زۆری بۆ پشکنین و نووسینەوەیان بەسەر دەبرد. من پێم وایە لەبەر بەهاداری و بایەخەکی زۆریان، ئەو دەسـتووسـانەی لەنێو باولەیەکی قوفڵدراو هەڵگرتبوون.

دیسان شانی خۆی ڕاهەژاند، پێکەنی و گوتی:

- ئەمن مســســازم! وەرە پارچە مسـێکم بدێ، پێت دەڵێم لە بازاڕی (حەمدیە) چ وەستایەک سازی کردووە!

- جوانە، جوانە!

پارەی ناو جانتاکەم دەرهێنا و خســتمە ســـەر مێزەکە، ئەویش هەڵیگرت و و ســوپاســی کردم، پاشــان ڕۆیشــت. بەر لەوەی لە دەرگەی قاوەخانەکە دەرچێت، گەڕایەوە، منیش هێشــتا هەر دانیشــتبووم. داوای لە خزمەتکارەکە کرد، قەڵەمێکی بداتێ، ژمارە تەلەفۆنی خۆی لەسەر ئەو پارچە کلێنکسە نووسی، کە لەگەڵ کوپی قاوەکە هاتبوو، دایە دەستی من و گوتی:

- ئەمە ژمارە تەلەفۆنی منە لە بەیرووت. ئەگەر دەرکەوت دەستنووسەکە ساختەیە، من پارەکەت بۆ دەنێرمەوە.

خەریک بوو ئەسرین بە چاوەکانیدا بێت، گوتی:

- ڕاســتییەکەی نامەوێت بەهۆی منەوە ئەســتۆی برای خوالێخۆشبووم گلاو بێت.

# ٩٩

**"تەسەووف بەبێ ئەخلاق، هیچ نییە"**

**ئیبن عەرەبی**

سـەدرەدین باخۆش و هەراش بوو، بە ڕادەیەک تینوو و عەودالّی زانسـت بوو، نەمدەتوانی تاسـە و تامەزرۆیی بشـکێنم. دەرس و دەوری سـەدرەدینی کوڕم لەگەڵ شـێخ کرمانیدا بەش کرد، بەلاّم دوای ئەوەی ئامۆژگارییەکی وام دادا، کە قەت لەبیری نەچێتەوە. لە خانەقا لەگەڵ سەدرەدین پێکەوەبووین، لە خۆم نزیک کردەوە، توووند چیچکەگوێیم گرت و بە توندی هەڵمگوشـی، لەبەر ئازاری زۆری، چاوەکانی نووقاندن، ئینجا پێم گوت:

- تۆ دەزانی شـێخی کرمانی، هاوەڵی باوکی تۆیە، یەک لە کەسـە هەرە باشەکانی ئەهلی تەریقەتە. زانستەکەی بەکەڵکە و خودان زەوق و ئەحوالە، بەلاّم...

زیاتر چیچکە گوێیەکەم گوشـی، بۆ وەی هەموو هەسـتەکانی بکاتە گوێ، ئەوسا پێم گوت:

- بەلاّم شێت و شەیدای گەنجی جوانە!

بە سـەرسـووڕمانەوە چاوەکانی ئەبڵەقبوون و دەمی لێ بەش بوو، وەک ئەوەی شـتێکی زۆر ناشیاو و ناخۆشی لە دەمی من بیستبێت، گوتی:

- چی؟
- هەر ئەوەی بیسـتت، تکایە مەمخەرە باری دووزمانیی هاوەڵەکەم. لە زانسـتەکەی بەهرەمەند بە و تەواو. تەنیا لە خانەقادا لەگەڵی دانیشە. وریای خۆت بە!
- فەرمانتە بابەگیان.
چیچکە گوێم بەردا، سوورسوور هەڵگەڕا. سەدرەدین بێدەنگ بوو، خەریکی تانوپۆی ئامۆژگارییەکەی من بوو. من گومانم نییە شێخ کرمانی کەسێکی بەتەقوا و خودان فەزڵە، بەڵام ڕاستییەکەی وەک لە خۆم دڵنیانیم، لەویش دڵنیانیم. ئای چەندە پێم خۆشە سەدرەین ڕیشی بێت و چیتر بە دەرچوونی لە ماڵ، نیگەران نەبم.
عیمادەدینیش سرک و لاسارە، بە هاتوهاوار نەبێت، وەڵام ناداتەوە. خۆمی لێ ترشوتاڵ نەکەم بە قسەم ناکات. تاکوو بە ڕانیدا نەکێشم، یان نەرمەی شانی نەگرم، واز لە بەدکارییەکەی ناهێنێت... ئەو ئێستە منداڵێکی تێر و تەواوە، لەنێو گەڕەکدا جگە لە یاری ساپساپانێ و زارومارانێ، هیچ خەمێکی دیکەی نییە. زۆر جار لەگەڵ خۆم دەیبەمە خانەقا، هەر چاوم لێی غافڵ بێت، بە لایەکدا دەڕوات، لەکن دەرگەی مزگەوت یەخەی شێتەکان دەگرێت و هەراسانیان دەکات، ئەوانیش تا کۆتایی ڕێگە وەدوای دەکەون، هەرکە ئەوان لە دوای دەبنەوە، ئەویش دەگەڕێتەوە. ڕۆژێک یەعقووبەشێت، پشتەملی گرت و هێنایە ناو حەساری دەور و تەدریس، من مژووڵی وانەگوتنەوە بووم، هێنای و گوتی:
- با ئەو کوڕەت وازمان لێ بێنێت، دەنا ئێسکەکانی تێک دەشکێنم.
هێندێک لە فەقێکانم قیتبوونەوە، ویستیان لەسەر ئەو بێئەدەبیەی چاوترسێنی بکەن، بەڵام ژمارەیەکی دیکە نەیانهێشت. عیمادەدین وەک ئەوەی نەبای دیبێ و نەباران، لەبەر دەستی یەعقووبەشێت خۆی ڕاپسکاند و هەڵات. وەختێک چوومە ماڵەوە، لەوێ نەبوو. شەوان کە من دەخەوتم، بە خشکەخشک دەهاتەوە و دەچووە

ژوورەکەی و لەنێو برایەکانی دەخەوت، وەک ئەوەی هیچ شـتێک لە گۆڕێ نـەبێت. وەختێـک بۆ نوێژی بـەیانی خـەبـەرم دەبوویـەوە، بۆ ئەوەی چاوپۆشیی لە بەدکارییەکەی بکەم، بۆ چوونە مزگەوت پێشم دەکەوت. منیش چاوپۆشـیم لێ دەکرد، وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، بەڵام ئەو هەر وازی نەهێنا.

ڕۆژێک بە گریە و ناڵەوە دەگەڕێتەوە ماڵ، وەک ئەوەی دوو ساڵ بێت نەگریا بێت و بیەوێت قەرەبووی بکاتەوە. تەنیا سـەفیە لە ماڵ دەبێت، ئـەویش لـەو گـەڕانـەوە پێشـوەخت و گریـانـە نـاوەختـەی، دەترسـێت. تا شـەکەت دەبێت، لێپرسـینەوەی لەگەڵدا دەکات، بەڵام هیچ شـتێک لەبارەی ئەوەی پێی کراوە، نادرکێنێت. دەچێ کوندەی ئاو هـەڵدەگرێت و دەڕواتە ژووری منداڵان، بەدرێژایی ڕۆژەکە پاڵ بـە دەرگەوە دەدات و ناهێڵێت کەس بیکاتەوە، بەردەوام دەناڵێنێت و هاوار دەکات، سەفیەش گوێی لێ دەگریت.

گاهێک گەڕامەوە، حاڵ و مەسـەلەکەی ئەوی بۆ گێڕامەوە. پرسـیارم لێی کرد و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە. سـەروسـۆراخی ئەو باسـەم بە سەدرەدین سپارد، شەو بەر لەوەی خەوم لێ بکەوێـت، پێی گوتم شـتەکان گرتوویانە و بیبەری تیژی کوتراویان دە قینگی کردووە! هـەر لـەو ڕۆژەوە عیمادەدین هیچ پێوەندیەکی پێیانەوە نەماوە، چیتر گەمە و گاڵتەی لەگەڵ نەکردنەوە، هەرکە لە ڕێگە شـتێکی دەبینی، ڕێک دەگەڕایەوە، دواتر بە ڕێگەیەکی دیکەدا دەڕۆیشتەوە.

وا دیـارە عیمـادی کوڕم بـەم بیبـەرە، ئازارێکی زۆری بینیوە، بـەڵام هەر تەنیا چەند هەفتەیەکی پێچوو، خەڵکی دیمەشق تووشی ئازار و مەینەتییەکی زۆر گەورەتر هاتن. ئەگەر ئاسـمان بە خوڕ دابارییا و زەویی وەبنەخۆ دابا، گێژەڵۆک هەڵی کردبا، لووت و چاو و قوڕگ و ڕووحەکان لە بیبەری تیژ سـیخناخ بوانە، بەقەد ئەو ئازارە نەدەبوو. بـە هـەر کوچـە و کۆڵانێکدا دەڕۆیشـتی، شـین و قوڕپێوان بوو. دەچوویە هەر مزگەوتێک، ناڵەناڵ و لاحەولەووەلاقوەتە بوو. بە هەر

بازێڕێکدا ڕەتدەبوویت، دیمەنی خەمناکی و دڵتەنگی باڵی کێشـــابوو. مەلیک کامل بە ســـوڵح بەیتولموقەدەســـی تەســـلیمی ئیمپراتۆری فەڕەنگی کرد. ئەگەر لە ڕێگەی شـەڕ و کوشـتار و خۆسـەپاندنەوە بەیتولموقەدەســـیان لەدەســـت هاتبایە دەر، لای موســـڵمانان زۆر خۆشـتر دەبوو، بەتایبەت بۆ پیرەپیاوانی وەک من، کە شـایەتی ئەو ڕۆژە بوون، کە ســـەلاحەدین بەیتولموقەدەســـی لە دەســـت ئەوان دەرهێنا و گێڕایەوە دەسـتی موسـڵمانان، کەچی ئەمڕۆ دەبینین یەک لە نەوەکانی ســـەلاحەدین لەژێر فشـــار، تەســـلیمی فەڕەنگەکانی دەکاتەوە!

مەلیک ناسـرِ داود، کە حوکمڕانیی دیمەشـقی دەکرد، بەشـێوەیەکی ڕەسمی ماتەمی سـەرتاسـەری ڕاگەیاند. شین و گریان هەتا دەهات زیـاتر دەبوو، لـە هـەموو لایـەکـەوە مـاتـەمگێڕان بوو. دەرویێش و فەقێکانی خانەقا لە خەڵکی دی حاڵیان باشـــتر نەبوو. بە پرســـیاری دوور لە بابەتەکمان دەرسیان دەبڕی. هەموو پرسیار و قسەکردنی ئـەوان بووبووە باســـی قودس و جیهاد و تاعەت، هەر شـــتێک بە بیریـان ڕەت دەبوو، لـە دڵ و دەمـارەکـانیـان قـەتیس دەبوو، دواتر دەیانخســـتە ڕوو. تەنانەت ســـودکین، کە هێشـــتا مژووڵی گاگۆڵە و گڕوگاڵی کوڕەکەی بوو، شمشێر و زرێ و خودەیەکی کڕیبوو، وای دەزانی زووبەزوو مەلیک ناسرِ داود، بۆ گرتنەوەی بەیتولموقەدەس، جاڕی جیهاد دەدا.

وەلێ نە بۆ جیهاد و نە بۆ شتێکی دیکە، کەس دەرنەچوو. ناسرِ داود نە جاڕی جیهادی دا و نە هیچ ســـوپایەکیشـــی ڕێک خســـت، بەڵکە لـەجیاتی ئەمە، ئاهەنگێکی گەورەی لە حەوشـــەی مزگەوتی گەورە ســـاز کرد، هـەرچی وتـاربێژ و شـــاعیر هەبوو کۆی کردنەوە، لە هـەجوی مـەلیـک کـاملی مـامی و لاوانـدنـەوەی شـــاری قودس، پێشـــبڕکێیان دەکرد. خەمە ڕاســـتەقینەکان، تێکەڵ بە چڵک و گڵاویی سیاسـەت بوون. مەلیک کاملیش هەر لەگەڵ تەسلیمکردنی قودس بە

فەڕەنگەکان، بە نیازی دەرهێنانی دیمەشق لە چنگی برازاکەی، بەرەو شـــاری دیمەشـــق هات. یەک ســـاڵی ڕەبەق گەمارۆی داین، دارا و دەوڵـەمەندەکان هەموو ڕێگە و ســـــەرچاوەیەکی ئابووریيان لێ بڕا، نرخی شـــتومەک بێتام بەرز بووەوە. بەڵام ئەهلی تەســـەووف، کە خوويان بە نان و شـــیرەوە گرتبوو، بە هیچ جۆرێک هەســـتیان بەم گرانییە نەکرد. ئاخر ئەوان لە کاتی خۆشـــییدا گەمارۆیان خستبووە ســـەرخۆیان، بۆیە لە کاتی ناخۆشـــی و نەهامەتیدا هەســـتیان بەم گەمارۆیە نەکرد. بەپێچەوانەی خەم و ناخۆشـــی، بوومەلەرزەی سیاسی سەر دیمەشق، ئارامی و سەکینەتی بەسەر من و فەقێکانمدا هەڵڕشـــت. خەڵک هێندەی ســـــەرقاڵی ئەوە بوون کێ لە کۆشـــک نیشتەجێ دەبێت، هێندە خەمی ئەوەیان نەبوو ئاخۆ کێ لە خانەقاکان ژیان بەسەر دەبات.

## ١٠٠

**" هەر ژیانێك فەنابوونی بەدواوە بێت، هیچ نییە"**
**ئیبن عەرەبی**

حەفتا ساڵ، هەم بەسەر شانمەوە قورسە و هەمیش چڕنووکدارە. ئەوەتە زاکیرەی خاشخاش کردووم. بۆ کارێک ملی ڕێ دەگرم، تا نیوەی دەچم، دواتر لەبیرم دەچێت لە کوێ هاتووم و بۆ کوێ دەچم. هەموو جومگە و گەهێکم لەجێ چووە، هەرکە هەڵدەستم و دادەنیشم، دەبێتە تەقوهۆڕیان، هەر دەڵێی لە دووکانی ئاسنگەریم. سەفیە هەموو شەوێک ئەژنۆکانم بە گێراوەی زەعفەران و زەیتی کافوور چەور دەکات، بەڵام بێسوودە. بەدەم ڕۆیشتنەوە ڕادەهەژێم. بۆ ئەوەی لەکاتی دانیشتندا ئەژنۆکانم نەنووشتێنەوە، قاچەکانم درێژ دەکەم. مەرگ دەیان نامەی هەڕەشەوگوڕەشەی بۆ ناردووم، هەر ساتێک لە هەر شەو و ڕۆژێکدا، دەورم بدا، هیچ بەڵگەیەکی خۆبەدەستەوەنەدانم پێ نەماوە. قژم سپی بووە و پشتم چەماوەتەوە، ژانی ئازاکانم زۆر بووە، چاوەکانم کز و گوێچەکانیشم تەپ بوون، زاکیرەشم وێران بووە. بەدەر لەمانەیش، هەموو هاوەڵ و دۆستەکانم لێرە باریان کردووە و

چوونەتە خزمەت باری تەعالا. لە دیمەشق شەکەت بووم هێندەی بەدوای جەنازەکانیانەوە بڕۆم، لە شـــار و وڵاتانی دیکەیش، بەردەوام خەبەری دۆستانی دیکەم پێدەگات.
هاوڕێکانم: عەبدوڵڵای ئەرمەنی خاوەن کەرامەت، بیرمی ماردینی خەڵوەتچی، ســـوهرەوەردی بە مڕوئەت، ئیبن فاریزی خودان قەســـیدەی تائی، هەموو ســـەریان نایەوە و بۆ دنیای ئەودیو ڕۆیشـــتن. زۆری نەماوە ئیبن عەرەبی گوناهکار و دڵ بە حەسرەتیش، بە وان بگات!
حاڵم زۆر شـــەپرێو بووە، تەنانەت ناتوانم بەتەواوی فریای یەک وانەیش بکەوم. چەند فەقێیەکم داناوە کتێب بخوێننەوە و ئەوانی دیش گوێیان بۆ ڕادێرن تا تەواو دەبێت، ئینجا پرسیارم لێ بکەن. ئەگەر پرسیارەکە زۆر پاتە بکرێتەوە سودکین، یان ئەوانەی تێی گەیشتوون وەڵامی دەدەنەوە. لە سودکین بترازێت، هیچ هاوەڵێکم لەتەک نەماوە. کرمانی بە هاوەڵیی ســـەدرەدین بۆ قاهیرە چوون، ئاخر ناهەق نەبوون، لە دیمەشـــق زانســـتێک نەما وەری نەگرن، کتێب نەماوە نەیخوێننەوە، شـــێخ نەماوە پرســـیاری لێ نەکەن، ڕاستییەکەی منیش بۆ ئەمە دنەم دان. سەعدەدینیش هەراش بووە و لەگەڵم دێتە خانەقا، بەهێمنی دادەنیشـــی و گوێچکەکانی قولاخ دەکات، بەڵام هیچ قسە و پرسیارێک ناکات. براگەورەکەیشی بە چەندان ڕۆژ، مەگەر پێش خەوتن بە ڕێکەوت، یان لە کاتی وەخەبەر هاتنەوەی بکەوێتە بەرچاوم، دەنا هەر نایبینم. قەفەزێکی گەورەی کڕیبوو، جۆرەها باڵندەی تێدا ماڵی دەکردن و دەچوو لە بازاڕ دەیفرۆشـــتنەوە، یان لەگەڵ هاوڕێکانی یاری و گەپی پێ

دەکردن. کاتێک لە دیمەشق لافاو هەستا، چەندان خانوو و خانەقای خستنە ژێرخۆ، بە قەد بەژنێک ئاو لە کوچە و کۆلانان بەرزبووەوە، لەو کاتەدا قەفەزەکەی ئەویش ژێر ئاوکەوت و چەندان مەلی ڕەنگینی تێدا مرداربوویەوە، زۆر خەمی بۆ خواردن، هەروەک ئەوەی ئایینی ئیسلام لەبەین چووبێت و دواتریش بە غەریبی و غەوارەیی گەڕابێتەوە.

ئەیووبییەکان یەکبەدوای یەک فەرمانڕەوایی دیمەشقیان کرد. ئەویان لە دوای برایەکە و ئەمیان پاش باوکی، تەنانەت هەنووکە گەلێک جار نازانم ئێستها کامیان جڵەوی حوکمداری ئێمەی لەدەستە. وەختێک وتاربێژی هەینی نزا بۆ مەلیک دەکات، ئەو کات بیرم دەکەوێتەوە کێیە، بەڵام کە لە مزگەوت دێمە دەرەوە، لەبیرم دەچێتەوە. فەقێکانم پێیان گوتم ناسر داود لە (کەرک) سوپاکەی وەگەڕخستووە و بەیتولموقەدەسی لە دەستی فەرەنگەکان دەرهێناوەتەوە، بۆ ئەم هەواڵە فرمێسکی شادیم هەڵرشت. ڕۆژی دوایی، لە کۆتایی وانەکەم نزام کرد و گوتم: "خودایە بەیتولموقەدەس بخەیتەوە دەستی موسڵمانان." فەقێکانم زۆر بە سەرسوورمانەوە نیگای پڕ شەفەقەتیان تێبڕیم، دواتر تێگەیشتم ئەو نیگا پڕ شەفەقەتانەی ئەوان چی بوون. دوای هەموو ئەو ڕووداوانە، درکم بەوە کرد گەیشتوومە تەمەنێک، ژیان زۆر لە مەرگ ناخۆش و دژوارترە.

کڵۆڵی و چارەڕەشی، بەس بە نەخۆشی و چەنگەڕنێی مەرگ نەوەستا، بەڵکە دەستی لە گیرفانیشم گیر کرد و تووشی هەژاری و نەبوونی بووم. دوای بەرزکردنەوەی سکاڵایەکی زۆر لە دژی

من، قـازی ئیبن زەکی وەک فشـــارێک مووچـەکـەی بڕیم. ئـەو وەقفەی، کە مەسرەفی خانەقای دەکرد، بەهۆی لافاوەکە ڕووخا و نـەما. ڕۆژێـک هیچ پـارەیـەکم نـەمـا بۆ مـاڵـەوە خـەرجی بکـەم. سـەفیـەش ماوەیەک بەرگەی ئەو حاڵەی گرت، دواتر ئەویش بە بۆڵە کەوت و گوتی: هیچ چتێکمان نییە ئێوارە بیخۆین. سەعدەدین دوا کولێرە و چـەند دانـەیـەکی کـەمی خورمای نێو سـەبەتەکەی دەرخوارد داین و ئەو شـەوەمان بە برسیەتی بەسـەر برد. بەیانی سکی بەتاڵم، حاڵی گیرفانمی بیرخستمەوە. لە ماڵ دەرچووم و بە پێچەوانەی ڕێگەی خانەقا ڕۆیشـتم و چوومە غوتە. لەتەک ئەو پیاوانە وەسـتام، کە بۆ کرێکاریی هاتبوون، زۆربەیان بردن و منیش مامەوە. کاتێک تەماشـای پیری و کەنەفتی و پشـتکووڕییان دەکردم، وەک ئەو هەردوو پیاوەی کە یەکیان کۆڵەواری دەسـتان و ئـەویتریش کولـەبنـە بوو، لێم دەسـڵـەمینـەوە. لـە چاوەڕوانیی ڕزقێکدا بە سـێ قۆڵی بەدەم ڕێگەوە دانیشـتین، وەختی نیوەڕۆ پیاوێک هات و هەر سـێمانی برد. دوو پیاوەکەی ڕەوانەی کێڵگە کردن و منیشـی بردە باخێکی نزیک ماڵیان. هەتا ئێوارە، خەریکی هـەڵپـەرداوتنی دار و خڕکردنـەوەی گـەڵا و ڕنینی بـەر و ئـاودانی کشـتوکاڵ بووم. ڕۆژانە هاوژینەکەی نانی دەدامێ و ئەویش دوو دەرهەمی پێ دەدام، بەمە نانی ئێوارەم بۆ سـەفیە و سـەعدەدین دەکڕی.

هەشـت نۆ مانگم بەم تاسـوحەمامە بەڕێ کرد. ڕاسـتییەکەی باش بیرم نییە بە دەقیقی چەند بوو. لە ئاخروئۆخری زسـتان دەسـتم پێ کرد، ها ئەوەتە ئێسـتایش داخڵی زسـتانێکی نوێ دەبینەوە.

فەقێکان لە خانەقا بەدوامدا گەڕابوون، دواتر هاتنەماڵەوە، پێم گوتن لەمڕۆ بە دواوە من نایەم. ناوی متمانەدارەکانم پێ گوتن، کە کتێبەکانی منیان لێ ژنەوتبوون، ئیتر ئەوانیش وازیان لە من هێنا. سـودکین وای زانیبوو لە خەڵوەتدام، ئەویش لە دەرەوەی دیمەشق کەوتبووە خەڵوەت. چوونە ناو باخی کابرا، بووە ڕێگەی سپێدە و ئێوارانم. هەردوو ئەژنۆکانم ژانیان دەکرد و دەیانناڵاند، تا دەگەیشتمە باخ، چەند جارێک دادەنیشتم و پشووم دەدا. سەرەتا لە کارە ئاسانەکان دەست پێ دەکەم، ئەمەیش لەبەر ئەوەی نەبادا کارە تاقەتپڕووکێن و قورسەکان، هێز و تینم لێ ببڕن و ئیشەکەم پێ تەواو نەکرێت.
دان بۆ مریشکان ڕوو دەکەم و کوڵێتیان خاوێن دەکەمەوە. لەنێو سەبەتەیەک هێلکە کۆ دەکەمەوە و لەپێش دەرگەی ماڵی کابرا دایدەنێم. پاشان گەڵای وەریو دەماڵم و ئاو لە جۆگە هەڵدەبەستم، ئەو کارە پشتی وەژان خستووم، بە قینگەخشکێ گێسک لێ دەدەم، پێمەڕەکردن و تەورکاری، بۆ من ئەرکێکی قورسە. ناتوانم بێڵ هەڵگرم، بە دەستەکانم سەرەجۆگە دەکەمەوە. باسکەکانم شەرەمەزاریان کردم، دارێک ئەگەر نەختێک لەمن بەرزتر بێت، ناتوانم پێی بگەم و بەرەکەی بڕنم.
کارکردن بۆ من زۆر قورس بووە، ئەوەی پێشتر بە دانەڕۆژێک دەم کرد، ئێستە یەک ڕۆژی ڕەبەقی پێوە دەبم، بەڵام ڕاستییەکەی هیچ کارێک لەمە ئاسانتر و دوور لە چاوی خەڵکم دەست ناکەوێت.

لەوە تێگەیشتم ئەگەر لەبارەی کتێبەکانم داوای لێبووردن بکەم و لە قسە و وتەکانیشم پاشگەز ببمەوە، ئەوە مووچە و پارەم پێ دەدرێتەوە و ژیانم خۆش دەبێتەوە، بەڵام تازە گەیشتوومەتە تەمەنێک پاشگەزبوونەوە زۆر لە ئێش و ئازار و پیریم تاڵوژارترە. جارێکی دیکە بۆ وەرگرتنی یەکدوو دینار، ناچمەوە کن ئیبن زەکی و بەڕێوەبەری خانەقا. تا بەسەر پێیانەوە بم، بۆخۆم لەو باخەدا کار دەکەم، هەتا هەق تەعالا بۆ خانەی خۆی دەمباتەوە، لێرە بەروبوومی دەستی خۆم دەخۆم، هەڵبەت لە دنیای ئەودیویش، نە کار هەیە و نە ماندووبوون.

زستان بەنیوە بوو، سەرماوسۆڵەکەی هەتا دەهات بەتینتر دەبوو. وەختێک ڕووبەڕووی ڕەشەبای نێو کۆڵانە تەنگ و تەسکەکان دەبمەوە، خەریکە هاوسەنگیم لەدەست بدەم. لە ماڵ دەرچووم بە لچکی پێچەکەم دەموچاوم داپۆشی، جوبەیەکی قورسی خوریم بە خۆم دادا. شەقامەکان ئاڵۆزی و پەشێوییان تێکەوتبوو، خەڵک پۆل پۆل لە کوچە و کۆلانەکاندا تەکبیریان لێ دەدا و بانگیان دەدا، منداڵیش لە دەرگەی ماڵانیان دەدا، داوایان لە پیاوگەل دەکرد ڕەگەڵیان بکەون. خۆم لە ڕیزی ئەو خەڵکە دوورەپەرێز گرت، ئاخر ئەو خەڵکە وەک ئەوەی لە جەنگدا بن وابوون. بەبن دیواراندا ڕۆیشتم، تا زوو بگەمە باخەکە و دوا نەکەوم. بەڵام ئەو ڕێگەیەی من پێیدا ڕۆیشتم، زۆر بە جۆشوخرۆشتر بوو. تەواوی ڕێگەکە بە زایەڵەی دەنگی وان دەلەرایەوە، یەک بە دەنگی خۆیان هاواریان دەکرد:

- شکۆ بۆ ئێمە ...سەرشۆڕی بۆ ئێوە.

له هیکران، دەستەیەک سەرباز بە سواری ئەسپەکانیانەوە پەیدابوون، قامچیان بە دەستەوە بوو، بەبێ جیاوازی، لە خەڵکیان دەدا. بە قامچیان وەرگەڕانە ئەو خەڵکە، دەستیان لە پیر و منداڵ و گەنج نەپاراست. قامچیان لە شان و ڕوومەتم سرەواند و بە زەویدا کەوتم. کەوتمە بن قاچی خەڵکەکە و سەرم بە دیواری ماڵێک کەوت. بەحاڵ هەستامەوە، ئازا و جومگەکانم ناڵەناڵیان بوو، سەرسوورکێیەکی تووندم گرت، خەریک بوو لە هۆش خۆم بچم. لە ترسی بەربوونەوە، خۆم بە دیوارێک گرتەوە، لە بەردەم دەرگەی ماڵێک هەڵکورمام. پەیتاپەیتا خەڵک بە کۆڵانەکەدا ڕەت دەبوون و چریکە و هاواریان هێندەی تر بەرز دەبووەوە و پەلەبەردیان لە عەسکەران دەگرت. هێزم دایە بەر خۆم و هەستامەوە، نەختێک ڕۆیشتم، کەسێک خۆی بە جلەکانمەوە گرت و دیسان بەربوومەوە. بە تۆزوتاڵی ژێرپێی ڕاکردوان و سمی ئەسپەکان، خەریک بوو تەنگەتاو دەبووم. بەردێک لە زرێی عەسکەران هەڵزۆقییەوە و شەویلاکی پێکام و سەری سووڕاندم. زانیم چیتر ناتوانم بەپێوە بوەستم. دەستم لەسەرم وەرهێنان و هاواری خوام کرد:

- یا لەتیف. ماوەیەک بێهۆش کەوتم، نەمزانی چەند بوو. وەختێک وەئاگا هاتمەوە لەشم لە خۆڵ وەرچووبوو، پێچەشم کرابوویەوە. خوێن لە دەمم دەچۆڕایەوە، ددانێکیشم لەقەلەقی بوو. ژاوەژاو و جەنجاڵی کوچە کەم بووبووەوە، زۆربەی خەڵک پەرتەیان لێ کردبوو، یان ڕایانکردبوو. گوێم لە دەنگی کۆمەڵە هەرزەکارێک

بوو، که به لامدا تێپەڕبوون و دروشــــمیان دەکێشــــا. یەکێک منی بینی به زەویدا کەوتووم، هاته لام و دەستی درێژ کرد و گوتی:

- یا شێخ! خوا پاداشتی هەقبێژیەکەت بداتەوە.

پاشان لای له هاوڕێکەی کردەوە و گوتی:

- دەبێ چ پاســــاوێکمان به دەســــتەوە بێت، ئەگەر کۆمەکی عیزی کوڕی عەبدوســـەلام نەکەین و له زیندان دەری نەهێنین، له کاتێکدا ئێمه لەشــــســـــاغ و تەندروســــتین، کەچی ئەو پیاوە بەو پیرییە بۆ هاوکاریی ئەو هاتووە و تووشی ئەو ئەشکەنجەیە بووە.

ئەو گەنجه کۆمەکی کردم، دواتر وەســـتام و هەســـتم به ئازارێکی زۆری پەراســــووەکانم کرد. هەســــتم کرد یەکدوو پەراســــووم شـــــکاون. بیرم له حاڵی خۆم دەکردەوە. ئەگەر بچمه باخ، ئەوە بەدڵنیایی هیچ کارێکم پێ ناکرێت. ئەگەر بشـــگەڕێمەوە ماڵ، ئەوە ئەوشـــەو بەبێ خواردن دەمێنینەوە. دواتر بڕیارم دا بەهەر حاڵێک بێت، بچمەوە باخ. خۆ ئەگەر پەراسووم شکا بێت، ئەوە ئازارەکەی تا چەندان ڕۆژی دیکه تەواو نابێت. بۆ دەبێ ئازاری پەراســـوو و برسییەتی، بەسەریەکەوە لەخۆم کۆ بکەمەوە.

له کۆتاییدا گەیشـــتمه باخەکە، دەســـــتی چەپەم خســــته ســــەر پەراسووی شکا و دەستم بەکارکردن کرد. هێلکەیەکم له دەست بەربووەوە و شـــکا. ئاوم هەڵبەســـت و دانیشـــتم و پشـــووم دا. گەڵاکانم خڕکردنـەوە و هێندێک میوەم لێ کردەوە، ئینجا بـه هانکەهانک وەســـتام. هەســـتم کرد خوێن لەســـەرم تەکان دەدات، وەک ئەوەی له باتی قاچەکانم، له ســــەر ســــەرمەوە وەســــتابم. دانیشتم بۆ ئەوەی هەناسـەیەک هەڵمژم، دیسان هەوڵم دا هەستم.

سەرم سوورِا و بەسەر ڕوومدا کەوتم. مریشکیش لە ترسان لە دەورم تێکهەڵقژان. چاوم کەوتە سەر گەلایەکی زەرد، کە هێشتا ڕام نەماڵیبوو. ئەوسا ماڵاواییم کرد و مردم.

ئای خوایە ژیانی نێو بەرزەخەکان چەندە سێنایە. تۆ لە ژیان ڕاماویت، لە کاتێکدا تەنێ ئیرادەیت و بەس. هیچ نەکەیت، هەڵنەچیت. ژن و پیاوێک هەڵتدەگرن و دەتبەنە ماڵێکی غەریب. دەستت پێدا دەهێنن و لاحەولەووەلاقوەتە دەکەن، پاشان هەر بە جوبەکەی خۆت دنیات لێ دەشارنەوە. دواتر تەختی ڕەوانم دەبەنە ماڵێکی ئاشنا، ها ئەوە دەنگیان دەژنەوم و بۆنیان دەکەم. کاتێک پێڵوە بەیەکدا گیراوەکانم دەکەونە بزاو، دەموچاوی گریاناوییان دەبینم. ئەوەتە سەفیە دەگری، بۆ جاری دووەم بێوەژن کەوتەوە.

سودکین بە سۆزەوە دەستی لە قاچەکانم هەڵپێکاوە، وەک ئەوەی قاچەکانم لەگەڵ من دەفن نەکرێن. سەعدەدین وەک چۆلەکەی شەوێکی باراناوی، هەموو جەستەی هەڵدەلەرزێت. ئیبن زەکی دەست بە سنگ و ئەندامەکانمدا دێنێت و ڕێنمایی مردووشۆر دەکات. ها ئەوەیش عیمادەدین خەریکە ئاو بە سەرمدا دەکات. ئاوی کافوورم پێدا دەکات و کونەلووتەکانم لە بۆنکردن دەگرێت. کفنم دەکات و ڕێی بینینشم لێ دەگرێت. جەستەم بەسەر شانی جەنازە هەڵگرانەوە دەلەرێتەوە. لەکۆتاییدا لە میحرابی مزگەوت دادەنرێم. بانگ دەدرێت و ئیمام نوێژ دەکات. سوورەتی یاسین ناخوێنێت. خەڵکەکە هەڵم دەگرن. هاتوهاوار و ناڵەناڵ، بەرزدەبێتەوە. دەنگی گریانی فەقێکانم، لەناو هەموویان جیا دەکەمەوە. گوێم لە تەپەتەپی نەعلەکانیانە. لەگەڵ خۆڵ

بەســـەرداکردنمدا وردە وردە دەنگی گریان نزم دەبێتەوە و دوور دەکەوێتەوە. دواتر بە یەکجاری دوایی دێت، تەنیا دەنگی سـودکین نـەبێت، کە بەبێ ئـەوەی ئاگای لە خۆی بێت، یەک بە دەمی خۆی هاوار دەکات و دەچریکێنێت.

محەمەد حەسەن عەلوان
کەنەدا- تۆرینتۆ ٢٠١٦

وەرگێرانی: حەیدەر عەبدوللا
کوردستان- هەولێر- ٢٠١٧

ڕۆژگارێکی دوورودرێژە من خەریکی هەڵزنانم، ڕێی وەسڵم لێ دەگیرێت، دووبارە دێمە خوارەوە، دیسان ڕێیەکی دیکە دەگرم و تێ هەڵدەچمەوە. سەردەکەوم، خۆم لەسەر هەڵدێرێک دەبینمەوە، هەمدیس بە ڕێی خۆمدا دەگەڕێمەوە.

ڕیشم هێندەی تر ئاڵۆزاوە، لێوەکانم شەقیان بردووە، وەختێک بۆ خواردنی تیکەنانێک دەیانکەمەوە ، خوێنیان لێ دەچۆڕێتەوە! هەموو ئەندامەکانی جەستەم وەناڵەناڵ کەوتوون، کەچی هەر دەڕۆم و ناوەستم...

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر

بەرگ: ئاکار جەلیل

ANER 442

نرخ: ١٣٠٠٠دینار

1000000442